# شازادەی حەمام

بیرەوەرییەکانی

محەمەد حسین پاپولی یەزدی





بەرگی چوارەم

وەرگێڕانی لە فارسییەوە:

تەها سێکانیانی

# شازادەی حەمام

**نوسینی: محەمەد حسین پاپولی یەزدی**
بەرگی چوارەم
**وەرگێڕانی: تەها سێکانیانی**
**هەڵەچنی: کارزان عەبدوڵڵا**
**تایپ: پەیام دارا**
**دیزاین: هەرێم عوسمان**
**چاپ: چاپخانەی کارۆ**
**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**
**نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم**
**ساڵی چاپ: ٢٠١٩ - سلێمانی**
**نرخ: ٦٠٠٠ دینار**

لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتیيەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٩٠٨ ) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە

# پێڕست

## پێشەکی نووسەر

دنیا لە یەک باردا ناوەستێت، ئەوەی دەمێنێتەوە چیرۆک و یادەوەرییەکانە.

سەرەتای کتێب و پرسیارێک:

ژیانی خەڵکی دەکەم بە چیرۆک و بۆتانی دەگێڕمەوەو ڕاڤەی دەکەم، دەڵێم و دەنووسم، دەیخوێنمەوەو دەیزانم، بەڵام ئایا بەڕاستی لە ژیانی خەڵکی تێدەگەم؟ هەستی پێدەکەم؟ یاخود تەنها ژیانی خەڵکی دەزانم.

هۆنراوە ئەو گوفتارە شیاوەیە کە نیشاندەری ژیانی مرۆڤە، ئایا ئێمە لە زۆرێک لە هۆنراوەکان تێدەگەین، یاخود تەنها دەیانخوێنینەوە؟ ئەگەر بەڕاستی لە ژیانی خەڵکی تێبگەیشتینایە، ژیان بەمجۆرە دەبوو؟ ئەگەر فەرماندەکانی جەنگ کە لە کۆشکەکانیان لە ئاسایشدا دەژین، مانای بۆمب، لاپاڵم، وێرانی، کوشتن، برینداربوون، ڕاکردن و ئاوارەیی، برسێتی، سوکایەتیپێکردن و... تێدەگەیشتن، بەهیچ کلۆجێک جەنگیان بەرپا نەدەکرد، جەنگیان نەدەکردو بەردەوام نەدەبوون لە جەنگ.

دەمەوێت هاوارو ناڵەی خانمە شاعیرێکی ئەفغانستانی هاوزمان، هاودین و هاوکەلتوور گوێ لێبگرم، کە لە ئاکامی جەنگە یەک لەدوا یەکەکانی ئەفغانستان بەمیرات بۆ نەوەکانیان ماوەتەوە. لە ئێوە دەپرسم، دیارە ئێمە بەڕاستی ئەم هاوارە دەبیستین، بەڵام ئایا لە ماناکەی تێدەگەین و هەستی پێدەکەین؟ یان تەنها گوێبیستی دەبین و هیچی تر.

**شەو تەنهایی وای لێکردم**
**ئاوێنە لە ئامێز بگرم**
**کە کوژراوی تەنهاییم من**

**ئەمگەرەکە کەسانی من**
**پەیبەرن بە تەنهاییم**
**زەنگ لێدەدەم بۆ دایکم**
**حاڵم وایە**
**هەموو شت لە باشیدایە**
**زەنگ لێدەدەم بۆ خوشکم**
**بەرهەڵستە لای ساڵەهایە**
**ژیانم لە تەنگی دایە**
**ئەو تێدەگات چەندین ساڵە**
**حاڵم لە خراپی دایە**

هۆنراوە گوفتارێکی شیاوە، ئەم چەند دێڕە لە هۆنراوەی (بارانی سوجادی)، دەکرێت بە ئاسانی بیخوێنینەوە، دەکرێت بە ئاسانی لەبەری بکەین، بەڵام ئایا دەکرێت وا بەئاسانی تێیبگەین؟ ئایا دەکرێت وا بە ئاسانی هەست بەم چەند دێڕە هۆنراوەیە بکەین؟ من دەتوانم مانای هۆنراوەکانی (سوجادی) بزانم، بەڵام هەرگیز ناتوانم لە چەمکی ئەو هۆنراوەیە تێبگەم، تۆ دەتوانیت لە مانای هۆنراوەی (بارانی سوجادی) تێبگەیت؟

بەدرێژایی چەندین سەدە هەزاران لێکدانەوە بۆ دوو دێڕ لە هۆنراوەی سەرەتای مەسنەوی مەعنەوی کراوە.

**ببیستە نەی چۆن چیرۆک بەیان دەکات**
**هەی داد لە دەست دابڕان و دووری دەکات**
**لەو دەمەی لە قامیشەڵان هەڵبڕام**
**لە هاوارم پیاوو ژن ناڵین دەکات**

پێویستبوو جەلالەدین محەمەد بەڵخی لێرە بووایە، تاوەکو مانای ئەم دوو دێڕە هۆنراوەیەمان تێبگەیەنێت. جەلالەدینی بەڵخی کە بە بنەماڵەوە لە ترسی هێرشی مەغۆلەکان دەربەدەرو ئاوارەبوون. ئایا ئەگەر مەولەوی لە شارو وڵاتی خۆیدا بژیایە و ئاوارە نەبووایە، لە زێدی خۆی نەڕۆیشتایە، دەبوو بە کەسێکی عیرفانی؟

پێویستبوو بارانی سوجادی لێرەبووایە، تاوەکو لە مانای تەنهایی تێبگەین، بەجۆرێک لە مانای تەنهایی تێبگەین تا دەگاتە ئەو ئاستەی ئاوێنە لەباوەش بگرین.

ژیاننامەی بارانی سوجادی هەر خۆی ڕۆمانێکە، لەوەیە ڕۆژێک بێت لەبارەی ژیانی ئەوەوە ڕۆمانێک بنووسم. بارانی سوجادی منداڵی کوڕو کچێکی دوو ئایەتوڵڵای ئەفغانییە. باوکی تەمەنی (١٦) ساڵ و دایکیشی تەمەنی (١١) ساڵ بووە کە بەیەکەوە هاوسەرگیرییان کردووە، هەردووکیان بەیەکەوە ڕۆیشتوون بۆ شاری نەجەف، باوکی دەیویست لە نەجەف لە خوێندنی وانە ئاینییەکان بەردەوام بێت. باوکی باران بوو بە حوجەتولئیسلام، وتاربێژێکی باش بوو، کەسێکی شۆڕشگێڕ بوو، هەربۆیە لە وڵاتی عێراق دەریانکردن. ساڵی (١٣٥٤/ ١٩٧٥) لەگەڵ هاوسەرو دوو منداڵەکەی لە ناوچەی گوڵشەهری مەشهەد نیشتەجێ بوون. دایکی تەمەنی شانزە ساڵ بوو کاتێک باران لەدایک بوو. باران سێیەمین منداڵی بنەماڵەکەی بوو، ئەو لە گوڵشەهری مەشهەد لەدایک بوو. باوکی باران لە ساڵی (١٣٦٩/١٩٩٠) ڕۆیشت بۆ شاری لاهوری پاکستان. باران تەمەنی یازدە ساڵ بوو کاتێک باوکی شەهید دەبێت، باوکی لە تەمەنی (٣٤) ساڵیدا شەهید دەبێت. دایکی بارانیش لە تەمەنی (٢٧) ساڵیدا بە شەش منداڵەوە لە ئاوارەییدا دەبێتە بێوەژن. ئێمە دەزانین کە ژنێکی تەمەن (٢٧) ساڵ بە شەش منداڵەوە لە غەمی هاوسەرەکەیدایە، بەڵام ئایا ئێمە لە ژیانی ئەو تێدەگەین؟ ئەوە ژیانە یان دۆزەخە؟ من لە مانای کەساسی و ئاوارەیی و دەربەدەریی تێدەگەم؟ پێویستە باران لەگەڵ چارەنووسی گوڵشەهر بگونجێت، یادەوەریی تاڵ و شیرینی گوڵشەهری مەشهەد ئەوەندەی هەزار بەرگ کتێبە.

گوڵشەهری مەشهەد بەتەواوی جیهانەوە پەیوەستە، گوڵشەهری مەشهەد ناوجەرگەی جیهانە. دە هەزار کەسی ئەفغانی لە گوڵشەهەری مەشهەد لەدایکبوون و هەر لەوێش گەورەبوون و هەر لەوێش دەژین، ئێستا هەزاران کەسی گوڵشەهری لە سەرانسەری جیهاندا بڵاوبوونەتەوە. ناوی گوڵشەهر لە هەموو جیهاندا ناوێکی بیستراوە. لەو گەڕەکە هەژارنشینەی مەشهەد وەزیر، دادوەر، ملیاردێر، نووسەر، شاعیر، خەباتکەر، شەهیدو قارەمان و کرێکاری هەژاری زۆر تێدایە، گەڕەکی گوڵشەهر نیشانەی خۆڕاگریی میللەتێکە. باران تەمەنی (١٨) ساڵ بوو کاتێک چووە زانکۆی فیردەوسی مەشهەد، لەو زانکۆیەدا بەشی جوگرافیای هەڵبژارد، سێ ساڵ لەوێ خوێندکار بوو، بەڵام خوێندنی تەواو نەکردو وازی هێنا.

بارانی سوجادی بەتەنها داوای مافی پەنابەرێتی کرد لە وڵاتی کەنەدا، بەتاقی تەنهاو بەبێ هیچ ناونیشان و هاوڕێ و خزمێک لە مەشهەدەوە ڕێگای (تورنتۆی) گرتەبەر، لەوێ بەتەنها دەژیاو خۆی فێری زمان کردو کاریدەکرد.

ژیانی بارانی سوجادی دوای دە ساڵ مانەوەی لە کەنەدا، هێواش هێواش بەرەو باشتر دەچوو، برا گەورەکەی سەید ئەسەدوڵڵا لە سوریا شەهید بوو، سەید ئەسەدوڵڵا خاوەنی ژن و سێ منداڵی بچووک بوو. باران کچە شەهید بوو، دواتریش بووە خوشکی شەهید، ئێستا دەبێت پێیەکی لە تۆرنتۆی کەنەدا بێت و پێیەکەی تری لە مەشهەد، دەبێت دایکی و هاوسەری براکەی و برازاکانی دڵنەوایی بکات.

هەموو گرفتارییەکانی بەلایەک و وەرگرتنی ڤیزا بەمەبەستی هاتنەوەی بۆ ئێران لەلایەکی تر. ئەو بۆ هەرجارێک هاتنەوەی بۆ ئێران، دەبێت ڤیزا وەربگرێت. هاتنەوە بۆ وڵاتێک کە لێی لەدایکبووەو لێی گەورە بووەو بە زمانی ئەوان دەدوێت و پابەندی هەمان ئاینی ئەوانە. باوک و براکەی لەپێناو ئامانجێکدا شەهیدبوون. خۆمان دەزانین وەرگرتنی ڤیزا چ دەردیسەرییەکە.

ژیانی ملیۆنەها ئاوارەی ئەفغانی و ملیۆنەها ئاوارەی جەنگ لە سەرانسەری جیهاندا هاوشێوەی ژیانی بارانی سوجادیە.

ئێمە گوێمان لە هاوارەکان دەبێت، بەڵام ئایا هەستی پێدەکەین، ملیۆنەها فەڵەستینی، کورد، عێراقی، سوری، یەمەنی، ئەفریقایی و کینیایی... لەهەمان باردان و بەڵکو خراپتریش. من لە بنەچەی خۆم دانەبڕاوم، کەواتە چۆن دەتوانم لەو دێڕە هۆنراوەیە تێبگەم:

**شەو تەنهایی وای لێکردم**

**ئاوێنە لە باوەشبگرم**

لەم جیهانە چەقیوە بێدادپەروەری و بێهێزو بێپارەییەدا ژنێکی دابڕاو لە بنەچەی خۆی، تەنها لە غوربەتدا دەتوانێت وێنەی خۆی لە ئاوێنەدا لەباوەش بگرێت. خۆزگە هیچ کەسێک لەوانەی جەنگ هەڵدەگیرسێنن، نەهاتنایەتە دنیاوە، خۆزگە هەموو سنوورەکان دەبوون بە پردێک، خۆزگە هەموو ئەو قەڵەمانەی بڕیاری جەنگیان پێدەنووسرێت، دەشکان. وڵاتان بە بڕیارە بەدەکانیان گرفتاریی بۆ گەلان دروست دەکەن. خۆزگە دەست و پێی هەموو ئەو بڕیاردەرانە دەشکان. لە سەرەتای کتێبەکەدا داواکارییەکم لە ئێوە هەیە، تکایە هەوڵبدەن لە چیرۆک و هۆنراوەکان تێبگەن، نەک تەنها بیانخوێننەوە.

بۆئەوەی ماندوو نەبیت، سەرەتا پارچەیەکی تر لە هۆنراوەکانی شاعیری ئاوارەو سەرگەردانی ئەفغانی بخوێنەرەوە، پاشان یادەوەرییەکانی من بخوێنەرەوە:

**من ئەوەندەی چاوانی**
**تۆ قەترانی بووم**
**لەسەر فەرشێکی ڕاخراو**
**بەبێ بوونی دەستانی تۆ**
**دوور لە خانووە بەردینەکە**
**ویستەکانم بە بادا بڵاو دەبنەوە**
**وەکو عەتری سینەی ئەوینی شەو**
**دیسانەوە شێت دەبمەوە**
**بۆنی مەینەت لە باخی شاری کابول دێت**
**هەر منداڵەو لە بن پرد دا دەسوتێت**
**غیرەتەکان دەبنە دوکەڵ**
**لە توێی هەزار بێ هیوایی دەپچڕێت**
**ئارەزووەکانی خۆم ناشت**
**لە ژێر گڵی تڕەی دڵی هاوشاریانی بێ گوناهم**
**کاشکێ تیشکی خۆر هێرشی بهێنایە بۆماڵمان**
**بۆ ماڵە گڵێنەکەی باپیرمان**

## پێشەکی وەرگێڕ:

ئەمە دوایین بەرگی کتێبی شازادەی حەمامە، پەرتوکێک پڕ لە نەزم و ئەزموون، بە جۆرێک خوێنەر پابەندی خۆی دەکات ئەستەم بێت بوونی لە ناو پێچ وکۆلانەکانی بەر هەستکردنی تاوی واتاکانیدا نەبینێتەوە، پەلی خوێنەر دەگرێت و بە خوێندنەوەی سایکۆلۆجیای پیری داناو پیتۆلی بە تواناو سادەیی نەخوێندەوارێک و بەریەک کەوتنی توندگیرێک و فراونگیرێک ئاشنای دەکات. لە نشینگەیەکی داخراوی فرە کەلتوری یەکتری قبولکردووەوە دەمانباتە ناو شەپۆلە سەرشێتەکانی شارێکەوە کە بێبەزەییانە هەموو شتێک لە خۆیەوە دەپێچێت و لە ناو خۆیدا وێڵ و سەرگەردان، هەندێک جاریش گومی دەکات، بەڵام لە ناو بنکڵی ئەو شەپۆلانەدا هێشتا سەدەفانێک هەن ناویان پڕە لە مرواری گرانبەها، کە هەر ئەوان هۆی درەخشانی وبەهاداری وسەرپێکەوتنی ژیارو شارستانیەتی مرۆڤایەتین:

لەم بەرگەدا پاپۆلی یەزدی هەم ئاسۆیی وهەم ستوونی کاری لەسەررەهەندە جۆراوجۆرەکانی شێوە ژیانی ناوخۆیی وبیابانی و خۆرهەلاتی وخۆرئاوایی وگەرمەسێرو بەستەڵەکی باکوری کردووە. لە سنوری زێدو شارو ولاتی خۆی تێپەڕیووەو بەرگی گۆی زەمینی بە بەر ئەم بەرگەی پەرتوکەکەیدا کردووە. ئەوەی گرنگە لێرەش تاکی کوردو پانتایی کوردستان و ئومێدی کورد لەو نیوە گۆی بەستەڵەکی باکورە دەبێتە کاراکتەرێکی بەهێزی تەواوکاری نێو ئەم پەرتوکە.

ئەوەی ماوە بڵێین نووسەر لە ماوەیەدا سێ کتێبی تری بە چاپگەیاندووە، بەناوەکانی مەزهەبی عیشق وجەژننامەو دبلۆماسیەتی ئاوی ئێران . هەرچەندە لە بەرگی چوارەمدا ئاماژەی بەوە داوە کە بەشی پێنجەمی شازادەی حەمام دەنووسێت و تایبەت دەبێت بە بیرەوەریەکانی لەسەر دەمی خوێندکاری زانکۆدا. هەروەها لە نەورۆزی ئەمساڵدا کاتێک هات بۆ شاری سلێمانی گوتی لە سەر ئەم گەشتەم بۆ کوردستان شتێکی باش دەنووسم. ئەوەندەی ئاگاداربم دەستی بە نووسینی کردووە.

پاییزی ۲۰۱۹

## یادەوەرییەک لە حوجەتولئیسلام حاجی سەید عەلی محەمەد وەزیری

کچە عەبا سپییەکە ون ببوو، ئیتر ئەوم نەدیتەوە، هەرگیز نەمدیتەوە، هەمان ئەو کچەی لە قوتابخانەوە تاکو گەراجی ئەتمینان بەدوایدا ڕامکرد. بەدرێژایی ڕێگاکە تاکو شەقامی پەهلەوی (ئیمام خومەینی) نزیکەی (٥،٢) کیلۆمەتر بەبێ وەستان بەشوێنیدا ڕامکرد، ئاخر ئەگەر درەنگ بکەوتمایە، ئەو دەڕۆیشت. ئێستا ئەوم لێ ونبووە، ئیتر بیانووی ڕاکردنم بە شوێنیدا نەماوە. هیچ جیاوازییەک نەبوو کاتژمێر (١٢:١٠) بگەمە بەردەمی گەراج، یاخود کاتژمێر (١٢:٠٥). تازە ئەو ڕۆیشتبوو، ئیتر ماوەی بینینەوەی نەبوو. لەبەرخۆمەوە گوتم: ئێستا کە هیچ پەلەیەکم نییە، بۆچی لە شەقامەکەوە بەرەو ماڵەوە بڕۆم؟ وا باشترە کۆڵانەو کۆڵان بڕۆم بەرەو ماڵەوە. ئیتر هەر ڕۆژەو لەڕێگایەکەوەو لە شوێنێکەوە دەڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە. دووریی قوتابخانە تا ماڵەوە پێنج کیلۆمەتر دەبوو، دەمتوانی لە دە ڕێگاوە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. ڕۆژێکیان گوتم: لەڕێگای مزگەوت و چواربازاڕو گەڕەکی یەهودییەکانەوە دەڕۆمـەوە. کاتێک نزیک مزگەوتەکە بوومەوە، دەنگی بڵندگۆی مزگەوتەکە هاتە گوێم، بانگدەر دەستیکردبوو بە بانگدان. کاتێک گەیشتمە گەڕەکی یەهودییەکان، دەنگی بانگ و بڵندگۆکان نەهاتە گوێم، گەڕەکی یەهودییەکان دیواریان بە دیواری مزگەوتەکەوە بوو، مزگەوتەکە لە دامێنی گەڕەکی یەهودییەکانەوە بوو. ژمارەیەک لە خانووی یەهودییەکان بەتەنیشت دیواری خۆرئاوای مزگەوتەکەوە بوون. ئێستاش ساڵی (١٣٩٤-٢٠١٥)، خانووی یەهودییەکانی یەزد دیواریان بە دیواری مزگەوتەکەوەیە. کەنیسـەی گەورەی یەهودییەکانی یەزد تەنها

(٥٠) مەتر دوورە لە مزگەوتەکەوە. دیارە ئەمە زۆر مانا هەڵدەگرێت، ئەوانەی شارەزاییان هەیە لە ئایینی ئیسلام باش تێدەگەن. ئەوانەی لە کەلتووری ئێرانی- ئیسلامی تێدەگەن، باش دەزانن کە نزیکیی مزگەوتی موسڵمانان و کەنیسەی یەهودییەکان مانای چییە؟ دەزانن ئەو نزیکیی جوگرافیاییە ڕیشەی کەلتوورێکی دەوڵەمەندی چەند هەزار ساڵی هەیە. دەزانن چ هاوژییانی و ئاشتەواییەک لەم نزیکیی جوگرافیا شاراوەیەدا هەیە. شتێک کە ئەمڕۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نیازی زۆری پێی هەیە. چەند ڕۆژێک لە هەمان ڕێگاوە لە قوتابخانەوە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە. هەستمکرد لە (٦٠-٧٠) مەتر دووریی مزگەوت لەگەڵ گەڕەکی یەهودیان دەنگی بانگی مزگەوت کەمتر دەبیسترێت. کاتێک بە تەواوی دەچیتە ناو گەڕەکی یەهودیان، بەهیچ جۆرێک دەنگی بانگەکە نەدەبیسترا، دڵنیابووم کە ئەمە بێهۆ نییە.

تەمەنم شازدە ساڵ بوو، مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بوو، دایکم گوتبووی ئەمساڵ شەوان بۆ نوێژکردن دەچم بۆ مزگەوت. من و دایکم لەگەڵ چەند ژن و منداڵی دراوسێمان بەرەو مزگەوت بەڕێکەوتین، دووریی مزگەوت لە ماڵمانەوە بەڕێگای کۆڵانەکاندا، نیو کاتژمێر دوور دەبوو، دەبووایە لە گەڕەکی یەهودییەکانەوە بڕۆیشتینایە بەرەو مزگەوت، کاتێک لە گەڕەکی یەهودییەکانەوە گەیشتینە دیواری پشتەوەی مزگەوتەکە، هیچ دەنگێک نەبوو. گەیشتینە بەردەرگای مزگەوت، مەراسیمی نزاخوێندن لە بڵندگۆکانەوە بڵاو دەکرایەوە. دایکم ڕۆیشت بۆ بەشی ژنان، منیش لەبەر دەرگای مزگەوتەوە تێپەڕیم و گەڕامەوە بۆ ناو گەڕەکی یەهودییەکان، دەنگی بڵندگۆکان هێواش هێواش کەمدەبووەوە، کاتێک چوومە ناو گەڕەکەکەوە، هیچ دەنگێک نەدەهاتە بەرگوێم، گەڕەکەکە بێدەنگ و ئارام بوو.

دووبارە گەڕامەوە بۆ مزگەوت، بەشی پیاوان تاڕادەیەک قەرەباڵغ بوو، بۆ یەکەمینجار ویستم لەناو مزگەوتەکەدا دانیشم. زانیم مزگەوتەکە نۆژەنکراوەتەوەو دەیانەوێت کتێبخانەیەکی تازە لەلایەکەوە دروست بکەن، دەمزانی قوتابخانەیەکی فێرکاریی ئیسلامی دروستکراوە. کەسێکی باڵابەرزی تەمەن (٦٥) ساڵ، ئەگەرچی کە سەیرت دەکرد لەو تەمەنە کەمتر بەدی دەکرا، ڕووخسارێکی گەش و جوانی هەبوو. لایەنگری لە شاردا زۆر بوون، عەمامەیەکی ڕەشی لەسەردا بوو، جلوبەرگەکانی زۆر خاوێن بوون. بەئازادی لە سەرەوەی مینبەر دانیشت و چەند ئایەتێکی لە سورەتی (طه) خوێند.

قال رب اشرح لی صدری (٢٥)
ویسرلی امری (٢٦)
واحلل عقده من لسانی (٢٧)
یفقهوا قولی (٢٨)

وتەکانی شیرین بوون، جیاواز لە زۆربەی هاوکارانی، ئەوشەوە ڕێکەوتی شەهیدکردنی ئیمامی عەلی بوو، ئەو پیاوە بەڕێزە نە نەفرەتێکی بۆ ئیبن مولجەم نارد، نە شمشێری ڕاکێشاو نە خوێنی ڕشت. هەوڵیدەدا بۆچوونەکانی ئیمام عەلی پیادە بکات. ئەو ساڵە سێ شەو چووم بۆ مەراسیمەکانی مزگەوت، هەموو شەوەکان سەیدی گەورە دەچووە سەر مینبەرو بەهەمان ئایەت دەستی پێدەکرد، منیش هۆگری وتارەکانی بووم. بەگشتی ئەو کەسێک نەبوو زیاتر وتار بدات، واتە کەسێک نەبوو بە بەردەوامی بڕوات بۆ وتاردان.

تێگەیشتم چوونە سەر مینبەرو وتاردان پیشەی ئەو نییە، ئەو زیاتر کاری لە کتێبخانەکەو وانەوتنەوەی ئیسلامی بوو. بەردەوام گەشتی دەکرد بۆ بانگێشەکردن، دەچوو بۆ شارو دێهاتەکان. ئەو زیاتر کەسێکی بنیاتنەر بوو، دامەزرێنەری قوتابخانەو کتێبخانەو کاروباری خێرخوازیی بوو، بەم هەموو سەرقاڵییەوە ساڵی چەندجار دەچووە سەر مینبەری مزگەوت و هەموو جارێک بەهەمان ئایەتی قورئان دەستی پێدەکرد. دوو پرسیار لە مێشکمدا بوون، یەکەمیان، بۆچی دەنگی بڵندگۆی مزگەوت لە گەڕەکی یەهودییەکانەوە نابیسترێت، گەڕەکێک کە دیواریان بە دیواری مزگەوتەکەوەیە. دووەمیان، بۆچی ئەم سەیدە بەڕێزە کاتێک دەچووە سەر مینبەر بەهەمان ئایەتی قورئان دەستی پێدەکرد. مامۆستای جوگرافیا ئاغای جەلیلی تەیبات لێکۆڵینەوەیەکی بەمن سپاردبوو، بۆیە دەبووایە بچم بۆ کتێبخانە. منیش چووم بۆ کتێبخانەی تازە دروستکراوی وەزیری. کتێبخانەیەکی بچووک بوو لە تەنیشت دەرگای هاتنەدەرەوەی مزگەوت. زۆربەی ڕۆژەکان کوڕێکی گەنج دەهات لە پشتی یەکێک لە مێزەکانی کتێبخانەوە دادەنیشت، تەنها بۆ ئەو کوڕە گەنجە چاییان دەهێنا. وام هەستکرد ئەو کوڕی یەکێک لە گەورە پیاوانی شار بێت. پرسیارێکی تریش لە مێشکمدا دروستبوو، نەمدەزانی دەبێت لە کێ بپرسم، کەسێکی تەمەن (١٥-١٦) ساڵ سەدەها پرسیاری هەیە، بەڵام نازانێت لە کێ بپرسێت. دیارە ئەگەر باوکم هەبووایە زۆر بە ئاسانی دەمتوانی

پرسیارەکانم لەو بکەم. گەنجەکانی ئەمڕۆ زۆر بەئاسانی وەڵامی پرسیارەکانیان لە ئینتەرنێت دەست دەکەوێت، ئینتەرنێت جێگای باوک و دایک و برای گرتۆتەوە. ڕۆژێک لەکاتی نیوەڕۆدا لەبەردەمی مزگەوتەکەوە تێپەڕیم، کاتی بانگ بوو، لە دەرگای لای ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتمە چواربازاڕ، ویستم لە کۆڵانی یەهودییەکانەوە بڕۆم، بە بەردەمی دووکانێکدا ڕۆیشتم، دووکاندارەکە کەسێکی بەتەمەن بوو، لە بەردەمی دووکانەکەیدا لەسەر کورسییەک دانیشتبوو. گوتم با لەم دووکاندارە بپرسم بزانم بۆچی دەنگی بڵندگۆکانی مزگەوت لە گەڕەکی یەهودییەکانەوە نابیسترێت؟ دووکاندارەکە گوتی: بەڕێز سەید عەلی محەمەد گوتوویەتی، نابێت دەنگی بڵندگۆکان بگاتە گەڕەکی یەهودییەکان. گوتم: بۆچی وایگوتووە؟ گوتی: سەید نەوەی پێغەمبەرە، ئەو قسەیەکی باشی کردووە، ئەو گوتوویەتی ئەم یەهودییانە دراوسێی مزگەوتن، ئەوان کەسانی نوێژخوێن نین، ئێمە بۆچی ببینە مایەی زەحمەت بۆ ئەوان. سەیدی گەورە گوتوویەتی بڵندگۆکان بەجۆرێک دابنێن کە دەنگەکە نەچێت بۆ گەڕەکی یەهودییەکان. دووکاندارەکە بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: بڵندگۆکان لەسەر دیوارە بەرزەکەی مزگەوت نین، بەڵکو چەند مەترێک لەخوارتر لە دیوارەکانیان بەستوون، دیوارەکە خۆی بۆتە بەربەستێک بۆ تێپەڕ نەبوونی دەنگەکە بەرەو گەڕەکی یەهودییەکان. ئێستا تۆ لە دوو لاوە بەباشی دەنگەکە دەبیستی، بەڵام لە گەڕەکی یەهودییەکانەوە بەهیچ جۆرێک دەنگەکە نابیستیت. پیرەمێرد بەردەوام بوو لە قسەکانی و گووتی: بەتایبەت ئاغای وەزیری گوتوویەتی: بەتایبەتی دەنگی بانگی بەیانیان نابێت ئەم بەندانەی خودا لە خەو هەڵسێنێت. ماڵە یەهودییەکان زیاتر لە باشووری مزگەوتەکەو کەمێک بەلای ڕۆژئاواوە بوون. لەو سەردەمەدا هێشتا ماڵی مامە موسای قەساب (موشە کاتساو) دیواری ماڵەکەیان بە دیواری لای خۆرئاوای مزگەوتەکەوە بوو. هەمان موسای قەساب، یان موشە کاتساو، کە دواتر بوو بە سەرۆک کۆماری وڵاتی ئیسرائیل. من چەندینجار هەمان پرسیارم لە چەندین کەس کرد، هەموویان هەمان وەڵامیاندامەوە، کە ئاغای وەزیری گوتوویەتی دەنگی بڵندگۆکان و مزگەوت، بەتایبەتی بانگی بەیانیان، نابێت هاوسێی یەهودییەکانما تووشی نارەحەتی بکات. لەم سەردەمەدا پێویستە چەند وانەیەک لەم وتانەوە فێر ببین. ئازاردانی دراوسێکەت کارێکی خراپە، تەنانەت ئەگەر دراوسێکەت هاودینی خۆشت نەبوو.

بۆ بەدەستهێنانی وەڵامی پرسیاری دووەم، چووم بۆ کتێبخانە. بڕیارمدا لە کەسێک بپرسم بۆچی تەنها چایی دەدەن بەو کوڕە گەنجە. ڕۆیشتم لە مێزەکەی تەنیشت ئەوەوە دانیشتم، یەکێک لە کارگوزارەکانی کتێبخانەکە چایی بۆ هێنا. چایەکە ڕەنگێکی جوانی هەبوو، پیاڵەو ژێرپیاڵەکە خاوێن و درەوشاوە بوون. سینی و شەکردانەکەش لەوان خاوێنتر. کارمەندی کتێبخانە بەڕێزەوە چایەکی پێشکەش بە کوڕە گەنجەکە کرد، کوڕەکەش بە سوپاسەوە چایەکەی لێوەرگرت. منیش لەپشت کارمەندەکەوە لە هۆڵی خوێندنەوە هاتمە دەرەوەو گوتم: بەڕێز دەتوانم لێت بپرسم بۆچی تەنها چایی دەدەن بەو کوڕە گەنجە. ئەویش گوتی: ئەو کوڕە یەهودییە، دراوسێی مزگەوتە. ئاغای وەزیری فەرموویەتی هەرکاتێک ئەم کوڕە گەنجە هات ڕێزێکی زۆری لێبگرن و چایی پێشکەش بکەن. ئێمە بەهەموو کەسێکی یەهودی و زەردەشتی و هەموو ئەوانەی کە موسڵمان نین و دێن بۆ کتێبخانە، ڕێزێکی زۆریان لێدەگرین، ئاغای وەزیری گوتوویەتی ڕێز لە هەموو کەسێک بگرن، بەڵام ڕێزێکی زیاتر بگرن لە یەهودی و زەردەشتی و هەموو ئەوانەی موسڵمان نین.

بەڕاستی نازانم چ ساڵێک بوو، بەڵام وا هەست دەکەم ساڵی ( ١٩٦٣/١٣٤٢) بووبێت. کە من ئەم پرسیارەم کرد. ئێستا دەزانم کە کتێبخانەکە لە باڵەخانەیەکی کۆنی لای دەرگای پشتەوەی مزگەوتەکەیە. دوایی بە هەوڵی ئاغایان هیراتی و حسێن بەشارەت باڵەخانەیەک بۆ کتێبخانە دروستکرا. ئەو ڕۆژە پرسیاری زیاترم نەکرد، ئەوەندە تێگەیشتم کە نابێت تەنها لەگەڵ هاوشارییە یەهودی و زەردەشتییەکان بژین، بەڵکو پێویستە چەند هێندە ڕێزیان لێبگرین. تۆ باشتر لە من تێدەگەیت، ئەم وتانە چ گرنگییەکیان هەیە، ئەم وتانە گرنگن بۆ دەوروبەرو بۆ هەموو جیهان. پاش پەنجا ساڵ ڕۆیشتم بۆ کتێبخانەی وەزیری، باڵەخانەیەکی تازە، بە هاوکاری پارێزگاری مەشهەد دروستکرابوو، هەرکاتێک دەچم بۆ ئەوێ، سەردانێکی بەڕێزان محەمەدی ئینتزاری سەرۆکی کتێبخانە و حوسێن مەسرەتی بیرمەندو زانا دەکەم. محەمەد ڕەزای ئینتزاری هەر خۆی کتێبخانەیەکی گەورەو کتێب ناسە، ئەو یادەوەرییەکی زۆر لەمێشکیدا هەیە، زانایەکی بلیمەتە، هەمیشە چایی و شیرینی یەزدی پێشکەش بە میوانەکانی دەکات، ژوورەکەشی لە تەنیشت دەرگای چوونە ژوورەوەی کتێبخانەکەوە بوو. بابەتی پەنجا ساڵ پێش ئێستا لە ئاغای ئینتزاری دەپرسم تاکو بەڕاستی بزانم ئایا کەسانی

ناموسڵمان سوود لە کتێبخانە وەردەگرن؟ وەڵامدەداتەوە، بەڵێ، بەڵێ، پاشان دەست دەکات بە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی و دەڵێت: سەرەتای دامەزراندنی کتێبخانەکە بوو، هێشتا لە باڵەخانە کۆنەکە بووین، کوڕێکی گەنج چەند ڕۆژێک دەهات و سەیرێکی ناو کتێبخانەی دەکرد و دەڕۆیشت. ڕۆژێک یەکێک لە کارمەندەکان لەو کوڕەی پرسی، بۆچی هاتوویت؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی: پرسیارێکم لە ئاغای وەزیری هەیە. پاشان کوڕە گەنجەکە ئاغای وەزیری دەدۆزێتەوەو پێی دەڵێت من یەهودیم و بە ئاغای وەزیری دەڵێت: مۆڵەت دەدەیت لە کتێبەکانی کتێبخانە سودمەند بێت. حاجی ئاغا دەستی کوڕە یەهودییەکە دەگرێت و دەیبات بۆ ناو کتێبخانەکەو بە کارمەندانی کتێبخانەکە دەڵێت: ئەم کوڕە گەنجە یەهودییە، دراوسێی مزگەوت و کتێبخانەیە، هەرکاتێک هات بۆ کتێبخانە ڕێزی لێبگرن و چایی پێشکەش بکەن، ئەگەر کتێبی پێویست بوو پێی بدەن. حاجی ئاغای وەزیری بە کارمەندان دەڵێت ئێمە کتێبخانەمان بۆ هەمووان دروستکردووە. بۆ موسڵمانان، بۆ شیعە، سوننە، یەهودی، زەردەشتی، مەسیحی، ئەرمەنی و تەنانەت کەسانێک کە ئێمە لە ڕوانگەی دین و مەزهەبەوە قبوڵمان نین، ئەوانە هەموو ڕێنوێنی بکەن بۆ ناو کتێبخانەکە. (هەرکەسێک هات بۆ ئێرە لە دینی مەپرسن و کتێبی پێ بدەن)، ئەگەر زانیتان ئەو کەسە موسڵمان نییە، دەبێت زیاتر ڕێزی لێبگیرێت. لەو ڕۆژەوە کە دەبێت ساڵی ( ١٣٤٢/ ١٩٦٣) بووبێت. هەموو کارمەندانی کتێبخانە تێگەیشتن کە کتێبخانە بۆ هەمووانە، هەروەکو ئەوەی شارو وڵات بۆ هەمووانە.

ئێستا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر تێدەگەم کە بۆچی سەید عەلی محەمەد وەزیری، ئەو زانا گەورەیەی بنیاتنەری مزگەوت و کتێبخانەو قوتابخانە، هەمیشە کە دەچووە سەر مینبەر بە داواکاری حەزرەتی موسا لەبەر خودا دەپاڕایەوەو یەکەمین داخوازی حەزرەتی موسا لە خودا ئەوەبوو (رب اشرح لی صدری ویسرلی امری)، یەکەمین شت کە حەزرەتی موسا داوای لە خودا کرد ئەوەبوو فەرمووی، خودایە سنگم فراوان بکەیت، سنگفراوانیم پێ ببەخشە. ئەمە داواکارییەکی سادەیە، بەڵام خەڵکانی ئەمڕۆ زۆر زیاتر لە خەڵکانی پێشتر پێویستیان بەو داواکارییە هەیە لە خودای گەورە. خودایە سنگم فراوان بکەیت، سنگفراوانی سەرچاوەی پێکەوە ژیان و پێکەوە هەڵکردن و سەبرکردنە. سنگفراوانی سەرچاوەی ڕێزو خۆشەویستییە، سنگفراوانی نیشانەی ئاشتی و تەباییە، سنگفراوانی گەورەترین بانگەشەیە بۆ ئایین و مەزهەب، کەلتووری ئەم وڵاتە دوژمنان

دروستیان نەکردووە، کەلتووری ئەم وڵاتە کەسانی وەکو شێخ ئەبو ئەلحەسەنی خورقانی، بایەزیدی بوستامی، فیردەوسی، مەولەوی، سەعدی، حافز، سەید عەلی محەمەد وەزیری یەزدی بنیاتینناوە. خوداوەند سنگفراوانیمان پێ ببەخشە. ئێرانییەکان سەد هەزارانجار نیشانیان داوە کە ڕێز لە هەموو ئاینەکان دەگرن. کاتێک زەمین لەرزە، یاخود لافاوێک لە هەرشوێنێکی ئەم جیهانە ڕوودەدات، هاوکارییەکانی میللەتی ئێمە نیشانەی سنگفراوانی ئێمەیە. خەڵکی شاری یەزد لە ڕووی ڕێزی کەمینەکانەوە زۆر لە پێشەوەن. ئەوەش شانازییە بۆ خەڵکی شارەکەمان کە بە پلەیەکی زۆر باڵا لە هەستکردن بە مرۆڤایەتی و هاوژیانی و پێکەوەژیانی هاوشارییان گەیشتوون. کە هاوشارییەکی زەردەشتی خۆشەویست خۆی بۆ ئەندامی شورای ئیسلامی یەزد هەڵبژارد، لە شاری یەزد لانی هەرە زۆری (٣٠٠٠) کەسی زەردەشتی دەیانتوانی دەنگ بدەن، بەڵام ئەو کوڕە زەردەشتییە (٢٠١٨٩) دەنگی بەدەستهێنابوو، واتە (١٨٠٠٠) کەسی موسڵمان دەنگیان بەو هاوشارییە زەردەشتییە داوە. هەڵسوکەوت و پێکەوەژیان و خۆشرەفتاری و ڕێزی بەرامبەرو هاوژیانی لەوە باڵاترە. ئەو هاوشارییە زەردەشتییە بەڕێزەی یەزد لە مافی یاسایی خۆی سودمەند بووە، بەڵام ئەوان خەڵکی یەک شارن کە هێزو وزە و توانای خۆیان بۆ پێشخستنی کەلتووری دەوڵەمەندی ئیسلامی-ئێرانی نیشانی جیهانیان دا. ئەو دەرفەتە گرانبەهایەی کە نیشانەی گەورەیی کەلتووری ئیسلامی- ئێرانی ئێمەیە، دەبێت بیپارێزین.

# ترسام و ترسم شکا

منداڵ منت کوشت، دۆزەخت نیشاندام، ئاخر بۆچی ئەوەندە خەفەتم پێدەدەیت؟ بۆچی لە گەڕەک لەگەڵ منداڵاندا شەڕ دەکەیت؟ بۆچی دەمولوتت پڕبووە لە خوێن؟ بۆچی جلەکانت خۆڵاوی کردووە؟ بۆچی پانتۆڵەکەت دڕاوە؟ بۆچی ئەوەندەم خەفەت پێدەدەیت؟ بۆچی ئەوەندەم ئازار دەدەیت؟

دایک دەستی منداڵەکەی گرت و لە کۆڵانەوە بەخێرایی هێنایەوە بۆ ماڵەوە، منداڵەکەی هێنایە کەناری حەوزە ئاوەکەو بە ئاوی حەوزەکە دەموچاوی بۆ شۆری و خوێنی دەمولوتی پاککردەوە. حەوزە ئاوێک کە یەک مانگ دەبوو ئاوەکەی نەگۆڕدرابوو. ئاوێکی بۆگەن، کە کرێکارەکان هەر مەشکەیەکی بە سی شایی هێنابوویان. باوکی منداڵەکە مردبوو، ئەوان هێشتا تازیەبار بوون و چلەی نەچووبوو. دراوسێکان دەیانگوت: ئەو منداڵە دڵتەنگی باوکییەتی، هەربۆیەش وا لاساریی دەکات، بۆیە پێویستە بەهێمنی ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت. ساڵی (١٩٥٥/١٣٣٤) بوو. خۆ ئەگەر ئەم سەردەمە بووایە، ئەوا منداڵەکەیان دەبرد بۆ لای توێژەرێکی دەروونی.

باوک مردبوو، یەک دنیا کێشەو ناکۆکی لەدوای خۆی جێهێشت بوو، کێشەی میرات لەنێوان سێ ژن و سێ منداڵدا. دایکەکە بە منداڵەکەی گوتبوو: ئیتر نابێت ئەوەندە بچێتە کۆڵان و لەگەڵ کەسدا شەڕ بکات. منداڵەکەش بەگریانەوە دەیگوت: من شەڕم نەکرد، ئەکبەر شەڕی پێفرۆشتم، ئەکبەر و جەواد برای یەکترین، ئەوان هەمیشە بەیەکەوەن، ئەوان لەگەڵ ڕەزا پورزای یەکترین، عەلیش هەر کوڕە پوریانە. منیش تەنهام، براو پورزاو ئامۆزام نییە. کاتێک شەڕ دروست دەبێت لە نێوانماندا، ئەوان حەوت هەشت

کەسن و منیش بێکەس و تەنهام. دایکەکە دەیزانی کە نابێت منداڵەکە بەتەنها لە ماڵەوە جێبهێڵێت، بۆخۆی بەیانیان زوو دەچوو بۆ کار، هاوسەرەکەشی مردبوو. ئەو پارەی بەشی سێ رۆژی نان کڕینی نەبوو، چۆن دەیتوانی منداڵێکی تەمەن شەش ساڵ لە ژوورێکی بچکۆلەدا زیندانی بکات؟ ئەوکاتە تەلەفزیۆن نەبوو، سیدی نەبوو، کتێبی وێنەکێشان نەبوو. دایکەکە دەیزانی منداڵەکەی لە ژوورەوە بەند نابێت و دەچێتە دەرەوە، بۆیە ئامۆژگاری دەکردو هەڕەشەشی لێدەکردو پێیدەگوت: تۆ کە دەزانیت برا و پورزا و ئامۆزات نییە و هیچ خزمێکت نییە، بۆچی لەگەڵ منداڵاندا شەڕ دەکەیت؟ منداڵەکە دووبارە گوتییەوە: من شەڕ ناکەم، ئەوان شەڕ بە من دەفرۆشن. دایکەکە گوتی: ئەوان بۆچی شەڕت پێدەفرۆشن؟ منداڵەکە گوتی: من گۆڵچیم. کاتێک تۆپەکە دەگرمەوە، ئەکبەرو جەواد جوێنم پێدەدەن و پێمدەڵێن بۆچی تۆپەکە دەگریتەوە؟ دایکی گوتی: ئێمە خەڵکی ئەم گەڕەکە نین، ئەم گەڕەکە گەڕەکی ئێمە نییە، ئەم منداڵانەش هەموو خزم و کەسی یەکترین و هەموویان یەکتری دەناسن، بۆیە دەبێت ئاگاداری خۆت بیت. دروومانی پانتۆڵی منداڵەکە هەڵوەشابوو، دایکی بە دەرزی بۆی دورییەوە. منداڵان هەموویان بە دەرپێی کورتەوە لە کۆڵان دەسوڕانەوە، تازە حکومەت بڕیاری دابوو کە دەبێت پیاوان بە پانتۆڵەوە لە بازاڕ بگەڕێن، پاسەوانەکان پیاوانی بێ پانتۆڵیان دەستگیر دەکرد. گەڕان لە بازاڕدا بە پانتۆڵی کورتەوە سزاکەی (٥٢) ڕیاڵ بوو. تازە پیاوان فێر دەبوون پانتۆڵ لەپێ بکەن. هەندێک لە پیاوان جوێنیان دەداو دەیانگوت: شا خائینە، دەیانگوت شای خوێڕی هەقی چییە بەسەر دەرپێ کوڵەی ئێمەوە، ئێمە حەز دەکەین بە دەرپێ کوڵەوە بچینە کۆڵان و ناو بازاڕ.

ئاغا سەید جەوادی قەڵنەچی کەسێکی تلیاکی بوو، دەهات بۆ ماڵی فاتیمە جان کە ژنی دووەمی بوو، لەبەردەمی ماڵی فاتیمە بەتەنیشت باخچەکەوە دادەنیشت، تلیاکی دەکێشاو دەیگوت: ئەم شایە خائینە، باوک و باپیریشی هەر خائینە. جا دەیگوت: ئەم شایە باوکیشی کاری بەسەر چادری سەری ژنانەوە هەبووە. ئێستا شا چی بەسەر دەرپێ کوڵەی پیاوانەوە هەیە، ڕۆژێک دێت خەڵکی ڕادەپەڕن و شا لە ناودەبەن. ئاخر ئەمە قسەیە بچین پێنج تومەن و دوو ڕیاڵ سزای ئەوە بدەین کە بە دەرپێ کوڵەوە چووین بۆ بازاڕ. ئاغا سەید جەواد دەیگوت: من مردوو، ئێوە زیندوو، هەرکەسێک کاری بە دەرپێ کوڵەی پیاوانەوە هەبێت، ڕۆژێک دێت لەناو بچێت. لە مێژوودا هیچ

شایەک کاری بەسەر دەرپێ کوڵەی پیاوانەوە نەبووە، ئەوەی ئەم شایەش دەیکات لەپێناوی پێنج تومەن و دوو ڕیاڵدایە. ڕوویکردە ئەحمەد ئاغای دەبیری. ژوورەکەی ئەحمەد ئاغا بەتەنیشت ژوورەکەی فاتمە جانەوە بوو. هاوینان هەموویان لەبەردەمی ژوورەکانیان دادەنیشتن، دووریی نێوان دوو ماڵ تەنها (١،٥) مەتر بوو. منیش هەر لەوێ بووم. ئاغا سەید جەواد بە دەنگێکی تلیاکییەوە گوتی: ئەحمەد ئاغا دەزانی پێنج تومەن و دوو ڕیاڵ مانای چییە؟ ئەحمەد ئاغا وەلامیدایەوەو گوتی: بەڵێ، مانای نرخی چل ڕاویە ئاوە، کە من لە چاڵێکی قوڵی چل پەنجا مەترییەوە دەیهێنمە دەرەوە، کەمەرم دەشکێت تا ئاوەکە سەردەخەم. سەید جەواد گوتی: نا کاکە گیان نەتزانی... نەتزانی پێنج تومەن و دوو ڕیاڵ واتە پارەی بیست ڕۆژی تلیاکەکەی من، واتە بەو پارەیە من دەتوانم بیست ڕۆژ تلیاک بکێشم، ئاخر من ئەو پارە خۆشەویستە بدەم بە ئەوان، ئەوە چییە بە دەرپێ کورتەوە چووم بۆ نێو بازاڕ. ئێستاش سەرۆکی پۆستەو گەیاندن دەڵێت هەر کارمەندێک بە دەرپێی کورتەوە بچێتە بازاڕ، لە فەرمانگە دەریدەکەین. دوو ساڵ بوو شا بەهۆی کودەتاوە دەسەلاتی گرتبووەوە دەست. ئاغا سەید جەواد دەیگوت: دەستێوەردان لە کاروباری پیاوان و دەرپێی کورتی پیاوان لە کودەتا خراپترە. قوتابخانەکانیش فشار دەهێنن کە پێویستە مندالان بە پانتۆڵەوە بچن بۆ قوتابخانە. زۆریک لە پیاوان بەزۆر پانتۆڵیان لەپێ کرا. پاش (٤٥) ساڵ لە ترسی سزا زۆرێک لە خەڵکی قایشی خۆبەستنەوەیان دەبەست لە نێو ئۆتومبێلدا. ئێستا هەندێک لە شۆفێری تاکسییەکان دەڵێن لەم جادەیەدا پۆلیسی هاتوچۆ نییە، پێویست ناکات پشتێن ببەستین. لەو سەردەمەدا حوسێن تاکە منداڵ بوو کە بە پانتۆڵەوە دەچووە کۆلان، ئەوکات تازە بەزۆری بەڕێوەبەر خوێندکاران بە پانتۆڵەوە دەچوون بۆ قوتابخانە، بەلام زۆرێک لەو خوێندکارانە کاتێک دەیانویست یاریی بکەن بەدەرپێی کورتەوە، دەهاتنە کۆلان، ئەوکاتە هێشتا حوسێن نەچووبوو بۆ قوتابخانە. کۆتایی (مانگی موردادی ساڵی (١٣٣٤/ تەموزی١٩٥٥) بوو، هەوای شاری یەزد گەرم و سووتێنەر بوو، زۆربەی کۆلانەکان خۆڵ بوون، هەندێک کۆلان بە بەردی قاوەیی بچووک بەردڕێژ کرابوون. هەرچەند سانتیمەترێک دوورتر بەردەکانیان گۆڕیبوون بە بەردی شین. ئەو بەردانەیان لەکوێوە هێنابوو، نازانم، بەلام ئەو ڕەنگە شینە هەر لە ڕەنگی ئاسمانی شینی کەوێر دەچوو، واتە ناو کۆلانەکان لەگەڵ ئاسمانی شیندا هاوڕەنگ بوون. ئاسمان و زەوی هەروەکو

دڵی خەڵکی شارەکە پاک و بێگەرد بوو. لەناو ئەو کۆڵانە هەزارە گەرما بردووانەدا جگە لە دەنگەدەنگی منداڵ، هیچ شتێکی تر نەدەبیسترا. تۆپێکی دڕاو دەبووە هۆی دڵخۆشیی منداڵەکان. ئەنجامدانی چەندین یاریی دەبووە هۆی دڵخۆشیی منداڵەکان، بەڵام هەندێک جاریش سەر دەشکاو پانتۆڵ و کراسیش دەدڕان. دیوارە گڵەکان و خۆڵە تەپەی کۆڵانەکان جلوبەرگەکانی پیس دەکردن، ئەو بەردانەی لە یەکیان دەگرتن، دەست و قاچی پێ بریندار دەکرا. هەرکاتێک شەڕێک ڕووی بدایە، دوای دوو کاتژمێر ئاشت دەبوونەوە، منداڵان کینەو بوغز لەدڵ ناگرن، چەند خولەکێک شەڕیان دەکرد، واهەست دەکرا تا ڕۆژی قیامەت ئاشت نەبنەوە، بەڵام دوای چەند خولەکێک ئاشت دەبوونەوەو وەک هیچ ڕووی نەدابێت وابوو. سوپاس بۆ خوا کە هیچ یەکێک لە منداڵانی ئەو کۆڵانە، نەبوونە ساواکی و ئەشکەنجەدەرو دۆسیەساز. هەموو ئەوانە ئێستا تەمەنیان (٧٠) ساڵ دەبێت. ئەوان هەرچییەک بن کەسانی خراپ و شەڕئەنگێز نین. کەلتووری ئەو گەڕەکە کەلتووری ڕاستگۆیی و ڕاستی و دروستی و پێکەوەژیان بوو. حوسێن ڕۆژانە دەچووە کۆڵان، دایکی چوو لە قوتابخانەی هیدایەت ناونووسی کرد لە پۆلی یەکەم.

چەند ڕۆژ لەوەدوا، دایک دەستی منداڵەکەی گرت و بردی بۆ بازاڕ، پارچە قوماشێکی بۆ کڕی و بردی بۆ لای بەرگدروو تاکو چاکەت و پانتۆڵێکی پڕ بە بەری بۆ بدوورێت. لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا بۆ ماڵەوە دایکەکە لەگەڵ کوڕەکەیدا قسەی دەکرد. دایک دەینالاند و دەیگوت: لەبەر حەیاو ئابڕووی خۆم ئەم دەستە جلەم بۆ کڕیویت، دڵم خۆشبوو دەمگوت ئەو پانتۆڵە تا هاوین نادڕێت، کەچی چوویتە کۆڵان تاکو منداڵان پانتۆڵەکەت بدڕێنن، ئێستا تا چەند ڕۆژی تر کە دەچیت بۆ قوتابخانە، پانتۆڵت نییە لەپێی بکەیت، بۆیە منی بێچارە ناچاربووم پانتۆڵت بۆ بکڕم، دەزانی بۆ کڕینی ئەو دەستە جلە دەبێت من چەند ڕەنج بکێشم تاکو بتوانم پارەکەی پەیدا بکەم.

## ترس

نزیکی ماڵ بوونەوە، گەیشتبوونە بەردەمی ماڵی ئاغا سەید عەلی عاشقە مەدینە، بەرامبەر کۆڵانی ئاشتی، یان کۆڵانی ئەرسەلان. نیوەڕۆیەکی ڕۆژی پێنجشەممە بوو، لەناکاو حەسەنە و حوسێنەی مەعسومە پەیدابوون. ئەوان دوو برای دووانە بوون، لە پۆلی سێیەم بوون، تەمەنیان نۆ ساڵ بوو، باڵایەکی مامناوەندییان هەبوو، سەریان ئەوەندەی ڕشک و ئەسپێ پێوە بوو، قژەسەریان بە سپی دەهاتە بەرچاو. درێژیی

قژەسەریان لە دوو سەنتیمەتر زیاتر نەبوو، بەڵام ئەو دوو سانتیمەترە پڕ پڕ لە ڕشک بوو، ڕشک گەرای ئەسپێیە. ڕوخساریان لەڕو لاواز بوو، چاوەکانیان لەبرساندا دەرپەڕیبوون، ملیان باریک و درێژ بوو، وەکو شمشاڵی نێرگەلە، لەبەر چڵک لاملیان ڕەش ببوو، دیاربوو دەمێک بوو نەچووبوون بۆ حەمام. چاکەت و پانتۆڵێکی کۆنی دڕاوی خۆڵەمێشییان لەبەردا بوو، کە چەندین پینەیان پێوەبوو. چاکەتەکەی حەسەنە دەستەکانی پێوە نەمابوو، چاکەتی حوسێنییەش دووگمەی پێوە نەبوو. پانتۆڵەکانیان لە چاکەتەکانیان خراپتربوون، پێڵاوەکانیان بەپێیانەوە نەدەوەستا لە هەموو لاوە دڕابوون و پێڵاوی حەسەنە قەیتانەکەی بەدوایدا دەخشا. کە سەیری سەرو کەللەیانت دەکرد، پیاوی گەورە لێیان دەترسا. جا چ بگات بە منداڵێکی تەمەن شەش ساڵ. ئەو دوو منداڵە هەردووکیان بە دەنگی بەرز سڵاویان کرد. گووتیان: بیبی خەدیج سڵاو: بیبی خەدیج گووتی: سڵاو لە ئێوەش، دیارە ئەمڕۆ پێنج شەممەیە؟ ئەمڕۆ هاتوونەتەوە بۆماڵەوە. هەردوو منداڵەکە بەیەکەوە گووتیان: بەڵێ. ئەوان هەموو ڕۆژێکی پێنج شەممان تا عەسری ڕۆژی هەینی دەهاتنەوە بۆ ماڵەوە. شەوی هەینی دەڕۆیشتنەوە. حەسەنە و حوسێنە لە خانەی بێسەرپەرشتان بوون، دایکیان ئەوانی بە خانەی بێسەرپەرشتان سپاردبوو. سێ ساڵ بوو باوکیان مردبوو. پێنج خوشک و برا بوون. باوکیان کرێکاری خانوو دروستکردن بوو، لەسەر داربەستێکی بەرزەوە کەوتبووە خوارەوە، سەری بەر زەمین کەوتبوو مرد بوو، نە بیمەی هەبوو، نە کەمێک پارە. ئاخر لە ساڵی (١٩٥٢/١٣٣١) کێ کرێکارێکی خانوو دروستکردنی بیمە دەکرد، چ ڕێکخراوێک دەبووە پشتوپەنای ژنێکی خاوەن پێنج منداڵ؟ ئەوان هەموویان لە ژوورێکدا دەژیان، لە خانوویەکی بچووکدا لە کۆڵانێکی تەسکی کورتدا، لە کۆڵانێکدا کە درێژیی کۆڵانەکە پەنجا مەتر نەدەبوو، پانییەکەشی نزیکەی یەک مەتر دەبوو. کۆڵانی ئاشتەوایی کە من ناوم لێناوە کۆڵانی ئەرسەلان، بۆچی، چونکە ماڵی ئەرسەلانەکان لەو کۆڵانەدا بوون. ئەرسەلانێک کە لەگەڵ مندا یاریی دەکرد، لە پۆلی یەکەمەوە تاکو پۆلی شەشەم لە یەک پۆلدا بووین، کە لە پۆلی شەش بووین ئامۆزایەکیشی لە قوتابخانەیەکی ترەوە هات بۆ قوتابخانەکەی ئێمە.

لەم کاتەدا کە یادەوەرییەکانم دەنووسمەوە کاتژمێر (٢:٤٠)ی بەرەبەیانی (٩-٩-١٣٩٤/٣٠-١١-٢٠١٥)یە، پێویستە لەم کاتی شەوەدا یادێک لە هاوڕێی دێرینم بکەمەوە،

هاوڕێیەک کە لانیکەم (٤٥) ساڵ دەبێت ئەوم نەبینیوە، منیش کۆڵانەکە بەناوی ئەوەوە ناودەنێم، چونکە ماڵیان لەو کۆڵانەدا بوو. کۆڵانەکەش ناوی نەبوو، ئێستاش ناوی لێ نەنراوە، باشە چی تێدایە ئەگەر من کۆڵانەکە ناوبنێم ئەرسەلان، داوای لێبووردن لە شارەوانی یەزد دەکەم. کاتێک باوکی منداڵەکان مردبوو، دایکیان بە پێنج منداڵی بچووکەوە بەبێ پارەو پول مابووەوە، دایک و باوکی ئەو دوومنداڵە چەند ساڵێک لەوەپێش بە ئومێدی دەستکەوتنی پاروە نانێک هاتبوونە شار. ئەگەر لە گوندەکەیان بمانایەتەوە لەبرساندا دەمردن. بۆیە هاتبوون بۆ شار تاکو نانێکیان دەستبکەوێت. بەبێ هۆ ئەم هەموو منداڵەیان ببوو، باشە بەندەی خودا تۆ کە نان نییە بیخۆیت، بۆچی لە ماوەی دە ساڵدا پێنج منداڵت خستۆتەوە؟ کە دووان لە منداڵەکان دووانە بوون. خاوەن خانووەکەیان پیاوێک بوو تاڕادەیەک دەوڵەمەند بوو، خانوویەکی هەبوو لەگەڵ دوکانێکدا، لە بازاڕ کاری سیراجی دەکرد، زینی ئەسپی دروستدەکرد، باری ژیانی زۆرباش نەبوو، بەجۆرێک نەبوو کە بتوانێت ژوورە بەتاڵەکەی نەدات بە کرێ. تەنها دەیتوانی بژیەت. خزم و کەسی پیاوی مردوو لە گوندەوە هاتن بۆ شار، یەک لە یەکی هەژارتر بوون، پیاوەکە لەگەڵ ژنەکەیدا ئامۆزای یەکتری بوون. لەدوای مردنی هاوسەرەکەی، ژنە بەبێ خەرجی مابووەوە. هەمان مانگی یەکەم نەیتوانیبوو کرێی ئەو ژوورە بدات کە بە کرێیان گرتبوو. شەوانە بەبێ شێو سەریان دەنایەوە. دراوسێکانیان دەیانزانی کە ژیانیان لە چ بارێکدایە، هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە هاوکاری دەکردن، بەڵام زۆربەی زۆری دانیشتووانی گەڕەکەکە هەژار بوون، ئەو ژنەش بە پێنج منداڵی بچووکەوە نەیدەتوانی کار بکات. خاوەنماڵ سێ ساڵ دەبوو هاوسەرگیری کردبوو، ژن و مێردێکی میهرەبان بوون، دوو کەسی هێمن و لەسەرخۆ بوون، منداڵیان نەدەبوو. ئەو ژن و مێردە لەنێوان خۆیاندا ڕێگاچارەیەکیان دۆزیبووەوە، ئەوەبوو کە پیاوەکە لەگەڵ ئەو ژنەی کە هاوسەرەکەی مردبوو، هاوسەرگیریی کرد، بەڵکو خوا بکات وەجاخیان کوێر نەبێت و خودا منداڵێکیان پێ ببەخشێت، بەڵام ئەو ژنە بە پێنج منداڵەوە دەبوو چی بکردایە؟ دوو منداڵە دووانەکەی نارد بۆ خانەی بێسەرپەرشتان، منداڵە تەمەن سێ ساڵەکەشیان پوری لێی وەرگرتن و بڕیاری بەخێوکردنی دا، دوو کچەکەشی لای خۆیان مانەوەو جیایان نەکردنەوە. دوو کچەکە تەمەنیان پێنج ساڵ و حەوت ساڵبوو. ناویشیان سەکینەو ڕوقیە بوو. هەژاریی بەڕێگای چارەسەری هەژاریی ئەنجامدرا، ژنی

خاوەنماڵ بڕیاریدا بەرگەی هەویەداری بگرێت. بڕیاریاندا ئەگەر ئەم ژنە منداڵێکی بوو، ناسنامەی بەناوی ژنی یەکەمی پیاوەکەوە بێت، بەڵام دوای ئەوەی کە منداڵەکە تەمەنی بوو بە دوو ساڵ و لە شیر بڕدرایەوە، ئەو پیاوە ژنە تازەکەی تەڵاق بدات و ژنەکەش لە خانووەکەدا بڕوات. بۆ کوێ بڕوات؟ ئەوە تەنها خودا دەیزانێت. خۆ ئەگەر هەتا ساڵێکیش ژنی تازە دووگیان نەبوو، ئەوکات تەڵاق وەربگرێت و بڕوات. ئیتر لەسەر ئەو ڕێکەوتنە بوو کە حەسەنە و حوسێنەیان نارد بۆ خانەی بێسەرپەرشتان. ئەو ڕۆژە کە هەردوو منداڵەکەی خانەی سەرپەرشتیاران بە پیسی و چەپەڵی لەلای کۆڵانە باریکەکەی لایماڵیان دەرکەوتن. بیبی خانم بەهەمانشێوە دەستی حوسێنی گرتبوو. بیبی لە حوسێنی پرسی خۆ حەسەنەو حوسێنەت بینی؟ کە دایکیان چۆن ناردنی بۆ خانەی بێسەرپەرشتان و خۆشی شووی کردەوە. ئەگەر لەوە زیاتر خەم و خەفەتم پێ بدەیت، منیش تۆ دەبەم بۆ خانەی بێسەرپەرشتان و خۆم شوودەکەمەوە. منداڵەکەش لەو قسەیەی دایکی دڵی راپەڕی و ترسا. ڕوخساری حەسەنەو حوسێنەی هاتەوە بەرچاو، برسێتی و جلە دڕاوەکانیان و دەرکردنیان لە ماڵ و شێوەی هاوسەرەکەی و دایکیان، هەموو لەبەر چاو بوو. منداڵەکەش دەستیکرد بە گریان و هاوارو دەیگووت: من ناچم بۆ خانەی بێسەرپەرشتان. توند عەباکەی دایکی گرتبوو هاواری دەکرد من نامەوێت بچم بۆ خانەی بێسەرپەرشتان، دایکە گیان من نامەوێت تۆ شوو بکەیتەوە. دایکی دەیگووت: ناتەوێت بچیت بۆ خانەی بێسەرپەرشتان و دەتەوێت لە کۆڵان شەرم بۆ بنێیتەوە. جلەکانت بدڕێنیت. منداڵەکەش بە گریانەوە دەیگووت: بەچاوان... بەچاوان ئاگاداری جلەکانم دەبم و ناهێڵم بدڕێن، توخوا دایکەگیان دەمەوێت هەر لای تۆ بم، توخوا مەمبە بۆ خانەی بێسەرپەرشتان.

چوار مانگ تێپەڕی، منداڵەکە لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی بوو، لە قوتابخانەی هیدایەت، زستان بوو، هەوای وشکی یەزد سارد ببوو، سەرمای سووتێنەری کەوێر تا ئێسقانەکان کاری لە مرۆڤ دەکرد. لەوانەیە بەهۆی کەمیی جلوبەرگەوە بووبێت کە هەستیان بەسەرما کردووە. دیاریش نییە خەڵکە دەوڵەمەندەکان هەستیان چۆن بووە بەرامبەر بە سەرما. حوسێن لەکاتی یاریکردنیدا لە کۆڵان لەگەڵ منداڵاندا قۆڵی چاکەتەکەی دڕابوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. کاتێک دایکی چاوی پێیکەوت هاواری کرد بەسەریا، بۆچی خۆتت خۆڵاوی کردووە و چاکەتەکەت دڕاوە؟ ئادەی وەرە بابڕۆین.

حوسێن گووتی: بۆ کوێ؟ دایکی گووتی: بۆ شوێنێک جێگایەکی خۆش! دوو بەدوو ڕێگایان گرتەبەرو ڕۆیشتن. حوسێن تەنها ئەو چاکەت و پانتۆڵەی هەبوو کە لەبەریدابوو، ئەویش قۆڵی چاکەتەکەی دڕابوون. لە کۆڵانەکەوە ڕۆیشتنە سەر شەقامەکەو لەبەردەمی کارگەی ئیقبالەوە تێپەڕین و گەیشتنە لای باخی میللی، حوسێن ماندوو ببوو. دایکی دەستی منداڵەکەی گرتبوو بەخێرایی بەڕێگادا دەڕۆیشتن. حوسێن غەمبار بوو، چرکە لەدوای چرکە نیگەرانتر دەبوو، ئاخر بۆ کوێ دەچین؟ سەرەتا وا بیری کردبووەوە دایکی دەیەوێت بیبات بۆ ماڵی دایەگەورەی، بەڵام لە ماڵی دایەگەورەیەوە تێپەڕین. دیسانەوە لە دایکی پرسی ئەوە بۆ کوێ دەچین؟ دایکیشی دەیگووت: کاتێک گەیشتین دەزانیت بۆ کوێ دەچووین؟ حوسێن شەوی پێشوو گوێی لە قسەکانی بیبی هەلی و دایکی بوو. بیبی هەلی بە دایکی حوسێنی گووتبوو تۆ ئێستا گەنجیت، ئێستا تەمەنت سی وسێ ساڵ زیاتر نییە، چۆن دەتەوێت تا کۆتایی تەمەنت بەدیار ئەم منداڵەوە دانیشیت؟ ئێستاش کە کەسێک هاتووە بۆ داوات، برۆ شووی پێبکە. دایکەکەش لە وەڵامدا گووتبووی نامەوێت کوڕەکەم لەسەر سفرەی باوەپیارە گەورە بێت. بیبی هەلی گووتبووی کوڕەکەت ببە بۆ ئەو شوێنە. حوسێن تێنەگەیشتبوو ئەو شوێنە مانای چییە؟ ئێستاش دایکی ئەو دەبات بۆ جێگایەک دوور لە ماڵی خۆیان، دوور بە پێوانەی منداڵێکی پۆلی یەکی سەرەتایی. حوسێن دەیزانی کە دایکی دەیەوێت بیبات بۆ ئەو شوێنە، بەڵام ئەو شوێنە لەکوێ بوو؟ نەیدەزانی. قاچە بچووکەکانی ئازاریان هەبوو، نەیدەتوانی هەنگاو هەڵهێنێتەوە، تەواو شەکەت ببوو، لەترس و لە ماندوویتیدا قاچەکانی هێزیان لەبەر برابوو، لەکۆتاییدا گەیشتن. حوسێن چوو بووە لای مەلا بۆ خوێندن، دەیتوانی شت بخوێنێتەوە، چەند مانگێکیش چووبوو بۆ قوتابخانە. گەیشتنە بەردەرگایەکی گەورە، دەرگایەکی گەورەی ئاسن، حوسێن سەیری کرد تابلۆیەک لەسەر دەرگاکە نووسرابوو (خانەی بێسەرپەرشتانی یەزد)، ئیتر هەموو گیانی کەوتە لەرزین. ویستی لە دەستی دایکی ڕابکات، بەڵام دایکی توند مەچەکی گرتبوو. حوسێن دەگریاو دەیگووت: من نامەوێت بێم بۆ ئێرە. دەرگاکە کرایەوەو چوونە حەوشەکەوە، دەرگای حەوشەکە شەقار ببوو. خشتی نێو حەوشەکە شکابوون، لە هەندێ شوێن بەتەواوی خشتەکان نەمابوون، باخچەی نێو حەوشەکە وێران ببوو. گوڵ و گیاکان وشک ببوون. چەند پشیلەیەک لە باخچەکەدا لە هاتوچۆدا بوون، چوار درەختی کاجی

گەورە کە لە حەوشەکەدا بوون یەکی لایەکیان وشک ببوون. باخچەو درەختەکان وەک پێویست ئاو نەدرابوون. خانووەکە یەک قات بوو، پەنجەرەکانیان بە کاغەز گرتبوو، لەو زستانە ساردەدا نەیانتوانی بوو شووشە بگرنە پەنجەرەکان. کاتێک چوونە ژوورەوە بۆنێکی ناخۆش هاتە بەر لوتیان. منداڵان بە جلوبەرگی چڵکن و دڕاوەوە دەهاتن و دەچوون. منداڵەکان زۆر چڵکن بوون، دیوارەکان لە منداڵەکان چڵکنتربوون، دەرگای ژوورەکان شکابوون، ناو ژوورەکان لە پیسیدا ڕەش ببوون. حوسێن بە چاوی خۆی ناو ژوورەکانی بینی. لە ژوورەکاندا چەند قەرەوێڵەیەکی سێ قات هەبوو، لە ژوورێکی تردا چەند دەست نوێنی چڵکن دانرابوون. دیارە قەرەوێڵە بۆ هەمووان نەبوو، منداڵەکان هەموویان لات و بێهێز بوون. حوسێن، حەسەنەو حوسێنەی بینی. دایکی چووە ژووری بەڕێوەبەر، ژووری بەڕێوەبەریش لە ژوورە کانی تر باشتر نەبوو، چەند کورسییەکی شکاوی تێدابوو، مێزی بەڕێوەبەریش مێزێکی کۆن و شکاو بوو، قاچیکی مێزەکە بەتەواوی شکابوو، چەند پارچە خشتی شکاویان خستبووە ژێر مێزەکەوە. بەشێک لە گەچی بنمیچی ژوورەکە کەوتبووە خوارەوە. دایک سڵاوی لە بەڕێوەبەر کردو گووتی: منداڵەکەم هێناوە بە ئێوەی بسپێرم، لە پۆلی یەکەمە و باوکیشی شەش مانگ دەبێت مردووە، زۆر ماندووم دەکات، ناتوانم ئاگاداری بکەم. بەڕێوەبەر گووتی: چەند منداڵت هەیە؟ دایک گووتی: هەر ئەم منداڵە. بەڕێوەبەر گووتی: هەرچۆنێک بێت لای خۆت بێت باشترە، ڕەوشی ئێرە ئەوهایە کە دەیبینیت، ئێمە ئەم منداڵانە بەنانی وشک تێر دەکەین، بودجەکەمان زۆر کەمە، هەمیشە ئەم منداڵانە بە برسێتی دەمێننەوە، بۆیە واباشترە منداڵەکە لای خۆت بێت. دایک گووتی: ئاخر زۆرم خەفەت پێدەدا و زۆر ماندووم دەکات. دایک بەهێواشی بە بەڕێوەبەرەکەی گووت: هێناومە تاکو بیترسێنم. حوسێن تێگەیشت دایکی چی گووت! تاڕادەیەک دڵی هاتەوە سەرخۆی. دایک بە بەڕێوەبەری گووت: هەستم نەدەکرد ئێرە بەو ڕادەیە وێرانە بێت. بەڕێوەبەر گووتی: بەڵێ ئێرە زۆر خراپە، نازانین دەبێت چی بکەین، لەوانەیە ناچاربین چەند منداڵێک بنێرینەوە بۆ ماڵەوە. یاخود چەند کەسێکیان بنێرین بۆ ئەسفەهان. ئەوکاتە هێشتا یەزد شارێکی سەر بە پارێزگای ئەسفەهان بوو. دایک بە کوڕەکەی گووت: ئیتر لەمەودوا ئاقڵ نەبیت و ئازارم بدەیت، ئەوا دەتهێنم بۆ ئێرە، بۆخۆشم دەڕۆم شوو دەکەمەوە. حوسێن لەترسا هەموو گیانی کەوتە لەرزە، بەجۆرێک ترسا کە ئێستاش پاش شەست ساڵ ئەو ترسە

لە گیانیدا ماوە. ئێستاش هەرکاتێک ئەو ترسێک لە دڵی منداڵێکی بێ باوکدا دەبینێت، ئەو ترسەی وەبیر دێتەوە... لەتاوی منداڵانی بێباوک و بێ پارە فرمێسک بە چاوەکانیدا دێنە خوارەوە. هەرکاتێک لە تەلەفزیۆن فیلمێک لەبارەی منداڵانی بێلانەو سەرگەردان دەبینێت، چاوەکانی پڕ لە فرمێسک دەبن. بەڕێوەبەری خانەی بێسەرپەرشتان گووتی: کوڕەکەت ناوی چییە؟ دایکەکە گووتی: ناوی حوسێنە. بەڕێوەبەر گووتی: حوسێن کوڕێکی ئاقڵە و بەڵێن دەدات کە ئیتر دایکی تووشی کێشە و ناڕەحەتی نەکات، ئەگەر ئەمجارە لە قسەت دەرچوو، بیهێنەرەوە بۆ ئێرە. بەڵێ، منداڵێکی تەمەن شەش ساڵان نەیدەتوانی لێکدانەوە بۆ قسەکانی ئەوان بکات. حوسێن بەترس و لەرزەوە لە ژووری بەڕێوەبەر هاتە دەرەوە.

ئەو ڕۆژە حوسێن و دایکی لە ماڵی ڕوحەکان هاتنە دەرەوە، ماڵی جنۆکەکان، ماڵی منداڵانی برسی ملباریک. ئەو منداڵانە تەنها پێست و ئێسقان بوون، چڵکن و پۆخەڵ بوون، جلوبەرگی دڕاو و بێکەڵکیان لەبەردا بوو، لە ماڵێکی تێکڕووخاوی بێ دەرگادا.

لەناو حەوشەکەدا ئاغا میرزا، حوسێن و دایکی حوسێنی بینی. ئاغا میرزا کارگوزاری خانەی بێسەرپەرشتان بوو، ماڵیان لەهەمان گەڕەکی ماڵی حوسێن بوو. ئاغا میرزا گووتی: بەهـ بەهـ ... بیبی خەدیج: چۆنە لێرەیت، ناکا بۆیە هاتبیت حوسێن لەم شوێنە دابنێیت. دایکی حوسێن گووتی: نانا بۆیە هاتبووین سەرێک لە حەسەنە و حوسێنە بدەین. ئاغا میرزا گووتی: خۆ بەباشی ئێرەتان بینی؟ خوا نەکات کەسێک ڕوحمێک بەم منداڵانە بکات. ئەگەر ئێرە نۆژەن نەکرێتەوە، ئەم منداڵانە زستان لەسەرماندا دەمرن. دایک خوداحافیزی لە ئاغا میرزا کردو لە خانەی بێسەرپەرشتان چوونە دەرەوە. وەک ئەوەی کە خۆشی لە هێنانی حوسێن بۆ خانەی بێسەرپەرشتان پەشیمان بووبێتەوە. کاتێک گەیشتنە ماڵەوە، بیبی هەلی گووتی: چی بوو؟ حوسێنیان وەرگرت؟ بیبی خەدیج لەپاڵ دەرگای ژوورەکەوە لێی دانیشت، حوسێنی لەباوەش گرت و بە عەشق و خۆشەویستییەوە چەندجارێک ماچی کردو گووتی: بیبی هەلی، من هەرگیز شوو ناکەمەوە، کوڕەکەشم نابەم بۆ خانەی بێسەرپەرشتان، خۆم کاردەکەم و گەورەی دەکەم. بیبی هەلی گووتی: ئەوە قسەی کۆتاییتە؟ واتە پێی بڵێم کە شوو ناکەیت. دایک گووتی: بەڵێ، بەڵێ ئەوە دوا قسەمە. ئەگەر دەزانیت خانەی بێسەرپەرشتان چ کەلاوەیەکە، بەڕاستی هەر جێگای مشک و سیسرک و پشیلەیە. بەداخەوە بۆ ئەو منداڵە

نازدارانە کە لەو شوێنەدا دەژین. ئەو دۆزەخخانەی بێسەرپەرشتانە هەمیشە لە مێشکی حوسێندا بوو. هەرکاتێک لەگەڵ منداڵەکان یاریی دەکرد، ئاگاداری ئەوەبوو ڕێگای نەکەوێتە ئەو خانە وێرانەیە. حوسێن نەیدەویست زۆر گوێی لە وتە نەشیاوەکانی هاوڕێکانی بێت، زۆرجاریش جوێنەکانی ئەوانی بەهەند وەرنەدەگرت، چونکە هەمیشە خانەی بێسەرپەرشتانی لەمێشکدابوو. پێویستە مرۆڤەکان لە تەواوی تەمەنیاندا بەرگەی زۆرێک لە قسەو قسەڵۆک بگرن، چونکە خانەی بێسەرپەرشتان هەیە. هەموو هەفتەیەک دوانیوەڕۆیانی پێنج شەممە حەسەنەو حوسێنە دەهاتنەوە بۆماڵەوە. مەعسومەی دایکیان ببوو بە خاوەنی منداڵێک لە مەحمود ئاغا، ناوی منداڵەکەیان لە ناسنامەدا خستە سەر ژنی یەکەمی مەحمود ئاغا. ژنی یەکەمی مەحمود ئاغا لەگەڵ دوو خوشکەکەی حەسەنەو حوسێنە زۆر میهرەبان بوو، بۆ ئەو دوو کچە بێباوکە وەک دایکێکی دڵسۆز وابوو، شەوانە لەلای ئەو دوو کچە دەخەوت. مەعسومەش لە ژووری مەحمود ئاغا دەخەوت. ناتوانم درک بە هەستی ژنێک بکەم کە دوای سی وسێ ساڵ ژیان لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، هەوێیەک بهێنێتە سەر ماڵی خۆی. ئەو هەوێی بەسەر خۆیدا هێنا، تاکو هاوسەرەکەی ببێتە خاوەن منداڵ، هەوێی بەسەر خۆیدا هێنا، تاکو ناوی منداڵی هەوێکەی لە ناسنامەدا بەناوی ئەوەوە بێت. هەوێیەک کە لەلای هاوسەرەکەی دەمێنێتەوە، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە ژوورێکدا دەخەون. ئەو هەوێی بۆیە هێنا تاکو شەوانە ئاگاداری منداڵەکانی هەوێکەی بێت و لەلایان بخەوێت، هاوسەرەکەشی لەلای هەوێکەی بخەوێت. من ناتوانم هەستی ژنێکی هەژاری پیاو مردووی خاوەن پێنج منداڵ درک پێ بکەم. ژنێک کە دەبێت لاشەی خۆی بەهۆی هاوسەرگیرییەوە پێشکەش بە پیاوێک بکات، لەسەر ئەو مەرجەی لەماوەی یەک ساڵدا منداڵێکی ببێت و ناوی ئەو منداڵە لە ناسنامە بەناوی خۆیەوە نەبێت، بەڵکو بە ناوی هەوێکەیەوە بێت. واتە بە حکومەت بڵێت، ئەو منداڵە منداڵی خۆی نییە. لە بەرامبەر ئەوەدا کە هاوسەری ئەو ژنەی کردووە بە هاوسەری خۆی. ژنێک کە لە ڕێگەی عەشق و خۆشەویستییەوە نا، بەڵکو لە ڕێگەی هەژاری و نەبوونیدا هاوسەرگیری کردووە، دەبێت چ هەستێکی هەبێت؟ ژنیک کە دووان لە منداڵەکانی ناردووە بۆ خانەی بێسەرپەرشتان و منداڵێکی داوەتە دەست خوشکی هاوسەرە مردووەکەی، دوو منداڵیشی لە ماڵێکدا دەژین کە هەوێکەشی هەر لەو ماڵەدایە، ئەو ژنە چ هەستێکی هەیە؟ ژنێک کە پێیدەڵێن دەبێت دوو ساڵ شیر

بدات بەو منداڵەی کە بەپێی یاسا منداڵی کەسێکی ترە، شیری پێ بدات و پاشان تەڵاق وەربگرێت. ژنێکی خەفەتبار کە نازانێت دوای وەرگرتنی تەڵاق لە هاوسەرەکەی، دەبێت چی بکات.

ماڵێک کە من ئێستا چیرۆکەکەی دەنووسم، لە شاری یەزدە، دەرگای ماڵەکەیان بەرامبەر دەرگای کارگەی ئیقبالەو تەنها (١٥٠) مەتر لە یەکترەوە دوورن. ئەو کارگەی ئیقبالەی کە ئێستا تێکدراوە و لە شوێنەکەیدا پارکی (فەناوەر)ی یەزد دروستکراوە. لە گەڕەکێکدا وا ئێستا خانووەکانی تێکدەدەن و خانووی تازە لە شوێنیان دروستدەکرێنەوە، گەڕەکێک ئەگەر نۆژەن بکرایەتەوە، بۆخۆی دەبوو بە مۆزەخانەیەکی گەورە و گەشتیاران و بەزۆریی سەردانیان دەکرد.

مەحمود ئاغا زۆر دڵخۆشبوو بەوەی لە کۆتایی تەمەنیدا بووە بە خاوەنی کوڕێک، ئەو لە تەمەنی پیریدا دوو ژنی هەبوو لە ماڵێکدا. عەبدوڵڵای بچکۆلانە منداڵێکی جوان بوو. مەحمود ئاغا هەوڵی دەدا فریای حەسەنەو حوسێنەش بکەوێت، هەفتانە دەیبردن بۆ حەمام، بەڵام نەیدەتوانی، یان نەیدەویست جلوبەرگی تازەیان بۆ بکرێت. عەبدوڵڵا تەمەنی ببوو بە ساڵێک. ژنان بەگوێی مەعسومەدا دەیانچرپاند ئەگەر بیەوێت پاش دوو ساڵ مەحمود ئاغا تەڵاقی نەدات، پێویستە بۆ جاری دووەم دووگیان ببێتەوە. عەبدوڵڵا تەمەنی یەک ساڵ بوو کە دراوسێکان دەیانگوت مەعسومە دووگیانە. لەو هەلومەرجەدا نەدەکرا مەحمود ئاغا ژنە دووگیانەکەی تەڵاق بدات. ئەو ڕووداوە لە مەرجەکانی هاوسەرگیرییدا پێشبینی نەکرابوو. پاش ماوەیەک ئارەزووش لەدایک بوو. مەحمود ئاغا بەجۆرێک دڵخۆشبوو کە ژنی یەکەمی جورئەتی نەدەکرد بەڵێننامە کۆنەکەی وەبیر بهێنێتەوە. مەعسوم ئەوەندەیتر خۆشەویست بوو لەلای مەحمود ئاغا. ژنی یەکەمی مەحمود ئاغا زۆر ناڕەحەت بوو. ئیتر ئەو ماڵە بۆ حەسەنەو حوسێنە هێمن نەبوو، سەرەتا بڕیار وابوو ڕۆژانی هەینی حەسەنەو حوسێنە بێنەوە بۆ ماڵەوە، پاشان بڕیارەکە گۆڕدرا بەوەی پانزە شەو جارێک بێنەوە، دواتر مانگی جارێک بێنەوە. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆسەویستی مەعسومە لەلای مەحمود ئاغا زیاتر دەبوو. ڕقی زەهرا خانمی ژنی یەکەمی موحمود ئاغا بەرامبەر بە مەعسومە و منداڵەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادی دەکرد. زەهرا بەردەوام ڕق و کینەی خۆی لە سەری حەسەنە و حوسێنە بەتاڵ دەکردەوە. ئەوکات ئەو دوو کوڕە دووانەیە لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو.

زستانی ساڵی (١٣٣٧-١٩٥٨) بوو، هەوا زۆرسارد بوو، حەسەنەو حوسێنە جلوبەرگی گەرمیان لەبەردا نەبوو. ئەوان هەریەکەو کراسێک و چاکەتێکیان هەبوو. هەوا بەجۆریک سارد بوو کە خانەی بێسەرپەرشتان بە منداڵانیان گوتبوو دەبێت چەند ڕۆژێک بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە. بەڕێوەبەری خانەی بێسەرپەرشتان بۆ ئەو منداڵانەی جلوبەرگی پێویستیان نەبوو، بە هەریەکەو پارچە بەتانییەکی پێدابوون. بەتانییەکان بەتانی سەربازیی بوون، بە منداڵەکانیان گوتبوو بەتانییەکان لەخۆتانەوە بپێچن و بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە.

نیوەڕۆیەکی پێنج شەممە بوو، حوسێنی بینی خەدیج لەگەڵ چەند منداڵێکی تردا لە قوتابخانە دەگەڕانەوە، ئەوکات ئەو لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بوو. حوسێن و منداڵەکانی تر لە حەسەنەو حوسێنەیان پرسی بۆچی ئاوها خۆتان لە بەتانییەوە پێچاوە. دوو منداڵە دووانەکە دەیانویست بەزوویی خۆیان بگەیەننە ماڵەوە، نەیاندەویست کەسێک چاوی پێیان بکەوێت. حەسەنەو حوسێنە وەڵامی منداڵەکانیان نەدایەوە، بەڵام منداڵەکان زوو لە وەڵامی پرسیارەکان گەیشتن. حوسێن دووبارە خانەی بێسەرپەرشتانی بیرهاتەوەو گیانی ساردبووەوەو کەوتە لەرزین، لەرزینەکەی لەبەر سەرمای زستان نەبوو، بەڵکو لەترسی سێ ساڵ لەوەو پێش، ترس لە پیس و بۆگەنی ئەو کۆمەڵگایە، ترس لە بێئاگایی، ترس لە هەژاری و بێکەسی. حەسەنەو حوسێنە هەموو نیوەڕۆیانێکی ڕۆژانی پێنج شەممە و عەسری ڕۆژانی هەینی بە بەردەمی ماڵە دەوڵەمەندەکانی شاردا تێپەڕ دەبوون، هیچ کەسێک لەبیری ئەوەدا نەبوو کە هاوکارییەکی ئەم دوو منداڵە بکات. لەو سەردەمەدا لەبەرکردنی جلوبەرگی دڕاو و چڵکن و پینەکراو ئاسایی بوو. دەیەها، بەڵکو سەدەها پیاوی گەورە بە جلی دڕاو و پینەکراوەوە لەناو بازاڕو گەڕەکدا دەبینران. سەدان منداڵ کە سەریان پڕ لە ڕشک و ئەسپێ بوو، لە کۆڵاندا بەرەڵڵا بوون. ئەوکاتە هێشتا پارەی نەوت ڕەوانەی بازاڕ و کۆمەڵگا نەکرابوو. جارێکیان حەسەنەو حوسێنە بە حوسێنیان گوت: جاری وا هەیە بە سێ مانگ جارێک ناچینە حەمام. خانەی بێسەرپەرشتان حەمامیان نەبوو، پارەشیان نەبوو، دایکیشیان پارەی نەبوو تاکو بیانبات بۆ حەمام. مەحمود ئاغای میهرەبانیش ڕۆژانی پێنج شەممە و هەینی ئەو دوو منداڵەی داڵدە دەداو چاودێری دەکردن، سەرەتا دەیبردن بۆ حەمام، بەڵام لەدوای ساڵی دووەم و سێیەمی هاوسەرگیریی لەگەڵ دایکیاندا، ئیتر ئەو میهرەبانییەی ساڵی یەکەمی نەما. ئێستا

مەحمود ئاغا دوو ژن و چوار منداڵی هەیە.

ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) بوو، ئەو دوو منداڵە پۆلی شەشەمی سەرەتاییان تەواو کرد، خانەی بێسەرپەرشتان پێی گوتبوون ئیتر نابێت بێنەوە بۆ ئێرە، چونکە جێگە نەماوەو بودجەشیان نییە. منداڵی بێ باوک و هەژار زۆربوون، واتە ئەو منداڵانەی تر دەبووایە بچن بۆ خانەی بێسەرپەرشتان و ئەو منداڵانەی کە کەمێک گەورەبوون و پۆلی شەشەمیان تەواوکردووە، دەبێت برۆن. ئەم دوو منداڵە دەبووایە ڕوو بکەنە کوێ؟ زەهرا خانمیش ڕووبەڕووی مەحمود ئاغا وەستابووەوە و گوتبووی، یان دەبێت تەڵاقم بدەیت، یان نابێت ئەو دوو منداڵە بەمماڵەدا بێنەوە. مەحمود ئاغاش کە سەیری کردبوو دەبێت شەش منداڵ و دوو ژن لە ماڵێکدا کۆبکاتەوە، گوتبووی: دەبێت ڕێگە چارەیەک بدۆزینەوە، ئەوەبوو حەسەنەی نارد بۆ کارگەی تواندنەوەی مس و حەسەنە شەوانەش لەکارگەکەدا دەخەوت. حوسێنەش ڕۆیشتبوو بۆ لادێ بۆلای دایەگەورەو بابەگەورەی، لەوێ ببووە شاگردی کارێزهەڵکەن. هاوین هات و حەسەنە لە شار بوو، سەرەتای مانگی میهر چوو بۆ لای بەڕێوبەری خانەی بێسەرپەرشتان، گوتبووی دەیەوێت لە قوتابخانە بخوێنێت. بەڕێوەبەر پێیگوتبوو جێگامان نییەو کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیی پێدابوو، گوتبووی خۆت بیانخوێنەرەوە هەر پرسیارێکت هەبوو دوای نیوەڕۆیان وەرە بۆلای من و لێم بپرسە، پاشان تاقیکردنەوەی دەرەکی بدە. حوسێنە لە گوند شاگردی کارێز هەڵکەندن بوو. ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠)بوو، حەسەنە بە چەند ڕۆژێک جارێک سەردانی خانەی بێسەرپەرشتانی دەکرد، ڕۆژێک سەیر دەکات وا خانەی بێسەرپەرشتان نۆژەندەکرێتەوە، خەریکن خانوویەکی تازە دروست دەکەن. ئەو ڕۆژانی پشووش بۆ هاوکاریکردن سەردانی دەکردن. لە مانگی شەهریوەردا حەسەنە بەشداری تاقیکردنەوەی دەرەکی کردو بەیەکەم دەرچوو، بەڕێوەبەر دەیزانی حەسەنە کرێکارەو لە کارگەی مس تواندنەوە دەخەوێت، ماوەی ساڵێکە جێگای خەوتنی نییەو کەسێک نییە سەرپەرشتی بکات، بەڵام لە تاقیکردنەوەی دەرەکیدا یەکەم بووە. هەربۆیە بە حەسەنەی گوت: لەوەیە ئەمساڵ جێگەمان هەبێت ئەگەر پێتباشە لێرە ناوت تۆمار دەکەین. حەسەنە بەو قسەیە خۆشحاڵ بوو، تکاشی لێکرد بەڵکو جێگایەک بۆ براکەشی بکاتەوەو ناوی ئەویش تۆمار بکات. بەڕێوەبەر ڕازی بوو بە ناونووسینی هەردووکیان. حوسێنەش لە گوندەوە هاتەوە بۆ شار، بەڵام پۆلێک لەدوای براکەیەوە بوو.

دوای چەند ساڵێک حەسەنەو حوسێنە تەمەنیان بوو بە (١٥-١٦) ساڵ. ئەوکاتە

حوسێن لە پۆلی پێنجەم بوو، هەستیکرد دوو کوڕە دووانەکە زۆر پاکوخاوێنن، چاکەت و پانتۆڵی تازە لەبەردەکەن، هەرکاتێک دێنەوە بۆماڵەوە، هەریەکەو جانتایەکی پێیەو ڕیشیان تاشیوە، سەرو ڕوویان جوان و خاوێنە. حوسێن زانی کە ئەوان هەریەکەو قاتە جلی جوان و باشی خۆیان هەیە. ئێستا حوسێن سڵاو لە دوو برا دووانەکە دەکات، ئێستا منداڵ بە دوو برا دووانەکە ناڵێن حەسەنەو حوسێنە، بەڵکو دەڵێن حوسێن ئاغاو حەسەن ئاغا. ئاخر چاکەت و پانتۆڵەکەیان تازە بوو، پاکوخاوێن بوون، پێڵاوەکانیان نەدڕابوو، بەڵکو تازەو بۆیاخکراو بوون. ئیتر پێیان نەدەگوتن حەسەنەو حوسێنە، لەبەرئەوەی خاوێن و جلوبەرگیان تازەبوو، ببوون بە حەسەن ئاغاو حوسێن ئاغا. ڕۆژێک لە خانەی بێسەرپەرشتان ئاهەنگ بوو، حەسەن ئاغاو حوسێن ئاغا بە دایکیان گوتبوو بەڕێوەبەر گوتوویەتی پێویستە دایکتان لە ئاهەنگەکەدا ئامادە بێت. دایکیان گوتبووی من ناتوانم بێم بۆ قوتابخانە، مەعسومە بە منداڵی چوارەمیشەوە لە مەحمود ئاغا دووگیان بوو، بۆیە دایکیان گوتبووی داوا لە بیبی خەدیجەی دراوسێمان دەکەم لەجیاتی من بچێت بۆ ئاهەنگەکە. بیبی خەدیج دایکی حوسێن بوو. دایکی بە حوسێنی گوتبوو ئەمڕۆ لە خانەی بێسەرپەرشتان ئاهەنگ هەیە. حوسێن دیسانەوە ترسابوو گیانی کەوتبووە لەرزە، بەڵام ئەو ئێستا گەورەبووەو تەمەنی دوازدە ساڵ دەبێت، باڵای گەورە بووەو جلوبەرگەکانی خاوێنە. حەسەن ئاغاو حوسێن ئاغای وەبیرهاتەوە. ئیتر حەسەن ئاغاو حوسێن ئاغا نیشانەی هەژاری و بەدبەختی نەبوون. حوسێن پێی باشبوو بچێت و ببینێت خانەی بێسەرپەرشتان چ گۆڕانکارییەکی تێداکراوەو چۆن جێگایەکە.

## ترسم شکا

حوسێن بە ترس و ناڕەحەتییەوە، بەڵام بەوریاییەوە چووە ناو خانەی بێسەرپەرشتان، خانەی بێسەرپەرشتان ئیتر ئەو خانووە بێکەڵکەی شەش ساڵ لەوەو پێش نەبوو، ناو حەوشەکەی کرابوو بە کاشی و زۆر پاکوخاوێن بوو، بیناکە نۆژەنکرابووەوە، دیمەنی بەتەواوی گۆڕابوو، بینایەکی تازەی چەند ژووری لەتەنیشت بیناکەی ترەوە دروستکرابوو. منداڵەکان هەموویان پاکوخاوێن بوون، هەموویان جلوبەرگیان خاوێن و نوێ بوو، بۆینباخیان بەستبوو. منداڵەکان لە حەوشەکەدا سروودیان دەخوێندو شەربەت و شیرینییان دابەشدەکرد، پاشان میوانەکان سەردانی ژوورەکانیان کرد. ئەو دۆزەخەی

پێشتر من بینیبووم، ببوو بە بەهەشت. لەناو ژوورەکاندا فەرش ڕاخرابوو، کورسی و مێزی تازەیان کڕیبوو، لە هەموو ژوورەکاندا قەرەوێڵەی خەوتن دانرابوو، میوانەکان هەموویان لە ژوورێکی گەورەدا کۆببوونەوە. یەکێک لە منداڵەکان بەخێرهاتنی میوانەکانی کرد، منداڵێکی تر بە زمانی ئینگلیزی بەخێرهاتنی میوانەکانی کرد، میوانەکانیش سەریان سوڕمابوو، بەڕێوەبەر ڕاپۆرتی کاری خانەی بێسەرپەرشتانی خوێندەوە.

یەکەمینجار حوسێن لەوێ ناوی خانم ئەقدەسی بەقایی بیست، بەڕێوەبەر سوپاسی خانم بەقایی کرد لەسەر کارو چالاکییەکانی. گوتی: خانم بەقایی دایکێکی دڵسۆزە بۆ ئەم منداڵانەو هەوڵێکی زۆری داوە تاکو گۆڕانکارییەکی باش لەم خانەیەدا بکات. خانم ئەقدەسی بەقایی بەناونیشانی سەرۆکی کۆمەڵەی ژنانی شاری یەزد، وتەیەکی پێشکەشکرد، سوپاسی شارەوانیی یەزدی کرد بۆ ئەم هەموو هاوکارییەی کە پێشکەش بە خانەی بێسەرپەرشتانیان کردووە. خانم بەقایی گوتی: کڕینی تەواوی جلوبەرگ و کەلوپەلەکان لەلایەن خێرخوازێکی ئەم شارەوە دابینکراوە، ئەو خێرخوازە پێیگوتووم کە ناوی نەهێنم. هەروەها گوتی: ئەو خێرخوازە بەڕێزە چەند چەکێکی بانکی پڕنەکراوی بۆ ئیمزاکردووم و پێیگوتووم هەرچەندێک پارەت خەرجکرد، خۆت لە چەکەکەدا بینووسەو برۆ لە بانک پارەکە وەربگرە. من بەپارەی ئەو خێرخوازە توانیومە ئێرە نۆژەن بکەمەوەو پێویستییەکانم کڕیوەو چێشتخانەم دروستکردووە، بینایەکی تازەشم دروستکردووە، حەمامم دروستکردووە، قەرەوێڵەو دۆشەک و بەتانییەکانم گۆڕیوە. هەروەها قاپ و کەوچکی منداڵەکانم گۆڕیوە، جانتاو تەواوی کەلوپەلم بۆ کڕیون، بۆ هەر منداڵێک دوو دەست چاکەت و پانتۆڵ و چوار دەست جلی ژێرەوەم بۆ کڕیون. فڵچەو مەعجونی ددان شۆردن و پێویستیەکانی ترم بۆ کڕیون. بڕیارە ساڵی دوو جار سەردانیان بکەم و تەواوی پێویستییەکان و ساڵی دوو قات چاکەت و پانتۆڵیان بۆ بکڕم. ئەو بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: کتێبخانەمان بۆ دروستکردوون و مامۆستای زمانی ئینگلیزیمان بۆ دابینکردوون، پاشان سوپاسی بەڕێوەبەری خانەکەی کرد. بەڕێوەبەریش گوتی: ساڵی پار چەند منداڵێک بەهۆی بێجێگەییەوە ڕۆیشتن، خۆشبەختانە ئەمساڵ توانیومانە ئەو منداڵانە بگەڕێنینەوە بۆ خانەی بێسەرپەرشتان. خانم بەقایی زۆر سوپاسی عەلی عەسکەرخانی سەرۆکی شارەوانیی یەزدی کرد و گوتی: بڕیاریان داوە حەوشەکە بەجوانی دروست بکەنەوە. بە باخچەکەش ڕابگەن و ئەم خانەی بێسەرپەرشتانە وەک بەهەشت لێ بکەن.

منداڵەکان ئاسودە بوون، مامۆستای زیاتریان بۆ دابینکردبوون. بەڕێوبەر گوتی: بۆ ئەو منداڵانەی لە ئامادەیی دەخوێنن، چاکەت و پانتۆڵمان بە ڕەنگی جیاواز بۆ کڕیون، چونکە هەندێک لەو منداڵانە نایانەوێت هاوڕێکانیان بزانن کە لە خانەی بێسەرپەرشتان دەژین. خانەی بێسەرپەرشتان ماڵی ئومێدی منداڵەکان بوو. خانم ئەقدەسی بەقایێ گوتی: ئێستاش خانەی بێسەرپەرشتان داواکاری زیاتری لە خێرخوازان هەیە، تائێستا یەک کەسی خێرخواز دەستی هاوکاری بۆ درێژ کردووین، ئەگەر خێرخوازانی تریش هاوکارمان بن، ئەوا باشتریش دەبێت. ئەو خێرخوازە گوتوویەتی: من ئامادەم هەمیشە هاوکارتان بم. خانم بەقایی بە وتە بەهێزو نەرمونیانەکەی و بەئەدەبەوە داوای لە تەواوی خێرخوازان کرد بەشداری بکەن لە بەرەو پێشچوونی خانەی بێسەرپەرشتان.

هەردوو برا دووانەکە لە خانەی بێسەرپەرشتان جێگیر بوون و وانەکانیان دەخوێندو کەمتر دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، کەمتر لە گەڕەک و کۆڵان دەبینران. حوسێنی کوڕی بیبی خەدیجیش ئیتر لە خانەی بێسەرپەرشتان نەدەترسا، ئیتر وەک دۆزەخ سەیری خانەی بێسەرپەرشتانی نەدەکرد. ساڵی (١٣٤١/١٩٦٢) یەکێک لە خوشکەکانی برا دووانەکان لە تەمەنی (١٤) ساڵیدا هاوسەرگیری کرد، هەردوو برا گەورە ببوون، بە جلوبەرگی تازەو نوێوە لە ئاهەنگی خوشکەکەیان هەڵدەسوڕان. ساڵی (١٣٤٤/١٩٦٥) حەسەن ئاغا دبلۆمی وەرگرت و داواکاری پێشکەشکرد لە زانکۆی تاران، لە کۆلێژی ئەندازیاری وەرگیرا. حوسێن ئاغاش ساڵی دواتر دبلۆمی وەرگرت و لە بەشی ئەندازیاری میکانیک لە زانکۆی تاران وەرگیرا. حەسەن ئاغا زۆر لێهاتوو بوو، یەکێک بوو لە باشترین پسپۆڕەکانی دروستکردنی پرد لە وڵاتدا. حوسێن ئاغاش لە کارگەی ئێران ناشناڵ دەستبەکاربوو، لە بەشی پیلانڕێژی پارچەی ئۆتۆمبێل کاری دەکرد، هاوکات چەند نوێنەرایەتییەکی گەورەی ئێران ناسوێناڵی لەئەستۆ گرتبوو، لەدوای خانەنشینکردنی زیاتر کاری بریکاری دەکرد. هەروەها دوای خانەنشینبوونی بوو بە کەسێکی شارەزا لە ئابووریدا. لە دەوروبەری (ئەرک) کارگەی دروستکردنی پارچەی ئۆتۆمبێلی دامەزراند. هەردوو برا سەرکەوتوو بوون. حەسەن ئاغا چوار منداڵ و شەش نەوەی هەیە. ئەو دوو برا دووانەیە لەدایکبووی ساڵی (١٣٢٣-١٩٤٤) هەتا ئێستاش ساغ و بەهێزن. بەو پارەیەی ئەو خێرخوازە خستییە ژێردەستی خانم بەقایی چارەنووسی دەیان و سەدان منداڵی هەژاری بێ باوک گۆڕانی بەسەردا هات. ئەگەر هەوڵەکانی خانم بەقایی و

پارەکانی ئەو خێرخوازە نەبووایە، حەسەن کرێکارێکی باشی گەرمکردنی کورەی مس تواندنەوە دەبوو، حوسێنیش هەر شاگردی کارێز هەڵکەندن دەبوو، یا دەبووە وەستا. خوای گەورە ئاگاداری کرێکاران و کارێزهەڵکەنان بێت و خوا تەمەنیان درێژ بکات، بەڵام چارەنووسی ئەم دوو برا دووانەیە شتێکی تر بوو. حەسەن ئاغا کە گوندەکەیان (٤٥) کیلۆمەتر دوورە لە یەزدەوە، قوتابخانەیەکی جوان و باشی لەسەر ئەرکی خۆی لێ دروستکردووە.

هەمیشە حەزمدەکرد لە خانم بەقایی بپرسم ئەو کەسە خێرخوازە کێ بوو کە پارەی نۆژەنکردنەوەی خانەی بێسەرپەرشتانی دابینکردووە، خێرەومەندێک کە فریای منداڵانی هەژار دەکەوت؟ هەلێکم بۆ هەڵنەکەوت تا بەخزمەت ئەو خانمە گەورەو بەڕێزە بگەم. لەدوای بڵاوکردنەوەی یادەوەرییەکانی شازادەی حەمام بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵدا کرد. لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) هاوڕێی بەڕێزم ئەحمەد نەداخی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئەو بەڕێزەدا بۆ ڕێکخستم. ڕۆژێکی عەسر لەگەڵ ئاغای ئەحمەد نەداخی و ئاغای داودی مەهریزیزادە چووین بۆ سەردانی خانم بەقایی، ئەو خانمە بەڕێزە لە ماڵی خۆیان پێشوازییان لێکردین. ئاغای مەهریزی زادە لەگەڵ خانم بەقاییدا چەند وێنەیەکی جوانی بۆ گرتین. خانم بەقایی تەمەنی لە نزیک هەشتا ساڵیدابوو، لەشساغ و لەسەرخۆ بوو، نزیکەی دوو کاتژمێر لەلای ماینەوەو قسەمان کرد، بەشێک لەو وتووێژەمان ئێستا لەلایەن چەند هاوڕێیەکەوە چاپکراوە. لێکدانەوەی ژیانی ئەو خانمە گەورەو بەڕێزەم لە جێگایەکی تردا خستوتەڕوو. ئەم خانمە بەڕێزە سەر بە بنەماڵەیەکی خانەدانی کۆنە. ئەوان خۆیان بە هەڵۆکانی جەنگیزخانی مەغۆل دەزانن. ئەو بە شانازییەوە گوتی: پشتی هەژدەیەمم، جەنگیزخانی مەغۆلە، شەجەرەنامەی تەواویشمان هەیە، باپیرە گەورەکانیان پشتاوپشت لە دەزگاکانی حکومەتداو لە یەزد دەوریان هەبووە. شێوازی فێرکردن و پەیوەندییەکانی لەگەڵ تەواوی مامۆستاکاندا بەلامەوە زۆر جوان بوو.

خانم بەقایی لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بووە کە ڕۆژێک ژنێک دێتە ماڵیان، دایکی پێشتر زانیبووی کە میوانیان دێت، خۆی ئامادەکردبوو بۆ پێشوازیکردن. دایکی بۆ ئەقدەس و خزمەتگوزاری ماڵەکە گەورەیی نواند. ئەقدەسی تەمەن پێنج ساڵ زانیبووی کە ئەو لە بنەماڵەیەکی ناسراو و گەورەیە، دەیزانی کە دایکی هەمیشە خزمەتکار و نۆکەری هەبووە. بینیبووی کە هەندێک کەس دێن بۆ ماڵیان و دەستی دایکی ماچ دەکەن، بەڵام

ئەو ڕۆژە کە ئەو میوانە هاتبوو بۆ ماڵیان، ئەقدەس سەیری کرد بەپێچەوانەی جارانی پێشووەوە دایکی زۆر بەڕێزەوە دەستی میوانەکەی ماچکرد. دایکی بە ئەقدەسی تەمەن پێنجساڵی گوتبوو: دەستی شیرین خانم ماچ بکات! ئەوە یەکەمینجاربوو کە دایکی پێی بڵێت دەستی کەسێک ماچ بکات. ئەو هەرگیز نەیبینیبوو کە دایکی دەستی کەسێک ماچ بکات. ئەم دەستماچکردنە لە مێشکی ئەقدەس خانمدا شوێنەواری هەیە، شوێنەوارێک کە خۆشەویستی مامۆستاکەی لەلا زیاتر بوو. شوێنەوارێک دوای (٧٥ ) ساڵ بەشێک لەم یادەوەرییانە پێکدەهێنێت. ئەو لەبارەی ئەو میوانەو هۆی دەستماچکردنی بەمجۆرە دوا: شیرین خانم ژنێکی زەردەشتی بووە، مامۆستایەکی زەردەشتی کە وانەی بە منداڵانی موسڵمان دەگوتەوە، ئەو مامۆستای زانست و ئەخلاق و خۆشەویستی بوو. ئایا مامۆستا شیرینی زەردەشتی هەمان ئەو مامۆستایە بوو کە لە دەیەی (١٣٣٠- ١٩٥٠)دا شەهربانوو لەبارەی شیرینی مامۆستایەوە قسەی دەکردو دەیگوت: شانامەو مەسنەوی مەعنەوی مەولانای لای شیرینی زەردەشتی خوێندووە. بیری لێ بکەنەوە، من لە شارێکدا گەورەبووم. کە شیرینی زەردەشتی بە شەهربانووی موسڵمان و بە منداڵانی یەهودی وانەی وتۆتەوە. (ئەرباب بەهرامشەهری) کەسێکی دڵسۆزو خۆشەویست بووە، ئەو بەڕێزە زەردەشتی بووەو وانەی بە چەندین منداڵی موسڵمان وتۆتەوە. پەیوەندی قوڵی موسڵمان و زەردەشتی و یەهودی لە یەزدو ئێراندا، سومبولی مرۆڤایەتییە، سومبولی گەورەیی یاساکانی ئیسلام، هاوژیانی و پێکەوەژیانی ئەم سێ ئاینە لە یەزدو شارەکانی تری ئێران، هێماو نیشانەی پێشکەوتن و ڕاستگۆیی و کەلتوورییە.

ناوی ئەو کەسە خێرخوازەم لە خانمی بەقایی پرسی کە لە ساڵی (١٣٣٩-١٣٤٠/١٩٦٠-١٩٦١) ئەو هەموو پارەیەی بۆ بنیاتنان و نۆژەنکردنەوەی خانەی بێسەرپەرشتان تەرخانکردبوو. ئەویش ناوی دکتۆر (حاجبی مورتازی) برد. بەو ناوبردنە سەرسام نەبووم، چونکە چەندینجار بیرم کردبووەوە کەسێک کە ئەو خێرە گەورەیەی کردووەو حەسەنەی لە کارگەی مس تواندنەوە دەرکردو حوسێنەی لە شاگردی کارێزهەڵکەنییەوە دەرکرد و خستنییەوە قوتابخانە، دەبێت ئەوکەسە (دکتۆر حاجبی مورتازی) بێت. دکتۆر حاجبی مورتازی ئێستاش (١٣٩٤-٢٠١٥) لە تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵیدایەو دەتوانێت لە نزیکەوە سەرپەرشتی نەخۆشخانەکەی خۆی بکات.

## دڵگەرمیی دڵە بەستووەکان
### میهری

سەرەتای مانگی (دەی-١٣٩٢/ تشرینی دووەم ٢٠١٣ )، دایکم لە یەزد نەخۆشەو لە نەخۆشخانەی دکتۆر (حاجبی مورتازی) خەوێنراوە، منیش لەلای ئەوم، لەسەر پلیکانەکانی قاتی سێیەمی نەخۆشخانەکە خانمێکی بەتەمەن هەواڵپرسی لێکردم، تەمەنی نزیکەی (٧٠ ) ساڵ دەبوو، دەپرسێت دایکت چۆنە؟ منیش دەڵێم سوپاس بۆ خودا باشترە، دەپرسێت، من دەناسیت؟... من مهریم، نەوەی شەهربانوو، کچی خەلیفە محەمەد عەلی. منیش دەپرسم کچی ڕوقیە خانم، هاوسەری ئاغا ڕەزای پاسەوان؟ بە ئاماژەی بەڵێ سەرێکی بەرەوخوار لەقاند. بەبیستنی ناوی شەهربانوو و ڕوقیە خانم یادەوەرییەکی زۆرم وەبیرهاتەوە. یادەوەریی خۆش، یادەوەریی سەردەمی منداڵی، کە پراوپڕە لە دەیان پرسیار، یادەوەریی ماڵ و گەڕەکی کۆن.

دەپرسم ئاغا ڕەزا چۆنە؟ ئەویش دەڵێت: خودا لێیخۆش بێت، دوو ساڵ و شەش مانگە مردووە. من نزای خێر دەنێرم بۆ هەموو خوالێخۆشبووان. لە هەواڵی هەموو خزمەکانی دەپرسم، هەواڵی خوشکەکانی و منداڵەکانیانی لێدەپرسم. هەواڵی زینەت خانمی خوشکی و منداڵەکانیشی دەپرسم، هەواڵی ئەکبەر ئاغا و سفورا خانمیش بەجیا دەپرسم. ئەویش لەبارەی هەموانەوە قسەی بۆ کردم، بە پێکەنینێکی ماناداراوە دەڵێت: سفورا پێنج منداڵی هەیەو ماڵی لە کەرەجە. لێی دەپرسم چی دەکەیت لە نەخۆشخانە؟ ئەویش دەڵێت: برای هاوسەرەکەی سەکتەی لێداوەو هاتووە بۆسەردانی، دەیەوێت سەردانێکی دایکیشم بکات. بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ ژوورەکەی دایکم، لەگەڵ دایکمدا هاوڕێن، لەگەڵ دایکمدا زوو زوو یەکتریان دەبینی. لەوێ لەگەڵ دایکمدا کەوتنە قسەکردن،

دوای قسەکردن بە دایکم دەڵێت: من کتێبی شازادەی حەمامم خوێندۆتەوە، منداڵی خوشکەکانم پێمدەڵێن: تۆش یادەوەرییەکانی خۆت بنووسەرەوە، منیش پێمگوتوون: ناتوانم، کچە خوشکەکەم دەڵێت: تۆ یادەوەرییەکانت بۆ ئاغای پاپۆلی باسبکەو با ئەو بیاننووسێتەوە.

ڕاستییەکەی لانیکەم (١٥٠) کەسی خەڵکی شاری یەزد حەزدەکەن من یادەوەرییەکانیان بنووسمەوە. تێگەیشتم کە ئەو خەڵکە یادەوەرییان زۆرە، بەڵام ناتوانن، یان نایانەوێت خۆیان یادەوەرییەکانیان بنووسنەوە. بەگومانم لەکۆتایی تەمەنمدا بتوانم سەرگەرمی کۆکردنەوەی یادەوەریی خەڵکی و نووسینەوەیان بم. یادەوەرییەکانی خەڵک، مێژووی سەرزاری هاوڵاتییانی ئەم وڵاتەیە. من لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا گوێم بۆ یادەوەری نزیکەی (٦٥) کەس گرتووە. بەشێک لە بابەتەکانی ئەم کتێبە یادەوەریی مهری نەوەی شەهربانووە. دیارە ئێستا یادەوەرییەکی بۆ دەنووسمەوە کە خۆشم تاڕادەیەک ئاگاداری ڕووداوەکانی ئەوم، واتە یادەوەرییەکانی خۆم بەشێوەی چاوپێکەوتن تەواو دەکەم، بۆ نموونە یەکێک لەو بەڵگانەی کە یادەوەرییەکانی مهری خانم دەنووسم، ئەوەیە کە یادەوەریی ئەو بەشێکە لە یادەوەرییەکانی خۆم، من لە منداڵییەوە تەواوی بنەماڵەکەی مهری دەناسم، چەند کەسێک لە خوشکەزاکانی وەکو ئەکبەرئاغا و سەفورا خانم هاوتەمەن و هاوساڵی منن.

لە نەخۆشخانەکەدا ژوورەکەی دایکم چۆڵە، جگە لە من و دایکم و مهری خانم هیچ کەسێکی تری لێ نییە. مهری خانم نزیکەی سێ کاتژمێر مایەوەو دەردەدڵ دەکات، منیش پرسیاری لێدەکەم. دوو جاری تریش دەچم بۆ ماڵیان و بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەین. ئەو لە تاران دەژیا، بەڵام لەدوای مردنی هاوسەرەکەی زیاتر لە یەزد دادەنیشت. چەند تەلەفۆنکردنێکی دوورو درێژ یادەوەرییەکان تەواو دەکات. بەدرێژایی پێنج مانگ لەگەڵ سێ کەس لە خوشکەزاکانی مهری خانم و ئاغای عەبدوڵڵای هاوسەری خوشکەکەی و برای هاوسەرەکەی گفتوگۆم کرد. لە دەیەی ساڵی (١٣٣٠/١٩٥٠) ماڵەکانمان دوو کۆڵان لە یەکترییەوە دووربوون. بنەماڵەی خەلیفە محەمەد عەلی لە گەڕەک و کۆڵانی ئێمەدا ناو و ناوبانگیان هەبوو. گەڕەکەکەی ئێمە گەڕەکێکی کۆن بوو، گەڕەکێک بە کۆڵانی باریک و دیواری بەرز، گەڕەکێک بە خانووی کۆن، ماڵێک کە هەریەک بۆخۆی کەلتوورێکی دیاربوو. ئێستاش لەوەیە ئەو جۆرە خانووانە بوونیان هەبێت، خانوویەک

کە هیچ پەنجەرەیەک، یان هیچ دەلاقەیەکی تێدا نەبوو، هیچ ڕووناکییەک لە کۆڵانەوە نەدەهاتە ژوورەوە، هیچ ڕووناکییەکیش لە ژوورەکانەوە نەدەچووە دەرەوە. خانووی دەورگیراو بەخانووی تر، خانوویەک کە پەنجەرەی ژوورەکانی تەنها بەلای حەوشەدا دەکرایەوە. لە دەیەی (١٣٣٠/١٩٥٠) لە شاری یەزد تەنها یەک پەنجەرە لە خانووەکاندا بەڕووی کۆڵاندا نەدەکرانەوە. هیچ کەسێک نەیدەتوانی لە دەرەوە ناو ژوورەکان ببینێت. دەیانگوت: ئەو دیوارە بڵندانە بەهۆی ئاوهەواوە بووە، بەڵام من لەو وتانە بەگومانم، ئەوە ڕاکردنە لە ڕاستییەکان، لە گەڕەکە کۆنەکاندا جیاوازی جوگرافیایی و چینایەتی بوونی نەبوو. لە یەک گەڕەکدا دەوڵەمەندو هەژار بەیەکەوە دەژیان، بەیەکەوە دراوسێ بوون و بەیەکەوە لە یەک مزگەوت و سەرچاوەی ئاو و بازاڕ سوودیان وەردەگرت. بەدرێژایی ساڵ لە یەک حەمامدا یەکتریان دەبینی، ئەو دیوارە بڵندانە بۆ خۆشاردنەوە بووە لە خەڵکانی نامۆ. هەژارەکان نەدەبوو ئاگایان لە ماڵە دەوڵەمەندەکان بووایە. دەوڵەمەندەکانیش نەدەبووایە ئاگاداری ڕەوشی ماڵە هەژارەکان بن. ئەم دیوارە بڵندانە دیواری پەچەو داوێنپاکی بوون. بەهەمان شێوەی کە دەبێت ژنان و پیاوان جلوبەرگی درێژ لەبەر بکەن. ماڵەکانیش دەبووایە دیواریان بڵندو بێ درزو دەرەچە بێت، دیواری بڵندو بێ دەرەچە، چادرو ڕووپۆشی ماڵەکان بوو. خەڵکەکە لەو چوار دیواری قەڵائاسایەدا ژیانێکی هێمنیان دەگوزەراند، ئەگەر ئاسودەیی نەبووایە لەبری ئەوە ئارامییان هەبوو. لەوەیە ژیان لەو خانووانەدا بە بەراورد بە ژیانی ئەمڕۆ، دژوار بووبێت، بەڵام ئەوان ئارامییان هەبووە، دژوارییەک کە ئەوان خوویان پێوەگرتبوو، ناکرێت پێویستییەکانی ژیانی ئەوکاتە بە ژیانی ئێستا بەراورد بکرێت.

ئەو خانووانە پەناگەیەک بوون، شوێنی پشوودان و کارگەو تەویلە بوون، شوێنی خواپەرستی و چیرۆک گێڕانەوە بوون. ئەوکات هێشتا کەلێن نەکەوتبووە نێوان وەچەکانەوە، هێشتا کەلێنی نێوان وەچەو بەرەبابەکان دەرنەکەوتبوو، هەندێکجار باپیرە گەورە لەگەڵ نەوەی چوارەمی پشتی خوار خۆی بەیەکەوە دەژیان. بەڕاستی ئەم ژیانە تازەیەی ئێستا چ ژیانێکە. ئەو ڕۆژە خۆش و ئارامانە ڕۆیشتن و ئاسودەیی جێگای گرتۆتەوە. ئەو دوو وشە جیاوازە مانایەکی زۆریان بەیەکەوە هەیە. دەرگای ئەو خانووە کۆنانە هەمیشە بەڕووی دراوسێکاندا کراوە بوون، ئەو دراوسێیانەی کە لە یەک چینی کۆمەڵایەتی بوون. دەرگای خانووی دەوڵەمەندەکان بەتوندی داخرا بوون،

قفڵی گەورەیان هەبوو. هەژارەکان بەبێ بانگهێشتن نەدەچوونە ماڵە دەوڵەمەندەکانەوە، دەوڵەمەندەکانیش نەدەچوون بۆ ماڵە هەژارەکان، بەڵام دەرگای ماڵە هەژارەکان و چینی مامناوەند هەمیشە بەڕووی دراوسێکاندا کراوە بوو، بەتایبەتی بەڕووی ژن و منداڵانی دراوسێدا. دراوسێکان هەمیشە بەجۆرێک خزم و کەسی یەکتر بوون، دراوسێیەک کە بەیەکتری نامۆ نین، دیدو ڕوانینی نامۆکان نەدەگەیشتنە ئەو ماڵانە. ئەوکات مانای نامۆ بوون لەگەڵ ئەم سەردەمەدا جیاواز بوو، لە بوونی هەر ڕووداوێکدا، بەتایبەت ژنەکان، دەچوون بەهانای دراوسێکانیانەوەو ئاگاداری هەموو شتێکی یەکتری بوون. ئەم دیوارە بڵندانە دیواری دژو ناکۆکی بوون، بەلای ئێمەوە هیچ کەسێکی نامۆ ڕێی نەدەکەوتە ئەو ناوە، تەنها مەگەر دراوسێکان، بەتایبەتی ژنان. دراوسێی یەک چینی کۆمەڵایەتی نامۆ نین بەیەکەوە، بۆ دەوڵەمەندەکان نازانم، بەڵام هەموو هەژارەکانی جیهان خزم و کەسی یەکترین. ئەم دیوارانە پێشی لە زانست و هەواڵ دەگرت. لەو سەردەمەدا شەپۆلەکان نەدۆزرابوونەوە. باشتر بڵێم شەپۆلەکان نەگەیشتبوونە شارەکانی ئێمە. دیوارەکان پێشیان لە هەواڵ و زانیاری دەگرت. هەریەک لە ماڵەکان بۆ خۆیان بنکەیەکی کەلتووری و پارێزەری کەلتوور بوون. کەلتووری ڕاستی، ڕاستگۆیی، هاوژیانی و پێکەوەژیان. یەک کەسی خەڵکی یەک گەڕەک، خەڵکی یەک شارو یەک کۆڵان هەمیشە و لانیکەم دوو ڕووی یەک دراو بوون. دراوێک کە ئێستا چەندین ڕووی هەیە. هەرکەسێک خاوەنی دوو ڕوو، سێ ڕوو بەخۆیەتی. کاتێک کە ئازادیی نەبێت، خەڵکی دەگۆڕێن بۆ چەند کەسایەتییەک. کەلتووری کۆن کەلتووری دژە. لە هەمانکاتدا کەلتووری کەسێتیشە. لەکۆتاییشدا ئەو ماڵانە مەکۆیەکی کەلتووری بوون. لەهەمانکاتدا کەلتووری کارو هەوڵ و تێکۆشان بوون. هەروەها ئەو ماڵە قەڵائاساییانە شوێنی ئارامگرتنی کەلتووریی بوون. کەلتووری پێشکەوتن لەناو ئەو ماڵانەدا بوونی نەبوو، ئەوان هەر چاویان لەسەر ڕابووردوو بوو، هیچ تێڕوانینێکیان بۆ ئاینده نەبوو، کەلتووری باڵادەست لەو سەردەمەدا دەیویست شەپۆلەکان بگەیەنێتە ناو ماڵەکان، ئەی بۆچی هەندێک کەس دژی ڕادیۆو تەلەفزیۆن و سەتەلایت بوون؟ چونکە شەپۆلەکان بەبێ مۆڵەت دەچوونە ناو ماڵەکانەوە.

لەسەردەمی کۆندا ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و کتێب و تەواوی شەپۆلەکان ڕێیان نەدەکەوتە ماڵەکانەوە. تەنها بەیانیان پیاوان بۆ پەیداکردنی پارووە نانێکی حەڵاڵ

لە ماڵ دەرۆیشتنە دەرەوە و شەوانە دەگەڕانەوە، بەڵام لەم دواییانەدا زۆرێک لە پیاوان لە ماڵەکانی خۆیاندا کاری جۆلایی و چنینیان دەکردو هەفتەی جارێک دەچوونە بازاڕ بۆ فرۆشتنی پارچە چنراوەکانیان. ئەو پیاوە کاسب و سەر ڕاستانە لە کارو کاسپییەکانیاندا درۆیان نەدەزانی، خۆ ئەگەر درۆیەکیشیان بکردایە، ئەوا لەپێناو ئابڕووی خۆیاندا بووە. زۆرێک لە ژنەکانیش هەر لە ماڵەوە کاریان دەکرد، ئەوان زیاتر کاری تەشیڕستن و کڵاش چنینیان دەکرد. ئەو خەڵکانە دەبووایە زیاتر هەوڵبدەن تاکو لە کەموکوڕییەکانی ڕابردوو و ئێستایان تێبگەن. بۆئەوەی ڕێگەچارەیەک بۆ ژیانی ئەمڕۆ و ئاییندەیان بدۆزنەوە، بەڵکو لەو ئاسودەییە پڕ دەردەسەرییە ڕزگاریان ببێت و بگەن بە ئارامی. تاکو مرۆڤەکان لە زەمانەو کۆشک و خانوو و شارەکانی ئەم سەردەمە ڕزگاریان ببێت. ژنان تەنها چەند کۆڵانێک لە ماڵەکانی خۆیان دووردەکەوتنەوە، ئەویش بۆ سەردانیکردنی ماڵی دایک و باوک و خوشکەکانیان،ساڵی چەندجارێکیش دەچوون بۆ مزگەوت بەمەبەستی مەراسیمی ئیمام حوسێن، ساڵی چەندجارێکیش سەردانی مەزاری ئیمام جەعفەری یەزدیان دەکرد. ئەوان هەر نەیاندەزانی باکوری وڵات لەکوێیە! تاکو گەشتێکی بۆ بکەن، هەرگیز تووشی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ نەدەبوون. لەماوەی (٢٥) ساڵدا لە ساڵی (١٣٢٠-١٣٤٥/ ١٩٤٠-١٩٦٦) لە هەموو شاری یەزدا یەک کەس خۆی کوشتووە. لە دەیەی (١٣٣٠-١٣٤٠/ ١٩٥٠-١٩٦٠) یەک نوکتەی گەلانی تر بەر گوێی ئێمەی یەزدی نەکەوتبوو، هێشتا پەیوەندییەکان کەم بوون، هێشتا ئەوانەی دەیانویست نوکتە لەسەر گەلان و ناوچەکانی تر دروست بکەن پەیدا نەببوون. ئەوانەی لەو خانووانەدا دادەنیشتن، ئەگەر پارەداربوونایە لە تەمەنیاندا یەک دوو جار سەردانی مەشهەدیان دەکرد. لە هەر گەڕەکێکدا تەنها چەند کەسێک حاجی بوون. ژیانی کۆمەڵایەتی، بەتایبەت چوون بۆ حوسێنییەکان، خۆشییەکی پێدەبەخشین.

لەکۆتایی دەیەی (١٩٥٠/١٣٣٠)دا تازە لەسەری کۆڵاندا دارێکیان چەقاندبوو، بۆ ڕووناککردنەوە فانۆسێکیان پێدا هەڵواسیبوو، بەردەمی ماڵەکانیان بە فانۆس ڕووناکدەکردەوە. هەندێک لە ماڵەکان بە کارەبای دزیەتی گڵۆپەکانیان هەڵدەکرد. لەوەیە ئەو کارەبا دزینە یەکەمین دزی و یەکەمین سەرپێچی بووبێت کە لە شارەکاندا کرابێت، ئەوە بوو تازەگەریی بە سەرپێچی دەستپێکرد. لە شارێکدا کە ساڵانە یەک ڕیاڵی دزی تێدا نەدەکرا، لەناکاو لە هەر کۆڵانێکدا دوو سێ کەسی کارەبادز پەیدابوون. هەندێک

ماڵیش پسوڵەی پارەی کارەبایان پێ دەدرا، بەڵام پارەکەیان نەدەدا. هێشتا خەڵکی فێر نەببوون پارەی پسوڵەی کارەبا بدەن. یەکەمین پسوڵەی پارەدان کە لە شاری یەزد بە دەرگای ماڵاندا هەڵواسرا، پسوڵەی کارەبا بوو. کەلتووری نوێ خەریک بوو پەیدا دەبوو، فرۆشیار کاڵای نادیاری دەفرۆشت، فرۆشیارێک قەرزدارەکانی خۆی نەدەناسی، کاڵاکەش نە دەخوراو نە دەپۆشرا. کاڵایەک کە نەخورێت و نە بپۆشرێت، خەڵکی دەبێت پارەی چی بدەن؟ داهێنانەکەی ئەدیسۆن نەریتی خواردن و نەریتی خەڵکی گۆڕی. ئەو داهێنانە گۆڕانکارییەکی گەورەی دروستکرد، گۆڕانکارییەک کە ئەوسەری دیار نییە. پێش هاتنی کارەبا، شەوانە کۆڵانەکان لە دەرەوەو لە ناوەوە بێ ڕووناکی بوون، ئێواران کە تاریک دادەهات ژنان لەبەردەم ماڵەکانیاندا دادەنیشتن.

ژنان باسی باش و خراپی ژیانیان دەکرد، باسی هاوسەرەکانیان دەکرد، غەیبەتی دراوسێکانیان دەکردو تۆمەتیان بۆ دەبەخشینەوە، بەم قسانەیان خۆشگوزەرانییان بۆ خۆیان دروست دەکرد. بە غەیبەتکردن کاتەکانیانی خۆیان دەکوشت. ئەوان هیچیان لە سیاسەت نەدەزانی، بەهیچ جۆرێک باسی گرانی و هەرزانییان نەدەکرد، هیچیان لە هونەرو مۆسیقا، لە هەواڵەکان و لە بازاڕ نەدەزانی، ئەی دەبووایە چییان بکردایە. ڕۆژانە بە بەردەوامی لە ماڵەوە کاری چنین و ڕستن و کڵاش دروستکردنیان دەکرد. سەرەتای شەو لەبەردەرگا دادەنیشتن و وتووێژیان دەکرد، درەنگانێکی شەو خوداحافیزییان دەکردو بڵاوەیان لێدەکرد. سوپاسی خودایان دەکردو زۆر ڕازیبوون بەو ژیانە، هیچ ڕق و کینەیەکیان لەدڵدا نەبوو، تۆمەتیان بۆ کەس هەڵنەدەبەست. وتەکانیان بۆ پێکەنین و خۆشی بوو. هیچ کەسێک دۆسیەی ئاسایشی بۆ نەکرابۆوە، حکومەتیش ئەوەندە پارەی نەبوو تاکو بۆ هەر کۆڵانێک ئاسایشێک دابین بکات. ساڵانە هیچ هەواڵێکی گرنگ لە کۆڵانەوە نەدەبیسترا، خەڵک هیچ زانیارییەکیان لەبارەی شارو وڵات و دنیاوە نەبوو. ژنان بەبێ ئەوەی بانگهێشت بکرێن، دەچوون بۆ زەماوەندەکان. ئەو خەڵکانە نە هۆگری مۆسیقابوون، نە هۆگری شایی و هەڵپەڕکێ، نە هۆگری شیعرو شاعیریی بوون. لە شاری ئێمە هونەر واتە هونەری دەستی. واتە مسگەری و زەڕەنگەری و دارتاشی و جۆڵایی و دروستکردنی بەڕەو جاجم. ئەو هونەرەی ئەمڕۆ هەیە، لە شاری ئێمە بوونی نەبوو. هەندێک لە پیاوان تلیاکیان دەکێشا، هەندێکیشیان وەکو باوکی من هەم تلیاکیان دەکێشاو هەم ژنی دووەم و سێیەمیان دەهێنا. ئەو خەڵکە هەموویان یەکتریان دەناسی،

سڵاویان لە یەکتری دەکرد. لە بازاڕ و حەمام و مزگەوت یەکتریان دەبینی، لە هەر پەنجا کەسێک یەکێکیان کەمێک خوێندەوار و حسابی دەزانی. ڕۆژانی نەورۆز دەچوون بۆ دیدارو سەردانیکردنی یەکتری. ژنان لە پیاوان بە کەیفتر بوون، گۆرانییان دەگوت و شاییان دەکرد، تەنانەت پیاوان حەزیان لە سەیرکردنیش نەبوو.

بنەماڵەی خەلیفە محەمەد عەلی، باوکی مهری بەهۆی ناسراویی دایەگەورەیانەوە (شەهربانوو)، لە گەڕەکدا ماڵێکی ناسراو بوون. محەمەد عەلی باوکی مهری شیرینی دروستدەکرد، لە دووکانی شیرینی دروستکردندا کاری دەکرد، واتە وەستای شیرینی بوو. پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو، مۆڵەتی دابوو کچە بچووکەکەی بچێت بۆ قوتابخانە. لەو سەردەمەدا چەند حاجییەکی دەوڵەمەندی گەڕەک مۆڵەتیان نەدەدا کچەکانیان بچن بۆ قوتابخانە، دەیانگوت: ئەگەر کچێک بچێت بۆ قوتابخانە، بێ شەرم دەبێت، کچی خوێندەوار خەریکی نامەنووسین دەبێت و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا شەڕ دەکات و تەڵاق وەردەگرێت. واتە خوێندەواربوونی کچان دەبێتە هۆی جیابوونەوەیان لە هاوسەرەکانیان. خوێندەواران حەز بە خوێندنەوەی هۆنراوە دەکەن، ئەوکاتە حەز بە ئازادیی دەکەن. خوێندەوارەکان پەیوەندی دەبەستن و مەیلیان بۆ ئازادیی دەجوڵێت و تەڵاق وەردەگرن، مەبەست لە ئازادیی بێبەندو باو نییە، بەڵکو مەبەست لە ئازادیی ڕا دەربڕینە. کاتێک من تەمەنم (١٠)ساڵبوو، مهری دەڕۆیشت بۆ قوتابخانە، ئەو سێ خوشکی لە خۆی گەورەتری هەبوو، ئەوان هیچیان نەچووبوون بۆ قوتابخانە. دایکی دەیگوت: من نامەوێت پیاو وانە بە کچەکەم بڵێتەوە، نامەوێت کچەکانم لەگەڵ کوڕاندا نامە ئاڵوگۆڕ بکەن. ئەو وایدەزانی کە کچان خوێندەوار بوون یەکڕاست نامە بۆ کوڕان دەنووسن. باوکی ڕوقیە خانم مەلا بوو، کاتێک من منداڵبووم، ئەو زۆر پیربوو، وابزانم تەمەنم (٧-٨) ساڵبوو کاتێک باوکی ڕوقیە خانم، واتە باپیری مهری، کۆچی دوایی کرد. ڕوقیە خانم دایکی مهری بیستبووی کە کچەکەی لە قوتابخانە سەری ڕووتە، هەربۆیە پێداگریی دەکردو دەیگوت: نابێت مهری بچێت بۆ قوتابخانە، ئەو دەیگوت لە قوتابخانەیەکدا کە پیاوان وانەی تێدا دەڵێنەوە، چۆن دەبێت کچان بەبێ عەبابن؟ ئەوکاتە دایەگەورەی مهری (شەهربانوو) تەمەنی (٨٨) ساڵبوو. شەهربانوو دەیگوت: کچانیش وەک کوڕەکان دەبێت بچنە قوتانخانەو بخوێنن، کچان لە کوڕان زیاتر پێویستیان بە خوێندن هەیە.

## شەهربانوو

شەهربانوو زوربەی کات لەسەری کۆلانەکە دادەنیشت، ئەو پیرەژنێکی کەمێک بالابەرز بوو، لەکۆتایی تەمەنیدا کەمێک پشتی چەمابووەوە، دەموچاویشی کەمێک چرچ و لۆچی تێکەوتبوو، تەمەنی (٨٨) ساڵ بوو، بەلام بە کەسێکی تەمەن (٦٥-٧٠) ساڵ دەردەکەوت، گۆناکانی سوور بوون. دایکم دەیگوت: شەهربانوو هەمیشە سوراو و سپیاوی دەکرد. کەسێکی پاکوخاوێن بوو، کراسی گوڵداری بە ڕەنگی سور و پرتەقاڵی لەبەردەکرد. زۆربەی کات بەبێ چارشێو لەسەری کۆلاندا دادەنیشت، هیچ شەرمی نەدەکرد. هەمیشە کلاوی ڕازاوەی ژنانی لەسەر دەکرد، بەلام ژێر گەردنی نەدەبەست. هەمیشە کلاشی ژنانەی گوڵداری لەپێ دەکرد، دەیانگوت: کلاشەکەش هەر خۆی دەیچنێت. قۆڵەکانی باریک و درێژبوون، ڕەنگ و ڕوویەکی نورانیی هەبوو. شەهربانوو بەهۆی وریایی و قسەزانییەوە لەگەڵ خەڵکانی تر جیاواز بوو. ئەو تەنها ژنی گەڕەک بوو کە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، خۆ ئەگەر ژنانی تریش ڕۆژنامەیان خوێندبێتەوە من نازانم. هەموو ڕۆژێکی عەسر ڕۆژنامەیەکی دەهێناو لەسەری کۆلانەکە دادەنیشت و دەیخوێندەوە. عەینەکیشی لەچاو نەدەکرد، هەتا مردیش عەینەکی بەکار نەهێنا. شەهربانوو بە کچانی گەڕەکی دەگوت: بەقسەی دایک و باوکتان مەکەن، چۆن حەزدەکەن ئەوها بۆخۆتان بژین. پێشی دەگوتن برۆن بۆ قوتابخانەو وانە بخوێنن. ئەگەر شەهربانوو بیزانیایە برایەک لە خوشکەکەی داوە، یا شەڕی پێفرۆشتووە، ئەوا بانگی دەکردو ئامۆژگاری دەکرد، پێیدەگوتن: ئێوەی پیاوان بەکەڵکی هیچ شتێک نایەن، ئێوە کەسانی گەلۆرو نەزانن، تەنها ئەوەندە دەزانن لە ژنان بدەن و بیانچەوسێننەوە.

شەهربانوو هەمیشە لەگەڵ ڕوقیەخانمی بووکیدا ناکۆک بوو، ڕوقیە بەردەوام شەڕی بە شەهربانوو دەفرۆشت. شەهربانووش دەیگوت: پیاوان دوژمنی ئێمەی ژنانن، کەچی ئێمەی ژنان هەمیشە بەڕووی یەکدا وەستاوین و بەیەکەوە لەشەڕداین، بۆچی مافەکانی خۆمان لەدەست بدەین، بۆچی ئێمە قسەی پیاوان قبوڵ بکەین، بۆچی ئەو یاسایە قبوڵ بکەین کە پیاوان دایانڕشتووە لە دژی ئێمە. شەهربانوو بە ڕوقیە خانمی دەگوت: تۆ مافی کچەکانت پێشێل کردووە، تۆ مۆڵەتیان پێنادەیت ئەوان بچن بۆ قوتابخانە. بیری لێ بکەرەوە ئێستا ساڵی (٢٠١٥/١٣٩٤ ) وەرگرتنی کچان لە زانکۆکاندا زیاترە لە کوڕان، بەلام ئێمەی پیاوان بەشی کچان لە زانکۆ کەمدەکەینەوە، ئێمەی پیاوان

دەترسین لەوەی ڕێژەی ژنانی خوێندەوار زیاد بکات، دەترسین حکومەت و هێز بکەوێتە دەست ژنان. ژنان نیشانی جیهانیان داوە ئەوان لە ئێمەی پیاوان زیاتر دەتوانن وڵات بەڕێوەبەرن. پیاوان لە ژنان دەترسن، ئەوان لە هەموو بوارەکانی زانست و زانیاری، هونەر و سیاسەتدا ژنان بە خەنیمی خۆیان دەزانن. لە هەر شوێنێک ژنان بەڕاستی بچنە ناو ئەو کارانەوە، پیاوان پاشەکشە دەکەن. ڕوقیە خانم دەیگوت: کچان نابێت بچنە قوتابخانەیەک کە مامۆستای پیاو وانەی تیا بڵێتەوە. ئەوسەردەمە مامۆستای ژن زۆر کەم هەبوو. باوکی مهری دەیگوت: مامۆستا وەکو باوکە بۆ قوتابییەکانی، مامۆستا داوێنپاکن، هەروەها دەیگوت: من چووم بۆلای مەلای مزگەوت و پرسیاری چوونی کچان بۆ قوتابخانەم لێکردووە، مەلای مزگەوت فەرموویەتی: من پرسیارم کردووە. کچەکان لە بەرچاوی مامۆستا پیاوەکاندا پەچەیان پێوەیە، هەروەها مامۆستاکان وەکو فریشتە وان. ڕوقیە خانم بە هاوسەرەکەی دەگوت: ئەی بۆچی من نەمبیستووە مەلای مزگەوت ئەو قسانەی کردبێت، ئەگەر وا دەڵێت، بۆچی کچەکانی خۆی نانێرێت بۆ قوتابخانە؟ تۆ هەر لەخۆتەوە قسە دەکەیت، بۆیە تاوانەکەی لە ئەستۆی تۆدایە. باوکی مهریش دەیگوت: تاوانی نەخوێندەواریی سەد ئەوەندە لە تاوانی بێپەچەیی زیاترە.

ڕوقیە خانم بە هاوسەرەکەی دەگوت: تۆ کچەکانت داوەتە دەست مامۆستای پیاو، دەبێت هەرخۆت وەڵامی خودا بدەیتەوە. شەهربانووش هاواریدەکردو دەیگوت: وەڵامی تاوانەکانی ئێوەو هەموو خەڵکانی تر لەو دنیای تردا من دەیدەمەوە، مەگەر ئێمە چیمان کردووە! خودا دەبێت خۆی وەڵامی تاوانی دروستکردنی ئێمە بداتەوە. شەهربانوو هەمیشە دەیگوت: خودا زانیویەتی ئەم جیهانەو گۆی زەوییە هێمن و بێکێشەیە، هەرخۆی بیری کردەوە کە پێویستە بوونەوەرێک دروست بکات تاکو تاوان بکەن و سەرکێشی بکەن و بۆڵەبۆڵ بکەن و پرسیاربکەن و قسەبکەن. بوونەوەرێک کە داوای شتێک لە ئەو بکات و لێی بپاڕێتەوە. بوونەوەرێک کە بزانێت کەی هاتۆتە دنیاوە، بوونەوەرێک بزانێت دایک و باوک و نەژادی کێیە؟ لە هەمووی گرنگتر بزانێت کە ڕۆژێک دێت دەبێت بمرێت، لەدوای مردنیش کۆشک و تەلارو پەری و باغ و گوڵ و ڕیحان و شیرو هەنگوینی لە خودا بوێت. شەهربانوو دەیگوت: خودا سەرگەرمییەکی باشی بۆخۆی دروستکردووە. خودا کاتێک ئادەمی دروستکرد، هەموو حسابێکی بۆ خۆی کردبوو، سەرەتا دوژمنی بۆ ئادەم دروستکرد بەناوی شەیتان، شوێن و تاوان و چاکەی بۆ دروستکرد. خودا

بەبێ ئادەم بێکار بوو، لە بێکاریی خۆیداماندوو ببوو. هەموو دروستکراوەکانی خودا وەکو مەکینە وان، کاتێک یەکێکیان کەوتە کار، ئەوانی تریش دەسوڕێن، ئادەم چەرخی مەکینەکەیە. خودا ئادەمی دروستکرد جیهان بگۆڕێت. شەهربانوو دەیگوت: مرۆڤ تاکە ئاژەڵە کە دەزانێت دەمرێت. دەیگوت: مرۆڤ ئەگەر تاوان نەکات وەکو مانگا وایە، ئەوکاتە نیازی خودا ئەنجام دەدرێت.

لەو کۆڵانە کپ و بێدەنگ و تاریکانەدا هەموو شتێک هەر ئەوەبوو کە پێنجسەد ساڵ لەوەوپێش هەبوو. ئەوکاتەو لەو بارە ناهەموارەدا پیرەژنێکی تەمەن (٨٥-٩٠) ساڵ بەجۆرێک قسەی دەکرد، کە ئاستی تێگەیشتنی زیاتر بوو لە ئاستی تێگەیشتنی خەڵکی کۆڵان و گەڕەکی ئێمە. خەڵکی گەڕەکی ئێمە نەک تەنها ڕێزیان لە شەهربانوو نەدەگرت، بەڵکو پێشیان دەگوت کافر، هەر بەڕاست شەهربانوو بە قسەو کردەوەکانی دوژمنایەتی بۆ خۆی دروستدەکرد. من لە سەردەمی منداڵیمدا چەندینجار بیستوومە کە ئاغا ڕەجەب قسەی خراپی بەدەم شەهربانووەوە دەکرد. ئاغا ڕەجەب دەلاڵ بوو، ژنان لە ماڵەوە پارچەیان دەچنی و ئاغا ڕەجەبیش پارچەکانی لێوەردەگرتن و دەیبردن بۆ بازاڕ، پارچەکانی دەفرۆشت و کرێی خۆی لێهەڵدەگرت و پارەکەی تری دەدایەوە بە ژنەکان.

لە مانگی ئەسفەندی (١٣٩٢/ کانوونی دووەم ٢٠١٣) لە دایکم پرسی بۆچی ئاغا ڕەجەب بە خراپی باسی شەهربانووی دەکرد؟ دایکم گوتی: شەهربانوو تا ئەوکاتەی کە تواناى هەبوو، چەند دەزگایەکی پارچە چنین و جاجم چنینی هەبوو، (١٠-١٢) کرێکاریشی هەبوو. شەهربانوو ئەوکاتە مووچەی زیاتری دەدا بە کرێکارەکانی، هەمیشە لە ڕۆژانەکەی خۆیان (٢-٥) ڕیاڵ زیادەی پێدەدان، چونکە ئەو بۆخۆی پارچەکانی دەبرد بۆ بازاڕ دەیفرۆشتن. دایکم دەیگوت: باوکت تازە مردبوو کۆتایی ساڵی (١٣٣٤-١٩٥٥) بوو، من هیچ پارەیەکم نەبوو، پارچەم دەچنی تۆپە پارچەکانم دەدا بە ئاغا ڕەجەب کە بۆمی بفرۆشێت. ڕۆژێک شەهربانوو گوتی: خەدیجە بۆچی پارچە چنراوەکانت دەدەیت بە ئاغا ڕەجەب؟خۆت ببیە بۆ بازاڕ بیفرۆشە. شەهربانوو لەگەڵ دایکمدا ڕۆیشتبوون بۆ بازاڕو بۆ لای بازرگان. بڕیاریان دابوو پارچەکان بە ئاغای (قەدکچیان) بفرۆشن. پێشتر دایکم بۆ هەر تۆپێکی بیست مەتری (٣٠) ڕیاڵی وەرگرتبوو، بەڵام کاتێک پارچەکەی بردبوو بۆ بازرگانەکە نزیکەی (٥٥) ڕیاڵی وەرگرتبوو. دایکم زۆر سوپاسی شەهربانووی کردبوو، دەیگوت: ئەو ژیانی منی گۆڕی. ئاغا ڕەجەب و

هاوشێوەکانی گوتبوویان تەنها ئەو ژنانە بەڕەڵڵاو سەر بەدەرەوەن کە دەچن بۆ بازاڕ. شەهربانوو هاواری لێهەڵسابوو گوتبووی: بەڵێ من سەر بەدەرەوەم، خۆم پارچە دەچنم و خۆم دەیبەم بۆ بازاڕو دەیفرۆشم و قازانجەکەشی بۆ خۆم هەڵدەگرم، ئامادە نیم نیوەی پارەی ماندووبوونی من بچێتە گیرفانی هاوکارەکانتەوە. شەهربانوو بە ژنانی گەڕەکی گوتبوو: ژنێک نەڕوات بۆ بازاڕو بۆخۆی پارچەکانی خۆی نەفرۆشێت، ئەوە هەر مرۆڤ نییە. باشە دیارە ژنێک بییەوێت عەقڵی ئەوان گەشە بکات و پارەی زیادیان دەستبکەوێت، کافر دەبێت. هەموو ئەو کەسانەی ئەوها بیردەکەنەوە، کەوتوونەتە بەر گێژەڵوکەی کافربوونەوە. تاوانێک لەوە گەورەتر کە بتەوێت خەڵکی تێبگەیەنیت، تاوان لەوە گەورەتر، کە بتەوێت داهاتی دەلاڵەکان کەم بکەیتەوە، تاوانێک لەوە گەورەتر، کە بتەوێت داهاتی چینی کرێکاران و هەژاران زیاد بکەیت.

لە نەورۆزی ساڵی (٢٠١٤/١٣٩٣) چووم بۆ سەردانی حاجی عەبدوڵڵای ئاتەشکار هاوسەری نەوەی شەهربانوو. ئەو تەمەنی (٩٢) ساڵ بوو، بەیەکەوە لەبارەی شەهربانوو قسەمان کرد. لەسەر قسەی ئەو دەڵێم. شەهربانوو لەو باوەڕەدا بوو تاکو ژنان نەچنە قوتابخانە، واتە نەخوێنن و نەڕۆن بۆ بازاڕ، وڵات پێش ناکەوێت. شەهربانوو دەیگوت: ژنانی یەهودی دەگەڕێن و بەقاڵی دەکەن و شت دەفرۆشن، ژنانی موسڵمانیش لە ماڵەوە نۆکەری دەلاڵەکان دەکەن. پێویستە ژنان خۆیان بڕۆن بۆ بازاڕ تاکو ماڵیان ئاوەدان بێت. شەهربانوو مەبەستی ئەوە بوو کە ژنان بۆ بازرگانی و کارو کاسبی بچن بۆ بازاڕ، تاکو داهاتێکیان دەستبکەوێت، نەک تەنها بۆئەوەی بۆ شت کڕین بچن. دیارە دەلاڵەکان بۆ ئەمجۆرە ژنانە قسە هەڵدەبەستن. زۆر جار خەڵکی لە شەهربانوو دەترسان. ژنێک کە بە کچە لاوەکانی دەگوت: مۆڵەت نەدەن براکانتان دەستوەربدەنە کارەکانتانەوە، بە کچەکانی دەگوت: شوو بە کەسێک بکەن کە خۆشتاندەوێت، شوو بە پیاوێک مەکەن کە خۆشتان ناوێت. ئەو هەموو پێکهاتەو ڕێساو داب و دەستوورو کۆڵان و گەڕەک و وڵاتی بەسەریەکدا دەدا. خۆزگە من ئەوکاتە لە مانای قسەکانی شەهربانوو تێدەگەیشتم و کەمێک زیاتر قسەم لەگەڵ بکردایە. ڕوقیە خانمی بووکی هەمیشە لەبارەی خێرو تاوانەوە قسەی لەگەڵدا دەکرد، هەموو کارەکانی ئەوی بە گوناە لەقەڵەم دەدا. شەهربانووش بە بووکەکەی دەگوت: ئەم باسی تاوانکردنە کێ خستییە مێشکی تۆوە، هەرکەسێک بووە نەفرەتی خودای لێبێت. ڕوقیە خانم هاواری دەکردو

دەیگوت: تۆ بوختان بە باوکم دەکەیت. شەهربانوو بە ڕوقیە خانمی دەگوت: ژیانت لە منداڵەکانت تاریک کردووە، لەترسی قسەکانی تۆ بوو ئەو سێ کچە نەچوون بۆ قوتابخانە، نەفرەتی خودا لە تۆ و لەو کەسەی ئەو چیرۆکی گوناهکردنەی خستە مێشکی تووە. نەفرەتی خودا لە منیش بێت کە کەسێکی نەخوێندەواری وەکو تۆم بۆ کوڕەکەم هێنا، کاتێک هاتم بۆ داواکردنی تۆ شێخ حەسەنی باوکت گوتی: کچەکەم هەرگیز تاوانی نەکردووە. منیش بە باوکتم گوت: کچێک کە هەرگیز تاوانی نەکردووە، تەنها بەکەڵکی ئەوە دێت بیکەینە دیوارەوە. ئەوان وایاندەزانی من بەشۆخییەوە قسەدەکەم، تێر پێکەنین، بەڵام ئەوە بیروباوەڕی منە. کەسێک کە ئەوەندە ئازایەتی نەبێت گوناهێک ئەنجام بدات، ئەوە هەر مرۆڤ نییە، بەڵکو کەرو گایە. هیچ کەرو گایەک لە تەمەنیان تاوان ئەنجام نادەن. مرۆڤ بە گوناه و تۆبەوە مرۆڤە. مرۆڤ ئەگەر گوناهی نەکردایە ئێستا لەناو بەهەشتدا دەسوڕایەوە. مرۆڤ ئەگەر گوناه و تۆبە نەکات، نرخی بەقەدەر درەختێکە.

ڕوقیە خانمی دایکی مهری هەمیشە لەگەڵ محەمەد عەلی هاوسەریدا لەسەر ڕۆیشتنی کچەکەی بۆ قوتابخانە، بەردەوام لەشەڕدا بوون. ڕوقیە خانم بە هاوسەرەکەی دەگوت: تۆ جێگەت دۆزەخە. محەمەد عەلیش دەیگوت: من ئێستا لە دۆزەخدام، لە بەیانی تا ئێوارە بەدیار کورەی ئاگرەوەم و شەوانەش تا بەیانی بەدیار تووەم، ئەمەش مانای وایە لە دۆزەخدام. دۆزەخ واتە کاری ناتەندروست و کەمداهات کە پەیوەندی بە ئاگرەوە بێت، لە ماڵەوەش ژنەکەت نەهێڵێت منداڵەکانت ببێتە کچێکی تەواو. ژنەکەش دەیگوت: من نامەوێت تۆ بچیتە دۆزەخ. محەمەد عەلی دەیگوت: بەندەی خودا من سەد جار لەخەودا بینیومە کە لە بەهەشتدام. بەهەشتی خودا هیچ نەبوو، جگە لە بیابانێکی وشک و گەرم، کە تاکە درەختێکی تێدابوو، ئەو درەختەش تۆ بوویت. محەمەد عەلی بە هاوسەرەکەی دەگوت: ئێستا تێگەیشتی لە ڕوانگەی منەوە بەهەشتی خودا چۆن جێگایەکە؟ یەک بیابانی وشکی گەرمە. یەک درەختی وشکبووی بێکەڵک لە شێوەی تۆ. ڕوقیە خانم هەمیشە لە گوناهکردن دەترسا. دایکانی تریشی ئامۆژگاری دەکرد کە کچەکانیان نەنێرنە قوتابخانە.

لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥٠) کۆبوونەوەی ژنانی مەزهەبی ئەوەندەی ئەمڕۆ نەبوو، زۆرێک لە پیاوان هەروەکو خزم و کەسەکانی من دە ڕۆژی سەرەتای محەرەم دەچوونە مزگەوت. لە مانگی ڕەمەزاندا ڕۆژانە بەڕۆژوو دەبوون و شەو تا بەیانیش نوێژیان

دەکردو نزایان دەخوێند. کاتێک ڕەمەزان تەواو دەبوو خۆیان بە ڕۆژووەکانیانەوە هەڵدەکێشا. خۆ ئەگەر ئەو ڕۆژووگرتنەیان بۆ ڕیایی نەبێت، دنیا بەجۆرێکیتر دەبوو. ئەگەر ئەوە بۆ ڕیایی نەبێت زۆرێک لەو شارانەی کە بە خانەی ئیمانداران و خانەی تێکۆشەران ناسراون، ناوێکی تریان لێدەنرا، وەکو خانەی ڕیایی و خانەی تاوان. لەوەیە بۆ پاراستنی کردەوەکانیان و پاراستنی دابی کۆمەڵایەتی ڕیایی شتێکی باش بێت. ئێستا کە بەتەواوی گرفتاری ڕیایی و تەزویر بووینەوە. من ئێستا ڕۆژێک نییە تووشی ڕیایی و تەزویر نەبم، لەماڵەوە لەگەڵ خۆمدا، لە زانکۆ بەجۆرێک و لە کۆمەڵگاشدا بەجۆرێکیتر. من سەد ڕەنگم، ئاخر کۆمەڵگای ئێمە ئەوەی دەوێت، خوا ئاکاممان بەخێر بگێڕێت. یەکێک لە بەڵگە سەرەکییەکانی پێشنەکەوتنی هەروڵاتێک، ڕیاییە.

لەدوای مانگی ڕەمەزان مزگەوتی گەڕەکی ئێمە چۆڵ دەبوو، تەنها (١٥-٢٠) کەس ئامادەی نوێژکردن دەبوون، لە هەر دە پیاوێک لە گەڕەکی ئێمەدا یەکێک دەچوو بۆ مزگەوت، بەڵام بەگشتی لە (١٠)ی محەرەمدا هەمووان دەچوون بۆ سنگکوتان و لەخۆدان. لەو بارەدا ڕوقیە خانم مانگی یەک جار لە ماڵەکەی خۆیدا مەراسیمی نزا خوێندنی ڕێکدەخست، هەندێکجار هەفتانەش ئەو مەراسیمەی ڕێکدەخست، هەموو جارێک یەک دوو ئاخوندی دەهێنا بۆ قورئانخوێندن.

ڕوقیە لە کۆڵاندا بیری کچانی دەهێنایەوە کە نابێت سەریان ڕووت بێت و قژیان بەدەرەوە بێت، هەربۆیە ئەو ببوو بە ئیماندارێکی کۆڵان. کچ و زاواکانیشی لەترسی ئەو دەبوو کێشە شەرعییەکانیان لەبەرچاو بگرتایە. ئەو بە کوڕانی دراوسێی دەگوت: بۆچی ڕیشتان دەتاشن. ئەگەر کوڕێکی نامۆ لە کۆڵاندا دەرکەوتایە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردو پێیدەگوت: تۆ چی دەکەیت لێرە؟ لە کوڕان و کچانی دەدا نەبادا سەیری یەکتری بکەن، هەمیشە سەری لەسەر سەری ئەو ژنانە بوو کە پیاوەکانیان بۆ کارکردن ڕۆیشتبوون بۆ بۆمبای و کوێت، کە عەباو پەچە بکەن و خۆیان داپۆشن. ئیتر ئەوەبوو لەو گەڕەک و کۆڵانەی ئێمەدا خۆی بەسەر خەڵکیدا سەپاندبوو. تەنها کەسێک بە ڕوویدا دەوەستایەوە دایکی هاوسەرەکەی بوو، بەڵام هەمان ڕوقیە تەپڵ و دەفیشی لێدەدا. لەو سەردەمەدا لە هیچ ماڵێکی یەزد دا تەپڵ و دەف نەبوو. خۆ لەوەیە ئەو دەنگەی لە ماڵەکاندا دەچووە دەرەوە، دەنگی ئەو تەپڵ و دەفە بوو بێت. پیاوان لایەنگری مۆسیقاو گۆرانی و هەڵپەڕکێ نەبوون، بەڵام ژنەکان ڕۆژ نەبوو ئەو جوڵەیان نەبێت. لە کۆمەڵگەیەکدا

کە ژنان هیچ دەرفەتێکی وەرزش و خۆشگوزەرانییان نەبێت، هەڵپەڕکێ دەبێتە جۆرێک لە وەرزشی لاشەو ڕوحی.

لە هەموو شاری یەزد دا تەنها پیاوانی چەند بنەماڵەیەک لایەنگری مۆسیقا بوون، لەسەروو هەموویانەوە بنەماڵەی ڕوحبەخش. حوسێن و ڕەزای ڕوحبەخش و باوکیان، بەهەموو مانا ڕوحبەخش بوون. یەکەمینجار کە وانەی مۆسیقامان هەبوو، لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم، مامۆستایەکمان هەبوو بە ناوی ئاغای حوسێنی، ئەو مامۆستای کەمانچە بوو، کاتێک کەمانچەکەی لە جانتاکەی دەرکرد، ئێمە هەموو سەرمان سوڕما، بۆ یەکەمینجار بوو کەمانچەم بینی. وانەی مۆسیقامان لە چەند وانەیەک زیاتر نەبوو، چونکە خوێندکارەکان هەواڵی وانەی مۆسیقایان بە ماڵەوە گەیاندبوو. بەشێک لە باوکەکان وانەی مۆسیقایان لەلای ئاغا شێخ عەلی کوڕی ئایەتوڵڵا شێخ غولام ڕەزا خۆراسانی باسکردبوو، ئەویش گوتبووی: مۆسیقاو ئالەتی مۆسیقا حەرامە. ئیتر وانەی مۆسیقا لە قوتابخانەکەماندا نەما. مامۆستای قورئانمان خوالێخۆشبوو ئاغا سەید جەوادی جەلیلی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو. یەکێک لە خوێندکارەکان وابزانم فەرهادی وەتەن خوا بوو، لە مامۆستای پرسی، بۆچی ماوەیەکە مامۆستای مۆسیقا نایەت بۆ قوتابخانە. ئەو مامۆستا بەڕێزە کە زۆر قینی لە مامۆستای مۆسیقا بوو، گوتی: ئێستا بە دەرپێ کوڵەکانتان مۆسیقا لێبدەن، تا ببینم وەڵامی ئاغا شێخ عەلی چییە بۆ ئێوە. ئیتر ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە من هەرکاتێک کەمانچە دەبینم بەبێ ویستی خۆم دەرپێ کوڵەم وەبیردەکەوێتەوە.

## شووکردنی مهری

بەپێی قسەی خەڵکانی ئەو سەردەمەو ئەم سەردەمە بێت، کچێک نەچێتە قوتابخانە، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا دەبێتە قەیرە کچ، بەڵام کچێک خوێندەوار بێت و بەتایبەت دەوڵەمەندیش بێت، لە تەمەنی (٤٥) ساڵیشدا هێشتا خونچەیەو داواکاری هەیە. دیارە زۆربوونی خوازبێنیکەرانیش پەیوەندی بە باری ئابووری باوکی کچ و کارو داهات و جوانیی کچەوە هەیە. لەدوای ئەمانەش ئینجا شوێن و پێگەو کەلتووری بنەماڵەکە. جوان سەیرکە واتای کەلتوور بنچینەی ژیانە، کەچی لەدوای هەموانەوە حسابی بۆ دەکرێت. هەر بۆیە دەبێت چاوەڕوانی کێشەو ناکۆکی و لێکجیابوونەوە بکەین. ئەمڕۆ خەڵکی خۆشگوزەرانییان هەیە، بەڵام ئاسودە نین. خەڵکی جیاوازی وشەکانی

ئاسودەیی و ئاسایش و ئارامی دەزانن، بەڵام ئایا کاری پێدەکەن. باشترین خانوو باشترین ئۆتۆمبێل و هەموو پێداویستییەکانی ژیانیان هەیەو خۆشترین گەشت دەکەن. کەچی باسی شەڕو کێشەو لێکجیابوونەوە دەکەن. هاوڕێیەکم دەیگوت: لەم سەردەمەدا دەتوانیت هەموو شتێک بەپارە بکڕیت. منیش پێمگوت: هەرکەسێک هەرشتێکی بوێت و بتوانێت بەپارە بیکڕێت، دەبێت هەموو شتێک بە پارە بفرۆشرێت. ئاخر چۆن دەکرێت لەشساغی و بەختەوەریی و خۆشبەختی و ئارامیی بە پارە بکڕدرێت؟ سەرێک لە دادگاکان بدەن و ببینن چەندین هاوسەری ملیاردێر سەگەردان و چاوەڕوانن قازی بڕیاری جیابوونەوەیان بۆ دەربکات.

دایکی مهری لە بنەماڵەیەکی دواکەوتوو بوو، بنەماڵەیەکی نەگۆڕو بێبەهرە. باوکی مەراسیمگێڕێکی سادە بوو، لە دەیەی (١٩٥٠/١٣٣٠) لە تەمەنی (٨٠) ساڵیدا کۆچی دواییکرد. ڕوقیە لەو ماڵە قەڵائاسایەدا زیندانیکرابوو، ئەو زیندانی نەریتی کۆنی بنەماڵەکەی خۆی بوو، زیندانی مێژوو بوو، هەروەکو زۆربەی کەس و خزمەکانی خۆی هەمیشە سەیری ڕابردووی دەکرد. هەموو ئومێدی ژیانی لەسەر ڕابردوو هەڵچنیبوو. نیگەران مەبن کە دەڵێم زۆرێک لە ڕۆسنبیرانمان هەمان تێڕوانینیان هەیە و دەیانەوێت بە نیگای مێژوویی بۆ لاوانی سەردەمی تەکنۆلۆژیاو دیجیتاڵ بنووسن. هەندێک لەو ڕۆشنبیرانە زۆریش بەناوبانگن، ئەوان کەسانی ڕاستگۆ و ئازاو قسەزان بوون، من خۆم مەیلێکم هەیە بۆ هەندێک لەو کەسانە.

باوکی مهریش کەسێک بوو لەسەر بیروباوەڕی کۆن بوو، بەڵام بیروباوەڕێکی هەبوو لەگەڵ نوێخوازییدا دەگونجاو هەمیشە چاوی لە دوارۆژ بوو. محەمەد عەلی لە دەوروبەری ساڵی (١٩٧٤/١٣٥٣) پێیگوتم: ئێمە زەحمەتێکی زۆرمان کێشاوە، هەمیشە لەسەر هەموو شتێک گفتوگۆیەکی زۆرمان دەکرد. گوتم: مەبەستت چییە؟ گوتی: بۆ نموونە من لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێکانم دوو ساڵی تەواو لەگەڵ وەستای کارەکەماندا لە گفتوگۆدا بووین لەسەر گۆڕینی ئەو قاڵبی کەللە شەکرانەی کە دروستمان دەکردن. لەبەرئەوەی قاڵبە کۆنەکان کێشەیان هەبوو. قاڵبی تازە پەیدا ببوو، بەڵام وەستاو هاوکارەکانم ئامادە نەبوون بە گۆڕینی قاڵبە کۆنەکان. هاوکارەکانم دژی بچووکترین گۆڕانکاریی بوون، پاشان من و هاوڕێکەم هەشتا قاڵبی زیادەمان دروستکرد. هەمووان لە چاوەڕوانی جیاوازییەکەدا بوون. جیاوازی لە خێرایی و کارو جوانی و پتەویی کەللە

شەکرەکان، بەڵام هێشتا چەند مانگێکی تری پێچوو تاکو کارکردنی بە قاڵبە تازەکەیان قبووڵ کرد. ئیتر ئەوە بوو محەمەد عەلی بۆخۆی کەسێکی داهێنەر بوو، جگە لەوە ئەو یەکەمین کەسی کۆڵانی ئێمە بوو کە ڕادیۆی کڕیبوو، خۆ دیارە دەیانگوت بە بڕیاری دایکی (شەهربانوو) ڕادیۆی کڕیوە. ئەو قبوڵیکردبوو کە شەپۆل و دەنگ، بەبێ مۆڵەتی ئەو بچێتە ماڵەکەیەوە، ئەو قبوڵیکردبوو دەزگایەک بکڕێت کە قسە دەکات، قسەی پیاوان و ژنانی نامۆو نەناسراو ببیستن. ئەو بابەتە لەو سەردەمەدا زۆر گرنگ بوو. ڕادیۆ بۆچی دەبێت حەرامبێت؟ لەو سەردەمەدا بەشێوەیەکی گشتی وا بڵاوببووەوە ئەگەر ژنان دەنگی پیاوانی نامۆ ببیستن، ئەوە تاوانێکی گەورەیە. ئێستا ئەگەر ئەو دەنگە مێشکیان ڕووناک بکاتەوەو گۆڕانکارییەک لە مێشکیاندا دروست ببێت، ئەوە تاوانێکی گەورەیە. ئەگەر ئەو دەنگە نامۆیە بنەمای فکرو بیرو دابونەریتی چەند هەزار ساڵە بگۆڕێت، ئەوا زۆر حەرامە. ڕادیۆ دەیویست کەلتووری کۆنی گەڕەک و کۆڵانەکان بگۆڕێت بە کەلتوورێکی نوێ و جیهانی. کەلتوورێک کە لەباری دەرکەوتنا بوو، لەباری ئاشکرابووندا بوو. ڕادیۆ دووەم هەنگاوی بەجیهانیبوون بوو. داهێنانەکەی (گۆتەم بەرگ)و کتێب و ڕۆژنامەش یەکەم هەنگاوی بەجیهانیبوون بوو. لانیکەم دە ساڵ شەهربانو و بووکەکەی لەسەر گوێگرتن لە ڕادیۆ لە جەنگ و هەرادا بوون. کاتێک محەمەد عەلی ڕادیۆکەی هێنابووەوە بۆ ماڵەوە، ژنەکەی ویستبووی فڕێی بداتە ناو حەوزی ئاوەکەوە. شەهربانوو لەترسی شکانی ڕادیۆکە ئەو ڕادیۆ گەورەیەی لەژێر کراسەکەیدا شاردبووەوە. محەمەد عەلی لەسەر بڕیاری شەهربانووی دایکی ئەو ڕادوێیەی کڕیبوو. دوایی ڕوقیە خانم گوتبووی ئەم دەزگا فەسادە ببەنە ژووری ئەو کافرەوە، با من چاوم پێی نەکەوێت. هەر بۆیە محەمەد عەلی بە ناچاری ڕادیۆکەی بردبووە ژوورەکەی دایکی. منداڵەکانیشیان هەرکاتێک بیانویستایە گوێ لەدەنگی ڕادیۆ بگرن، بەدزی دایکیانەوە دەچوونە ژووری دایەگەورەیانەوە.

چەند ساڵێک ڕوقیە گوێی لە ڕادیۆ نەگرت، پاشان تەلەفزیۆنیشی بە حەرام دەزانی. خۆ ئێستاش لە ڕوانگەی هەندێک کەسەوە سەیرکردنی تەلەفزیۆن حەرامە. ئەو دەزگایە نەک تەنها دەنگەکەی دەچێتە ناو ماڵانەوە، بەڵکو کەسەکە خۆیشی نیشاندەدرێت. کەسانی نامۆ و نەناسراو کە بەبێ مۆڵەت لە دیوارە بەرزەکانەوە دەچنە ناو ماڵان. ئەم شەپۆلە خۆی لەخۆیدا تاوانەو تاوانهێنەریشە. تەکنۆلۆژیای شەپۆلەکانی جیهانی

نوێ لە بەرامبەر چاوی ئەو خەڵکە قەڵانشینەدا نمایش دەکرێت. کەلتوورێک لەکاتی دەرکەوتندا بوو، کەلتوورێکی زاڵ و باڵادەست کە لە ململانێدا بوو لەلایەکەوە لەگەڵ ئەوانەی کە دەنگ و بیرو فکری نامۆ دەنێرنەماڵەکانەوەو لەنێوان ئەوانەدا کە دانایی بەهۆی شەپۆلەکانەوە پێشکەش بە ماڵەکان دەکەن. لەلایەکی ترەوە لەنێوان ئەوانەی کە دەیانویست خەڵکی وەک پێش هەزاران ساڵ لە ماڵەوە زیندانی بکەن، زۆربەیان حەزیاندەکرد تەنها دەنگی کەسێکی نامۆ کە دێتە گوێیان، دەنگی خۆیان بێت. کە بەڕاستی دەنگەکەی خۆشیان هەستێکی خۆشی پێ دەبەخشین.

خەلیفە محەمەد عەلی هەموو ڕۆژێک بە ڕۆژنامەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئەو زیاتر ڕۆژنامەکانی (تۆفانی یەزد) و (ئیتلاعات)ی دەکڕی. جارجاریش ڕۆژنامەی کۆنی بۆ منداڵە خوێندکارەکان دەهێنا تاکو بیخوێننەوە. دەیانگوت گوایە ئەو ڕۆژنامانە بۆ شەهربانووی دایکی دەکڕێت. شەهربانوو یەکێک بوو لەو چەند ژنە کەمەی گەڕەک کە ڕۆژنامەیان دەخوێندەوە. شەهربانوو هەر خۆشی کوڕەکەی خۆی ڕاسپاردبوو کە ڕادیۆ بکڕێت. هەر هەمان ژن لە گەڕەکدا بە ژنێکی کافر ناسرابوو. مەلای مزگەوت گوتبووی: شورەییە بۆ محەمەد عەلی کە هاتوچۆی مزگەوت ناکات. دیارە لەو سەردەمەداو لە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٠/١٩٦٠) مەلای مزگەوت لەبارەی زۆر کەسەوە قسەی کردبوو، خۆ دیارە هەموو خەڵکی گەڕەک بە ژن و پیاو و منداڵەوە دەچوون بۆ حوسێنییەی گەڕەک. حوسێنییە بازاڕی گەرمتربوو لە مزگەوت. مزگەوتیش گەورەتر و فراوانتربوو. محەمەد عەلی نەدەچوو بۆ حوسێنییەش، خۆ ئەم کارە کارێکی هەڵە بوو، کەسێک لە گەڕەکێکی مەزهەبی نیشتەجێ بێت و نەچێت بۆ حوسێنییە، مانای چییە؟ واتە دەیەوێت دۆسیەیەک بۆ خۆی دروست بکات. خەڵکی دەیانگوت هۆکاری ئەوەی کە محەمەد عەلی و براکەی نایەن بۆ حوسێنییە، تاوانی شەهربانووی کافرە. من بەو منداڵییە دەمویست بزانم خەڵک بۆ بە شەهربانوو دەڵێن کافر، ئێستا ساڵی (٢٠١٣/١٣٩٢) هەلێکم بۆ هەڵکەوت تاکو هۆکاری کافربوونی شەهربانوو لە مهری بپرسم. لەدڵی خۆمدا گوتم: لەوەیە پێیخۆش نەبێت ئەو پرسیارەی لێبکەم. واباشترە پرسیارەکەم هەڵگرم بۆ کۆتایی، بەڵام کاتی گفتوگۆکردن لەگەڵیدا تێگەیشتم کە پێویست ناکات ئەو پرسیارە بکەم. ژنێک کە لە دەیەی (١٣٢٠-١٣٣٠/١٩٤٠-١٩٥٠) ڕۆژنامەی دەخوێندەوەو گوێی لە ڕادیۆ دەگرت. باسی مرۆڤەکان و تاوانی دەکرد، لە هەمووشی

گرنگتر هۆنراوەی مەولەوی دەخوێندەوە، لە ڕوانگەی خەڵکەوە کافرە. دایکی مهری و هەرسێ خوشکەکەی چارشێویان دەپۆشی، بەڵام مهری چارشێوی نەدەپۆشی. ئەو یەکەم کچی گەڕەک بوو کە بەبێ چارشێو دەگەڕا، ئاخر ئەو یەکەم کچە خوێندکاری تەواوی کۆڵان و گەڕەکی ئێمە بوو، ئەو کچێکی نوێخواز بوو.

مهری جوان و باڵابەرز و ڕووخۆش بوو، من هەموو ڕۆژێک ئەوم دەبینی، مانتۆیەکی شینی لەبەردابوو، بەخێرایی بەڕێگادا دەڕۆیشت بۆ قوتابخانە. کاتێک من مهریم بە جلوبەرگی قوتابخانەوە لە کۆڵان دەبینی، نەگەیشتبوومە قۆناغی عاشقبوون، دەنا ئێستا باسی ژیانی خۆم و عاشقبوونی خۆم بۆ ئێوە دەنووسی. ژیانی منداڵیی، ژیانێکی سادەیە، بەڵام گەنجێتیش خەڵاتی خودایە، گەنجێتی سەردەمی بێئاگاییە. هەمووی چێژ و گوناهـ و حەسرەتە. پێویستە ئێمە زیاتر منداڵەکانمان فێربکەین کە چۆن بژین، دیارە ئەگەر قوتابخانەکان ڕێگامان پێبدەن. ئایا وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن بە ئەرکی خۆی هەڵدەستێت؟ من دەڵێم نەخێر، پەروەردەو فێرکردن مەکینەیەکەو مرۆڤ پەروەردە دەکات. کام مرۆڤ؟ پەروەردەو فێرکردن ئیمکانیاتی کەمە، پێویستە بودجەی زیاتری بۆ تەرخان بکرێت. لەو ساڵانەی کۆتایی دەیەی (١٣٣٠/١٩٥٠) تەنها کچانی قوتابخانە بەبێ چارشێو بوون. ژنانی یەزد چارشێوی ڕەشیان نەدەپۆشی. زۆر قینیان لە چارشێوی ڕەش دەبووەوە. لە هەموو شاری یەزد دا هیچ ژنێک چارشێوی ڕەشی بەکار نەدەهێنا، بەڵکو چارشێوی گوڵداریان بەخۆیاندا دەدا. ژنان جوانترین جلوبەرگیان لەبەر دەکرد، بەتایبەت ژنانی زەردەشتی جوانترین جلوبەرگیان لەبەر دەکردن. کاتێک ئەوان خۆیان دەگۆڕی و بەڕێگادا دەڕۆیشتن، وات هەستدەکرد فریشتەیەک بەرەو ڕووت دێت و دەتبات بۆ بەهەشت. لە دەیەی (١٣٤٠/١٩٦٠) کاتێک چەند ژنێکی زەردەشتی لە شەقامەکانی یەزد، یاخود کرمان بەیەکەوە بەڕێگادا دەڕۆیشتن وەک ئەوە وابوو باخچەیەک لە گوڵ لە جوڵەدا بێت. بەڕاستی بۆچی ئێستا هەموو شتێک بووە بە ڕەش؟ مەگەر چارشێوی ژنانی بەندەرەکانی باشوور چ نەنگییەکیان هەیە؟ مەگەر جلوبەرگی گوڵداری درێژی تورکمانەکانی باکوور چ نەنگییەکی هەیە. لەوەیە ئەگەر وازیان لەو جلوبەرگە خۆماڵییە گوڵدارو جوانانەی کە ژنان دادەپۆشن، نەهێنایە، ئەورۆ ئەوەندە نەگونجاندن لە پۆشینی جلوبەرگدا نەدەبوو. نەگونجانێک کە بۆنی دژایەتی نەزمی لێدێت. کاتێک دەمانەوێت جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگەکەی چەند هەزار ساڵەی خەڵکی بکەین

بە ڕەش، ئەو کاتە ئەوان لە شەقامەکاندا بە نیوەڕووتی دەگەڕێن. ئەو مانتۆ تەنگ و جەسپاوییەی کە من لە شارەکانی ئێران دەیبینم لە هیچ شارێکی ئەوروپادا نەمبینیوە. ئەم مانتۆیانە هێمای دژایەتیکردنە بە کەلتوورێک کە ئێمە دەمانەوێت باڵادەست بێت.

مهری جلوبەرگی قوتابخانەی دەپۆشی و ڕووسەرێکی گوڵداری جوانی لەسەری دەبەست. خوشکە گەورەکەی هەروەکو باوکی بیری دەکردەوە. مهری ئەوی تامەزرۆی خوێندن کردبوو، فێری خوێندن و نووسینی کردبوو. دەیانگوت: زینەت بەهاوکاری مهری و دایەگەورەی دەیتوانی ڕۆژنامەو هۆنراوە بەباشی بخوێنێتەوە. باشبوو خوشکە نەخوێندەوارەکانی مهری بەهاوکاری دایەگەورەیان چەندین هۆنراوەیان لەبەرکردبوو. دیارە ژنانی کۆڵان کاتێک دەیانگوت زینەت ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە، مەبەستیان ئەوە نەبووە ئەو کارێکی باش دەکات، بەڵکو لە ڕوانگەی ئەوانەوە خوێندنەوەی ڕۆژنامە نەگبەتییەکی گەورە بوو. هەر بەڕاستی لە ڕوانگەی ئەوانەوە بەهۆی خوێندنەوەی ڕۆژنامەوە شەهربانوو کافر بووە. واتە لە ڕوانگەی ئەو خەڵکەوە داناییبوون و هۆشیاربوونەوە یەکسانبوو بە کافربوون. خوشکەکانی مهری ناویان زینەت و ئەعزەم و ئەکرەمە بوو. محەمەد عەلی کچە گەورەکەی ناونابوو زینەت، بەڵام ڕوقیە خانم بە زەهرا بانگی دەکرد. هەموو خەڵک بە زینەت بانگیان دەکرد، تەنها دایکی نەبێت. زینەت شوویکردبوو، سێ منداڵێکیشی هەبوو، سەفوراو ئەکبەر و گوڵی. ماڵی زینەت بەرامبەر ماڵی باوکی بوو. پانیی کۆڵانەکەیان تەنها ( ١،٥) مەتر بوو، کۆڵانێکی باریکی تەسک کە ناچار دەبوویت و دەبووایە هەرکەسێکت بینی سڵاوێکی لێ بکەیت. کۆڵانەکە ناسرابوو بە کۆڵانی (ئاشتی کنان)، کاتێک بەو کۆڵانانەدا دەڕۆم کە ئێستا ئۆتۆمبێل دەتوانێت پێیدا بڕوات، گریانم دێت، هەموو شتێکم وەبیر دێتەوە، سڵاو و هەواڵپرسین و گیانی دراوسێیەتی، بەڵام ئێستا ئەو کۆڵانانە پانکراون و هەموو شتێکی هەیە، ئاو و کارەباو ڕێگای ئۆتۆمبێل. کۆڵان و ماڵەکان نۆژەنکراونەتەوە، خانووەکانی ئەمبەرو ئەوبەری کۆڵانەکە هەموو شتێکی ژیانیان هەیە، بەڵام سڵاو و هەواڵپرسین و یاریی منداڵان و هاوکاری و هاریکاری و کتوپڕ ڕۆیشتن و نان و ڕۆن و شەکر و چا قەرزکردن ئێستا نەماوە، دەنگی عەرەبانەو بەقاڵە گەڕۆکەکان نەماوە. ڕووی خانووەکان و کۆڵانەکان جوان بووە، بەڵام ناوەڕۆکیان تێکچووە، لەو سەردەمەدا کۆڵانە تەنگ و تاریکەکان هەژار و پڕ ئارامی بوون. ئێستا کۆڵانەکان فراوان و ڕووناکن، بەڵام ئارامییان تێدا بەدی

ناکرێت. شادی و سەلامەتی و ئارامیی ڕۆیشت، خۆشگوزەرانی دەیەوێت جێی هەموو شتێک بگرێتەوە. هەربژی خەیاڵی بەتاڵ، خۆ ناشکرێت ئەوەندە ڕەشبین بین. ڕوقیە خانم لە دەرگاکەی ماڵی خۆیانەوە سەری دەهێنایە دەرو بانگی زەهرای دەکرد. زەهراش لە کۆڵانەوە سەیرێکی دەکرد، ئەگەر کەسێکی نامۆ نەبووایە، ئەوا بە سەری ڕووتی و بەبێ سەرپۆش دەچوو بۆ ماڵی دایکی. ئەعزەمی خوشکی دووەمی مهری کەسێکی دووڕوو بوو، هەرکاتێک باوکی لەماڵبووایە، دەیگوت دەبێت مهری بچێت بۆ قوتابخانەو وانەکانی بخوێنێت، لەبەرچاوی باوکی خوشکە گەورەکەی خۆی بەناوی زینەتەوە بانگ دەکرد، بەڵام کاتێک باوکی دەچوو بۆ کار، دایکی لە ماڵەوە دەبوو بەناوی زەهرا بانگی دەکرد. لەبەردەمی دایکی دەیگوت: پێویستە مهری گوێ لە قسەکانی دایکی بگرێت و نەچێت بۆ قوتابخانە. هەروەکو زۆربەی کەسانی ئەم سەردەمە، لە هەرجێگەیەک و بەجۆرێک قسەی دەکرد. لەماڵەوە ڕاستگۆن و لەناو کۆمەڵگاش دووڕوو، ئەو جۆرە کەسانە هیچ کێشەیەکیان نییە دەیانەوێت بژین و بەزیندوویی بمێننەوە، ئەو خەڵکە دووڕوو و درۆزنانە هێواش هێواش وڵات دووچاری کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەکەن. ئەوان پێویست ناکات ڕێکخراو دروست بکەن و خۆپیشاندان ئەنجام بدەن. هەرخۆیان دەهۆڵی دژایەتیکردنی وڵات لێدەدەن، ڕیاکاریی و دووڕوویی هەروەکو مۆرانە وایە، هەرچوار پایەی کۆمەڵگا دەخوات، ئەوکات کە چوار پایەکە خورا، بیناکەش دەڕووخێت و دەکەوێت، خودا دواڕۆژمان بەخێر بگێڕێت.

خوشکی سێیەمی بەرامبەر بە مهری کەسێکی حەسوود بوو. دیارە ئەکرەمە جوانترین کچی خەلیفە محەمەد عەلی و کچی گەڕەک بوو، جوانیی ئەو وێردی سەر زمانی خەڵکی بوو. ئەکرەمە دەیگوت: مهری بە سەری ڕووتەوە بڕوات بۆ قوتابخانەو وانە بخوێنێت، منیش لەماڵەوە منداڵ بەخێو بکەم؟ عەبا لەخۆمەوە بپێچم، ئەویش بەبێ چارشێو و بە جلوبەرگی تەسک و سەرپۆشی گوڵدارەوە بچێت بۆ قوتابخانە، منیش حەزدەکەم مانتۆ لەبەربکەم و سەرپۆشی گوڵدار بەسەرمدا بدەم. هاوسەرەکەم مۆڵەتم پێنادات هەفتەی یەک جار بچم بۆ حەمام، پێم دەڵێت لەماڵەوە خۆت بشۆرە، ئەو پەتەڕییەش بۆخۆی لە کۆڵان دەسووڕێتەوە، تاکو ئێستا دە هاوڕێی گرتووە، منیش ناتوانم سەیری باڵندەی ئاسمانیش بکەم، پورم ئەو دنیای ترم نیشان دەدات. ئەکرەمە ژنی کوڕە پوری خۆی بوو، دایکی هاوسەرەکەی پوری خۆی بوو، لەگەڵ

دایکی هاوسەرەکەی لە یەک خانوودا دەژیان، خۆزگە لەو خانووەدا لەگەڵ پوری، یاخود دایکی مێردەکەیدا بەتەنها بووایە. پوری ئەکرەمە سێ کوڕی هاوسەرگیرییان کردبوو. هەمووشیان بەیەکەوە لەیەک خانوودا دەژیان. بیری لێبکەرەوە خەسوو لەگەڵ سێ بووکدا لەیەک خانوودا بژین و دراوسێی یەکتریشبن، دەبێت چی ڕووبدات؟ دوو کوڕی بێ ژنیش هەر لەو خانووەدا بوون. پوری ئەکرەمە پێنج کوڕی هەبوو. خوشکێک پێنج جار دووگیان ببوو.

ڕۆژێک دێت چیرۆکێک لەسەر ئەو جۆرە ماڵانە بنووسم، بەڵام دایکم دەڵێت تا من زیندووم و لە ژیاندام ئەو چیرۆکە بنووسیت، لێت قبووڵ ناکەم. منی بێچارە چەندین سانسۆر بەرۆکی گرتووم، لەپێش هەموویانەوە ویژدانی خۆم، پاراستنی ئابڕووی شارەکەم، دایکم و سەدان هەڵە کە بەرۆکم دەگرن. کەسانێک هەمیشە باسی ژیانی بە کۆمەڵ دەکەن کە چۆن لە ماڵە کۆنەکانیاندا بەیەکەوە ژیاون. هەموو ئەوانە ئەگەر یادەوەرییەکانیان بەڕاستی بڵێن، یان بنووسنەوە، دیار نییە چی ڕوودەدات.

لەدواییدا ڕوقیە خانم و ئەکرەمە هەر ڕۆژێک کەسێکیان بۆ مهری دەدۆزییەوە. مهریش دەیگوت: من دەمەوێت وانە بخوێنم و واز لە قوتابخانە ناهێنم و شوو ناکەم. دایکی و ئەکرەمەش پێیان دەگوت: تۆ هەڵە دەکەیت چۆن شوو ناکەیت. باوکیشی دەیگوت: پێویستە مهری شوو نەکات و لە خوێندنەکەی بەردەوام بێت. شەهربانووش لەولاوە هاواری دەکردو دەیگوت: پێویستە مهری بەردەوام بێت لە وانەخوێندن و ببێتە خوێندەوارێکی باش، تا من لە ژیاندابم مۆڵەت نادەم شوو بکات، هەتاکو دبلۆم وەرنەگرێت. لەو سەردەمەدا خەڵکی هیچ شتێکیان نەبوو بۆ سەرگەرمی و کاتبەسەربردن. گەورەترین خۆشی و ڕابواردنیان سەیرکردنی شەڕی خەڵکانیتر بوو. ئێستاش کاتێک دوو ئۆتۆمبێل بەیەکدا دەدەن، یاخود شەڕێک ڕوودەدات بە سەدان کەس کۆدەبنەوە بۆ سەیرکردنیان. کاتێک شەڕێک ڕوودەدات خەڵکی هەموو لێی کۆدەبنەوە. یەکێک لە کێشەکانی پۆلیس و ئاسایش لەکاتی ڕوودانی هەر شەڕو دەمەقاڵێیەکدا، ئەو کۆبوونەوە بێکەڵک و بێ سوودەی خەڵکییە. دیارە هەندێک کەس کە کۆدەبنەوەو لەناو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا دەوەستن، بۆ برینی گیرفانی خەڵکانی ترە. خەڵکی هیچ خۆشگوزەرانییەکیان نییە، هاوکاریکردن باسێکی ترە. لەو سەردەمەدا لە ماڵەکانیشەوە دەنگ بڵند دەبووەوە، ژنانی دراوسێ دەچوونە ئەو ماڵانەوە تەماشایان دەکرد، نێوەندگیرییان دەکرد، هەواڵیان

دەبردو هەواڵیان دەهێنایەوە، دڵسۆزی و گێرەشێوێنییان دەکرد، ئاشتیان دەکردنەوە، کەلتووری ئێمەو کەلتووری هەموو مرۆڤایەتی کەلتوورێکی دژە. کاتێک بومەلەرزەیەک ڕوودەدات خەڵکێکی زۆر هاوکاری پێشکەش دەکەن. هەندێک کەسیش دێن و کەلوپەلە کۆکراوەکان دەدزن. کاتێک لەسەر شەقامەکان شەڕێک ڕوودەدات هەندێک کەس دێن بۆ نێوەندگیرییان و شەڕەکە دەکوژێننەوە هەندێکیتر دێن و گیرفانی تەماشاکەران دەبڕن، ئەمە لە هەموو جیهاندا بەمجۆرەیە. کاتێک دەنگەدەنگ و هاوارهاوار لە ماڵی محەمەد عەلی بەرز دەبووەوە. بومان جان، سەکینەی تەرزجان، ژنی ئەکبەری ئاوکێش، چەندین ژنی تری گەڕەک لێیان کۆدەبوونەوە. هەریەکەیان بەچەند منداڵێکەوە سەیری شەڕی ڕوقیە خانم لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەی و کچەکەیان دەکرد. ئیتر ئەو ژنانە پێویستیان بە سینەماو شانۆ نەبوو. هیچ هونەرمەندێکی شانۆیی نەیدەتوانی دەوری ئەوان ببینێت. خۆ دیارە شەهربانوو بەگشتی بێدەنگ بوو، وەڵامی بووکەکەی نەدەدایەوە، ئەگەر زۆر توڕەبووایە هۆنراوەیەکی لەبەر خۆیەوە دەخوێندەوە، هۆنراوەیەک کە ئێسقانەکانی ڕوقیەخانمی دەسووتاند. دایکیشم (خەدیجەی بیدە) هەزاران دێڕ هۆنراوەی لەبەرە، لێی دەپرسم ئەو هۆنراوانە لەکێوە فێربوویت؟ ئەویش دەڵێت زۆرترینیان لە شەهربانووەوە.

## ماڵی محەمەد عەلی

من لەکاتی منداڵیمدا دەیانجار چووم بۆ ماڵی محەمەد عەلی، ماڵەکەیان نموونەی تەواوی ماڵە کۆنەکانی یەزد بوو، ماڵی کەسێکی هەژاری پڕ لە منداڵ، ماڵی کەسێکی مامناوەندی ڕوو بەرەوخوار، نە لە چینی هەژارو نە چینی مامناوەند. خانوویەک هەڵکەوتوو لە کۆڵانێکی باریک بە پانی (١،٥)مەتر لە کۆڵانی (ئاشتی کنان)، محەمەد عەلی بەشێکی خانووەکەی بە میراتی لە باوکییەوە بۆ جێمابوو، بەشی براکەشی کڕیبووەوە. شەهربانووی دایکیشی هەر لەگەڵ ئەودا دەژیا، دایکی خاوەنی هەشت یەکی خانووەکە بوو. باوکی محەمەد عەلی زۆر زوو مردبوو، محەمەد عەلی لە تەمەنی یازدە ساڵیدا دەبێتە هەتیوو. شەهربانوو مامۆستایەکی سادە بوو، وانەی بە منداڵان و تەنانەت بە کەسانی گەورەش دەگوتەوە، لەهەمانکاتیشدا چەند دەزگایەکی پارچە چنین و قوماش چنینی لە ماڵەوە هەبوو. بۆ وانە گوتنەوە پارەو دیاریی لە هیچ کەسێک وەرنەدەگرت، کاری مامۆستاییەکەی بە کارێکی پیرۆز دەزانی. ئەو دەیگوت: پێغەمبەرەکانیش پارەی فێرکردنیان لە کەس وەرنەگرتووە. لەدوای مردنی هاوسەرەکەی، هەردوو کوڕەکەی لەو

خانووەدا گەورەکردو هەر لەو خانووەشدا ژنی بۆ هێنان، محەمەد عەلی کورە گەورەی شەهربانوو، بەشی برا بچووکەکەشی کڕیبووەوە. برا بچووکەکەی چەند کۆلانێک لەولاتر خانووی کڕیبوو. محەمەد عەلی لەو خانووەدا چوار کچی هاوسەرگیرییان کردبوو، ئەو لەگەڵ دایکی و ژن و چوار کچی لەو خانووەدا دەژیان. سیان لە کچەکانی هاوسەرگیرییان کردبوو لە خانووەکە ڕۆیشتبوون. کاتێک من تەمەنم یازدە ساڵ بوو، شەهربانوو محەمەد عەلی و هاوسەرەکەی و مهری لەو خانووەدا دەژیان. ڕۆژگارێک شەش ئافرەت و یەک پیاو لەو خانووەدا دەژیان. دەرگای ماڵەکەیان لە تەختە دروستکرابوو، لە تەختەی دارگوێزی ڕەق، دەرگاکەیان زۆر پتەو و بەهێز بوو، بە بزماری گەورە داکوترابوو. ئەو دەرگایە لانیکەم هەشتا ساڵ دەبوو دروستکرابوو، لەوەیە بەرگەی سێسەد ساڵی تریشی بگرتایە، دارتاشێکی خۆماڵی دروستیکردبوو، ڕەنگێکی سرووشتی هەبوو، لە ڕەنگی تەختەی گوێزی قاوەیی. کاتێک لە دەرەوە لە دەرگاکە دەدرا، دەبووایە کەسێک بەزوویی بڕوات دەرگاکە بکاتەوە، کێلونی دەرگاکە دارێکی زۆر قایم بوو. لانیکەم نیومەتر درێژ دەبوو، کاتێک بە کلیلێکی ئاسن دادەخرا، ڕۆستەم نەیدەتوانی بیکاتەوە. بەگشتی و لەکاتی ڕۆژدا هەمیشە دەرگاکە کراوە بوو. تەنها کاتی شەوان دادەخرا. کە دەرگاکە دەکرایەوە بە دوو پلیکانە دەچوویتە ژوورەوە، حەوشەی خانووەکە بە خشتی سوور خشترێژکرابوو، لەوەیە ئەو خشترێژکردنە هی هەشتا ساڵ لەوەوپێش بووبێت. خشتێکی سوورەوەکراو، خشتی باش و ڕێکوپێک، ڕەنگیان کەمێک بەلای سەوزیدا بوو. خشتەکان پاڵیان بەیەکەوە نەدابوو نێوانەکەیان بۆش بوو. کاتێک حەوشەکە ئاوی تێدەچوو، ئاوەکە دەچووە نێوان خشتەکانەوە. شەوانی بەهارو هاوین محەمەد عەلی فانۆسی دادەگیرساندو بە میلێکدا لە بەرزیی خانووەکە هەڵیدەواسی، تیشکی ڕووناکییەکەش دەیدایەوە لە شووشە ڕەنگاوڕەنگەکانی پەنجەرەکە، ئەو تیشکە ئەوەندەیتر خانووەکەی جوانتر دەکرد. لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا حەوزێک هەبوو هەمیشە پڕ لە ئاو بوو، شەوانە تیشکی ڕووناکی چراکە لە ئاوی حەوزەکەی دەداو دیمەنێکی جوانی بە حەوشەکە دەبەخشی. کاتێک دەرگاکە دەکرایەوەو دەچوویتە ژوورەوە، بەو هەموو جوانییە سەرسام دەبوویت. خانووی دەوڵەمەندەکانی یەزدو زۆرێک لە خانووەکانی شارەکانیتر بەوجۆرە نەبوون، کە دەرگاکە دەکرایەوە، یەکڕاست نەدەچوویتە حەوشەکەوە. ئەگەر تۆ خەڵکی یەزد، یان کرمان، یان کاشان بیت، دەزانیت

خانووی ماڵە دەوڵەمەندەکان چۆنچۆنی دروستکرابوون. ئەگەر خەڵکی ئەو شارانە نیت، ئەوا پێویستە گەشتێک بکەیت بۆ شارەکانی یەزدو کرمان و کاشان. زۆرێک لەو ماڵانە ئێستا بوونەتە مۆزەخانە و ئوتێل و رێستورانت. لە یەزد چەند ماڵێک لەم خانووانە بوونەتە کۆلێژی ئەندازیاری. ئەم ماڵانە شاکاری هونەری تەلارسازیین، بۆیە پێتان دەڵێم بەزوویی برۆن و ببینن، چونکە زۆرکەس بەدەستکردە کۆنەکانی شارەکانی یەزدو کرمان و کاشان دوژمنایەتییان هەیە، هەمیشە دەیانەوێت ئەو سامانە گەورەیە تێکبدەن. ئەو ماڵانە خۆیان کەلتوورێکی گەورەن، بەڵام بەداخەوە کە هەندێک کەس دەستیان دەچێتە ئەم خانووانەو تێکیاندەدەن. ئەوان ئەم خانووانە تەنها بە مشتێک خشت و گڵ دەبینن، هەندێکیان نرخی ئەم خانووانە تەنها لە نرخی زەوییەکەیدا دەبینن. دەیانەوێت بەزوویی خانووەکان تێکبدەن و زەوییەکەی بفرۆشن.

## شەهربانوو

ژێرەوەی هەموو خانووەکە ژێرزەمین بوو، لە دوو لای خانووەکەوە دوو رێگای بە پلیکانە هەبوو. پلیکانەیەکیان دەچوو بۆ ژێرزەمینەکە. ژێرزەمینەکە لە شێوەی پیتی (U) بوو، لە دوولای ژێرزەمینەکە دەزگاکانی چنین جێگیر کرابوون. خەڵکی ماڵەکە هاوینان دەچوونە ژێرزەمینەکە، چونکە هاوینان ژێرزەمینەکە هەوایەکی فێنک و شێداری بە خەڵکەکە دەبەخشی. لە دوو بەشی ژێرزەمینەکەشدا هەشت دەزگای جۆلایی هەبوو، سێ دەزگای پارچە چنین و پێنج دەزگای چنینی جاجم و بەڕە. لەوکاتەوەی شەهربانوو نەخۆشکەوتبوو، هەموو دەزگاکان خەوێندرابوون و کاریان پێنەدەکرا. بە تەونی جاڵجاڵۆکە داپۆشرابوون. شەهربانوو تاکو تەمەنی (٨٤ ) ساڵی کاری بە دەزگاکان دەکرد، لەو تەمەنە بەدواوە توانای کارکردنی نەمابوو، لە پلیکانەی یەکەمی ژێرزەمینەکە بەسەر نۆ پلیکانەی تردا بە تەقلە رۆیشتبووە خوارەوە، بەهۆی ئەو کەوتنەوە سمتی شکابوو. ئیتر ئەوە بوو بەهۆی کۆتایی کاری دەزگاکانی. لە ساڵی (١٣٣٣/١٩٥٤) دەزگاکانی لەکارخران. ڕوقیە خانم و کچەکانی کاریان بە دەزگاکان نەکردو سوودیان لێنەدەبینین.

شەهربانوو لەسەر کۆڵانەکەدا دادەنیشت، کاتێک دەزگاکانی لەکاردابوون شەهربانوو داهاتێکی باشی هەبوو، خەرجیی بووک و نەوەکانی ئەو دابینی دەکرد. شەهربانوو بۆخۆی لە ژوورێکدا دەژیاو ئێواران دەهاتە سەر کۆڵانەکەو لەبەردەمی

ماڵەکەی خۆیان دادەنیشت، هەموو خەڵکی گەڕەک سڵاویان لێدەکرد، ئەگەر کەسێک سڵاوی نەکردایە بەدەنگێکی بەرز بانگی دەکردو دەیگوت: بۆچی سڵاوت نەکرد؟ لەمن نیگەرانیت، ئەگەر کارێکی خراپم کردووە بمبەخشە. ئەگەر کەسێکی نەناسراو بەکۆڵانەکەدا برۆیشتایە شەهربانوو سڵاوی لێدەکردو بەیەک سەیرکردن تەواوی کەسایەتییەکانی دیاریی دەکرد، بەیەک سەیرکردن دەیتوانی لە قەیتانی پێڵاوەکانییەوە تاکو کڵاوەکەی سەری دیاریی بکات. بۆ نموونە دەیگوت: ئەمڕۆ کەسێکی نامۆ هاتۆتە ئەم کۆڵانە دووگمەیەکی چاکەتەکەی شلببووەوە. هەموو شتێکی لەبارەی کەسەکەوە دەزانی. کەمجار هەبووە کە من ببینێت و قسەیەک نەکات، یاخود شتێکم لێ نەپرسێت، خۆ دیارە ئەو لەگەڵ هەموو منداڵێکدا ڕەفتارێکی دایکانەی هەبوو، چەند یادەوەرییەکی ئەوم لەلایە.

## چارەسەری کەچەڵی

یەکێک لە یادەوەرییەکانم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی تەمەنم حەوت ساڵ بوو، لە پۆلی یەکەم بووم. ئەکبەری کوڕی زینەت تەمەنی هەشت ساڵبوو لە پۆلی دووەم بوو، ئەکبەر سەری کەچەڵ ببوو، هەموو سەری ببووە برین. بەڕێوەبەری قوتابخانە گوتبووی نابێت ئەکبەر بێتەوە قوتابخانە، لەوەیە بەهۆی ئەوەوە منداڵەکانی تریش تووشی کەچەڵی ببن. لەو سەردەمەدا نەخۆشی کەچەڵی نەخۆشییەکی بەربڵاو بوو، زۆربەی منداڵان تووشی کەچەڵی دەبوون. دکتۆرو دەرمان کەمبوو، حەمامی دووشی پەیدا ببوو، بەڵام هێشتا حەوزی ئاو هەبوو بۆ خۆشۆرین. زۆرکەس بۆ خۆشۆرین و خۆپاکردنەوە دەچوونە حەوزە ئاوەکانەوە. هەندێک کەس دەیانگوت خۆشۆرین و خۆپاککردنەوە بە ئاوی دووش دروست نییە، پێویستە بچنە حەوزە ئاوەکەوە. لە ماڵەکانیش حەمام نەبوو، توانای ئاو گەرمکردنیش نەبوو. تەباخی پڵێتەداری نەوتی توانای گەرمکردنی مەنجەڵە ئاوی نەبوو. داری سووتاندنیش کەم و گرانیش بوو. جلوبەرگیش هەموو ئەسپێ بوو. ئەکبەریش وەکو زۆرێک لە منداڵانی تر کەچەڵ ببوو. بۆ دەرمانکردنی کەچەڵی (قیر و بوزویان) بەکاردەهێنا. کە یەکێک بوو لە بە ئازارترین و ناخۆشترین جۆری چارەسەری کەچەڵی. تازە دەزگایەکی کارەبایی هاتبوو بۆ یەزد، بەو دەزگایە کارەبایان لەسەری کەچەڵەکان دەداو بەئاسانی مووەکانی سەریان دەتاشین و مەڵهەم و دەرمانیان لێدەدا. بەڕێکەوت شوێنی دەزگای کارەباییەکە تەنها (٤٠٠) مەتر لە ماڵی زینەت و محەمەد

عەلییەوە دوور بوو، ئەو دەزگایە لە تەنیشت کارگەی ئیقبالی ئەو سەردەمە، یاخود پارکی ئەعلەمی ساڵی (۱۳۹۳/۲۰۱٤) بوو.

شەهربانوو بە عەبدوڵڵای ئاتەشگەر، باوکی ئەکبەری گوتبوو: ئەو منداڵە ببات کارەبا لەسەری بدەن. شەهربانوو دکتۆر ئولیای ڕاسپاردبوو ئەو کارەبایی بۆ بکات. دکتۆر ئولیا دەزگای کارەبایی هێنابوو بۆ یەزد. محەمەد عەلی قسەکەی دایکی وەرگرتبوو. زینەتیش پێی باشبوو کوڕەکە بەرێت بۆ لای دکتۆرو کارەبای لەسەر بدات. ڕوقیە خانم هاواری لێهەڵسابوو دەیگوت: هەزار ساڵە خەڵکی تووشی نەخۆشی کەچەڵی دەبن، هەموویان بە قیرو بووزو چارەسەر بوون. ڕوقیە خانم دەیگوت: ئەم دکتۆرانەی ئەم سەردەمە کاری سەیر دەکەن، کاتێک کارەبا لەسەری خەڵک دەدەن، ئەوا ئەقڵیان دەگۆڕن، بە کارەبا لێدان خەڵکانی موسڵمان دەبنە کافر. خەڵکیش کە بوونە کافر ئەوا دەچنە دۆزەخ. ئیتر ئەوەبوو کردی بەهەرا کە دەبێت سەری ئەکبەر کارەبای لێنەدرێت و لەسەر شێوازی کۆن چارەسەری بۆ بکرێت. چەند ڕۆژێک لەسەر ئەم بابەتە لە ماڵی محەمەد عەلی و زینەت شەڕو دەنگەدەنگ بوو. هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە کارەبا لەسەری ئەکبەر بدرێت، تەنها ڕوقیە خانمی دایەگەورەی نەبێت. لەکۆتاییدا قسەی دیکتاتۆرو کۆنەپەرست سەریگرت. خۆ بەگشتی خەڵکانی کۆنەپەرست باوەڕیان بە قسەکانی خۆیان هەیەو پێداگریی لەسەر قسەکانی خۆیان دەکەن، بەڵام نوێخوازەکان باوەڕیان بە قسەکانی خۆیان نییە، پێداگریش لەسەر قسەی خۆیان ناکەن. جیاوازی تیرۆریستەکانیش لەگەڵ ئازادیخوازەکان هەر ئەوەیە. تیرۆریستەکان بۆئەوەی بەکردەوە بیروڕای خۆیان بسەپێنن، خۆیان و خەڵکیش دەکوژن، بەڵام کەسانی لیبراڵ و ئازادیخواز ئامادە نین ئەوەندەی نووکە دەرزییەک ئازار بە خۆیان و خەڵکی بگەیەنن.

لەکۆتاییدا بڕیاردرا لەسەر شێوازی کۆن چارەسەر بۆ سەری ئەکبەر بکەن. لە ماڵی محەمەد عەلی بوو بە شەڕو هەرا، دراوسێکانی ماڵی زینەت کۆبوونەوە، منیش لەوێ بووم. ژنێکیش بەناوی ئامینەوە لەوێ بوو. پارچە قوماشێکی جاوی هێنا، مەڵهەمێکی وەکو سیکۆتینی لە بوزووەکە هەڵسوو، نەمزانی ئەو مەڵهەمە چی بوو، لە کەسیشم نەپرسی ئەو مەڵهەمە چی بووە. ئینجا پارچە بوزووەکەیان بە سەری ئەکبەرەوە چەسپاندو فشاریان لێدەکرد تاکو تەواو چەسپ بێت بە سەرییەوە، کاتێک کە فشاریان لێدەکرد ئەکبەر دەگریاو هاوارو ناڵەناڵی بوو، ئەو ژنەش زیاتر فشاری دەخستە سەر.

ئەکبەر دەگریاو دەیگوت: سەرم تەقی، سەرم سووتا. ئیتر قۆناغی یەکەمی کاری ئامینە تەواو بوو. مەنجەڵێکی گەورەیان هێناو خستیانە سەر ئاگرو شۆربایەکیان دروستکرد. ژنانیش ئاگایان لە ئازاری ئەکبەر نەبوو، شایی و هەڵپەڕکێیان دەکردو شۆربایان دەخوارد. شەهربانووش هۆنراوەی دەخوێندەوەو دەیگوت: هەمیشە دیکتاتۆرەکان لە خەمی سکی لایەنگرەکانی خۆیاندان. دەیگوت: ئەم بووکەی من شۆربا دەدات بە لایەنگرە بێئەقڵەکانی خۆی. دوو کاتژمێر بوو پارچەیەکیان لەسەری ئەکبەر دابوو، دەبووایە ئەو پارچە بوزووە باش چەسپ بێت بەسەری ئەکبەرەوە. ئامینە بۆ خۆی دانیشتبوو چایی دەخواردەوەو مژی لە نێرگەلە دەدا. پاش (٣-٤) کاتژمێر پارچە بوزووەکەی تاقیکردەوە تاکو بزانێت باش چەسپ بووە بە سەری ئەکبەرەوە، یان نا. شەهربانووش دەهری ببوو بە ڕوقیەی دەگوت: ئەوەتا دنیا گۆڕاوە، ئەوەتا دکتۆرو دەرمانی تازە پەیدابووە، ئەمە چ کارێکە تۆ بەسەر ئەم منداڵە داماوەیدا دەهێنیت. ڕوقیەش دەیگوت: پیرەژن ئەوە تۆ چی دەڵێیت، بۆ تۆ چیت؟ شەهربانووش بەئارامی و بەبێ هیچ ڕق و تووڕەبوونێک دەیگوت: تۆ کچەکەتت داوە بەشوو، ئەو منداڵە دایک و باوکی خۆی هەیە، بۆچی دەبێت هەمووان گوێ لە قسەی تۆ بگرن، کە تۆ دایەگەورەی ئەو منداڵەیت؟ ڕوقیەش دەیگوت: نا دەبێت گوێ لە قسەی تۆ بگرن، کە تۆ دایکی باوەگەورەی ئەو منداڵەیت. ئەو منداڵە نیو کاتژمێر ئازاری دەبێت، بەڵام نابێت بە کافرو ناچێتە دۆزەخ. شەهربانووش دەیگوت: ئەوەی دەچێتە دۆزەخ منم، کە ناتوانم پێش بەتۆ بگرم.

ئامینە گوتی: ئێستا کاتیەتی. ڕوقیەو عەبدوڵلاو زینەت و چەند ژنێکی تر دەست و قاچی ئەکبەریان توند گرت، بەجۆرێک نەیدەتوانی بجوڵێت. شەهربانووش بەبێدەنگی فرمێسکەکانی دەهاتە خوارەوە. ئامینە دەستی برد گۆشەیەکی بوزووەکەی سەری ئەکبەری گرت و گوتی: یا عەلی و بە هەموو هێزی خۆی ڕایتەکاند. ئەکبەریش هاوارێکی بەهێزی کردو لەتاو ئازار بووراوە، تەواوی مووەکانی سەری و پێستی سەری بە قوماشەکەوە هات، خوێن بەسەریدا هاتەخوارەوە. هەندێک ئاویان بە دەموچاویدا ڕشت، هەندێک شەکراویان بەدەمیدا کرد، کە پێشتر بۆیان ئامادەکردبوو. پاش ماوەیەک ئەکبەر بەهۆش خۆی هاتەوە. شەهربانوو لەلای حەوزە ئاوەکەوە دانیشتبوو بە دەنگێکی بەرز دەیگوت: خوایە کەمێک ئەقڵ بدەیتە ئەم خەڵکە بێئەقڵە. پاش پانزە ڕۆژ سەری ئەکبەر باش بوو، بەڵام هەموو سەری بریندار ببوو، هەروەکو ئەم کەچەڵانەی ئەم سەردەمە. ئەکبەر

ببوو بە گاڵتەجاڕی منداڵانی قوتابخانەو هۆنراوەی کەچەڵ کەچەڵیان بەسەردا دەخوێند، ئەو هەمیشە هاوین و زستان کڵاوی لەسەر دەکرد. لە مانگی (ئۆردیبەهەشتی١٣٩٢/ مارس ٢٠١٣) چووم بۆ سەردانی و پێمگوت: دەمەوێت یادەوەریی سەردەمی منداڵیی بنووسمەوە، ئایا تۆ مۆڵەتم پێدەدەیت ئەو یادەوەرییانە بنووسمەوە کە پەیوەندییان بە کەچەڵیی تۆوە هەیە، ئەویش کڵاوەکەی لە سەری داگرت، مووەکانی سەری سپی ببوون، بەڵام نیوەی سەری شوێن برین بوو، مووی پێوە نەبوو. گوتی: ئەوە میراتی ڕوقیەی دایەگەورەمە، کە ویستی نەچم بۆ دۆزەخ و بەجۆرێک کەچەڵی کردم کە دەبێت بە گەرمای هاوین هەمیشە کڵاوم لەسەردا بێت. سەدجار نزای خێری بۆ شەهربانوو کردو دەیگوت: ئەو پیرەژنە زۆر ئاقڵ بووە، کەچی خەڵکی پێیانگوتووە کافر، خۆزگە هەموو خزمەکانی من وەکو ئەو کافرو ئاقڵ بوونایە.

یادەوەرییەکی تری شەهربانووتان بۆ بگێڕمەوە. نزیکی شەش مانگ دەبوو باوکم کۆچی دوایی کردبوو. زستان بوو، هەوا سارد بوو، کاتی ئێوارە بوو لە حوجرەوە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە. بەیانیان دەچووم بۆ قوتابخانەو دوانیوەڕوانیش دەچووم بۆ حوجرە بۆلای مەلا نەباتی. شەهربانوو لەسەر کۆڵانەکە دانیشتبوو سڵاوی لێکردم و گوتی: حوسێن وەرە دانیشە، منیش چووم لەلایەوە دانیشتم و چەند دانە هەڵوژەیەکی وشکی پێدام. گوتی: لەکوێ بوویت؟ گوتم: لای مەلا نەباتی بووم. گوتی: مەلا نەباتی وانەی چیتان پێدەڵێت؟ گوتم: گوڵستانی سەعدی. گوتی: ئەم مەلا نەباتییە تەنها گوڵستان و قورئان دەزانێت. چەندینجار پێمگوتووە شانامە بە منداڵان بڵێرەوە، سەعدی تەنها ئامۆژگاریمان دەکات، سەعدی هەموومانی بێچارە کردووە، ئەم هەموو ئامۆژگارییەمان بۆ چییە؟ فیردەوسی وانەی خواپەرستی و ئازایەتی و بەرگریمان فێر دەکات. من تێنەدەگەیشتم چی دەڵێت، ئەم قسانەی جارێکیتر، کاتێک تەمەنم دوانزە ساڵ بوو، پێگوتمەوە. ئەوکاتەی تەمەنم دوانزە ساڵ بوو لێی پرسیم لەکوێ بوویت؟ گوتم: لە کتێبخانەی ئاغای وەزیری بووم. گوتی: لەوێ چ کتێبێک دەخوێنیتەوە؟ گوتم: کتێبی (دە کەسی قزڵباش)، گوتی: کاتێ بێکاربوویت بڕۆ بۆ لای مامۆستا ئەسەدوڵڵا شانامە بخوێنە، کاتێک گەورەتربوویت کتێبی شەمسی تەبریزی و مەسنەوی بخوێنە. مەسنەوی وانەی مرۆڤایەتییە، بە خوێندنی مەسنەوی لە ئاژەڵەوە دەبێت بە مرۆڤ. زۆر بەداخەوە من لە تەمەنمدا بەجۆرێکی باش مەسنەویم نەخوێند، پێویستە ئێستاش بڕۆم مەسنەوی

بخوێنم. شەهربانوو پێیگوتم: گوێ لە قسەکانی سەعدی مەگرە، گوڵستان بۆ ئەدەب و فێربوونی زمانی فارسی بخوێنە، بەڵام شانامە و مەسنەوی و حافز وانەی ژیانن.

ڕۆژێکی تر وابزانم ساڵی (١٣٤٠/١٩٦١) بوو، ئەوکاتە لە پۆلی یەکەمی ناوەندیی بووم، چەند مانگ لەوەدوا شەهربانوو کۆچی دوایی کرد، لەبەردەمی ماڵی نەوەکەی خۆی (مهری) دانیشتبوو، بانگیکردم و گوتی: حوسێن، قەدری دایکت بزانە، کە تۆی ناردۆتە قوتابخانە، باش گوێ بگرە، لە هەموو تایەفەی دایکتدا تەنها تۆ دەچیتە قوتابخانە، هیچ کەسێک لە کوڕە پورو کچە پورەکانت ناچنە قوتابخانە، بۆیە پێویستە تۆ بەباشی وانەکانت بخوێنیت، چونکە تۆیان لە کێڵگەی هەژاری و کەرێتی و چەوسانەوە بەرهەمهێناوە. کاتێک شەهربانوو ئەم قسانەی بۆ دەکردم، تەمەنم گەورەتر ببوو، لە جارانی پێشووتر زیاتر لە وتەکانی تێدەگەیشتم، گوتم: ئەم قسەیە مانای چییە؟ گوتی: باپیرەت (باوکی دایکت) پێنج کچی هەبوو، کچ لەدوای کچ دروستی دەکرد، بەڵکو ئەمە خوایە کوڕێکی ببێت، باشبوو منداڵی شەشەمی کوڕ بوو، ئاخر مەگەر کچ و کوڕ چ جیاوازییەکیان هەیە؟ کەسێک نەبوو بەو پیاوە بڵێت بۆچی پێنج کچت دروستکرد، تاکو منداڵی شەشەمت کوڕ بێت. شەهربانوو بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: باپیرەت ئەوەندە هەژار بوو نەیدەتوانی سکی منداڵەکانی تێر بکات لە نان، کەچی هەر منداڵی دروستدەکرد، دیارە ئەمەش کەرێتییە، چونکە پیاوێکی هەژارو بێدەسەڵات بوو بەردەوام کچەکەی لە ڕوویدا دەمدرێژیی دەکرد، هەربۆیە دایکتی دا بە باوکت، واتە دایکتی فرۆشت. ئەوی دا بە پیاوێک کە دوو ژنی تری هەبوو. ئەمە بۆخۆی کەرێتییە. دایکت بوو بە ژنی پیاوێکی تلیاککێش، ئەمەش هەر کەرێتییە. ژنی پیاوێکی بێکار کە تەنها بە پارەی سودو ئیجارەی زەوییەکان دەژیا، ئەمەش بۆ خۆی کەرێتییە. پیاوێک کە زیاتر لە (٣٥) ساڵ لە دایکت گەورەتر بوو، کە ئەمەیان کەرێتییەکی زۆر زۆرە. خۆ ئەگەر کچ بدەیت بە گورگی بیابان، زۆر لەوە باشترە کە بیدەیت بە پیاوێک (٣٥) ساڵ لەخۆی گەورەتر بێت. کەرێتی و هەژاری باپیرەت دایکتی لە تەمەنی (٢٨) ساڵیدا کرد بە بێوەژن. تۆ بەرهەمی تاوان و ستەمیت، چونکە باوکت بەهۆی بوونی کەمێک پارەوە دایکتی کڕی. سەردەمی دووەم جەنگی جیهانی بوو، گرانی و برسێتی بوو، باوکت ئەو تاوانەی کرد، ئێستا پێویستە تۆ بە خوێندن ئەم تەلیسمی هەژاری و کەرێتی و ستەمە تێک بشکێنیت. کاری تۆ زۆر دژوارە. ئێستا (٥٥) ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا ڕۆیشتووە، ئێستا دەتوانم

سوێند بخۆم کە ئەوە ڕاستترین قسە بوو کە شەهربانوو کردی. ئەو ڕستەیەی هەمیشە لەیادمدایە، کە گوتی: تۆ بەرهەمی کێڵگەی کەرێتی و هەژاری و تاوانیت. ئافرەتێکی خزمم لە تەمەنی پانزە ساڵیدا درابوو بە پیاوێکی تەمەن (٥٥) ساڵ. زاوا (٤٠) ساڵ لە بووک گەورەتر بوو. زاوا شەش منداڵی لە ژنی پێشووتری هەبوو، دوای چەند ڕۆژێک شەهربانوو چاوی بە بووک کەوتبوو، زۆر بەزەیی بە بووکدا هاتبووەوەو لە تاوانیدا دەستیکردبوو بە گریان، بەگریانەوە پێیگوتبوو: هەر ئێستا بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە تا دەتوانیت پیاوەکەت دارکاری بکە، پاشان تەڵاقی لێوەربگرە، هاوار بکەو داوای تەڵاق بکە. ئەوکاتە هەندێک لە خزمە بێئەقڵەکانی من دەیانگوت: شەهربانوو بووە بە شەیتان، تەنها خاڵم کە ئەوکاتە تەمەنی بیست ساڵ بوو، دەیگوت: شەهربانوو قسەکانی چەپکە گوڵە. ئێستا ساڵی (١٣٩٤/٢٠١٥)یـە، ئەو خانمە دوو منداڵ و چەندین نەوەی هەیە، بەڵام نزیکەی (٣٥) ساڵ دەبێت بێوەژنە. هەرکاتێک کە دەیبینم دەڵێت: خۆزگە بەگوێی شەهربانووم بکردایەو هەمان ڕۆژ تەڵاقم وەربگرتایە. شەهربانوو دەیگوت: کەسێک کە کچێکی پانزە ساڵ لە پیاوێکی تەمەن (٥٥) ساڵ مارە دەکات، پێویستە زیندانی هەتاهەتایی بکرێت.

ڕۆژێک عەبدولعەلی دراوسێیان لە ژنەکەی خۆی دابوو، شەهربانووش بە ژنەکەی عەبدولعەلی گوتبوو: ئەو تلیاکخۆری نامەردە بۆچی لێیداویت؟ تۆش بڕۆ دارێک بگرە بەدەستەوەو هەتا دەتوانیت تێیهەڵدەو مقەڵی و تلیاکی بۆ فڕێبدەرە دەرەوە. بڕۆ خوشک و براکانت بهێنە بە هەمووتان هەموو گیانی بشکێنن و شەویش نەهێڵیت بێتەوە بۆ ماڵەوە. لە ساڵی (١٣٣٠/١٩٥١)دا خەڵکی قینیان لەمجۆرە قسانە دەبووەوە، ئەمجۆرە قسانە باری کۆمەڵایەتییان تێکدەدا. ئەم ژنە کەلتوورێکی تازەی بڵاودەکردەوە، جۆرێک لە کەلتووری فێمەنستی. ئەو خەڵکە بەم ژنەیان دەگوت کافر. ئەوجۆرە قسەیەکی دەکرد لەبارەی ئەو پیاوە پیرانەی کە ژنی گەنجیان هەبوو. ئێستا ناکرێت من لێرە ئەو جۆرە قسانە بنووسم، بە ژنەکانی دەگوت: ئەو کارەی خوێڕییەکان لەگەڵتان دەیکەن، ئێوەش ئەوهایان لێبکەن. دەیگوت: پیرەمێردی شەست ساڵی تلیاکی کە ژنی تەمەن پانزە ساڵ دەهێنێت، دەبێت خەجاڵەتی گەنجەکانی کۆڵان بن.

پیرەژنێکی یەهودی هەبوو ئەو بەقاڵێکی گەڕۆک بوو، کۆڵێکی لە کۆڵی دەناو بە کۆڵانەکاندا دەگەڕاو شتی دەفرۆشت. دەرزی و سوژن و بەکرەو دەزیلەو لفکەو

دەزووی دەفرۆشت، هەر پانزە ڕۆژ جارێک و ڕۆژانی دووشەممە دەهاتە کۆلانی ئێمە. هەمووجارێک کە دەهات کەلوپەلەکانی لە حەوشەی ماڵی شەهربانوو بڵاودەکردەوە. دایکم دەیگوت: چل ساڵ زیاترە ئەو ژنە وردەواڵە دەفرۆشێت، پێش لەدایکبوونی من و ئەوکاتەی ڕوقیە دەبێتە بووکی شەهربانوو، ڕوقیە دەڵێت: ئەم پیرەژنە یەهودییە دەبێت شتەکانی کۆبکاتەوەو لە ماڵی ئێمەدا بڵاویان نەکاتەوە. شەهربانوو پێش بە بووکەکەی دەگرێت و دەڵێت: پێش شووکردنت دەتزانی کە ئەم وردەواڵەیە لێرە بڵاودەکرێتەوە، دەبووایە پێش شووکردنت ئەو قسەیەت بکردایە. دایکم دەیگوت: ئەو ژنە یەهودییە کە یەکەمجار هات بۆ ئێرە ژنێکی گەنج و جوان بوو. کاتێک تۆ ئەوت بینی پیر بوو. لەدایکم پرسی ئەو ژنە یەهودییە هیچ شتێکی دەدا بە شەهربانوو؟ دایکم گوتی: بەپێچەوانەوە شەهربانوو نانی نیوەڕۆی دەدا بەو ژنە یەهودییە. ڕۆژانە کە ئاسایی ژنە یەهودی دەهات بۆ ماڵی شەهربانوو، ڕوقیە دەچوو بۆ ماڵی شێخ حەسەنی باوکی. ئەم کارە نزیکەی چل ساڵ بەردەوام بوو.

شەهربانوو ژنێکی میهرەبان بوو، هەمیشە شتێک یان دەنکە میوەیەکی وەکو هەڵوژەو قەیسی و قۆخی دەدا بە منداڵان، بیروهۆشێکی باشی هەبوو ساڵی (١٢٤٦/١٨٦٧) لەدایک ببوو. ئەو دەیگوت: بەرواری لەدایکبوونی بە ساڵی هیجری لەپشتی بەرگی قورئانێک نووسراوە، خۆی بەروارەکەی گۆڕیبوو بۆ ساڵی شەمسی. کاتێک لە ساڵی (١٣٤٠/١٩٦١) مرد، دەیانگوت تەمەنی (٩٤) ساڵ بووە. ئەو لە تەمەنی (٩٠) ساڵیدا بەبێ چاویلکە نامەی بۆ خەڵکی دەنووسی و نامەکانی بۆ دەخوێندنەوە، دەستوخەتێکی جوانی هەبوو. هەمیشە هۆنراوەی دەخوێندەوە، جێگای باوەڕی ئەو ژنانە بوو کە هاوسەرەکانیان دەڕۆیشتن بۆ وڵاتان بۆ کارکردن. ئەوەندەی لەیادم بێت هۆنراوەکانی شانامە، عەتار، مەسنەوی، شەمسی تەبریزی، شێخ مەحمودی شەبستەری، حافز، فەرخی یەزدی دەخوێندەوە. چەندینجار کاتێک لە کۆلانەکەوە تێپەڕ دەبووم بانگیدەکردم و دەیگوت وەرە بۆلای من. چەند دێڕ هۆنراوەی دەخوێندەوە، دەیگوت: تاکو بەیانی بیری لێبکەرەوە بزانە ئەم هۆنراوەیە هی کێیە؟ بەڵام من نەمدەزانی هۆنراوەی کێیە، بۆ ڕۆژی دوایی کە سەردانم دەکردەوە، خۆی پێیدەگوتم: هۆنراوەکە هی کام شاعیرە. ئیتر من نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە. لەگەڵ هەموو قوتابییەکان هەمان ڕەفتاری هەبوو. شەهربانوو هەمیشە قژە سەری سووربوو، بەردەوام خەنەی لەسەری دەگرت، لەسەری

کۆڵانەکە دادەنیشت و سەرپۆشی گوڵداری بەسەریدا دەدا. زۆرکاتیش سەرپۆشەکەی لەسەری دەکردەوەو دەیگوت: کێ کاری بەسەر سەرڕووتی منەوە هەیە، من مەحرەمی هەموو خەڵکی گەڕەکم.

ڕۆژێک لەبەردەمی ماڵەکەیانەوە ڕەتبووم. ئەویش لەبەر دەرگاکە دانیشتبوو. سڵاوم لێکرد، ئەویش گوتی: حوسێن هیچ کەسێک لەماڵەوە نییە، بڕۆ لە ژوورەکەمدا لە نێو تاقەکەی دەستە چەپدا سەرپۆشێکی گوڵدار هەیە بۆمی بهێنە. من چەندینجار چوبوومە حەوشەکەی ئەوانەوە، بەڵام ئەوە یەکەمجارم بوو بچمە ژوورەوە، تەمەنم (١٠-١١) ساڵ بوو. ژوورەکەی شەهربانوو لەسەربانەوە کولانەیەکی هەبوو، ڕووناکیی لەو کونەوە دەهاتە ژوورەوە، بەشێکی ژوورەکەی ڕووناککردبووەوە. ژوورەکەی لە حەوشە چۆڵە بچوکەکەی پشتەوە کەمێک ڕووناکی بۆ دەهات. ژوورەکەی ژوورێکی چوارگۆشەی گەورە بوو، ڕادیۆیەکی گەورەی لە تاقەکەیدا دانابوو. من لە هیچ ماڵێکدا ئەوەندە کتێبی زۆرم نەبینیبوو، لە تاقێکی تردا تا سەرەوە گۆڤار و ڕۆژنامە دانرابوون، ژوورەکەی زۆر پاکوخاوێن بوو، نوێنەکانی لە گۆشەیەکەوە هەڵچنیبوو، چەند سەرینێکی لەپاڵ دیوارەکەوە دانابوو، لە گۆشەیەکی ژوورەکەیدا مێزێکی دانابوو، مێزێک بەبێ کورسی، چەند کتێبێک لەسەر مێزەکە دانرابوون، یەکێک لە کتێبەکان لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو (دیوانی شەمسی تەبریزی)، چووم بۆلای تاقەکەی دەستە چەپ، چەند سەرپۆشێکی گوڵدار لە تاقەکەدا بوون، یەکێک لە سەرپۆشەکانم هەڵگرت و بۆم برد، سوپاسی کردم و گوتی: تۆ کوڕێکی زرنگیت. سەرپۆشەکەی گۆڕی سەرپۆشەکەی کە پێشتر لەسەردا بوو سپی و خاوێن بوو. گوتم: بۆچی سەرپۆشەکەت گۆڕی؟ گوتی: کتوپڕ دڵم ویستی سەرپۆشەکەم بگۆڕم و سەرپۆشێکی گوڵدار لەسەر بکەم، خەڵکی چ تاوانێکیان کردووە تا شێوەی من بە پیری و ناشرینی ببینن، هەربۆیە سەرپۆشی جوانم لەسەرکرد تا دڵی ئەو خەڵکە شاد بکەم. شەهربانوو بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: بەهیچ شێوازێکی تر ناتوانم دڵی خەڵکی خۆش بکەم، بە ڕەنگی جوان دڵیان خۆش دەکەم. لەو ڕۆژە بەدواوە چەند جارێکیتر منی ناردووە بۆ ژوورەکەی خۆی تا شتێکی بۆ بهێنم. جارێکیان پێیگوتم: بڕۆ بۆ ژوورەکەم قاپێک بەرەو لە دەبەیەکدا کە لە گۆشەی ڕووبەڕووی دەرگاکەیە، هەندێک چەرەسات بهێنە. کاتێک چەرەساتەکەم بۆهێنا، یەک مشتی پێدام، ئەوەی تری دا بەو منداڵانەی لەو کۆڵانەوە گوزەریان دەکرد.

بیبی هاجەری عاشقە مەدینەش ئێواران لەسەر کۆڵانەکە دادەنیشت، هەمیشە ژمارەیەک ژن لە دەوری بیبی هاجەر دادەنیشتن و هەواڵیان بەیەکتری دەگەیاند. هەندێکجار پیاوانیش چەند خولەکێک لەلایان دادەنیشتن لە هەواڵی بیبی هاجەریان دەپرسی. هەندێکجار منیش لەوێ چیرۆکم بۆ دەگێڕانەوە. بیبی هاجەر بۆخۆی گەورەی بنەماڵەکانی عاشقە مەدینەکان بوو، چەندین منداڵ و دەیان نەوەی هەبوو، بەڵام شەهربانوو هەمیشە بەتەنهایی لەسەری کۆڵانەکە دادەنیشت، هیچ کەسێکی لەدەور نەبوو. واتە جورئەتی ئەوەیان نەبوو لەلای کەسێک دانیشن کە بە کافر ناوی بڵاوببووەوە. ژنان جورئەتیان نەدەکرد لەلای ژنێکەوە دانیشن کە ئەویان بە یاخییەکی تاوانبار دەزانی، کەسێک لەلای ژنێکەوە دانەدەنیشت کە ئەوەندە نەترس بێت. لەچی بترسێت؟ ئەو دەیگوت: ئەوەندە لە تاوان و لە دۆزەخ مەترسن.

لە دەیەی (١٣٣٠/١٩٥٠)دا کێ جورئەتی ئەوەی دەکرد لەلای پیرەژنێکەوە دانیشێت کە دەیگوت: من لەجیاتی هەمووتان دەچمە دۆزەخ، لەجیاتی ئێوە من وەڵامی خودا دەدەمـەوە، دەیگوت: منداڵانی قوتابخانە نابێت گوێ لەقسەی پیرەژن و پیرە پیاوانی نەخوێندەوار بگرن، دەیگوت ئەم نەخوێندەوارانە کەڕو کوێرن. شەهربانوو دڵنیابوو زۆرێک لەو گوناهانەی خەڵکی بۆیان باسدەکرد، خورافیاتە. ڕۆژێک بە ملوکە بیبی هەلی گوتبوو: لە ڕوانگەی ئەم خەڵکەوە گەورەترین گوناە زانست و زانین و بیرکردنەوەیە، ئەو دەیگوت: لە ڕوانگەی ڕوقیەی بووکمەوە هەرچەندە مرۆڤ بێئەقڵترو گەمژەتر بێت، کەسێکی بەدینترەو زووتر دەچێت بۆ بەهەشت. دەیگوت: ئەگەر بەو جۆرە بێت هەموو کەرو گاکان جێگەیان بەهەشتە. لە گەڕەک و کۆڵانی ئێمەدا تەنها یەک ژن هەبوو کە مەلاو زاناو خوێنەر بوو، لە ڕوانگەی خەڵکییەوە کافر بوو، ئەی لە شار و گەڕەک و کۆڵانی ئێوەدا هەبوو؟ چەند کافر هەیە؟

دایکم دەیگوت: شەهربانوو بۆخۆشی نەیدەویست ئێمەی ژنان لەلایەوە دانیشین، دەیگوت، من بە قسەکانتان سەرم دێشێت. ئێستا دوای (٥٥) ساڵ من لە مهری نەوەی شەهربانوو دەپرسم بۆچی دایەگەورەت هەمیشە بەتەنها لەسەری کۆڵانەکە دادەنیشت. ئەویش دەیگوت: دژەکانی ئەویان بە کافر ناودەبرد. من چاوەڕوان بووم مهری ئەم قسەیە بکات تاکو پرسیاری لێ بکەم، بۆیە خێرا لێمپرسی بۆچی خەڵکی ئەویان بە کافر دەزانـی؟ ئەم وشـەی کافرە لەکوێوە هات؟ مهری گوتی: دایەگەورەم مەلا بوو،

حوجرەی هەبوو، نزیکەی چل ساڵ وانەی بە منداڵانی خەڵکی گوتووە، لە تەمەنی (٢٥) ساڵی تاکو (٦٥) ساڵی حوجرەی هەبووە. مەلا نەباتیش خوێندکاری ئەو بووە. ئەگەر وابێت شەهربانوو دەبێت لە ساڵی (١٢٧٠-١٣١٠/ ١٨٩١-١٩٣١) خاوەنی حوجرە بووبێت. شەهربانوو لە حوجرەکەیدا جگە لە قورئان، هۆنراوەکانی مەسنەوی و دیوانی شەمس، شانامەشی بە منداڵان گوتووە. جگە لە منداڵانی موسڵمان منداڵانی یەهودی و زەردەشتیش دەچوون بۆ حوجرەکەی، ئەوان لەوێ شانامەیان خوێندووە. شەهربانوو ماوەیەکیش وانەی تەوراتی بە منداڵانی یەهودی گوتووە، هەربۆیە مەلاکانی پێیانگوتووە شەهربانوو کافرە، دەیانگوت وانەی کتێبی حەرام بە منداڵان دەڵێت، دەیانگوت ئەو ژنە کافرە کە شانامەو مەسنەوی فێری منداڵان دەکات، کافرە، چونکە یەهودی و زەردەشتی لەلایەوە دێن و دەچن. ئەوەندە ئەم قسەیەیان دووبارە دەکردەوە کە ئیتر هیچ کەسێک منداڵەکەی بۆلای ئەو نەناردەوە، هەربۆیە ناچار بووە حوجرەکەی دابخات، لەماوەی ساڵەکانی دواییدا تەنها (٢-٣) منداڵ لەلای ئەو دەیانخوێند. نزیکەی دوای بیست ساڵ خوێندکارە کۆنەکانی کە ببوونە کارمەند، هەموو ڕۆژانێکی دووشەممە لەکاتی عەسردا بۆ ماوەی دوو کاتژمێر دەهاتنە لای بۆ خوێندنی مەسنەوی. تاکو دەوروبەری ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣) هەموو عەسرانی دووشەممەیەک وانەی مەسنەوی دەگوتەوە. لە ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣)دا حوجرەکەیان پێداخست، بەبیانووی ئەوەی ئەوکەسانەی دەچنە لای و مەسنەوی دەخوێنن، کەسانی سیاسین، ئەوان گوتبوویان حوجرە بۆ منداڵانە، کەسانی تەمەن (٤٠-٥٠) ساڵ چی دەکەن لێرە؟ ئیتر ئەوە بوو حوجرەکەیان بەتەواوی پێداخست. دەبینن کاتێک دیکتاتۆریی پەرەیسەند تا کوێ دەگات، دەگاتە دوا کۆڵانەکانی گەڕەکە هەژارنشینەکان و حوجرەی پیرەژنێک دادەخات. کاتێک ڕەزاشاو محەمەد ڕەزاشا دەبنە دیکتاتۆر، کرێکارە هەژارەکانیش لە کۆڵانەکاندا دەبنە دیکتاتۆر.

شەهربانوو هەمیشە بەخەڵکی دەگوت، کچەکانتان بنێرن بۆ قوتابخانە. ڕۆژێک شەهربانوو بە حاجی ئاغا ڕەزا، کە دەوڵەمەندی گەڕەکەکە بوو، دەڵێت: تۆ لەم دنیایەدا لە دۆزەخدایت، چونکە مۆڵەتت بە کچەکانت نەدا بچن بۆ قوتابخانە. شەهربانوو پێداگریی کردبوو کە دەبێت نەوەکانی بنێرێت بۆ قوتابخانە، خۆ ئەگەر فشاری شەهربانوو نەبووایە، باوکی مهری ملکەچی ڕوقیەی هاوسەری دەبوو، مهریش هەروەکو خوشکەکانی نەدەچوو بۆ قوتابخانە. زۆرێک لە پیرەژنەکانی سەردەمی قاجارییەکان لایەنگری

خوێندن بوون، بەڵام زۆرێک لەو کچانەی سەردەمی ڕەزاشا دژی خوێندن بوون. منیش نازانم بۆچی وابوو؟ شەهربانوو بە مهری نەوەی دەگوت: من بۆخۆم پشتیوانیت لێدەکەم، هەتا من زیندووم تۆ برۆ بۆ قوتابخانەو بخوێنە، ڕوقیەش نەیدەتوانی دژی شەهربانوو بوەستێتەوە. شەهربانوو بە ڕوقیەی گوتبوو: ئەگەر نەهێڵیت مهری بچێتە قوتابخانە، هەموو ئاڵتوونەکانم دەدەم بە ئەشرەف. ئەشرەف شووبرای ڕوقیە بوو، ئەویش کوڕی شەهربانوو بوو ماڵیان سێ کۆڵان لەولاتر بوو. شەهربانوو تەنها دوو کوڕی هەبوو، کچی نەبوو. شەهربانوو هیچ کاتێک پارەو دیاری لە خوێندکارەکانی خۆی وەرنەگرتووە، هاوسەرەکەشی زوو مردبوو، هەردوو کوڕەکەی بە کاری دەستی و چنین گەورەکردبوو و ژنی بۆ هێنابوون. هەندێک لە خەرجی ژنهێنان و شووکردنی نەوەکانیشی ئەو دابووی. شەهربانوو دەیگوت: ئەگەر ژن کار نەکات و نەچێت بۆ بازاڕ، ئەوە ژنێکی دواکەوتووە. ئەو دەیگوت: مرۆڤ نابێت بێکار دانیشێت، ئەگەر کەسێک کار نەکات، خوو بە بێکارییەوە دەگرێت. کاتێک کەسێک بێکاربوو، سەر بە هەموو شوێنێکی خراپدا دەکات و تووشی بەڵاو دەردەسەری دەبێت. مرۆڤی بێکار هەمیشە توڕەو کەمئەقڵن. کەسێک کە پارەی پێنەبێت و نەزانێت پارە چۆن پەیدادەکرێت، کەسێکی بێکەڵک دەردەچێت، ئەو بە مهری دەگوت: ئەگەر دایکت کارێکی بکردایە، بە کارەکەیەوە سەرگەرم دەبوو، لە توهمەت و بوختانکردن دووردەکەوتەوە، دایکت لە ماڵەوە بێکارە، هەمیشە بەدوای قسەی بێتام و شەڕانگێزییەوەیە. چونکە بێکارە، هەمیشە لەگەڵ ژنانی تردا کۆدەبێتەوە بۆغەیبەتکردن، ئەوەش بۆ ئەو جۆرێکە لە کارکردن. ئەگەر تۆ بتەوێت وەکو دایکت لێنەیەت پێویستە بخوێنیت و ببیتە مامۆستا، پێویستە کار بکەیت، ئەگەر بچیتە ژێرزەمینەکەو خەریکی کاری چنین بیت، پارەیەکیشت دەستدەکەوێت و ئەقڵیشت لە ئەقڵی مرۆڤە بێکارەکان زیاتر دەبێت.

شەهربانوو ڕۆژ بەڕۆژ پیرترو بێهێزتر دەبوو. ئیتر نەیدەتوانی بەگۆچانەکەشی بەڕێدا بڕوات. ڕۆژانە کاتی عەسر نەوەکانی بن باڵیان دەگرت و دەیانهێنایە سەرکۆڵانەکە. شەوانە محەمەد عەلی و مهری هاوکارییان دەکردو دەیانبردە ژوورەوە. ڕۆژێک هەواڵ بڵاوبووەوە کە شەهربانوو نەخۆشەو لەسەر قەرەوێڵەکەی کەوتوتە خوارەوەو ژێر خۆی تەڕ دەکات، ناچاربوون دکتۆری بۆ بهێنن. ڕوقیە بە شەهربانووی گوتبوو: دەبێت پێم بڵێیت ئاڵتوونەکانت لەکوێ داناوە؟ من کچم هەیەو دەیانەوێت شوو بکەن.

دەبێت پێویستییەکانی ماڵیان بۆ دابین بکەم، پیاوەکەشم پارەی نییەو ناتوانین خەرجی دکتۆرو دەرمانی تۆ بکێشین. محەمەد عەلیش هاواری بەرامبەر ژنەکەی کردبوو، ئەوە چ قسەیەکە بەرامبەر بە دایکم دەیکەیت؟ ڕوقیە گوتبووی: چەندین ساڵە بۆخۆی دەڵێت ئاڵتوونم هەیە، باشە ئەو ئاڵتوونی بۆچییە؟ شەهربانوو دوو تاک گوارەی ئاڵتوونی لەگوێدابوو، هەردووکی لە گوێی دەرکردو دای بە ڕوقیە. چەند ڕۆژێک شەڕو هەرا نەما. نەخۆشی شەهربانوو بەردەوام بوو. مهری هەموو بەیانییەک دۆشەکە تەڕەکەی دایەگەورەی دەبردە بەر هەتاو بۆئەوەی وشک ببێتەوە، دۆشەکی وشکی بۆ ڕادەخست. ئەم سامانە چ خزمەتێکی کردووە، چەندە شەڕو ئاژاوەکانی کەمکردۆتەوە. ڕوقیە دووبارە فشاری بۆ شەهربانوو هێنابوو دەبێت شوێنی هەڵگرتنی ئاڵتوونەکانی پێ بڵێت. شەهربانووش دەستیکردبوو بەگریان و گوتبووی هیچ ئاڵتوونێکی نەبووە، جگە لە گوارەکانی نەبێت. ڕوقیەش دەیقیژاند بە سەریداو جوێنی دەداو دەیگوت: بۆچی کاتی خۆی درۆت لەگەڵدا کردم و گوتووتە ئاڵتوونم هەیە. ڕۆژێکیان مهری لە دایەگەورەی پرسیبوو، ئایا بەڕاستی هیچ کاتێک ئاڵتوونی نەبووە. شەهربانووش ئاماژەیەکی بۆ کتێبەکانی کردبوو گوتبووی ئەوانە ئاڵتوونن، پاشانیش گوتبووی ئەو دەزگای چنینانەی ژێر زەمینەکەش هەر ئاڵتوونن، دەتوانن کاریان پێبکەن و بە داهاتەکەی ئاڵتوون بکڕن. من بە داهاتی ئەو دەزگایانە ئاڵتوونم بۆ هەمووتان کڕیوە. بە مهری گوت: شەست ساڵە هاوسەرەکەم مردووە، دوو کوڕی هەتیوم گەورە کردووەو ژنم بۆ هێناون، هەرچی ئاڵتوونی هەمبووە لەکاتی شووکردن و ژنهێنانی نەوەکانم دراوە بە ئەوان، خۆ ئەگەر ئاڵتوونم هەبێت دەیدەم بە تۆ، ئاڵتوونی من کتێبەکان ودەزگاکانمە. تۆ تەنها نەوەی منی کە هاوکاریم دەکەیت، تەنها نەوەی منی کە چویتە قوتابخانە. تەنها تۆ میرات گری منیت. شەهربانوو بە مهری نەوەی گوتبوو: دایکەکەم هەموو ئاڵتوونی من ئەو جوتە گوارەیە بوو کە دامە دایکت. مهری گوتبووی: ئەی بۆچی پێشتر گوتبووت ئاڵتوونم هەیە؟ شەهربانووش گوتبووی: ئاخر ئەگەر ئەو درۆیەم نەکردایە، دایکت پانزە ساڵ لەمەوبەر لە ماڵەکە دەریدەکردم. پانزە ساڵ لەمەوپێش کە یەکەمجار نەخۆشکەوتم و ماوەیەک لەسەر جێگا کەوتم، ئەوکاتە هێشتا دەزگاکانم لەکاردا بوون، دایکت دەهاتە پشت سەرمەوەو دەیگوت پارەمان نییە چۆن بتوانین خەرجیی نەخۆشی تۆ بکێشین. منیش گوتم: ئەوە نییە دەزگاکانم داهاتیان هەیە. ئەویش دەیگوت: داهاتی دەزگاکان

کەمە. دەیگوت: دەبێت بچیت بۆلای ئەشرەفی کوڕت. منیش بە دایکتم گوت: با لێرەبم دوایی ئاڵتوونەکانم دەدەم بە تۆ. کاتێک دایکت بۆی دەرکەوت هیچ ئاڵتوونێکم نییە، ئیتر هێمنی و ئارامی لەم ماڵەدا نەما. ڕوقیە هەموو ڕۆژێک، بەڵکو هەموو کاتژمێرێک هاواری دەکردو دەیگوت: خودایە من چ تاوانێکم کردووە؟ کە دەبێت چاودێریی ئەم پیرەژنە کافرە بکەم. هەر ڕۆژنا ڕۆژێک دەچوو بۆ ماڵی ئەشرەفی برای هاوسەرەکەی و لەگەڵیدا دەیکرد بەشەڕو دەیگوت: ئێستا شەهربانوو بەشی تۆیە، ئەوەتا من ماوەی (٢٠) ساڵە چاودێریی ئەو پیرەژنە دەکەم. ئەشرەفیش دەیگوت: کێ ئاڵتوونەکانی بردووەو خواردوویەتی، با ئەو چاودێری بکات. کاتێک دەرکەوت کە ئاڵتوون بوونی نییە، ئیتر ڕوقیە نەیدەهێشت ئاسیای یەهودی وردەواڵەکانی لە ماڵی ئەواندا بڵاوبکاتەوە. دوای چل ساڵ تەواوی وردەواڵەکانی ئاسیای فرێدایە کۆڵان، دەرزییەکانی ئەو پیرەژنە یەهودییە لە کۆڵانەکەدا کەوتبوو. دەنگەدەنگی ڕوقیە بووە هۆی ئەوەی دراوسێکان کۆببنەوەو هەرکەسەو قسەیەکی دەکرد. ڕوقیە دەیگوت: من کافرێک لە ماڵەکەمدایە، ئیتر توانای ئەم ژنە یەهودییەشم نییە. ژنانی گەڕەکیش جوێنیان بە ڕوقیە دەداو نەفرەتیان لێدەکرد. چەند ژنێک پێشنیاریان کرد کە ئاسیا بچێت بۆ ماڵی ئەوان. ژنی ڕەزا سومال و بیبی زەهراو چەند ژنێکیتر کەلوپەلەکانی ئاسیایان کۆکردەوەو بڕیاردرا لەوەودوا ئاسیا وردەواڵەکانی لە ماڵی بیبی هاجەری عاشقە مەدینە بڵاوبکاتەوە. ئەو ڕۆژە لانیکەم بیست کەس نانی نیوەڕۆی بۆ ئاسیا هێنابوو. ئاسیا هەموو جۆرە خواردنێکی لە ژنانی موسڵمان وەرنەدەگرت. لەو بەروارە بەدواوە ئەو پیرەژنە یەهودییە تا چەندین ساڵ هەموو پانزە ڕۆژ جارێک لەبەردەم ماڵی بیبی هاجەردا وردەواڵەکانی بڵاودەکردەوە. ئیتر ئاسیا تا کۆتایی تەمەنی وردەواڵەکانی لەبەردەمی ماڵی بیبی هاجەردا بڵاودەکردەوە. من بووم بە خوێندکاری زانکۆو لە یەزد ڕۆیشتم، بەڵام ئاسیا بەردەوام بوو لە کارەکەی. ڕوقیە لەو ڕۆژەوە کە وردەواڵەکانی ئاسیای فڕێدایە کۆڵان، ئیتر لەناو ژنانی گەڕەکدا ئەو ڕێزەی نەما. بەهۆی دەمارگیریی کوێرانەوە بنەمای هاوژیانی و پێکەوەژیان لە شارو گەڕەکی ئێمەدا لەناوچوو. ژنانی گەڕەک دەیانگوت: ڕوقیە لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەیدا کێشەو هەرای هەیە، بۆچی وردەواڵەی ئەو ژنە یەهودییە فڕێدەدات؟ لەدوای ئەم ڕووداوەوە کارو کاسبی ئاسیا باشتربوو.

کاتێک دەرکەوت شەهربانوو ئاڵتوونی نییە، بەتەواوی پشتگوێیان خست، پیرەژنی نەخۆش شەو و ڕۆژ لە ژوورەکەی خۆیدا کەوتبوو. مهری بە بەردەوامی و خوشکەکانی جارجارێک بەسەری ڕادەگەیشتن. ڕوقیە هاواری لە کچەکانی دەکردو دەیگوت: واز لەو کافرە بهێنن هەرچی زووتر بڕوات بۆ دۆزەخ باشترە. مهریش بەبێدەنگی دەگریاو فرمێسکی دەڕشت... زینەتیش بەسەر دایکیدا دەیبۆڵاندو دەیگوت: ئەو دایەگەورەی ئێمەیە، دایکی باوکمانە، زەحمەتێکی زۆری بە ئێمەوە کێشاوە، چیرۆکی بۆ گێڕاوینەتەوە، هۆنراوەی بۆ خوێندووینەتەوە، پارەی پێداوین، کاتی شووکردن ئاڵتوونی بۆ کڕیوین، هاوکاری هاوسەرەکانی کردووین، جگە لەوەش ئەو مرۆڤە. زینەت و مهری بە دایکیان دەگوت: تۆ زۆر توڕەو تووندیت، بەڵام زۆر بەدینیت لە خودا بترسە. ڕوقیە دەیگوت: من لە خودا دەترسم، بەڵام چۆن لەو دنیای تردا وەڵامی خودا بدەمەوە، کە بۆچی ئەو پیرەژنە کافرە بەخێودەکەم. ئەو پیرەژنە ساڵی جارێکیش نوێژ ناکات. ئێستا لێی بپرسە نازانێت نوێژ چۆن دەکرێت. زینەت و مهری دەیانگوت: ئەو ئێمەی فێری نوێژ کردووە. ڕوقیەش دەیگوت: بەڵام هەرگیز بۆخۆی نوێژی نەکردووە. هەرگیز نزایەکی خێری نەکردووە. ئەوانیش گوتیان: بەڵام دایە ئەو هەرگیز نزای خراپیشی لە هیچ کەسێک نەکردووە. ڕوقیەش دەیگوت: هەرکەسێک کەسێکی کافر بکوژێت دەچێتە بەهەشت، بەڵام وا من ئەم کافرە ناکوژم، چۆن وەڵامی خودا بدەمەوە.

شەهربانوو کەمێک باری نەخۆشییەکەی باشتر ببوو، ئەو بە لۆژەلۆژ خۆی دەگەیاندە سەر کۆڵانەکە، لەوێ دادەنیشت. دوایی چاوەڕێی دەکرد تاکو کەسێک بێت و بیباتە ژوورەوە. هەندێکجار محەمەد عەلی درەنگ دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، دراوسێکان هاوکاری مهرییان دەکرد بۆ بردنە ژوورەوەی شەهربانوو. ڕوقیە شەو و ڕۆژ لەگەڵ محەمەد عەلی لەشەڕدابوو. کاتێک توڕەیی هات ئەقڵ دەڕوات، دەمارگیری و بەخیلی عەشق و ئەقڵ لەناودەبەن. کەسێک کە سەرمەستی دەسەڵات بوو، ئەقڵی کەم دەبێت، چاوی کوێر دەبێت، گوێی نابیستێت، سەرمەستی دەسەڵات لە مەستی بە هیرۆین و تلیاک خراپترە. مەستی بە ماددە هۆشبەرەکان بنەماڵەیەک لەناو دەبات، بەڵام سەرمەستی بەهێزو دەسەڵات گەل و وڵات لەناودەبات. هەتا زیاتر سودمەند بێت زیاتر سەرمەست دەبێت، وازهێنان لە دەسەڵات سەدانجار لە وازهێنان لە ماددەهۆشبەرەکان گرانترە. هیتلەرو ستالین و مۆسۆلۆنی و سەدام حسێن و قەزافی نموونەی ئەوانەن،

ئەگەر بتوانیت بە ئامۆژگاریکردن تلیاک بە ئالودەبوویەکی تلیاکی تەرک بکەیت، ئەوا دەتوانیت بە ئامۆژگاریکردن تەرکی دەسەلات بە ئالودەبوویەکی دەسەلات بکەیت.

## ماموستا کاوە

محەمەد عەلی بەحەساب کەسێکی ئایینی بوو، شەوان دوایین کەس بوو لە مزگەوتەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. چەند ژنێک لە ژنەکانی دراوسێیان بە ڕوقیەیان گوتبوو تۆ هەمیشە باسی گوناهـ و چاکە دەکەیت، بەلام بەرامبەر بەو پیرەژنە ڕەفتارت خراپە. ڕوقیەش گوتبووی: ئەو پیرەژنە کافرە، نوێژ ناکات، هەرگیز ڕۆژووی نەگرتووە، درۆ دەکات، کتێبی حەرام دەخوێنێتەوە، هۆنراوەی ناپەسەند دەخوێنێتەوە. ئێوەش یا قسە مەکەن، یا ئەو پیرەژنە کافرە ببەن بۆ ماڵی خۆتان. سەکینەی ئینتزاری گوتبووی: من ژووری بەتاڵم هەیەو پێی بدەم، بەلام خۆم قاچم نییەو ناتوانم خزمەتی بکەم، ئەگەر کەسێک هەبێت خزمەتی بکات، با شەهربانوو بێتە ماڵی ئێمە، ئەگەر کەسێکیش نەبێت، ئێمە بەهەموو دراوسێکان خزمەتی دەکەین. بیبی ڕوباب مەلا ڕۆیشتبوو تا شەهربانوو ببیات بۆ ماڵی خۆیان، ژوورێکی بۆ چۆڵ کردبوو. دراوسێکان ئامادەییان دەربڕیبوو کە خزمەتی شەهربانوو بکەن، بەلام محەمەد عەلی مۆڵەتی نەدابوو دایکی لەماڵ بەرنە دەرەوە. ڕۆژێک شەهربانوو بە مهری گوتبوو: شەڕی من و دایکت شەڕی بووک و خەسوو نییە، شەڕی ئێمە شەڕی شەریعەت و بیروباوەڕە، شەڕی خۆسەویستی بۆ خوداو کۆنەپەرستییە، شەڕی ئازادی و کۆمەلایەتییە. مهری لەو بارەیەوە زۆر شت لە دایەگەورەوە فێر ببوو. شەهربانوو بە قاچە فەلەجەکانی و بە هاوکاری مهری خۆی دەگەیاندە سەر کۆلانەکە، کاتێک قاچەکانی فەلەج ببوو، زمانی باشتر دەگەڕا. لەکاتێکدا کە بە ئیفلیجی و نیوە ئیفلیجی دەهاتە سەری کۆلانەکە، هەرکەسێک بەو کۆلانەدا گوزەری بکردایە، ئەو هۆنراوەی بۆ دەخوێندەوە. قسەی لەگەڵدا دەکردو ئامۆژگاری دەکرد. لەکاتی ئیفلیجیدا هەندێکجار پیاوانی گەڕەک لەلای دادەنیشتن و گوێیان لە هۆنراوەکانی دەگرت. ڕۆژێک من لە قوتابخانەوە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە دوانیوەڕۆ بوو، شەهربانوو لەسەری کۆلانەکە دانیشتبوو، سلاوم لێکردو گوتی: حوسێن وەرە ئێرە دانیشە، هۆنراوەیەکت بۆ دەخوێنمەوە تۆش بینووسەرەوە، پاشان پێم بڵێ هۆنراوەی کامە شاعیرە، خۆت پاشماوەی هۆنراوەکە پەیدابکەو بیخوێنەرەوە. قەڵەم و کاغەزم دەرهێناو ئەو هۆنراوەکەی دەخوێندەوەو منیش دەمنووسییەوە تا ئەو ڕۆژە

هەرگیز پێینەوتبووم هۆنراوە بنووسە، هەمیشە هۆنراوەی دەخوێندەوەو دەیگوت: ئەوە هۆنراوەی کێیە؟ ڕۆژی دواتر خۆی ناوی شاعیرەکەی پێدەگوتم، بەڵام ئەمجارەیان گوتی وەرە ئەو هۆنراوەیە بنووسەرەوە.

**هەر کاری تۆ هەوڵی ئەنجامدانی دەدەی**
**بە کۆمەکی خودایەو دواجار هەوڵی دەدەی**
**بە هەر بارێک ئەگەر سودەو ئەگەر زیان**
**لە هەولایە، چێژی کۆشش بە خۆ دەدەی**
**هێواش هێواش ئێوەش خۆتان هەر دەگۆڕێن**
**هەر وەک چۆن میوەی داریش دەگا، دەگەی**
**وەکو کەسان بە چ چەشنێ فێری کار بوون**
**هەر بەو نەزمە لە سەرخۆ بە ژیری دەگەین**
**گشت ئەزمون وتوانا و گوتەو پیشەو کارت**
**دەبن ئاشکار ڕۆژی دوایی دێ، پێی دەگەی**
**چۆن بەبێ بەرگ سەراسیمەی لەگەڵ خەڵکی**
**نەنگیت دەڵێ، ئاشکراین ساخۆت دەرخەدەی**

ئەوکات لە پۆلی یەکەمی ناوەندیی بووم، لە قوتابخانەی ئیرانشەهر بووم، بۆ ڕۆژی دواتر هۆنراوەکەم بۆ چەند هاوڕێیەکم خوێندەوە، لێمپرسین دەزانن ئەوە هۆنراوەی کێیە؟ هیچ کەسێک نەیزانی. وانەی خۆشنووسیمان هەبوو، ئاغای عەلی محەمەد مامۆستامان بوو، ناوی شاعیرەکەم لەو پرسی، ئەویش گوتی: قەڵەم قامیشەکەت دەرکەو دوو سێ جار هۆنراوەکەت بنووسەرەوە، هەرجارەو لەسەر پەڕەیەکی جیا بینووسەرەوە هەرکاتێک بەتەواوی سێ جار هۆنراوەکەت نووسییەوە ئەو کات پێت دەڵێم هۆنراوەی کێیە؟ جاری یەکەم کە هۆنراوەکەم نووسی پیشانی مامۆستا کاوەم دا. گوتی: پێویستە هۆنراوەکە زۆر جوانتر بنووسیتەوە، ئەمەم بەدڵ نییە. تا وانەکەمان تەواو بوو، نەمتوانی سێ جار هۆنراوەکە بەجۆرێک بنووسمەوە کە جێگای ڕەزامەندیی ئەو بێت. ئەویش پێی نەگوتم هۆنراوەی کێیە؟ لە مامۆستاکانی تریشم نەپرسی. کاتی عەسر کە گەڕامەوە بۆماڵەوە، شەهربانوو لەسەری کۆڵانەکە دانیشتبوو، لە بارێکی خراپدابوو، وابزانم

ژێر خۆی تەڕکردبوو. سڵاوم لێکردو لەبەر خۆمەوە دەمگوت: خودایە لێم نەپرسێت هۆنراوەکە هی کێ بوو؟ گوتی: حوسێن وەرە هاوکاریم بکە با ڕێک دانیشم. منیش هاوکاریم کردو ڕاست دانیشت. گوتی: هۆنراوەکە هی کێ بوو؟ گوتم: نازانم. گوتی: لە مامۆستاکانت نەپرسی؟ منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەویش گوتی: ئەو مامۆستا کاوەیە تەنها جوانیی خەتی دەوێت. ناوەڕۆک نابینێت، خەت بەلای ئەوەوە ڕەنگ و ڕووە، مانا نییە. ئەو ڕۆژە قسەیەکی کرد کە هەرگیز لەیادم ناچێت. گوتی: لە سەردەمی دیکتاتوریدا هونەری خۆشنووسی برەوێکی زۆر پەیدا دەکات، لە هەموو هونەرەکانی تر زیاتر دەردەکەوێت. منیش هۆیەکەیم لێپرسی. ئەویش گوتی: خۆشنووسی تەنها هونەرێکە کە دیکتاتۆرەکان بەئاسانی دەتوانن کۆنترۆڵی بکەن، هیچ هونەرێکی تر وەکو هونەری خۆشنووسی کۆنترۆڵ ناکرێت. ئێستا تێدەگەم ئەو چی گوت! گرنگ بوو کە ئەو لەو سەردەمەدا ئەو قسەیەی کرد. دوایی شەهربانوو گوتی: دانیشەو پاشماوەی هۆنراوەکە بنووسە. ئەو پانزە دێڕی تری لە هۆنراوەکە خوێندەوەو منیش نووسیم ئەم دوو دێڕەی دووجار گوتەوە. واتە گوتی دووجاری بنووسەرەوە.

**نەک هەر ترس و نەک ئاگایی هەم ژیری و دین**
**مەست و پەشێو کەوتونە خاک پەسلانە دەی**
**بەهەشت و حۆری مانەوە گونجاون سا**
**نەگونجاو باجی بێگانەیی و ویڵی دەدەی**

دوایی گوتی: ئەم هۆنراوەیە لە کتێبی (گوڵشەنی ڕازی شێخ مەحمودی شەبەستەریە). من تا ئەو ڕۆژە ناوی شێخ مەحمودی شەبەستەریم نەبیستبوو، جا چ بگات بەناوی کتێبەکانی. لە شەهربانووم پرسی تۆ لەکێوە فێری خوێندەواریی بوویت. گوتی: لە دایکم و باوکم و مەلایەک بەناوی مهرانگیز. شەهربانوو بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: میهرانگیز زەردەشتی بوو، هەر ئەو شانامەو مەسنەوی و مەعنەوی و حافزی فێرکردم. هاوسەرەکەی شەهربانووش خوێندەوار بوو، حەزی لە هۆنراوەو خوێندنەوە بوو، لەساڵی (٢٠١٢/١٣٩١) چووم بۆ سەردانیکردنی خانم ئەقدەسی بەقایی، ئەویش گوتی: ژنێکی زەردەشتی بەناوی شیرین ماموستای دایکی بووە. دایکی هەرکاتێک شیرینی بینیوە، دەستی ماچکردووە. دیارە ڕۆژگارێک بووە ژنانی زەردەشتی مامۆستای کچانی

موسڵمان بوون لە ماڵەکانی خۆیاندا. باوکی شەهربانوو کارمەندی فەرمانگە بووە لە یەزد، دایکیشی کچی پیاوێکی ئاینی بووە. هەردووکیان کەسانی خوێندەوارو ڕۆشنبیر بوون. هاوسەرەکەشی هەر کارمەند بووە. باوک و باپیری هاوسەرەکەی لە سەردەمی مەشروتەدا کەسانێکی زۆر چالاک بوون، ڕۆژنامەی جۆراوجۆریان دەبردەوە بۆ ماڵەوە. شەهربانوو یەکێک بووە لە لایەنگرانی ڕەوتی کاروباری مەشروتەخوازانی تاران و تەورێزو باکۆ و ئەستەمبوڵ و قاهیرە... ئەو لەسەردەمی مەشروتەدا تەمەنی لە سی ساڵ زیاتر بووە. بەداخەوە من لە دەیەی (١٩٥٠/١٣٣٠) منداڵبووم، پرسیاری زیاترم لە شەهربانوو نەکرد. مهریش زانیارییەکی زیاتری لە ڕابردووی دایەگەورەی نەبوو.

یەکێک لە شەڕو کێشەکانی دایک و باوکی مهری، لەسەر ڕۆژنامە خوێندنەوەی شەهربانوو بوو. ئەو پیرەژنە کاتێک لەسەر کۆڵانەکە دادەنیشت داوای دوو شتی لەو خەڵکە دەکرد. یەکێکیان ئەوە بوو داوای لێدەکردن هاوکاری بکەن تا ڕاست دابنیشێت و ڕاستیبکەنەوە، دوومیشیان ئەوە بوو کە بچن ڕۆژنامەی بۆ بکڕن. ئەو داوای لە کەسانێک دەکرد کە ڕۆژنامەی بۆ بکڕن کە هەرگیز بۆ خۆیان ڕۆژنامەیان نەدەخوێندەوە. محەمەد عەلی کاتێک کە دەهاتەوە بۆ ماڵەوە لەگەڵ دایکی مهری دەبوو بە شەڕیان، محەمەد عەلی بە هاوکاری مهری بەیەکەوە شەهربانوویان دەشۆری. ئەوکاتە لە هیچ ماڵێکدا حەمام نەبوو هەموو کچەکان بۆ هاوکاریکردنی دەهاتن. ڕوقیەش شەڕی پێدەفرۆشتن و دەریدەکردن لە هەموو گرفتارییەکدا ڕوقیە دەیگوت: دەبێت مهری شووبکات. هەرچەند مهری زیاتر هاوکاری دایەگەورەی دەکرد، دایکی زیاتر پێداگریی دەکرد، کە دەبێت مهری شوو بکات و لەو ماڵە بڕواتە دەرەوە.

## شووکردنی مهری

دوو کەس داوایانکردبوو کە مهری هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکات، یەکێکیان کوڕێک بوو خزمی دایکی بوو، مهری دەگریاو دەیگوت: نامەوێ شوو بکەم. ڕوقیەو ئەکرەمە فشاریان بۆ محەمەد عەلی هێنابوو، کە دەبێت مهری شوو بکات. دایکی لە توڕەییداو خوشکەکەشی لە بەخیلیدا، هەموو ڕۆژێک لەو ماڵەدا شەڕو هەرا بوو. ژنانی دراوسێ دەیانگوت: خودایە هیچ ماڵێک بێ گەورە نەبێت. خوشکەکانی مهری هەموویان لە تەمەنی منداڵیدا شوویان کردبوو. زینەت لە تەمەنی پازدە ساڵیدا، ئەعزەم

لە چواردە ساڵیدا، ئەکرەمەش لە سیانزە ساڵیدا. مهری کاتێک تەمەنی حەوت ساڵ بوو، ڕوقیە دەیگوت: کچەکەی خەریکە دەبێتە قەیرە، ئەو هەمیشە دەیگوت خودایە ئەم قوتابخانانە وێران بکەیت، کە بوونەتە هۆی قەیرەیی کچانی ئەم سەردەمە. کچان لەم سەردەمەدا زۆر بە ئاسودەیی دەچنە قوتابخانەو زانکۆ، ئەوان پێویستە بزانن کە چوونە قوتابخانەی دایک و دایکەگەورەیان هەروا ئاسان نەبووە، تەنانەت چوونی کوڕانیش بۆ قوتابخانە چیرۆکی دوورودرێژی هەیە. لە سەردەمی قاجارەکاندا دروستکردنی قوتابخانە ڕووبەڕووی بەرهەڵستکاریی دەبووەوە، هەوڵەکانی خوالێخۆشبوو حەسەن ڕەشدیەو یادەوەرییەکانی یەحیای دەوڵەت ئابادی بخوێننەوە. خەڵکی ئەم سەرزەمینە بۆ بەدەستهێنانی بچووکترین شتێک پێویستە خەبات و بەرگریی بکەن، چ بگات بە قوتابخانە کە دیاردەیەکی گەورەو گرنگە.

خەلیفە محەمەد عەلی بۆ دوورکەوتنەوە لە ماڵەوە بوو بە پیاوی مزگەت، هەر بەڕاستی ئەو لە ماڵی خۆی هەڵهات، پێش ئەوەی شەڕو هەرا لە ماڵەکەیدا دروست ببێت پێی نەدەخستە مزگەوت و حوسێنییەوە. کاتێک ماڵەکەی بوو بە شوێنی شەڕو دەمەقاڵە، ڕۆژانە دەچووە سەر کارو شەوانەش دەچووە مزگەوت. بەڕاست لەو ساڵانەدا ئەو دەیتوانی بچێت بۆ کوێ؟ خودا ڕوحمی پێکردبوو بۆ ڕاکردن لە ماڵەوە دەڕۆیشت بۆ مزگەوت. هەندێک کەس بۆ ڕاکردن لە ماڵەوە دەچوونە گازینۆکان، هەندێکیش لەگەڵ هاوڕکانیان دەچوون بۆ نادی و خواردنەوە، هەندێکیشیان ژنی دووەمیان دەهێنا.

شەوێک نۆبەی من بوو لە مزگەوت چایی بگێڕم، ئەو خەڵکانەی لەوێبوون، لە بیست کەس زیاتر نەبوون. چایەکم دا بە خەلیفە محەمەد عەلی. گوتی: حوسێن چایەکی ترم بۆ بێنە، منیش چایەکی ترم بۆ بردو لەلایەوە دانیشتم. گوتم: باشە چۆن بوو وا بوویت بە پیاوی مزگەوت؟ گوتی: نەبووم بە پیاوی مزگەوت، بەڵکو لە ماڵەوە ڕامکردووە، نزات بۆ دەکەم تووشت نەبێت بە تووشی ژنی پوولەکی و وشکەسۆفییەوە. میرزا عەباسی جابری هاوسەری کچە پورم، ئەویش لەلای خەلیفە محەمەد عەلییەوە دانیشتبوو. گوتی: وشکەسۆفی ژن و مێرد ناناسێت، خودا مرۆڤەکان بە نسیب گورگی بیابان بکات، بە نسیبی وشکەسۆفیان نەکات. میرزا عەباسی جابری گوتی: ئەگەر دەتەوێت ژنەکەت وەک مرۆڤ هەڵسوکەوت بکات، دەزگاکانی دایکتی بۆ بخەرە کار و با کاری چنین بکات، دەرمانی دەردی ژنی زۆربڵێ کارکردنە. ڕوقیە دەیویست

مهری بدات بە فەقێیەکی لاو، ئەو فەقێیە خزمی نزیکی ڕوقیە بوو. ڕوقیە دەیگوت: ئەگەر کچەکەم شوو بە فەقێ بکات، ئەوا بەهەشتی مسۆگەرە، لەم دنیایەشدا نانی دەکەوێتە ڕۆنەوە. محەمەد عەلیش دەیگوت: مهری پێویستە دبلۆم وەربگرێت. ڕوقیەش هاواری لێهەڵدەستا، کە نابێت کچەکەی ببێتە قەیرەو ئەو دبلۆمی بۆ چییە؟ دەیگوت: من مۆڵەت نادەم کچەکەم لە دەرەوە کار بکات، کەواتە دبلۆم بە کاری چی دێت؟ محەمەد عەلی دەیگوت: چ نەنگییەکی تێدایە ئەگەر مهری ببێتە مامۆستا. ڕوقیەش دەیگوت: من نامەوێت کچەکەم ببێتە مامۆستاو بچێتە دۆزەخ.

خراپ نییە ئەوەش بزانین لە دەیەی (١٩٦٠/١٣٤٠)دا لەناو خەڵکانی ئاساییدا بەسێ مانگ جارێک و تەنانەت ساڵی جارێکیش باسوخواسی بەهەشت و دۆزەخ نەدەکرا، لەنێوان خەڵکیدا لە کۆڵان و گەڕەک و شاریشدا باسی بەهەشت و دۆزەخ نەدەکرا، تەنها باسی باشی و خراپی کەسەکان دەکرا. من لە سەردەمی منداڵیمدا ساڵانە نزیکەی سێ جار دەچووم بۆ مەراسیمەکانی مزگەوت، لە مەراسیمەکانی ئەو کاتەدا هەمیشە باس باسی ئیمام حوسێن بوو، جگە لەوە ئەگەر باسێکی تر هەبووایە، ئەویش باسی ڕاستی و ڕاستگۆیی و باشی و خراپی مرۆڤەکان بوو. لەو سەردەمەدا پێوەرێکی ڕوون نەبوو، پێوەر تەنها کردەوەی مرۆڤەکان بوو، هەر بەهەمان پێوەر زۆربەی زۆری زەردەشتییەکان بە خەڵکانی باش و بەڕێزو ڕاستگۆو دروستکار دەژمێردران. بەهەمان پێوەر خەڵکە بازارییە موسڵمانەکان و یەهودییە کاسب و بازرگانەکان بە کەسانی ڕاستگۆو دروستکار دەژمێردران. بەهەمان پێوەر مەنشادییەکانیشیان (بەهایی) بە کەسانی باش ناودەبرد. هیچ گرووپێک لایەنی باشی بۆ خۆی قۆرخ نەکردبوو، هیچ گرووپێک بەهەشتی قۆرخ نەکردبوو، دیارە کەسە دەمارگیرەکان کە ژمارەیان زۆر کەم بوو، بەهەشتیان بە موڵکی خۆیان دەزانی، وەک ئەوەی خەڵکانی تر بەندەی خودا نەبن. ڕوقیە بەهەشتی تەنها بۆخۆی و هاوبیرەکانی دەویست، ئەوکاتە لە گەڕەکەکەی ئێمەدا تەنها یەک ڕوقیە هەبوو، بەڵام ئێستا سەدان ڕوقیە پەیدا بوون. ئەی لە ماڵ و کۆڵان و گەڕەک و شاری ئێوە چەند ڕوقیە پەیدابوون.

شێوازی خانووەکەی محەمەد عەلی شێوازێکی گونجاو بوو، بەجۆرێک بوو ئەگەر دەرگای حەوشە کراوە بووایە، لە دەرەوە هەموو ناو ماڵەکە دەبینرا. هەر شتێک لە ژوورەوە ڕوویبدایە، لە دەرەوە دەزانرا. وەکو گوتم خانووی محەمەد عەلی، خانووی

کەسانی کرێکارو کاسبکار بوو، وەک خانووی ماڵە دەوڵەمەندەکان نەبوو. بچووکترین دەنگەدەنگ لە دەرەوەو لە کۆڵان دەبیسترا. منداڵانی ئەمڕۆ لە مانای دراوسێیەتی کۆن تێناگەن، لە کۆندا دراوسێکان ئاگاداری هەموو شتێکی یەکتری بوون، بەتایبەت دراوسێ هەژارو کاسبکارەکان بە بچووکترین دەنگەدەنگ ژن و منداڵان بەبێ ئەوەی مۆڵەت لەخاوەن ماڵ وەربگرن، دەچوونە ژوورەوە. لە ئاهەنگی بووک گواستنەوەو خۆشییەکانی تردا ئامادەییان دەبوو، لە شەڕەکانیاندا بە هانای یەکترەوە دەچوون و نێوەندگیرییان دەکرد. ئێستاش لە شارە بچووکەکان و گوندەکان و گەڕەکە هەژارنشینەکان تارادەیەک ئەو دابە بەردەوامی هەیە. لە ڕابردوودا دەیانگوت: دراوسێ میراتی دراوسێ وەردەگرێت. ئەوکات تا چل ماڵ لەملاو چل ماڵ لەولاوە بە دراوسێ ئەژمار دەکرا. هاوگەڕەکبوون مانایەکی هەبوو، مانای نزیکیی و دۆستی هاوڕێیەتی و یادەوەری... ئەمڕۆ هاوسێیەتی لە شارە گەورەو تازەکاندا بووە بە وشەی بێگانەیی، تێگەیشتن لە مانای وشەی دراوسێ بەدرێژایی پەنجا ساڵ بەتەواوی گۆڕاوە. لەکۆتاییدا محەمەد عەلی تەسلیمی ڕوقیە و کچەکانی بوو. ئامادەیی دەربڕی بۆ بە شوودانی مهری. مهری خۆشی بێزار ببوو لەو ماڵەو لە قسەو ڕەفتارەکانی دایکی، دایکی بەردەوام دەیگوت: کچ نابێت ببێتە قەیرە. مهری بەتەواوی لە دایکی وەڕز ببوو، دەیویست ڕابکات لە ماڵەوە، دەیویست لەدەست کردەوەکانی دایکی ڕابکات.

محەمەد عەلی دەیگوت: ئێستا کە تۆ دەتەوێت مهری شوو بکات، منیش ڕەزامەندم، بەڵام دەبێت شوو بکات بە ئاغا ڕەزای پاسەوان. ڕوقیەش دەیگوت: شتی وا نابێت، دەبێت شوو بکات بە فەقێ عەباس ئاغا. محەمەد عەلی دەیگوت: یا دەبێت مهری شوو بە ئاغا ڕەزای پاسەوان بکات، یان دەبێت هەرگیز شوو نەکات. لەوەیە محەمەد عەلی ئەم قسەیەی بۆئەوە کردبێت ئەگەر ڕوقیە دژی شووکردنی مهری وەستایەوە، ئەوکاتەش مهری کاتێکی دەستدەکەوێت تاکو دبلۆم وەردەگرێت. محەمەد عەلی بە مهری دەگوت: ئەگەر تۆ دبلۆم وەربگریت، دەتوانیت ببیت بە مامۆستا. دواتر بە مهری دەگوت: خۆم چووم لەگەڵ عەلی ئەسغەری ڕەسوڵ زادەگانی بەڕێوبەری پەروەردە قسەم کردووە، گوتوویەتی: ئێمە ئەو کچانەی دبلۆم وەردەگرن، بەزوویی لە گوندەکاندا دایاندەمەزرێنین بە مامۆستا. محەمەد عەلی بە کچەکەی دەگوت: بۆخۆت بڕۆ لە گوندێکی دورە دەستدا ببە بە مامۆستاو هەفتەی یەک جار وەرەوە بۆ شار. پێویستە تۆ لە شەڕی من و دایکت

دووربکەویتەوە. محەمەد عەلی دەیگوت: باشتر وایە مهری بڕوات بۆ دێهاتەکانی کرمان، یان ئەسفەهان، لەوێ ببێت بە مامۆستا، نەک لەم ماڵەدا بێت. باوک بە کچەکەی دەگوت: ئەگەر لە جێگایەکی دوور ببیتە مامۆستا گەلێک باشترە لەوەی شوو بکەیت و دیلی ئەم ماڵ و ئەو کۆڵان بیت. محەمەد عەلی حەزی دەکرد کچەکەی ببێت بە مامۆستا. محەمەد عەلی بۆخۆشی تاکو پۆلی شەشەمی خوێندبوو، ئەو لەلای دایکی وانەی خوێندبوو، ئەویش حەزی لە هۆنراوە بوو، هۆنراوەی زۆریشی لەبەر بوو. چەندینجار لەگەڵ دایکدا شەڕە هۆنراوەیان دەکرد. ڕۆژێک ڕوقیە لە هاوسەرەکەی پرسی تۆ بۆچی دەتەوێت مهری شوو بە ئاغا ڕەزای پاسەوان بکات؟ بۆچی شوو بە فەقێ عەباس نەکات؟ محەمەد عەلی دەیگوت: من حەز ناکەم کچەکەم ببێتە مەلا ژن، مەلاکان هیچ داهاتێکیان نییە. خۆیان و ژن و منداڵەکانیان هەمیشە دەبێت بەڕۆژووبن. لە ماڵی مەلاکاندا هەموو شتێک دەستووردان و فەرمانکردنە (امرو نهی)، من نامەوێت کچەکەم بچێتە ئەو جۆرە ماڵانەوە. ڕوقیە بەسەر هاوسەرەکەیدا نەڕاندی و گوتی: بەڕاستی تۆ کوڕی شەهربانووی کافریت. محەمەد عەلی گوتی: من شانازی دەکەم کە کوڕی شەهربانووم. ڕوقیەش دەیگوت: من شانازی دەکەم کە کچی مەلا حەسەنم. محەمەد عەلی دەیگوت: ئاخوند هیچ داهاتێکیان نییە، بەڵام پاسەوان هەم مووچەی هەیەو هەم داهات. ڕوقیە بە هاوسەرەکەی دەگوت: هەی نمەک بەحەرام تۆ بە ئەندازەی هەزار مەن گۆشت و برنج و ڕۆنی زەردو پاقلاوەی ماڵی باوکمت خواردووە، لە چ ماڵێک، لەماڵی باوکم زیاتر خواردن و خۆراکت دەستدەکەوێت، تۆ ئەو هەموو خواردنەت لەوێ خواردووەو کەچی دەڵێیت داهاتی مەلا کەمە.

## ئاغا ڕەزای پاسەوان

ئاغا ڕەزای پاسەوان کەسێکی نموونەیی بوو، باڵایەکی بەرزی هەبوو، کاتێک جلوبەرگی پاسەوانیی لەبەردەکرد، بەژنوباڵای جوانتر دەردەکەوت، کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، پیاوێکی بەڕێزی گەڕەک بوو. لە گەڕەکدا کەسێکی خۆشەویست و خزمەتگوزار بوو، سڵاوی لە هەموو کەسێک دەکرد، هەمیشە بە سواری پاسکیل دەچوو بۆ کارەکەی. کۆڵانەکانی ئەوسەردەمە چۆڵ بوون، منداڵان لەنێو کۆڵاندا یارییان دەکرد. ئاغا ڕەزا لەگەڵ منداڵاندا زۆر گەرموگوڕ بوو، ئەگەر کەسێکی ببینیایە هەردووک دەستی لە سوکانی پاسکیلەکەی بەردەداو هەردوو دەستی تا لای چاوی بۆ بەرزدەکردەوەو

سڵاوی لێدەکرد، کاتێ پیاوە گەورەکانی گەڕەکی دەبینی، لە پاسکیلەکەی دادەبەزی و سڵاوی لێدەکردن، کاتێ مامۆستا (مەحسل هەمەدانی) پێشنوێژی مزگەوتی گەڕەکی دەبینی، لە پاسکیلەکەی دادەبەزی و لەبەردەمیدا خۆی دەچەماندەوە. کاتێ مامۆستایان و بەڕێوەبەری قوتابخانەی دەبینی، لە پاسکیلەکەی دادەبەزی و سڵاوی لێدەکردن. لەناو بازاڕدا هەر دووکاندارێکی ناسیاوی خۆی هەبووایە، سڵاوی لێدەکردن و لە هەواڵی دەپرسین.

ئاغا سەید حەسەنی موشتاقی پیاوێکی بەڕێزو خۆشەویست بوو، دووکانی وردەواڵەی هەبوو، سەرپەرشتی حوسێنییەی گەورەی گەڕەکی پشتی باغی دەکرد. منداڵەکانی هەموو ناردبوو بۆ خوێندن، کوڕێکی خوێندکاری زانکۆ بوو، ئەو کوڕە ساڵی (١٩٥٣/١٣٣٢) لە تاران کوژرابوو. ئاغا سەید حەسەنی موشتاقی یەکێک بوو لە گەورەپیاوانی گەڕەک و جێگای ڕێزی هەموو خەڵکی بوو. کلیلی حوسێنییەی پشتی باغ بەدەست ئەو بوو. ئاغا ڕەزای پاسەوان ڕێزێکی زۆری لە ئاغا سەید حەسەن دەگرت. ئاغا ڕەزا بەهەموو کەسێکی دەگوت هەرکارو خزمەتێکتان هەبێت، من لەخزمەتتاندام. ئەو بەبێ جیاوازی ڕێزی هەموو کەسێکی دەگرت. بە شەهربانووی دەگوت: نەنە شەهربانوو، بە دەنگێکی بەرز سڵاوی لێدەکردو هەندێکجاریش سڵاوی سەربازیی بۆ دەکرد، هەندێک جاریش لەلای ئەو ژنانەی لە کۆڵان دانیشتبوون، ماوەیەکی کەم لایان دادەنیشت و لە هەواڵی دەپرسین. ئەگەر منداڵێک یاخود ژنێکی بەتەمەن گۆزەئاوێکی بەدەستەوە بووایە، گۆزەکەی لێوەردەگرتن و بەدەستێک گۆزەکەی هەڵدەگرت و بەدەستەکەی تری سوکانی پاسکیلەکەی دەگرت تا گۆزەکەی دەبردەوە بۆ ماڵی خاوەنەکەی. یان گۆزەی بەتاڵی لەدەست ژنان و منداڵان وەردەگرت و دەچوو بۆلای تانکی ئاوەکەو گۆزەی پڕ لەئاوی بۆ دەبردنەوە. سەبەتەیەکی لەدوای پاسکیلەکەی قایم کردبوو، خورجێنێکیشی لەسەر پاسکیلەکەی دانابوو، کەلوپەلی کەسانی پیرو منداڵانی دەخستە نێو خورجێن و سەبەتەکەی و بۆی دەبردنەوە بۆ ماڵەوە. منداڵان زۆریان خۆشدەویست. کاتێک شەقی لە تۆپی منداڵەکان دەدا، ئەوانیش هوهایان بۆ دەکێشا، شەڕو کێشەی نێوان منداڵانی چارەسەر دەکرد، هاوکاری کۆڕی سنگکوتان و مەراسیمە ئاینییەکانی دەکرد، هەمیشەو بە بەردەوامی لە حوسێنییەکاندا خزمەتی دەکرد. لە گەڕەکدا هیچ کەس داردەستەکەی بەدەستییەوە نەدەبینی، هەمیشە کە لەسەر

کارەکەی دەگەڕایەوە داردەستەکەی دەخستە نێو خورجێنی پاسکیلەکەیەوە. ڕۆژێک محەمەد تەقی قەساب پێیگوتبوو: ئاغا ڕەزا بۆچی کاتێک دێیتەوە بۆ ماڵەوە (باتۆمەکەت) داردەستەکەت دەکەیتە خورجێنەکەتەوە. ئەویش گوتبووی: ناشرینە بۆ من بە باتۆمەوە بێمە ناو گەڕەک، چونکە لەوەیە منداڵان بەداردەستەکەوە لێم بترسن. گوتی: سوپاس بۆ خوا پێنجسەد ساڵە لەم گەڕەکەدا نە دزی کراوەو نە کارێکی خراپ، کەواتە داردەستی بەکاری چی دێت؟ لەدەرەوەی گەڕەکی خۆیان هەرکەسێکی ببینیایە سڵاوی لێدەکرد، هەواڵی زیندانییەکانی دەگەیاندە خزم و کەسوکارەکانیان. لەوسەردەمەدا ژمارەی کەسانی زیندانیکراو لە یەزد زۆر کەمبوون. تاوانی ئەو زیندانییانەش زیاتر کڕین و فرۆشتنی تلیاک بوو، ئاخر ئەوکاتە هیچ کەسێک بەبێ هۆ زیندانیی نەدەکرا. چەندین کار هەیە کە ئێستا بەتاوان ئەژمار دەکرێن و خەڵکانی لەسەر زیندانی دەکرێن، ئەوکاتە ئەو کارانە بەتاوان ئەژمار نەدەکران.

ئاغا ڕەزا لەکاتی چوونی بۆ حەمام سڵاوی لە وەستای حەمام و سەرتاش و ناترەکان دەکردو لەگەڵ هەموویاندا پەیوەندییەکی باشی هەبوو. لە حەمامەکەشدا منداڵان لە ئاغا ڕەزا کۆدەبوونەوەو دەیانبردە لای حەوزی ئاوەکەوەو ئاویان بۆ هەڵدەداو ئاوپرژێنیان دەکردو پێی پێدەکەنین. جارجارێک ئاغا ڕەزا پشتی هاوڕێکانی خۆی دەشۆری، منداڵەکانیش دەچوون سەتڵێکیان پڕ دەکرد لە ئاو و دەیانکرد بەگیانی ئاغا ڕەزادا. کاتێک دەچوو بۆ نانەوا بۆ نان وەرگرتن، هەمیشە بەشەنانی چەند پیرەژنێکی وەردەگرت و نانەکەی بۆ دەبردنە ماڵەوە. ئاغا ڕەزا کارێکی وای کردبوو کە هەموو خەڵکی گەڕەک دەیانناسی و هەمووان ئەویان خۆشدەویست. دیارە لەو سەردەمەدا ئاغا ڕەزا کەسێکی ناسراو و دیاربوو. خۆ خەڵکانی تری گەڕەک زۆربەیان یەکتریان دەناسی، بەڵام ئاغا ڕەزا کەسێکی گەرموگوڕتر بوو لە خەڵکانی ترو هاوکاری هەموو کەسێکی دەکرد بەبێ جیاوازی. لە دەیەی (١٩٥٠/١٣٣٠) لە هەموو ئێراندا گەڕەکێک نەبوو کە خەڵکەکەی یەکتری نەناسن. من ماوەی دە ساڵ دەبێت لە ساڵی ( ٢٠٠٥/١٣٨٤) لە باڵاخانەیەکی گەورەدا دەژیم کە (١١) ماڵ لەو باڵەخانەیەدا هەیە، تائێستا هەموو دراوسێکانم بەباشی ناناسم. ناوی دوو کەس لە دراوسێکان دەزانم، بەڵام بەتەواوی دراوسێکانی تر ناناسم، وا هەستدەکەم لە تەواوی ئێراندا ژیان بەو جۆرەیە.

ئاغا ڕەزا (١٠) ساڵ لە مهری گەورەتر بوو، مهری تەمەنی (١٧) ساڵ بوو ئاغا

ڕەزا (٢٧) ساڵ بوو، ئەو حەوت هەشت ساڵ بوو پاسەوان بوو، خانوویەکی بچکۆلانەی کڕیبوو. لەو سەردەمەدا هاوسەریتی لەگەڵ کەسێکی پاسەواندا گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو، هەندێک کەس بە نەنگییان دەزانی کچ بدەن بەپیاوی پاسەوان. خەڵکی ئاغا ڕەزایان خۆشدەویست، بەڵام زۆرکەس دەیانگوت بەداخەوە کە ئەم پیاوە بەڕێزە پاسەوانە. محەمەد عەلی حەزی دەکرد کچەکەی بدات بە ئاغا ڕەزا. ڕوقیە لە هەموو تەمەنیدا یەک جار ڕووبەڕوو لەگەڵ ئاغا ڕەزادا قسەی کردبوو، بەڵام ڕەزاش بوو بەوەی کچەکەی شوو بە ئاغا ڕەزا بکات. هەرچەندە مهری بۆخۆی حەزی نەدەکرد شوو بکات، نە بە ئاغا ڕەزا، نە بە هیچ کەسێکی تر، ئەو حەزی دەکرد لە خوێندن بەردەوام بێت و لە خوێندنگا دانەبڕێت. کۆتایی مانگی مهر(ئەیلول) بوو کە مهری بە چاوی گریاناوی و دڵی شکاوەوە لەبەردەمی مەلا دانیشتبوو بۆ مارەبڕین. ئەگەر مۆڵەتیان پێ بدایە هەر هەمان ساڵ دەیتوانی دبلۆم وەربگرێت، ئەو بەهۆی پێداگریی دایکییەوە شوویکرد، بەهۆی کێشەی نێوان دایک و باوکییەوە بوو شووی بە پیاوێک کرد کە خۆشینەدەویست. مهری حەزیدەکرد بچێتە زانکۆ، لە دەیەی (١٩٦٠/١٣٤٠) چوونەزانکۆ خەوێکی گەورە بوو، ئەوکاتە لەم وڵاتە گەورەیەی ئێمەدا تەنها لە پێنج شار زانکۆ هەبوو. ئەوکات زۆرێک لە بنەماڵەکان مۆڵەتیان نەدەدا کچەکانیان بچێتە قوتابخانە. لەو سەردەمەدا لە گەڕەکی ئێمەدا تەنها کچێک نەبوو چووبێتە زانکۆ. لەکۆتاییدا مهری چوو بۆ ماڵی پاسەوانێک کە بڕیار بوو جگە لە مووچەکەی، بەخشیشی هەبێت. من زەماوەندەکەی مهریم بە تەواوی لە یادە، لەکاتی زەماوەندەکەدا ئامادەبیم هەبوو، دووریی ماڵی باوکی بووک تا ماڵی زاوا نزیکەی (٧٠٠) مەتر دەبوو.

خانووەکەی ئاغا ڕەزا ڕووبەرەکەی (٢٥٠) مەتر دەبوو. بڕیار وابوو پورێکی ئاغا ڕەزا چەند مانگێک لەگەڵ ئەواندا بێت، تاوەکو بووک تەنها نەبێت. ئەوسەردەمە کچان لە تەمەنی (١٣-١٤) ساڵیدا شوویان دەکرد. هەندێک جاریش لە تەمەنی (٩-١٠) ساڵیدا. تەڵا خانم کاتێک کە شوویکردبوو، تەمەنی (٩) ساڵ بوو، ئێستا ساڵی (٢٠١٥/١٣٩٤) (٣١) ساڵ دەبێت هاوسەرەکەی مردووە. ئەو کچە بێچارانە کە بەو منداڵییە دەدران بە شوو، نەیاندەتوانی خۆیان بەڕێوەببەن، جا چ بگات بە خزمەتکردنی هاوسەرو ماڵەکەیان. هەربۆیەش کاتێک کچێک شووی دەکردو دەچووە ماڵی خۆی، کەسێکی گەورەتر لە خزمە نزیکەکانی هاوسەرەکەی لەگەڵیاندا دەڕۆیشت تاکو فێری

ئیشوکارەکانی بکات. دیارە ئەوکاتە ئەو کچانەی شوویان دەکرد، دەچوونە ماڵی دایک و باوکی هاوسەرەکەیان، بەڵام مهری یەکراست چووە ماڵی خۆی، مهری زۆر بچووک نەبوو، تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو، شارەزایی لەهەموو کارێکدا هەبوو، بەڵام بڕیار وابوو پورە تەمەن (٥٥) ساڵانەکەی ئاغا ڕەزا لە ماڵەوە لەگەڵیان بێت. ئێستا باسی مانگی هەنگوینی و تەنهایی بووک و زاواو خۆشییەکانی ژیانیان دەکرێت. ئەوسەردەمە ئەو بووکە بچکۆلانە دیلی ماڵی دایک و باوکێکی نەزان و نەشارەزا بوون و بەڕێدەکران بۆ ماڵێکی نامۆی نەناسراو، کە دەست وەردەدرا لە تەواوی ژیان و کاریاندا. خەو و خواردن و خۆشۆرین و چێشتلێنان و پاککردنەوەی ناوماڵ و هاتن و ڕۆیشتن و قسەکردن لەگەڵ دراوسێ و هەموو شتێکیان لەژێر کۆنترۆڵی ماڵە خەزوراندا بوو. ئەوکاتە بەردەوام شەڕو هەرا لەنێوان بووک و خەسوودا دروست دەبوو، خەسوو دەیگوت: پێویستە بووک هەموو فەرمانێک لە من وەربگرێت و هەرچییەکم گوت، لە قسەم دەرنەچێت. بووکیش دەیویست خۆی خاوەنی بڕیاری خۆی بێت. دەیان ژن دەناسم کە دەڵێن لە ساڵانی سەرەتای هاوسەرگیرییاندا جگە لە سوکایەتیپێکردن، هیچ شتێکی تر تێنەگەیشتوون، خۆ ئەگەر لە ڕابردوودا ڕێژەی جیابوونەوەی هاوسەران لە ئێستا کەمتر بووبێت، ئەوا مانای ئەوە نییە کە ئەوان خۆشبەختتر بوون، بەڵکو مانای سووتان و بێچارەیی بووە. ژیان هەمیشە دووچاری دژ دەبێتەوە، لەلایەک ئارامی هەیەو لەلایەکی تر گرفتاری. چ ژیانێک بەردەوام لە ئارامیدایە. من وا هەست دەکەم شاژنی بەریتانیاش هەندێکجار لە ژیاندا دووچاری کێشەو نیگەرانی بووە. ئایا کاتێک (دیانا) تەڵاقی وەرگرت، شاژنێکی هێمن بوو؟ ژیان لە ماڵەکان و گەڕەکە کۆنەکاندا لەلایەک هێمنی هەبوو، لەلایەی تر گرفتاری و سنووردارییەتی کۆمەڵایەتی و دەستتێوەردانی خەڵکی. مهری دەیگوت: پوری ئاغا ڕەزا ژنێکی باش بوو، بەڵام من تازەبووک بووم، بەیانیان و نیوەڕۆیان و ئێواران کەسێک لەسەر سفرە لە تەنیشت منەوە دادەنیشت، هەموو ڕۆژێک دەبووایە من چێشتێک لێبنێم کە ئەو بەدڵی بووایە، دەبووایە من لە قسەی ئەودا بوومایەو ئەو کارەم بکردایە کە ئەو پێیدەگوتم: دەمویست بچم بۆ ماڵی باوکم تاکو هاوکاری دایەگەورەم بکەم، بەڵام ئەو پورەمان مۆڵەتی پێنەدەدام بچم. مهری هاوسەرەکەی خۆشنەدەویست. هەر پێشی خۆش نەبوو شوو بکات. بەهۆی بوونی ئەو پیرەژنە لە ماڵەکەدا، مهری ئەو دەرفەتەی نەبوو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا وەکو

پێویست گفتوگۆ بکات. ئەو پیرەژنە ژنێکی خراپ نەبوو، بەڵام ئامادەبوونی لە ماڵەکەدا مهری و هاوسەرەکەی لە یەکتری دوورخستبۆوە. ئەو مۆڵەتی نەدەدا مهری چێشت بۆ هاوسەرەکەی تێ بکات. مهری دەبووایە جلوبەرگی پوریان بشوات. ئێستاش کە هەندێک کەس بەباشە باسی ژیانی سەردەمی کۆن دەکەن، با ئەوە بزانن ئەگەر ڕەوشی ئەو سەردەمە باش بووایە، ئەوا ئەو ژیانە تائێستا بەردەوام دەبوو، پێویستە شێوەی ژیانی کۆن بکەین بە چەند بەشێکەوە، باشییەکانی و خراپەکانی بە پێوەری ئەم سەردەمە هەڵسەنگێنین، خۆ ئەگەر بە پێوەری ئەمڕۆ بەراوردی بکەین، ئەوا دووچاری کێشە دەبین. هەروەک ئەم داستانەی من ئێستا دەینووسم. کە داستانێکی نیشاندەری دژە بە کەسایەتییەکان، بەڵام داستانەکە دژ نییە.

پورە فاتم هەروەک زۆربەی خەڵکانی ئەو سەردەمە گەورەیی خۆی دەنواند بەسەر مهریدا، مهریش مافی ئەوەی نەبوو بەبێ ڕەزامەندی ئەو لەماڵ بچێتە دەرەوە. هەفتەی یەک جار لەگەڵ ئاغا ڕەزادا دەڕۆیشت بۆ ماڵی باوکی. هەفتەی جارێکیش سەردانی دایک و باوکی ئاغا ڕەزایان دەکرد. جارجارێکیش ئەو دوو هاوسەرە بەیەکەوە دەچوون بۆ سینەما. پورە خانم نەدەچوو بۆ سینەما، ئەو دەیگوت: سینەما حەرامە. مهری زۆری حەز لە چوونە سینەما بوو، هەم حەزی لە فلیمەکە بوو، هەم پێیخۆش بوو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەیەکەوە بن، حەزی لەهەر شوێنێک بووایە، دەبووایە لەگەڵ ئاغا ڕەزا بڕۆشتایە. دیارە دایک و باوکی مهری و خوشکەکانیشی، بەتایبەتی زینەت، سەردانی مهرییان دەکرد. یەکەمجار کە ڕوقیە زانی کچەکەی لەگەڵ ئاغا رەزای هاوسەریدا بەیەکەوە دەچن بۆ سینەما، ئاژاوە دەستپێکرد. ڕوقیە دەیگوت: کچەکەم ماڵوێران بووە. هاواری دەکرد، خودایە ئەم پاسەوانە خوێرییە کچەکەم دەبات بۆ سینەما، ئیتر کچەکەم جێگەی دۆزەخ دەبێت، ئەگەر کچەکەم بدایە بە فەقێ عەباس، ئەوا لەجیاتی سینەما دەچوو بۆ مەراسیمی ئاینی و دەچوو بۆ مزگەوت، بەڵام ئێستا بووە بە ژنی پاسەوان و دەچێت بۆ سینەما. ڕوقیە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەشەڕدا بوو، دەیگوت: تۆ کچەکەمت داوە بە پاسەوان و ئەویش دەیبات بۆ سینەما، ئێستا من حەیا و ئابڕووم چووە، ئەو ئابڕوو چوونە لەکوێ بهێنمەوە. محەمەد عەلی دەیگوت: بە ئێمە چی بۆ هەرکوێیەک بچن، مهری ژنی ئاغا ڕەزایەو هەر شوێنێک پێیخۆش بێت لەگەڵ خۆیدا دەیبات، بۆ مەگەر بۆ کوێی بردووە؟ بردوویەتی بۆ سینەما، کارێکی باشی کردووەو

دەستی خۆش بێت. ڕوقیە دەیگوت: بردوویەتی بۆ دۆزەخ. سەرەنجام ڕۆژێک مهری بانگهێشتی دایکی دەکات کە بەیەکەوە بچن بۆ سینەما، دایکیشی هەتا توانیبووی جوێنی پێدابوو، پێیگوتبوو بەڕاستی تۆ نەوەی شەهربانووی کافریت.

ئاغا ڕەزا ئاگاداری ئەو قسانەی ڕوقیە نەبوو، مهریش پێیگوتبوو کە دەیەوێت خوشکەکانی لەگەڵ خۆیدا ببیات بۆ سینەما. ئاغا ڕەزا خوشکەکانی مهری بە هاوسەر و منداڵەوە بانگهێشت کرد کە بەیەکەوە بچن بۆ سینەما، هەر بۆیەش ئۆتۆمبێلی هاوڕێکەی وەرگرتبوو بۆ گواستەنەوەیان بۆ سینەما. سەرجەمیان دوانزە کەس بوون، هەموویان بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ سینەما سەفائیە. سینەماکە سینەمایەکی هاوینە بوو. کە دەکرا بە ئۆتۆمبێلەوە بچیتە ناو حەوشی سینەماکەوە. گەڕەکی سەفائیە گەڕەکێکی تازەو نوێ بوو، لەسەر شێوازی نوێ بنیاتنرابوو. ڕوقیە زانیبووی کچەکانی بە منداڵەوە لەماڵەوە نین، بەڵام نەیدەزانی ئەوان هەموویان بەیەکەوە بۆکوێ چوون. شەو درەنگانێک کە هەموویان گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە ڕوقیە زانیبووی ئەوان چوون بۆ سینەما. ڕوقیە دەستیکردبوو بە هاوارهاوار ئیتر هەموو خەڵکی گەڕەک بەسەریاندا ڕژابوو. منیش ئاگاداری ئەو هـاوارهـاوارە بـووم. کاتژمێر (١٠)ی شەو بوو کە دەستیکردبوو بە دەنگەدەنگ، ئیتر تەواوی خەڵکی گەڕەک زانیبوویان کە بنەماڵەی محەمەد عەلی چوون بۆ سینەما.

ئەو ژنانەی لە کۆڵان لە دەوری بیبی هاجەر کۆدەبوونەوە، ببوونە دوو دەستە. هەندێکیان دژی ئەوەبوون کە خەڵکی بچن بۆ سینەما، ئەوان دەیانگوت مەلای مزگەوت فەرموویەتی سینەما حەرامە، ئەوان دەیانگوت ڕوقیە مافی خۆیەتی هەرچییەک بکات و هەرچییەک بڵێت؟ بەپێچەوانەی ئەوەوە دوو سێ کەسی تر دەیانگوت، چی تیایە بچینە سینەما. بەتولیش لەگەڵ هاوسەرو خوشکەکانی چوون بۆ سینەما. بیبی هاجەریش دەیگوت: پاسەوانێک دەیەوێت نەریتی کۆڵانەکە تێکبدات. ئەو نەیدەزانی کە نەریتی هەموو جیهان لەگۆڕاندایە، نەیدەزانی کە مۆدێرنێتە بە ڕێگاوەیەو دەیەوێت باری هەموو شارو گوندو جیهان بگۆڕێت، نەیدەزانی تەکنۆلۆژیای تازە هاتووەو دەیەوێت هەموو جیهان بگۆڕێت. بیبی هاجەر تاوانی نەبوو کە ئەو قسانەی دەکرد، ئێستاش پاش چل ساڵ زۆرێک لە مامۆستایانی زانکۆ و کاربەدەستە گەورەکانی وڵات هەستیان بەم بابەتە نەکردووە. ئاغا ڕەزا هەفتەی دوو سێ شەو ئێشکگر بوو. مهری لە ژوورەکەیدا بە تەنها

دەمایەوە، نە تەلەفزیۆن هەبوو، نە کتێب، نە دەفتەرو قەڵەم، بەڵام ئاغا ڕەزا ڕادیۆیەکی کڕیبوو. هەندێک شەو مهری دادەنیشت و فرمێسکی دەڕشت. پورە خانمیش زیاتر خەریکی نوێژکردن و نزاخوێندن بوو. جارجارێکیش زینەت و ئەعزەم و ئەکرەمە دەهاتن بۆ سەردانی، خوشکە گەورەکەی بۆی دڵسۆز بوو، بەڵام ئەکرەمە کەسێکی بەخیل و دوو ڕوو بوو. هەرکاتێک هەستی بکردایە مهری دڵی توندە، دەیگوت: ئەوە بیری هاوڕێکانت دەکەیت. واتە تیروتوانجێکی زۆری لێ دەدا. جارجارێکیش دایکی ئاغا ڕەزا سەردانی مهری دەکردو دەیگوت: دە کچ عاشقی ئاغا ڕەزا ببوون، زۆرکەس حەزیان لێیکردبوو، ئیتر ئەوە خواستی خودا بوو کە تۆ بوویت بە هاوسەری کوڕەکەم، پێویستە زۆر خۆشحاڵ بیت کە بوویت بە ژنی ئاغا ڕەزای پاسەوان. دایکی ئاغا ڕەزا لەو ڕۆژەوە کە مهری چووە ماڵی ئاغا ڕەزا، دەیگوت: دەبێت تۆ بە زووترین کات دووگیان بیت، من دەمەوێت (١٠) نەوەم هەبێت. هیچ کەسێک نەیدەزانی مهری چی دەوێت، مهری دەچووە لای دایەگەورەی و دەردەدڵی دەکرد، لە تەنیایی و ماڵەوەو لە فەرمانەکانی پورە خانم بەسەریدا. شەهربانووش ئامۆژگاری دەکردو پێیدەگوت: تۆ تەنها نەوەی خوێندەواری منیت، ئەو کتێبانەی من هەمووی بۆتۆیە، هەموویان لەگەڵ خۆتدا ببە بۆ ماڵەوە. مهری کتێبەکانی دایەگەورەی ژماردبوو (١٨٧٢) بەرگ کتێب بوون. مهری بە دایەگەورەی گوتبوو کتێبەکان کەم کەم دەبەم و هەموویان بەجارێک نابەم. مهری یەکەمجار کە ویستی چەند کتێبێک لەگەڵ خۆیدا ببات، دایکی لەگەڵیدا کردی بە شەڕو دەیگوت: ئەم کتێبانە هەمووی کتێبی کوفرن، ئەگەر ئەمانە بخوێنیتەوە، دەبیت بە کافر. مهری دەیگوت: دایکە من پێشتر زۆرێک لەم کتێبانەم خوێندۆتەوە، ڕوقیەش بە چەپۆڵ دەیدا لەسەری خۆی و دەگریا، لەسەر زەوی دانیشت و دەیگوت: کچەکەم لەدەست دەرچوو! کچەکەم بووە بە کافر! شووی بە پاسەوانێک کرد، کتێب دەخوێنێتەوە، دەچێت بۆ سینەما، ئیتر جێگای دۆزەخ دەبێت.

دوای چەند مانگێک مهری داوای لە هاوسەرەکەی کرد کە مۆڵەتی بدات بچێت تاقیکردنەوەی دەرەکی بکات و دبلۆم وەربگرێت، وەک ئەوەی کوفری کردبێت. ئاغا ڕەزا بەتوڕەییەوە وەڵامیدایەوە، هەرچی جوێنێکی بەسەر دەمیدا هات بە کچانی خاوەن شەهادەو خوێندەواری گوت. گوتی: دبلۆم ناسنامەی ژنانی بەڕەڵڵاو لەشفرۆشە. مهری بەزوویی سەردانی دایەگەورەی کردو بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد. شەهربانوو گوتی: ئاغا ڕەزا دبلۆمی وەرنەگرتووە، پیاوی حەسوود لەکوێ مۆڵەت دەدا ژنەکەی لەخۆی ئاقڵتر بێت.

پیاوان دەیانەوێت ژنەکانیان نەزان و دواکەوتووبن. شەهربانوو بە نەوەکەی گوت: پیاوان هەمیشە لە ژنەکانیان دەترسن، بەتایبەتی لە چوونە قوتابخانەو وانەخوێندنیان. ژنان ئەگەر بچنە قوتابخانەو بخوێنن. تێکەڵاوی کۆمەڵگا دەبن، کاتێک تێکەڵاوی کۆمەڵگا بوون داوای مافی خۆیان دەکەن، ژنان کاتێک چوونە قوتابخانەو کتێبیان خوێندەوە، تێدەگەن ئەوان لە پیاوان کەمتر نین، کاتێک خوێندەوار بوون، تێدەگەن ئەو قسانەی بەدرێژایی مێژوو لەبارەی ئەوانەوە کراوە، هەمووی درۆیە. ژنان بەخوێندن تێدەگەن، کە بەدرێژایی مێژوو چەندە مافیان پێشێلکراوە. ژنان کاتێک خوێندەوار بوون حەز دەکەن ببنە سەرۆک، وەزیر، زانا، ئەوکاتە جێگای پیاوان دەگرنەوە. خۆ دیارە لە پیاوانیش باشتر و دڵسۆزانەتر کار دەکەن. شەهربانوو بە مهری گوت: وا هەست نەکەیت تەنها پیاوان لە خوێندەواربوونی ژنان بترسن، ژمارەیەکی زۆریش لە ژنان لە خوێندەواربوونی هاوجنسەکانی خۆیان دەترسن. گەورەترین دوژمنی ژنان، ژنان خۆیانن. ژنانێک کە هەمیشە بەدوای لەناوبردنی مافەکانی خۆیانەوەن، ژنانێک کە بە لێکدانەوەی نادروستی پێش دە هەزار ساڵ لە بەفیڕۆدانی مافەکانیان پشتی پیاوەکانیان دەگرن. ژنان پێویستە ئاشنابن بە مافەکانی خۆیان. بۆ ئەم کارەش پێویستە بخوێنن، پێویستە کار بکەن، پێویستە داهاتیان هەبێت، پێویستە پارە لە گیرفانی خۆیان دەربهێنن. ژنان کاتێک لەماڵەوە بوون و داهاتێکیان نەبوو، وردە وردە ئازادیی خۆیان لەدەست دەدەن و بیری کۆن دەچێتە سەریانەوە. تا ژنان لە کۆمەڵگادا دەوریان نەبێت، کۆمەڵگاش پێش ناکەوێت، بۆیە پێویستە تۆ بخوێنیت و لە دەرەوەی ماڵەوە کار بکەیت. پێویستە تۆ کارێک بکەیت کە ئاغا ڕەزا لە پێش تۆدا دبلۆم وەربگرێت. کاتێک هاوسەرەکەت چووە بەرخوێندن و دبلۆمی وەرگرت، لەوەیە ئەوکاتە مۆڵەت بدات تۆش دبلۆم وەربگریت، خۆشم لەگەڵ هاوسەرەکەتدا قسەدەکەم، کاتێک دایکت لەماڵ نەبوو ئاغا ڕەزا بهێنە بۆلام، مهری هەر ئەو کارەی کرد کە دایەگەورەی پێیگوت. ئاغا ڕەزا چوو بۆلای شەهربانوو، مهری نەیدەزانی دایەگەورەی چی بە ئاغا ڕەزا گوتووە، بەڵام لە دوای ئەو دیدارەوە ئاغا ڕەزا بوو بە موریدی شەهربانوو. ئاغا ڕەزا دوای چەندینجار دیدار لەگەڵ شەهربانوودا بە مهری گوت: خۆزگە ئەوم زووتر بناسیبایە. شەهربانوو نەوەکەی خۆی ئامۆژگاری کردبوو کە لەگەڵ ئاغا ڕەزادا میهرەبان بێت، ئاغا ڕەزا وردە وردە دەستیکرد بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە. مهریش چەند بەرگێک لە کتێبەکانی دایەگەورەی برد بۆ ماڵی خۆیان.

## مەیخواردنەوەی ئاغا ڕەزا

مهری نزیکەی شەش مانگ لەگەڵ پورە خانمدا بەیەکەوە بوون، دوای چەند مانگێک پورە خانم گوتی: دەچێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، مهریش ئەوەی پێخۆش بوو، پورە خانم ڕۆیشت و مهری و ئاغا ڕەزاش بەیەکەوە مانەوە. مهری کەم کەم هۆگری ئاغا ڕەزا دەبوو. دایکی ئاغا ڕەزا بە مهری دەگوت: ئەوە شەش مانگە لێرەیت، پێویستە هەرچی زووە ببیت بە خاوەن منداڵ، بەڵام هیچ هەواڵێک لە دووگیانبوونی مهری نەبوو. ئەوان یەخچاڵیان نەبوو، ئاغا ڕەزا هەموو ڕۆژێک گۆشت و سەوزە و میوەی دەکڕی، هەندێکجاریش نیو بوتڵ خواردنەوەی دەکڕی، بۆخۆی چەند پیاڵەیەکی لێدەخواردەوە. مهری هەرگیز هیچ کەسێکی نەبینیبوو کە خواردنەوە بخواتەوە، تەنانەت باوکیشی نەبینیبوو لەکاتی خواردنەوەدا. هەتاکو پوری ئاغا ڕەزا لەو ماڵەدا بوو، هیچ کێشەیەک ڕووینەدابوو، واتە پورە خانم ئاگاداری ئەوە نەبوو کە ئاغا ڕەزا خواردنەوە بخواتەوە. نزیکەی پێنج مانگ بوو مهری بە بووکی چووبووە ماڵی هاوسەرەکەی.

ئەوکاتە گرێبەستی هاوسەرێتی بەیەک ڕۆژ تەواو دەبوو، دوای نیوەڕۆ گرێبەستەکەیان دەنووسی و شەو بووکیان دەبرد بۆ ماڵی زاوا. ئەوکات ماڵکردن و کڕینی کەلوپەل بۆ بووک نەبوو، لە شاری یەزد کاتێک منداڵێکی کچ لەدایک دەبوو بەزوویی شتێکیان لەلای سەریەوە دادەنا. بۆ نموونە پیاڵەیەک، یان ژێر پیاڵەیەکیان لەلای سەریەوە دادەنا و دایکی دەیگوت: ئەمە ماڵ و پێویستییەکانی کچەکەمە. بەهۆی لە دایکبوونی کچەکەیەوە دایکی لەبیری دابینکردنی کەلوپەلی ناوماڵ بوو بۆی. کاتێک بووکیان مارە دەبڕی ناوماڵ و پێویستییەکانی ئامادەکرابوو، دیارە ئەوکاتە پێویستییەکانی ناوماڵ زۆر کەم بوون، یەک دەست لێفەو دۆشەک و یەک دەست قاپ و سینی و پێویستییەکانی حەمام و چەند دەست جلوبەرگ و ئاوێنەو مۆمدانێک، ئەمانە هەمووی پێش بووک گواستنەوە ئامادە دەکران.

هەفتەیەک بوو پوری ئاغا ڕەزا ڕۆشتبووەوە بۆ ماڵی خۆیان. مهری و ئاغا ڕەزا بە تەنها بوون، شەوێک ئاغا ڕەزا گۆشتی کڕیبوو. بەیانی لە ماڵەوە ڕۆیشتبووە دەرەوە بە مهری گوتبوو گۆشتەکە جوان بکوتە. شەو دەمەوێت کەباب دروست بکەم. ئەو سەردەمە لە سەد ماڵ، ماڵێک مەکینەی قیمەی نەبوو. شەو ئاغا ڕەزا هاتەوە بە مهری گوت: لە مقەڵییەکدا خەڵوزو پشکۆ بگەشێنەرەوە. ئاغا ڕەزا چوار شیش

کەبابی لێدا، ماست و خەیارو مەزەی جۆراوجۆری ئامادەکرد. بە مهری گوت: ئەو بتڵە شەرابە بهێنە. مهریش بتڵەکەی هێنا. ئاغا ڕەزا چەند پارووپەک نان و کەبابی خوارد، چەند پارووپەکیشی بە دەمی مهرییەوە کرد، پاشان دوو پێک شەرابی تێکرد، خۆی یەکێکیانی خواردەوەو ئەوی تری دا بە مهری و گوتی: بە سەلامەتی خۆمان بفەرموو بخۆرەوە، مهری هەرگیز هیچ جۆرە خواردنەوەیەکی نەخواردبووەوەو گوتی: من شەراب ناخۆمەوەو هەرگیز نەمخواردۆتەوە، باوکیشم هەرگیز نەیخواردۆتەوە. ئاغا ڕەزا چەند پێکێکی خواردەوەو نیوە مەست ببوو. پێکەکەی دایە دەستی مهری و گوتی: من دەڵێم بخۆرەوە. مهری گوتی: ناخۆمەوە من ناتوانم بخۆمەوە. ئاغا ڕەزا بەتووڕەییەوە گوتی: نەوەی شەهربانووی کافر ئەو پێکە بگرەو بیخۆرەوە. مهری گوتی: من کچی ڕوقیەم، خۆ شەهربانووش هەرگیز شەرابی نەخواردۆتەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: سوێند بە ئالی حەزرەت دەخۆیتەوە. گەورەترین سوێندی ئاغا ڕەزا ئالی حەزرەت بوو، واتا سوێندی بە سەری شاهنشا دەخوارد. مهری گوتی: سوێند بەخودای گەورە من ناخۆمەوە ناخۆمەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: سوێند بە ئالی حەزرەت دەرخواردتی دەدەم. ئاغا ڕەزا مهری لەسەر پشت ڕاکێشاو لەسەر سنگی دانیشت و بتڵە شەرابەکەی هەڵگرت و کردی بەدەمی مهرییەوە. مهری هەستی بە سووتانەوەی قوڕگی کرد. دەم و قوڕگ و گەدەی سووتایەوەو بەهەموو هێزی خۆی شەپازلەیەکی لەلاچاوی هاوسەرەکەی دا. ئاغا ڕەزا هاواری لێهەڵساو گوتی: ئەگەر تۆ نەوەی شەهربانووی کافریت من خۆم (شەمەرم)، بەڵام ئەو لە مهری نەداو دەستەکانی توند گرت و فشاری خستبووە سەر سنگی. مهریش ئازارێکی زۆری هەبوو نەیدەتوانی لە ژێرەوە جوڵە بکات. ئاغا ڕەزا بەدەستێکی دەمی مهری داپچڕی و سەری بتڵە شەرابەکەی خستە ناو دەمییەوەو بنی بتڵەکە بەرزکردەوە. مهری هەوڵیدەدا شەرابەکە نەخواتەوە. شەرابەکە لە دەمولوتییەوە دەهاتە دەرەوەو قاچەکانی دەجوڵاندو هەرچی کرد نەیتوانی خۆی لە دەستی ئاغا ڕەزا ڕزگار بکات. هەندێک لە شەرابەکە بە دەموچاوی مهریدا ڕژا، هەندێکیش چووە لوتییەوە. ئاغا ڕەزا هەموو شەرابەکەی کردە دەمی مهرییەوە. بە جارێک هەموو قوڕگ و گەدەی سووتایەوە. مهری سەری گێژ ببوو، خەریکبوو دەرشایەوە. ئاغا ڕەزا مهری لەسەر زەوی بڵندکرد. ئەو داماوە هیچ ئاگای لەخۆی نەمابوو. ئاغا ڕەزا کەمێک کەبابی کرد بەدەمی مهرییەوە، ئەویش دەستیکرد بە ڕشانەوە، شەوێکی ناخۆشبوو، مهری هەم

لەبارەی جەستەو هەم لەبارەی ڕوح لەبارێکی خراپدا بوو.

ئاغا ڕەزا لەگەڵ مهریدا زۆر میهرەبان بوو، بەردەوام داوای لێبووردنی لێدەکرد دەیگوت: مەست بووم و قوزەڵقۆرتم خواردبووەوە. کاتی بەیانی مهری حاڵی باشتر ببوو، قوڕگ و گەرووی نەدەسووتایەوە، سەری گێژ نەدەبوو، بەڵام کەمێک سەریەشەی هەبوو. ئاغا ڕەزا بانگی مهری کردو گوتی: هەڵسە کاتی نوێژە. بۆ خۆی دەستنوێژی گرتبوو، دەیویست نوێژەکەی بکات. ئەو هەمیشە نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا دەکرد، هیچ کاتێک نوێژەکانی دوا نەدەخست. هەرکاتێک لەماڵەوە بووایە لەکاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکرد. مهریش هەڵساو نوێژی کرد. زۆر گریاو بە ئاغا ڕەزای گوت: ئەوە چ کارێک بوو کردت؟ ئاغا ڕەزا گوتی: تۆ هێشتا منداڵیت و تەمەنت حەڤدە ساڵە، پێویستە خۆش بژیت، هەرکاتێک من شەرابم خواردەوە پێویستە تۆش یەک دوو پێک بخۆیتەوە. بەئالی حەزرەت ئەگەر تۆ لەگەڵمدا نەخۆیتەوە، من نارەحەت دەبم. مهری گوتی: من ئەمڕۆ دەچم بۆ ماڵی باوکم بە دایکم دەڵێم تۆ چیت کردووە. پێویستە تۆش بێیت و لەگەڵ دایکم لەسەر ئەو بابەتە قسە بکەیت. ئاغا ڕەزا گوتی: هەرکارێکت پێخۆشە ئەوە بکە، من ژنێکم دەوێت کە خۆشحاڵم بکات، هەر ئێستا هەڵسەو بڕۆ بە دایکت بڵێ. مهری گوتی: من سێ خوشکم هەیە هەرسێکیان شوویان کردووە، هاوسەری هیچ کامێکیان مەی ناخواتەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: یەکەم تۆ ئاگاداری هەموو شتێک نیت، دووەم هەرکەسێک بەرپرسیارە لە ژیانی خۆی. ئاغا ڕەزا جلوبەرگی پاسەوانی لەبەرکردو لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە. مهریش ڕۆیشت بۆ ماڵی دایکی، کاتێک گەیشتە ماڵی دایکی، باوکی لەماڵەوە نەبوو ڕۆیشتبوو بۆ سەر کار. دایک و دایەگەورەی لەماڵەوە بوون. کاتێک کە چووە ماڵەوە دەستیکرد بە گریان و بەسەرهاتەکەی شەوی بۆ دایکی گێڕایەوە. ڕوقیە دەستیکرد بەجوێندانی محەمەد عەلی هاوسەری، پاشان دەستی مهری گرت و بردی بۆ لای شەهربانوو. ڕوقیە هەزار جوێنی بەو پیرەژنە هەژارە دا، مهریش بەدایکی گوت: من هاوسەرەکەم شەرابی بەدەممدا کردووە، ئەم پیرەژنە داماوە تاوانی چییە؟ ڕوقیە گوتی: تاوانی ئەو کافرە بوو وای لە باوکت کرد، من تۆ نەدەدەم بە ئاخوندێک. ئەو کافرە نەیهێشت تۆ ببیتە مەلاژن. ئێستاش بخۆ کچە جوانەکەم. کچە نوێژکەرو بەدینەکەم، کچەکەم وەک چەپکە گوڵ وایە، دەبێت تێهەڵدان بخوات بەدەستی پاسەوانێک، دەبێت ئێستا مەی بخواتەوەو بچێت بۆ سینەما، شەهربانووش بەبێدەنگی دەگریا و فرمێسک

بەچاوانیدا دەهاتە خوارەوە. باری دەروونیی شەهربانوو خراپ بوو. لەوکاتەوە مهری شوویکردبوو ڕۆیشتبوو بۆ ماڵە مێردی خۆی، شەهربانوو کەمتر دەچووە سەر کۆڵان، تەنها چەندجارێک زینەت و هاوسەرەکەی هاوکارییان کردبوو تا بێتە سەر کۆڵانەکە. ڕوقیە دەردەدڵی خۆی لە سەری شەهربانوودا خاڵیکردەوە. پاشان ڕوویکردە مهری و گوتی: کچی خۆم ئەو بابەتە لای هیچ کەسێک باس نەکەیت. ئەگەر کەسێک بزانێت تۆ شەرابت خواردۆتەوە، ئابرووومان دەچێت. تەنانەت خوشکەکانیشت نابێت بزانن، من وا ئێستا دەچم بۆلای باوکت، ئەو دەدۆزمەوەو پێیدەڵێم بڕوات و بە تەڵاقدانت بدات. مهری بیریکردەوە لەوانەیە شەڕو هەرا و تێهەڵدان دروست ببێت. بۆیە بە دایکی گوت: جارێ سەبر بکە تاکو باوکم خۆی دەگەڕێتەوە. ڕوقیە گوتی: نابێت پێویستە هەر ئێستا بڕۆم عەباکەی بەخۆیدادا تا بڕوات بۆ لای هاوسەرەکەی. کتوپڕ ئەعزەمیش بە دوو منداڵەوە هاتەژوورەوە. ئەعزەم گوتی: دایکە بۆ کوێ دەچیت؟ دایکی گوتی: ویستم بڕۆم بۆ دووکانی ئاغا محەمەدی ئاوریشمی، مادام ئێستا تۆ هاتوویت ناڕۆم پاش ماوەیەکی تر دەچم. ڕوقیە بەهێواشی بە مهری گوت: شەو کە باوکت هاتەوە پێی دەڵێم بڕوات بۆلای ئاغا ڕەزاو پێی بڵێت تەڵاقت بدات. پێویستە تۆ لەم ناپیاوە شەرابخۆرەی کە هەمیشە دەچێت بۆ سینەما، تەڵاق وەربگریت. ئەعزەم نیوکاتژمێر دەبوو گەیشتبوو. کاتێک زانی دایکی باری دەروونیی باش نییە. هۆکارەکەی لە مهری پرسی. مهریش گوتی: دایکم لەگەڵ دایەگەورە شەڕی کردووە. ئەعزەمیش دەستی منداڵەکانی گرت و ڕۆیشت. لە بەیانییەوە هەتا نیوەڕۆ ڕوقیە جوێنی بەهەمووولایەک دەدا، بەردەوام دەیگوت: باوکت دەبێت بچێت بەتەڵاقدانت بدات، نیوەڕۆ مهری نانی برد بۆلای دایەگەورەی و لەلای دانیشت. شەهربانووش دەستی نەوەکەی گرت و گوتی: هاوسەرەکەت لێیداویت؟ مهری گوتی: نەخێر لێینەدام. شەهربانووش گوتی: بەهیچ جۆرێک داوای جیابوونەوە نەکەیت لە ئاغا ڕەزا. هەموو پیاوێک نەنگییەکی هەیە، خودا هیچ پیاوێکی بەبێ نەنگیی خەلق نەکردووە. شەهربانوو نەوەکەی هێمنکردەوەو خواردنەکەی خواردو پاشان هۆنراوەیەکی لە مەسنەوی بۆ خوێندەوە.

**کە ئێمە هۆگرین بۆ گفتی دەقیق**

**چارەی دەبێ کێشەمان لەلای عەشیق**

**تا گرفتمان چا بکەین هەر وا دەکەین**
**کێشەو وەلاممان پێکەوە چارەکەین**
**وەک باڵداریٚ تا ڕەهابیٚ، لە گرێی داو**
**بەند تر دەبیٚ هەتا زیاتر بدا تاو**
**ئەو لە دەست دووری لە مێرگ نادا نەفەس**
**تەمەنی بۆ ئەو گرێیە دا لە دەس**
**ئەو لە بۆ وەی نیەو نابیٚ زەبوون**
**دەشکیٚ باڵی و دەکەویٚ لە سرک بوون**
**کەم خەریک بە بۆ گریٚ باڵ و پەڕت**
**نەشکێت یەک یەک،لەو پەلەی فرهەڵفڕت**
**سەدان هەزار باڵدار باڵیان دا لە دەست**
**گومانی هەڵفڕینیان نەدا لە دەست**

شەهربانوو بە نەوەکەی خۆی گوت: (فان مع العسر يسرا. ان مع العسر يسرا). دایکی مهری نوێژی نیوەڕۆو عەسری کرد، لە نێوان نوێژەکاندا زۆر گریاو جوێنێکی زۆری داو نزایەکی زۆری کرد. بەگریانەوە دەیگوت: کچی من و خواردنەوە، زاوای من و خواردنەوە، کچەکەم پێویستە تەلاق وەربگرێت. باوکی مهری ڕۆژانە دەوروبەری کاتژمێر شەشی دوانیوەڕۆ دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەو ڕۆژەش لەهەمانکاتدا گەڕایەوە. ڕوقیەش دەستیکرد بەگریان و هاوارهاوار بەسەریدا، سەد نزای خراپی لە هاوسەرو دایکی هاوسەرەکەی کرد. پێیگوت: دەبێت بڕۆیت کچەکەمان بەتەلاقدان بدەیت. ئاخر پاسەوان بۆ ئەوە دەبێت تۆ کچی بدەیتیٚ؟ محەمەد عەلی گوتی: ژنەکە هێمنبەرەوە پێم بڵیٚ بزانم چی ڕوویداوە. ڕوقیە بە کچەکەی گوت: خۆت پێی بڵیٚ چی ڕوویداوە؟ مهریش هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ باوکی باسکرد. باوک لە کچەکەی پرسی ئایا پیاوەکەت لێیداویت؟ مهری گوتی: نەخێر، کاتی بەیانی زۆر میهرەبان بوو لەگەڵمدا، لە کچەکەی پرسی، هاوسەرەکەت کەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. مهری گوتی: ئەمڕۆ تاکو کاتژمێر هەشت ئێشککرە. دەوروبەری کاتژمێر (٨:٣٠) دەگەڕێتەوە. باوکی پێیگوت: بڕۆ بۆ ماڵی زینەت ئەگەڕ عەبدوڵلا لەماڵ بوو پێی بڵیٚ بەزوویی بێت بۆ ئێرە. ئاغا عەبدوڵلای ئاتەشکار هاوسەری خوشکی مهری بوو...

ماڵی زینەت ڕووبەڕووی ماڵی باوکی بوو. لە کۆڵانێکی تەسکدا. عەبدوڵڵا لەماڵەوە بوو. مهری پێیگوت: ئاغا عەبدوڵڵا باوکم کاری پێت هەیە. محەمەد عەلی و ئاغا عەبدوڵڵا چوونە ژوورەکەی شەهربانوو. نزیکەی چارەکە کاتژمێرێک سێ بە سێ قسەیان کرد. محەمەد عەلی لە ژوورەکەی دایکی هاتەدەرەوەو بە مهری گوت: هەڵسە بڕۆرەوە بۆ ماڵەوەو نانی ئێوارە ئامادە بکە، من و ئاغا عەبدوڵڵاش بۆ نانخواردنی ئێوارە دێین بۆ ماڵی ئێوە. ڕوقیەش هاواریکرد، من ڕێگە نادەم مهری بچێتەوە بۆ ماڵی ئەو پاسەوانە ناپیاوە. محەمەد عەلی بە ژنەکەی گوت: تۆ ناتەوێت کچەکەت تەڵاق وەربگرێت؟ هەرکارێک ڕێگەچارەیەکی هەیە، من دەچم مهری بەتەڵاقدان دەدەم، ئێستا لێگەڕێ با مهری بڕواتەوە بۆ ماڵەوە. محەمەد عەلی هەرگیز بۆ نانخواردن نەچووبوو بۆ ماڵی کچەکەی، هەفتەی دوو سێ جار بۆ هەواڵپرسین سەردانی دەکردن. محەمەد عەلی کچەکەی بەڕێکرد بۆ ماڵەوەو پێیگوت: یەک تاسکەبابی باش ئامادە بکە. مهری ڕۆیشت تاکو خوداحافیزی لە دایەگەورەی بکات، چەمایەوەو دەستی ماچکرد. دایەگەورە بە نەوەکەی خۆی گوت: کچەکەم باسی وشەی تەڵاق نەکەیت، لێگەڕێ باوکت کێشەکە چارەسەر دەکات، من ئامۆژگاری باوکتم کردووە کە شەڕ نەکات و باسی تەڵاق نەکات. مهریش نزای دەکرد کە شەڕ ڕوونەدات، ئەو وا بیری دەکردەوە ئەگەر شەڕو هەرا ڕووبدات، ئابڕوویان دەچێت، وا بیری دەکردەوە کە شەڕ ڕوودەدات و لەیەکتری دەدەن و سەرو کەللەی یەکتری دەشکێنن. دڵی وەکو سیرو سرکە دەکوڵێ. مهری نەیدەزانی تەڵاقی دەوێت یان نا. ئەو تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو، هێشتا منداڵ بوو. خۆشی نەیدەزانی چی دەوێت؟

دوای یەک کاتژمێر دەنگی دەرگا هات، کەسێک لە دەرگای حەوشەی دەدا، عەبدوڵڵا ئاغا بوو، هەندێک ناوکەکولەکەو بستەو بندوق و بادام و قەیسی وشک و هەنجیری وشک و کاسەیەک ماست و هەندێک خەیاری هێنابوو. عەبدوڵڵا لە هەیوانەکە دانیشت و مهریش لە چێشتخانە خەریکی ئامادەکردنی خواردن بوو. چایەکی بۆ عەبدوڵڵا هێنا. مهری نیگەران بوو ئاغا عەبدوڵڵاش هیچ قسەیەکی نەکرد، نزیکەی کاتژمێر هەشتونیوی شەو لە دەرگا درا. مهری دڵەکوتەی گرتبوو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئێستا لێرە دەبێت بەشەڕ. کاتێک دەرگا کرایەوە، مهری سەیریکرد باوکی و ئاغا ڕەزا بەپێکەنین و ڕوویەکی گەشەوە هاتنە ژوورەوە. ئاغا ڕەزا بوخچەیەکی بەدەستەوە بوو، ئەوکاتە هێشتا کیسەی

نایلۆن پەیدا نەببوو، عەلاگەی نایلۆن هەر نەبوو. مهری سەری سوڕمابوو، بەڵام هێمن بووەوە. ئاغا ڕەزا ئەملاولای ئاغا عەبدوڵڵای ماچکردو گوتی: خێرە هاتوویت بۆ ئێرە ئاوەڵزاوای بەڕێز،ماڵت ڕووناککردینەوە. ئەوکات کارەبا هەبوو گڵۆپەکانیان هەڵکردو ژوورەکە تەواو ڕووناکبووەوە. مهری چایەکی بۆ باوکی هێنا. ئاغا ڕەزا چوو بۆ ژووری چێشتخانەو بە مهری گوت: خواردن ئامادەیە. مهری سەیریکرد هاوسەرەکەی خەریکە خەیار ورد دەکات و لەگەڵ ماست تێکەڵی دەکات. ئاغا ڕەزا گوتی: مهری سفرەکە ڕاخە. مهری سفرەکەی ڕاخست و خواردنەکەی هێنا، سەیریکرد وا هاوسەرەکەی سینییەکی گەورەی بە سێ قاپ خەیارو ماستەوەو بە سێ پەرداخەوە هێنا. باوکیشی ئەو شتانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی بڵاویکردنەوە لەکاتی بڵاوکردنەوەی سفرەکە. محەمەد عەلی گوتی: باشبوو ئاغا فەیزوڵڵا سەهۆڵی هەبوو، ئاغا فەیزوڵڵا دووکانداریکی گەڕەک بوو. لەسەر سفرەکە کاسەیەک سەهۆڵی وردکراو و یەک بوتڵی شەراب هەبوو. مهری سەرسام ببوو هەرگیز نەیبینیبوو باوکی شەراب بخواتەوە. ئاغا ڕەزا سەرو پەرداخی بۆ محەمەد عەلی و ئاغا عەبدوڵڵا تێکردو پەرداخێکی بۆ خۆی تێکرد. هەرسێکیان بەیەکەوە پێکەکەیان بڵند کردو گوتیان: بەسەلامەتی مهری خانم. باوک کەوچکێک ماست و خەیاری بەدەمی کچەکەیەوە کردو گوتی: بەسەلامەتی هاوسەرەکەت نۆشی گیانی بکە. مهری سەری سوڕمابوو نەیدەزانی چی بڵێت؟ باوکی گوتی: ڕۆڵە هیچ نییە ماست و خەیارە بیخۆ. مهری دەمی کردەوەو خواردی. بڕیار وابوو محەمەد عەلی بێت و کچەکەی بەتەڵاقدان بدات، کەچی ئێستا بەیەکەوە دانیشتوون و خەریکی خواردنەوەن. هەریەکەو یەک پێکیان خواردەوەو باوکی سەری شووشەکەی داخست و گوتی: ئیتر بەسە، ئەوەش بۆ کاتێکی تر. ئاغا ڕەزا دەستی محەمەد عەلی ماچکردو نانی ئێوارەیان خوارد. مهری نەیتوانی بە تەواوی خواردنەکەی بخوات، کاتی خوداحافیزی باوک بە کچەکەی گوت: لەگەڵ هاوسەرەکەتدا وەکو دوو هاوڕێ بن. من ئامۆژگاری ئەویشم کردووە کە زیادەڕۆیی نەکات و ڕێزت بگرێت، ئەگەر دایکیشت گوتی دەبێت تەڵاق وەربگریت، بڵێ هاوسەرەکەمم خۆشدەوێت و نامەوێت لێی جیاببمەوە. ئاغا ڕەزا بەڵێنی دا کە هەمیشە ڕێزی مهری بگرێت.

ڕۆژی دواتر ڕوقیە هات بۆ ماڵی کچەکەی پێیگوت: باوکت گوتوویەتی کە تۆ ناتەوێت تەڵاق وەربگریت. مهری گوتی: بەڵێ نامەوێت تەڵاق بدرێم. ئاغا ڕەزا بەڵێنیداوە

ئیتر مەی نەخواتەوەو تۆبەی کردووە. ڕوقیە دەستیکرد بە هاوارهاوارو جوێندان. ئاغا ڕەزا لە هەفتەیەکدا سێ جار مەی دەخـواردەوە. هەموو جارێکیش پێکێکی بۆ مهری تێدەکرد، بەڵام زیاتر ئاوی تێدەکرد مهریش لەو نیو پێکە زیاتری نەدەخواردەوە. ئاغا ڕەزا دەیگوت: مهری من هیچ خۆشگوزەرانێک ناکەم، نامەوێت لەگەڵ هاوڕێکانمدا مەی بخۆمەوە، من هەموو خۆشییەکانی خۆم لەم ماڵەداو لەپاڵ تۆدا بەسەر دەبەم. من کاتێک لەسەر کارم هەمیشە لەبیری تۆدام، کاتێک کارم تەواو بوو، بەخێرایی سواری پاسکیلەکەم دەبم و پایدەر لێدەدەم تا زوو بگەمەوە لای تۆ، بەبێ تۆ هەست بەهیچ خۆشییەک ناکەم، ئەگەر تۆ هەبیت پێویستم بەهیچ هاوڕێیەک و بەهیچ خۆشییەک نییە، تۆ بۆ من هەموو شتێکیت. ئاغا ڕەزا لەماڵەوە لەگەڵ مهری یاریی تاوڵەیان دەکرد. هەمیشە ئاغا ڕەزا یارییەکەی دەبردەوە، بەڵام دوایی مهری باش فێری یاریی بوو زۆربەی جار ئەو یارییەکەی دەبردەوە. ئاغا ڕەزا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەگەڵ مهری زیاتر میهرەبانتر دەبوو. خوشک و دایکی ئاغا ڕەزا هەرچەند ڕۆژ جارێک دەهاتن بۆ ماڵیان. لەکاتی قسەکردندا لە مهرییان دەپرسی دووگیان نەبوویت، چەندجارێک دایکی ئاغا ڕەزا توانجی لە مهری دەدا.

## شەهربانوو لە ماڵی ئاغا ڕەزا

سەرەتای بەیەکگەیشتنیان ئاغا ڕەزا بە مهری گوتبوو، بەبێ مۆڵەتی من مافی ئەوەت نییە بۆ هیچ شوێنێک بچیت، کاتێک مهری بۆ خواردنەوە لەگەڵ ئاغا ڕەزا دانیشت، ئاغا ڕەزا پێیگوت: تۆ ئازادیت بۆ کوێ دەڕۆیت بڕۆ. ئەو کاتێک نیوەمەست دەبوو بە مهری دەگوت: ئێمە سەرەتا ژن و مێرد بووین، بەڵام ئێستا هاوڕێی یەکترین. دەیگوت: سوێند بە ئالی حەزرەت عاشقی تۆم و نۆکەری تۆم. ڕۆژێک ئاغا ڕەزا تێگەیشت کە دایکی و خوشکەکانی لەبارەی منداڵ نەبوونی مهرییەوە قسەدەکەن، ئەویش پێیگوتن باسی ئەو بابەتە مەکەن، خودا چی بوێت هەر ئەوە دەبێت، ئیتر بۆ ئێوە نییە باسی ئەو بابەتە بکەن. هەر ڕۆژێک مهری بڕۆیشتایە بۆ ماڵی دایکی، ئاغا ڕەزاش ئەو ڕۆژە نیوەڕۆیان نەدەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ئەو مۆڵەتی بە مهری دابوو ئەو شەوانەی کە ئێشکچییە، بڕوات بۆ ماڵی دایکی. مهریش بەزۆری دەچوو بۆ ماڵی دایکی تاکو زیاتر هاوکاری دایەگەورەی بکات. چەندجارێک وارێدەکەوت شەهربانوو یەک هەفتە لە ژوورەکەی خۆی نەدەهاتە دەرەوە. مهری دەچوو لەگەنی دەخستە ژێر. ڕوقیەش لەم

کارە زۆر تورە دەبوو. هەرکاتێک مهری بە دایکی دەگوت: ئەو گوناحە، دایکی جوێنی دەداو دەیگوت: تۆ جارێکیتر نەیەیتەوە بۆ ئێرە، خواردنیش بەو پیرەژنە مەدە بابمرێت.

رۆژێک مهری لە ماڵی دایکی بوو، دایکی گوتی: مهری هاوکاریم بکە با دایەگەورەت ببەینە کۆڵان. مهری پێی سەیربوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: دایکم چەند میهرەبان بووە. دایەگەورەیان بردە سەر کۆڵانەکە، کاتی ئێوارە بوو مهری رۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان، پاش چەند کاتژمێرێک زینەت و ئەکرەمە چوون بۆ ماڵی مهری. زینەت گوتی: دایکم نەیهێشت دایەگەورە ببەینە ژوورەوە، پێیگوتین ئیتر رێگا نادەم بێتە ئەم ماڵەوە، مۆڵەتیشی پێنەداین ئێمە بیبەین بۆ ماڵی خۆمان، پێیگوتین ئیتر شەهربانوو بەشی ئەشرەفە. ئەو دەڵێت دەبێت دایەگەورەتان بچێت بۆ ماڵی مامتان، خۆ لەوەیە ئێمە هاوسەرەکانمان رازی نەبن دایەگەورە ببەینە ماڵی خۆمان، هەر بۆیەش لەگەڵ ئەکرەمەدا چووین بۆ ماڵی مامم، کەچی ئامۆژنم هاواری کرد بەسەرمانداو گوتی: دایکتان ئاڵتوونەکانی شەهربانووی بردو خواردی، ئێستاش من ئاگاداریی بکەم. ئەوەتا ئێستاش دایەگەورەمان وا لە کۆڵان کەوتووە، وەرە با هەرسێکمان بەیەکەوە بچین بۆلای دایکم، بەڵکو هەرچۆنێک بێت رازی بکەین تاکو دایەگەورە ببەینە ژوورەوە. کاتێک هەرسێ خوشکەکە گەیشتنە ماڵی باوکیان، سەیریان کرد دایک و باوکیان لەگەڵ یەکدا بەشەرهاتوون، ئەوان هەمیشە شەریا دەکرد بەیەکەوە، بەڵام لەیەکیان نەدەدا، بەڵام ئەمجارەیان لەیەکیشیان دابوو، روقیە هاواری دەکردو دەیگوت: خودایە من چیم کردووە کە دەبێت میزو گووی ئەم ئافرەتە پاک بکەمەوە؟ زینەت گوتی: دایکە من رۆژانە دێم و کارەکانی دایەگەورەم ئەنجام دەدەم، ئاغا عەبدوڵلا بە خەسوی گوت: ئێستا تۆ مۆڵەتمان پێبدە با ئەمشەو ئێمە شەهربانوو ببەینە ماڵی خۆمان. روقیە هاواریکردو گوتی: دەبێت ئەم پیرەژنە ببەن بۆ ماڵی ئەشرەف. چەند کەسێک لە دراوسێکان هاتن بۆ ماڵی محەمەد عەلی بۆ ناوبژێکردن و دەیانویست بووک و خەسوو بەیەکەوە ئاشتبکەنەوە. ئەوان شەرەکەیان شەرێکی کەلتووری بوو، شەری کەسێکی دینداری توندرەو لەگەڵ کەسێکی عیرفانی. بووک جوێنی دەداو خەسوش هۆنراوەکانی سەنایی، عەتار، مەولەوی، حافزی دەخوێندەوە، وەڵامی شەهربانوو بۆ بووکەکەی تەنها خوێندنەوەی هۆنراوە بوو. شەری ئەو دووکەسە شەرێکە بەدرێژایی مێژوو هەبووە. من چەندینجار ئەو جۆرە شەرانەم لە زانکۆش بینیوە. ئەگەر توانیتان بەرگی پێنجەمی

شازادەی حەمام بخوێننەوە، کە دەمەوێت یادەوەرییەکانی زانکۆ لە ساڵی (١٣٤٦-١٣٩٤/١٩٧٦-٢٠١٥) لەو بەرگەدا بنووسمەوە.

دراوسێکان دەیانویست ڕوقیە هێمن بکەنەوە. بومانجان دەیگوت: ڕوقیە ئەوەندە مەڵێ کافر کافر خۆدیار نییە کێ لەلای خودا خۆشەویستە، کێ دەڵێت ئەو نوێژ نەکەرانە لە خودا نزیکتر نین، تاکو لە من و تۆی نوێژکەر. سەکینەی تەرزجانی دەیگوت: ئەو نوێژەی ڕوقیە دەیکات مردووشۆر بیبات، ئاخر چۆن دەتوانێت پیرەژنێکی تەمەن (٩٠) ساڵی نەخۆش لەسەر کۆڵان فڕێبدەیت. دراوسێکان تکایان لە ڕوقیە دەکرد کە ڕێگا بدات شەهربانوو بڕواتەوە بۆ ماڵەوە. ڕوقیەش دەیگوت: نابێت، ئەم کافرە بیست ساڵە بە ملێ منەوە ئێستاش نۆبەی ئەشرەفە. بومان جان گوتی: ئەم ژنە تا چەند ساڵێک لەمەوپێش پارەیەکی هەبوو، هەموو پارەکانیشی بۆ ماڵی تۆ خەرجکرد. زەهرای زەردنەبوو هەواڵێکی لەلای بیبی هاجەر عاشقە مەدینەوە هێنابوو. گوتی: بیبی هاجەر قاچی ئازاری هەیە خۆی ناتوانێت بێت، بیبی گوتوویەتی ئێمە لە ماڵەوە ژوورێکی بەتاڵمان هەیە شەهربانوو بهێنن بۆ ئەو ژوورەی ئێمە. بیبی هاجەر گوتبووی شەهربانوو تا کۆتایی ژیانی با لەماڵی ئێمە بێت. لەوکاتەدا مەلا نەباتی هات، چەمایەوەو دەستی شەهربانووی ماچکردو گوتی: شەهربانوو مامۆستای من بووە، دەیبەمە لای خۆم و هەر خۆم بەخێویشی دەکەم. ڕوقیە بەتوڕەییەوە هاواریکرد، بڕۆ بۆ کوێی دەبەی بیبە، تەنها لە ماڵی من و کچەکانمدا نەبێت. خەریکبوو شەهربانوویان ئامادە دەکرد تاکو بیبەن بۆ ماڵی مەلا نەباتی، خەریکبوو شەو درەنگ دەبوو، ئاغا ڕەزاش هات، ئەو ڕۆیشتبووەوە بۆ ماڵەوە، کە زانیبووی مهری لە ماڵ نییە، هاتبوو بۆ ماڵی باوکی هاوسەرەکەی. مهری بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: نە دەنگەدەنگ و نە سەریەشە، شەهربانوو دەبەین بۆ ماڵی خۆمان تاکۆتایی ژیانی خزمەتی دەکەین و دەیخەینە سەر چاومان. ئینجا بەبێئەوەی چاوەڕوانی قسەی کەسێک بکات، بانگی ئاغا عەبدوڵلای کردو گوتی: وەرە یارمەتیم بدە. شەهربانوو ژێری خۆی تەڕکردبوو، ئاغا ڕەزا کردییە کۆڵی خۆی و ڕۆیشت. مهری و محەمەد عەلی و ئاغا عەبدوڵڵا لەدواوە ڕۆیشتن. من خۆم گەواهی ئەو ڕووداوە دەدەم، ئاغا ڕەزا یەکسەر شەهربانووی برد بۆ ماڵی خۆیان.

مانگی شەهریوەر بوو، کەشێکی خۆشی بوو، ئەعزەم و زینەت و ئەکرەمە هەرسێکیان بەیەکەوە چوون بۆ ماڵی مهری، ژوورێکی زیادەیان هەبوو، ژوورەکە

میوانخانە بوو. ئاغا ڕەزا گوتی: یارمەتیم بدەن با دایەگەورە بگۆڕین. ئەویان گۆڕی و پاکیانکردەوە. ئاغا ڕەزا ڕاخەرێکی خاوێنی بۆ هێناو ڕایانخست. شەهربانوو گوتی: من شەرمەزارم. ئاغا ڕەزا دایەگەورەی ماچکردو گوتی: تۆ دایکی ئێمەیت، هەمیشە لەلای ئێمە بمێنەرەوە. لەو ڕۆژەوە دوو ساڵ و چوار مانگ شەهربانوو زیندوو بوو، ئەو لەلای مهری بوو ئاغا ڕەزا لە مهری زیاتر پێیڕادەگەیشت، هەندێک ڕۆژیش لەکاتی نیوەڕۆدا بە پاسکیل دەهاتەوە بۆ ماڵەوە تا هاوکاری مهری بکات، تاکو بە هەردووکیان بتوانن دایەگەورە ببەنە سەر ئاو و حەمام. دوای چەند هەفتەیەک شەهربانوو هاتەوە سەر حاڵ و باشتر بوو. قاچەکانی فەلەج بوون. نەیدەتوانی بەڕێگادا بڕوات، بەڵام کەمتر خۆی تەڕ دەکرد. ئاغا ڕەزا گوتی: پێویستە دایەگەورە ببەینە لای دکتۆر. ئاغا ڕەزا ڕۆیشت تەکسی هێنا. ئۆتۆمبێل نەیدەتوانی بچێتە کۆڵانەکەوە، بۆیە دایەگەورەی کردە کۆڵی، ماڵی ئاغا ڕەزا (١٥٠-٢٠٠) مەتر دوور بوو لە تاکسییەکەوە. سواری تاکسی کردو بردی بۆ لای دکتۆر سینا. دکتۆر گوتبووی نەخۆشییەکەی زیاتر بەهۆی لاوازیی و کەمخوێنییەوەیە، کەباب و گۆشت و جگەرو خواردنی باشی پێبدەن تاکو هێزێکی بۆ بگەڕێتەوە. دکتۆر چەند دەرزی و حەپی بۆ نووسی. ئاغا ڕەزا ڕۆژانە گۆشت و جگەرو کەبابی بۆ دەهێنایەوە. ڕۆنی زەردو هەنگوینی پێدەدا. دیارە ئەوکاتە بە مووچەی پاسەوانی دەکرا ئەم خواردنانە دابین بکرێت. ڕۆژێک مهری بە هاوسەرەکەی گوت: لەوەیە ئەم خواردنانە باش نەبن. ئاغا ڕەزا گوتی: لە تێری بمرێت باشترە تاکو لەبرسێتی. پاش مانگێک شەهربانوو بوژایەوە چاوەکانی ڕووناکییان بۆ گەڕایەوە، دەیتوانی ئاگاداری خۆی بکات و ژێر خۆی تەڕ نەکات. ڕۆژێک شەهربانوو بە مهری گوت: دەبێت ئاغا ڕەزا بڕوات کتێبەکانی من بهێنێت بۆ ئێرە. شەهربانوو شەوانە چیرۆکەکانی شانامەی بۆ ئاغا ڕەزا دەخوێندەوە، ڕۆژێک ئاغا ڕەزا گوتی: شەهربانوو من لە مانای هەندێک لە هۆنراوەکان تێناگەم. دایەگەورە گوتی: ئەگەر حەزدەکەیت هەندێک لە چیرۆکەکانی شانامەت بۆ لێکدەدەمەوە. بە مهری گوت: بڕۆ ئەو شانامەیەم بۆ بهێنە. مهری شانامەی هێناو شەهربانوو شانامەکەی کردەوە بە ئاغا ڕەزای گوت: فەرموو بخوێنەرەوە. ئاغا ڕەزا یەکەم دێڕی شانامەکەی خوێندەوە، شەهربانوو گوتی: پێم بڵێ ئەو دێرە مانای چییە؟ فیردەوسی دەیەوێت چی بڵێت؟

**بەنام خداوند جان و خرد کزین برتر آندیشه برنگذرد**
**بەناوی خوداوەندی گیان و ژیر که لەو زیاتر کەسێکی بە هۆش نیە**

ئاغا ڕەزا کەوتە منجەمنج و گوتی: مهری تۆ هۆنراوەکە ڕاڤەبکە. مهریش چەند قسەیەکی کردو شەهربانوو ماوەی یەک هەفتە هەموو شەوێک چەند کاتژمێرێک لەبارەی وشەکانی (خردو اندیشە) قسەی بۆکردن. شەهربانوو دەیگوت: هەندێک کەس دژی فیردەوسی و شانامەن، بەهانەشیان ئەوەیە کە فیردەوسی باسی شاکانی کردووە، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە دژی هەرکەسێک دەوەستنەوە کە لایەنگری عەقڵ و بیرکردنەوە بن.

نزیکەی یەک ساڵ و نیو لە ماڵی ئاغا ڕەزادا خوێندنەوەی شانامە بەردەوام بوو. ئیتر ئاغا ڕەزاش بوو بە خوێنەرێکی باشی شانامە. شەوێک دایەگەورە ئەم دێرە هۆنراوەیەی ڕاڤە کرد.

**که گفتت برو دست رستم ببند**
**مبند مرا دست چرخ بلند**

**کە گوتت بڕۆ دەستی ڕۆستەم ببەستە**
**دەستی من مەبەستە گەردوونی گەورە**

شەوێک ئاغا ڕەزا گوتی: بەڕاستی ئەم پاسەوانییە کار نییە، ئێمە هەموومان دەستمان بەستراوە. ڕۆژێک دایەگەورە بە نەوەکەی خۆی گوت: ڕۆڵە خۆتۆ هەموو کتێبەکانی منت نەهێناوە، مهریش ڕۆیشت بۆ ماڵی دایکی. دایکی پێیگوت: هەرچی زووترە کتێبەکانی ئەو کافرە هەڵگرەو بڕۆ، کتێبەکانی ئەو کافرە لە هەرشوێنێک بێت فریشتە ڕووی تێناکات، هەموو بەهۆی ئەو کتێبانە بوون ئەو ژنە بووە بە کافر. ئەگەر تۆش ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە دەبیت بە کافر. ئەم بۆچوونە تەنها تایبەت نەبوو بە ڕوقیە، بەڵکو بەدرێژایی مێژوو ئەو جۆرە بۆچوونە بوونی هەبووە، بەتایبەت دەسەڵاتدارەکان و شاکان و دیکتاتۆرەکان دژی ئەوەن خەڵکی کتێب بخوێننەوە. ڕوقیە هاواریکرد گوتی: دەبێت ئەم کتێبانە بسووتێنم، ئادەی کتێبەکانم بۆ بهێنن بۆ ژووری چێشتخانە با بیانسووتێنم. مهری لە تاواندا هاواری لێهەڵسا. دایکیشی دەیگوت: من ئەو کتێبانە هەردەسووتێنم. کچەکەی زۆر هاواریکرد، بەڵام سوودی نەبوو. مهری خێرا بانگی زینەتی کرد، زینەتیش هات. زینەت گوتی: دایکە ئاژاوە مەنێرەوە، ئەگەر باوکم بێتەوە بزانێت ئەو کتێبانەت

سوتاندووە، دەبێتە شەڕ لە نێوانتاندا، تکایە کارێک مەکە ئاژاوە لەماڵدا دروست بێت. لەو کاتەوە شەهربانوو ڕۆیشتبوو بۆ ماڵی مهری، ڕوقیەو هاوسەرەکەی کەمتر شەڕیان دەبوو. ڕوقیە بە مهری گوت: بەمەرجێک کتێبەکانت پێدەدەم کە سوێندم بۆ بخۆیت ئەم کتێبانە نەخوێنیتەوە. مهریش سوێندی خوارد کە کتێبەکان ناخوێنێتەوە. دیارە ئەو سوێندە سوێندی بەرژەوەندی بوو. ئێوە لە تەمەنتاندا چەندجار لەو جۆرە سوێندانەتان خوێندووە؟ مهری بە هاوکاری زینەت و ئاغا عەبدوڵلاو ئەکرەمە کتێبەکانی دایەگەورەی برد بۆ ماڵی خۆیان. شەهربانوو کەم کەم حاڵی باشتر ببوو. ژنانی دراوسێی سەردانیان دەکرد، تاکو نامەیان بۆ بنووسێت و نامەکانیان بۆ بخوێنێتەوە. جارجارێک مهری بە هاوکاری ئاغا ڕەزا شەهربانووی دەبردە سەرکۆڵانەکە، ئاغا ڕەزاش کورسییەکی دەسکداری بۆ کڕیبوو لەسەر کورسییەکە دایاندەنیشاند.

مهری منداڵی نەبوو، دایکی هاوسەرەکەی بەسەریدا دەیبۆڵاند، کە بۆچی منداڵی نابێت. مهری بەردەوام نوێژی دەکرد، جارجاریش لەگەڵ هاوسەرەکەی مەی دەخواردەوە، شەوانە ئەگەر ئاغا ڕەزا بیویستایە مەی بخواتەوە لە ژوورەکەی شەهربانوو، مێزی خواردنەوەیان دەڕازاندەوە. شەهربانووش هەندێک ئاوی دەکردە پەرداخێکەوەو دەیگوت: بەسەلامەتی ئێوە. ئەو هەرگیز مەی نەخواردبووەوە، هەرگیز نوێژیشی نەکردبوو. ڕۆژێک مهری لە دایەگەورەی پرسی لەکەیەوە نوێژت نەکردووە؟ شەهربانوو، گوتی: هەشتا ساڵە نوێژم نەکردووە. شەهربانوو هەمو ڕۆژێک بەیانیان تاوێک قورئانی دەخوێندو ماناکەی بۆ مهری لێکدەدایەوە، ئەو چەندین ساڵ وانەی قورئانی بە منداڵان گوتبوو، منداڵانی فێری نوێژکردن کردبوو، بەڵام بۆخۆی نوێژی نەدەکرد. کاتێک ئاغا ڕەزا لەماڵەوە دەبوو بەردەوام لەگەڵ دایەگەورە قسەی دەکرد. شەهربانووش باسی مێژووی بۆ دەکرد. شەهربانوو خۆی بە خوێندکاری شێخ هادی نەجم ئابادی دەزانی و لەسەر پەیڕەوی ئەویش بوو، باسی شۆڕشی مەشروتییەت و ڕاپەڕینەکانی میرزا کوچوک خانی جەنگەلی و دکتۆر حیشمەت و هاتنە سەرکاری ڕەزا شای دەکرد. شەهربانوو لەبارەی هاتنە سەرکاری محەمەد ڕەزا شاو خۆماڵیکردنی نەوت لەلایەن دکتۆر موسەدیقەوە قسەی دەکرد. ئاغا ڕەزا زۆر تینووی قسەکانی دایەگەورە بوو. ئاغا ڕەزا ڕۆژانە چەندین سوێندی بە ئالی حەزرەت دەخوارد، بەڵام دوای ساڵێک کە دایەگەورە هاتە ماڵیان، ئیتر ئەو سوێندەی تەرک کرد.

## مردنی شەهربانوو

چەند ڕۆژێک دوای نەورۆزی ساڵی (١٩٦١/١٣٤٠) کاتی بانگی نیوەڕۆ شەهربانوو بە مهری گوت: کچەکەم حەزدەکەم نوێژێک بکەم، وەرە یارمەتیم بدە بادەست نوێژ بگرم، مهری پێی سەیر بوو، دایەگەورەی تەمەنی (٩٤) ساڵبوو هەرگیز نوێژی نەکردبوو. مهری یارمەتی دا تا دایەگەورەی دەستنوێژی گرت و ڕوو بە قیبلە وەستا، مهری پێی سەیربوو. شەهربانوو چەندجارێک گوتی: خودایە تۆبەو فرمێسک بە چاوانیدا هاتنەخوارەوە، مهریش لەلایەکەوە دانیشتبوو سەیری دەکرد، کە چۆن ژنێک ماوەی هەشتاو چەند ساڵێک نوێژی نەکردووەو ئێستاش کە تەمەنی بووە بە (٩٤) ساڵ و یەکەمین نوێژ لە تەمەنیدا دەکات. سەیرکەن ژنێک خۆی مەلا بووەو چەندین ساڵ وانەی بە منداڵان گوتووەو فێری نوێژکردنی کردوون، بەڵام بۆخۆی نوێژی نەدەکرد. شەهربانوو سورەتی (الحمد)ی خوێند، دەستیکرد بە خوێندنی سورەتی (تۆبە). مهری سەرێکی لە چێشتخانەکە داو چەند قاپێکی شۆری و گەڕایەوە. شەهربانوو خەریکی نوێژکردن بوو. مهریش هات و لەلایەوە دانیشت تاکو دایەگەورەی نوێژەکەی تەواوکرد. شەهربانوو نوێژی عەسرو نیوەڕۆشی کرد. دوایی گوتی: کچەکەم دیوانی شەمسی تەبرێزیم بۆ بهێنە، دیوانەکەی کردەوەو دوو لاپەڕەی بەدەنگی بەرز بۆ مهری خوێندەوە، دواتر بەبێئەوەی نانی نیوەڕۆ بخوات، لێیخەوت. کەوتە خەوێکی قوڵەوە هەتا کاتژمێر پێنجی ئێوارە خەوت، کاتێک لەخەو هەڵسا مهری لێیپرسی دایەگەورە ئەوە چۆنی بوو نوێژت کرد. ئەویش گوتی: ئەمساڵ پێیدەگەم، مهریش تێنەگەیشت چی دەڵێت. گوتی: بەکوێ دەگەیت؟ شەهربانووش گوتی: بۆ ئەو شوێنەی لە تەمەنی (٢٢) ساڵییەوە دەمەوێت پێی بگەم.

بانگی ئێوارەی داو شەهربانوو بە نەوەکەی گوت: یارمەتیم بدە با نوێژەکە بکەم. مهری هاوکاریکرد تا دەستنوێژی گرت و ڕووەو قیبلە وەستا. شەهربانوو دوای خوێندنی سورەتی ئەلحەمد سورەتی یاسینی خوێند. لەنێوان دوو ڕکات نوێژدا کەمێک دیوانی شەمسی تەبریزی خوێندەوە. شەهربانوو نوێژی خەوتنانی دەکرد کە ئاغا ڕەزا هاتەوە. کاتێک ئاغا ڕەزا بینی وا شەهربانوو نوێژ دەکات پێی سەیربوو، لە مهری پرسی ئەوە خۆ شەهربانوو وا نوێژ دەکات. مهری گوتی: جگە لە نوێژکردنەکەی قسەیەکیشی کرد گوتی: ئەمساڵ پێیدەگەم، دەگەم بە جێگایەک کە لە تەمەنی (٢٢)

ساڵییەوە خۆمم بۆ ئامادەکردووە بچم. دوای نانخواردن ئاغا ڕەزا مانای ئەو قسەیەی لە شەهربانوو پرسی. شەهربانوو لە وەڵامدا گوتی: من لە تەمەنی لە (٢٢) ساڵییەوە دەروێشم. دەرویشی ڕێگای هەق. حەفتاودوو ساڵە بەڕێگاوەم بەرەو ئەو شوێنە ئەمساڵ پێیدەگەم. لەوەیە چەند مانگێکی تر پێیبگەم پێویستە تۆبە بکەم لە تاوانەکانم. ئەو وشەی (مردن و ڕۆیشتنی) بەکار نەدەهێنا. مهری و ئاغا ڕەزا لە وشەی (دەروێش و گەیشتن) هیچ تێنەگەیشتن.

لەوە بەدوا شەهربانوو بە بەردەوامی نوێژەکانی دەکرد، لە نێوان نوێژەکانی نیوەڕۆ عەسرو ئێوارەو خەوتناندا بە بەردەوامی کتێبەکانی (عەتار، مەسنەوی، دیوانی شەمس، حافز)ی دەخوێندەوە. هەندێکجاریش شانامەی بەدەنگی بەرز دەخوێندەوە.

سەرەتای مانگی (خورداد/ حوزەیران) بوو، شەهربانوو بە مهری گوت: کچەکەم وەرە لامەوە دانیشە دەمەوێت چەند قسەیەکت لەگەڵدا بکەم. مهری چووە لای دایەگەورەیەوە دانیشت. شەهربانوو گوتی: من درۆم لەگەڵ دایکتدا کرد، من ئاڵتوونم هەیە. مهری گوتی: چۆن دایەگەورە؟ تۆ ئاڵتوونت هەیە، ئەی ئاڵتوونەکانت لەکوێن؟ شەهربانوو ئاماژەیەکی کرد بۆ تاقەی کتێبەکان و کتێبەکانی نیشانداو گوتی: ئەوانە ئاڵتوونەکانی منن، ئەوانە لە ئاڵتوون بەنرخترن، تکایە بەباشی ئاگاداریان بکە، ئێستا ئەم کتێبانە هەمووی هی تۆیە، من ئێستا زیندووم و ئارەزووی خۆمە کتێبەکانم بە هەرکەسێک ببەخشم. لە کاغەزێکیش بۆتی دەنووسم کە هەموو کتێبەکانم پێشکەش بە تۆ کردووە. ئەوانە مافی کەسیان پێوە نییە لەتۆ زیاتر. لەو کتێبانەدا (٥٧) بەرگ کتێبی دانسقەو بەنرخ هەیە. کە زۆر کۆنن و نەوە دوای نەوە بۆ من جێماون. مهری هەرگیز دەستی بەر ئەو کتێبە بەرگ چەرمییانە نەکەوتبوو. هەرگیز پەڕەکانی ئەو کتێبانەی نەکردبووەوە، چونکە دایەگەورەی پێیگوتبوو دەست لە کتێبە بەرگ چەرمەکان نەدات. شەهربانوو بە مهری گوت: برۆ کتێبێکی بەرگ چەرمم بۆ بهێنە. ئەویش چوو کتێبێکی گەورەی بۆ هێنا. شەهربانوو گوتی: ئەم کتێبە سێ بەرگە، تایبەتن بە سەردەمی تەیموری لەنگ، ئەم کتێبە دانسقەیەو دەست ناکەوێت، بەدەست وێنەی جوانیشی تێدا کێشراوە. دوایی پێیگوت کتێبێکی تری بۆ بهێنێت. ئەو کتێبەیان شانامە بوو، لە شاری هیرات نوسرابووەوە. کتێبەکەی کردەوە زیاتر لە پەنجا لاپەڕەی وێنەی جوان و سەرنجڕاکێش بوو. گوتی: ئەم کتێبە لە ئاڵتوون بەنرخترە. شەهربانوو گوتی: کتێبەکانی

تر (٢٤) بەرگیان تایبەتە بە سەردەمی سەفەوییەکان، پێنج بەرگیان تایبەتە بە سەردەمی نادرشا. ئەوانی تریش تایبەتن بە سەرەتای سەردەمی قاجارییەکان. شەهربانوو گوتی: کچەکەم ئەم کتێبانە هەمووی هی تۆیەو نرخیان بزانە. مهری لە مەبەستی دایەگەورەی تێنەگەیشت، ئەو وای بیرکردەوە کە مەبەستی دایەگەورەی ئەوەیە، چونکە ئەو کتێبانەی بە میرات بۆی ماوەتەوە، پێویستە نرخیان بزانێت. ئەو نەیزانی دایەگەورەی مەبەستی ئەوەیە کتێبەکانی لەڕووی نرخی پارەوە بەنرخن.

کاتی ئێوارە ئاغا ڕەزا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، مهری پێیگوت: دایەگەورە کتێبەکانی داوە بەمن ئێستا کتێبەکان هەموویان هی منن. ئاغا ڕەزا گوتی: ئەو کتێبە کۆنانە دەڵێیت؟ پێویستە هەموویان فڕێبدرێن. ئەوانە بەکەڵکی چی دێن، بەبێ هۆ تاقەکەمان پێگرتوون، ئەگەر لەبەر خاتری ئەو پیرەژنە نەبێت جگە لە چەند کتێبێکی وەکو شانامەو مەسنەوی و دیوانی شەمس و دیوانی حافز نەبێت، کە هەمیشە دەیانخوێنێتەوە، هەموویان فڕێدەدەم. مهری گوتی: دایەگەورەم دەڵێت ئەو کتێبانە لە ئاڵتوون بەنرخترن. ئاغا ڕەزا گوتی: بەندەی خودا ئەوە خەوی بینیوە هەر لەخۆوە قسە دەکات، بۆئەوەی دڵی نەشکێت با بەیەکەوە بچین سوپاسی بکەین، هەردووکیان بەیەکەوە چوون سوپاسی شەهربانوویان کرد. ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: هەموو ئەم کتێبانە دوو قران ناهێنن، ئاغا ڕەزا هەڵوێستێکی کردو گوتی: دیارە قسەی ئەم پیرەژنە بەبێ بەڵگە نییە، لەوەیە ئەم کتێبانە بەکەڵکی شتێک بێن، خۆ لەوەشە پارەیەک بکەن. شەهربانوو بە ئاغا ڕەزای گوت: ئێوە زۆر بەمنەوە ماندوو بوون و پارچە کاغەزێکی دایە دەست. لەسەر کاغەزەکە نوسرابوو من ئێستا زۆر باشم، هۆشم لەسەر خۆمەو سێ دەزگای بەرە چنین و فەرشچنینم هەیە پێشکەشم کردووە بە ئاغا ڕەزای هاوسەری نەوەکەم، لە خوارەوەش ئیمزای کردبوو. نامەیەکیشی لەبارەی کتێبەکانەوە بۆ مهری نووسیبوو.

ئاغا ڕەزا لەتەنیشت دایەگەورەوە دانیشتبوو گوێی بۆ قسەکانی گرتبوو. شەهربانوو بە ئاغا ڕەزای گوت: پێویستە تۆ بخوێنیت. ئاغا ڕەزا گوتی: خوێندنی چی؟ من چۆن بخوێنم، من پاسەوانم و پاسەوانی دەکەم. دایەگەورە گوتی: هەرکارێکت کرد پێویستە بەدڵسۆزیی ئەو کارە ئەنجام بدەیت، کە ئەوەش گەورەییە بۆ خۆت، بەڵام کاری پاسەوانیی بەکەڵکی هیچ نایات. پێویستە تۆ بخوێنیت و ببیتە قازی یان دادوەر. ئاغا ڕەزا گوتی: چۆن؟ ئەویش گوتی: لەپێناو مافی خەڵکیدا بۆئەوەی مافی خەڵکی

وەربگریتەوە. شەهربانوو گوتی: پاسەوانیی دڵسۆز کارێکی پیرۆزە، بەڵام پاسەوانیی بەکەڵکی تۆ نایەت.

ئێوارەی چواردەی موردادی ساڵی (١٣٤٠/١٩٦١) بوو. شەهربانوو چەندین هۆنراوەی خوێندەوەو چەند یادەوەرییەکی گێڕایەوەو زۆر پێکەنی. زۆر سوپاسی ئاغا ڕەزای کردو ڕوویکردە مهری و گوتی: کچەکەم، خودا ئاگادەرتان بێت وەک ئاگاداری منتان کرد. مهریش بە دایەگەورەی گوت: دایکم زۆر ئازاری تۆی داوە تکایە لێی ببوورە. دایەگەورە گوتی: ڕوقیە هەرچییەکی کردبێت مافی خۆی بووە بە منەوە زۆرماندوو بووە، من هیچ کاتێک نزای خراپم لەدایکت نەکردووە، من هیچ کاتێک باوەڕم بە نزاو تۆڵەسەندنەوە نەبووە، خودا خۆی شاهیدە گەردنی دایکتم ئازادکردووە، خودا بۆخۆی گەورەو میهرەبانە، خودا بۆخۆی بەخشندەیە، من هیچ شتێک نیم لە هەموو کەسێک ڕازیم. لە دایکت، لە باوکت، لە ئێوە لە کوڕو بووک و نەوەکانم، لە هەمووتان ڕازیم، زۆر زۆر لە دراوسێکان ڕازیم. تەنها لەو کەسە ڕازی نیم و گەردنی ئازا ناکەم دژی ئەم وڵاتەو ئەم گەلەن، ئەمڕۆ ڕۆژی مەشروتییەتە، من لەوکەسانەی ئەم شۆڕشەیان نابوتکرد ڕازی نیم. شەهربانوو بە ئاغا ڕەزاو نەوەکەی گوت: ڕێزی یەکتری بگرن و هیوادارم ژن و مێردێکی سەرکەوتووبن. ئاغا ڕەزا دەستی دایەگەورەی ماچکرد. شەهربانوو گوتی: ئەو بەرماڵەم بۆ بهێنن با نوێژ بکەم. مهری گوتی: دایەگەورە خۆ تۆ نوێژی ئێوارەو خەوتنانت کردووە. شەهربانوو گوتی: دەمەوێت نوێژ بکەم، کاتێک سورەتی ئەلحەمدی خوێندو بە دەنگێکی بەرز سورەتی ئەلرەحمانی خوێند فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتنەخوارەوە، ڕوویکردە مهری و گوتی: کچەکەم هاوسەرەکەی خۆتت خۆشبوێت و ئاگاداری کتێبەکانی منیش بیت. وریابن ئەو کتێبانە بەبەلاش نەدەن بە کەس. دایەگەورە بە مهری گوت: ئادەی هەڵسن هەردووکتان یەکتری ماچ بکەن. ئەوان هەڵسان یەکتریان ماچکردو شەهربانووش تێر پێکەنی و چووە بن جێگاوە بۆ خەوتن. بەیانی زوو پێش مەلا بانگدان ئاغا ڕەزا چوو بۆ ژووری دایەگەورە، ویستی هاوکاری بکات بۆ دەستنوێژگرتن. کاتێک چووە ژوورەوەو لێفەکەی لەسەری شەهربانوو لادا، سەیریکرد گیانی تێدا نەماوە، لەناکاو هاواریکردو گوتی: مهری دایەگەورە مردووە، مهریش بەخێرایی هاتە ژوورەوە کە سەیری کرد دایەگەورە مردووە.

بۆ یەکەمینجار لەدوای هاوسەرگیرییەکەیان مامە ئەشرەف و ئامۆژن و منداڵەکانیان

هاتن بۆ ماڵی مهری. مردنی شەهربانوو هەمووانی لە دەوری یەکتری کۆکردەوە. بەڕاست بۆچی زۆرێک لە ئێمە هاتوچۆی یەکتری ناکەین و لەیەکتری ناپرسینەوە تاکو کەسێکمان لێ دەمرێت ئەوکات لە دەوری یەکتری کۆدەبینەوە. ئایا خزم و کەس تەنها بەکەڵکی کاتی مردن دێن. ئەم بۆچوونە شتێکی تازە نییە، بەڵکو پێشینەیەکی زۆری هەیە، گرانیی و نەبوونیش هۆکارێکن بۆ دوورکەوتنەوەی خزم و کەسەکان لەیەکتری. من پرسەکەی شەهربانووم باش لەیادە، پرسەکەی لە مزگەوتی پشتی باغ بوو. ئەوەی من سەرم لێی سوڕمابوو ئەوە بوو، کە نزیکەی پانزە کەس لە گەورەپیاوانی یەهودی بەشداری پرسەکەیان کردبوو. ئەوەشم بیست کە زەردەشتییەکانیش لە شارۆچکەی (خورەشا) پرسەیان بۆ گێڕابوو. دیارە تا دەیەی ساڵی (١٣٤٠/١٩٦٠) ئامادەبوونی زەردەشتییەکان و یەهودییەکان لە پرسەی موسڵمانان کارێکی ئاسایی بوو، بەپێچەوانەشەوە موسڵمانەکانش بەشداری تەواوی مەراسیمەکانی ئەوانیان دەکرد. من خۆشم چەندینجار بەشداری پرسەی زەردەشتی و یەهودیم کردووە.

## ڕۆیشتنی مهری بۆلای دکتۆر

هەفتەیەک دوای مردنی شەهربانوو، ئاغا ڕەزا باسی منداڵبوونی لەگەڵ مهریدا کردەوە. مهری نزیکەی سێ ساڵ بوو شوویکردبوو، تەمەنی نزیکەی (٢٠) ساڵ دەبوو هێشتا نەببوو بە خاوەنی منداڵ. دوای مانگێک ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: هەڵسە با بڕۆین بۆلای دکتۆر (موجیبیان) مهری زۆر بەکەمی چووبوو بۆلای دکتۆر، جارێک لە تەمەنی (٦-٧) ساڵیدا چووبوو بۆلای دکتۆر، ئیتر هەرگیز سەردانی دکتۆری نەکردبوو. ئەو نەیدەزانی دکتۆر بڕیاری چی دەدات، ژن و پیاو چوون بۆ نۆڕینگەی دکتۆر (جەلالی موحیبیان) چەند ژنێکی تر لەوێبوون، ئەوانیش نۆبەتی چوونەژوورەوەیان گرتبوو. ژنێک لە مهری پرسی بۆچی هاتووە بۆلای دکتۆر، ئەویش گوتی: سێ ساڵە هاوسەرگیریم کردووە، بەڵام تائێستا دووگیان نەبووە. ئەو ژنەش بە مهری گوت: دکتۆر دەتوانێت چارەسەرت بۆ بکات. مهری گوتی: بۆچی دکتۆری پیاو دەست لە من دەدات، ئەوکات دکتۆری پسپۆڕی ژن لە یەزد نەبوو، واهەست دەکەم ئەو کاتە لەهەموو ئێراندا دکتۆری پسپۆڕی ژنان زۆر کەم بوو. مهری بە ئاغا ڕەزای گوت: من نایەم بۆلای دکتۆر. ئاغا ڕەزا زۆری لەگەڵ گوت، بەڵام مهری دەیگوت: من ناچمە لای دکتۆری پیاو. ئاغا ڕەزا کە پیاوێکی زۆر میهرەبان بوو، گوتی: زۆرباشە تۆمەیە من خۆم تەنها دەچم بۆلای.

ئاغا ڕەزا بەبێ مهری خۆی چوو بۆلای دکتۆر جەلالی موجیبیان. دکتور بۆی نووسی بۆ پشکنین. دوای چەند ڕۆژێک ئاغا ڕەزا ئەنجامی پشکنینی بردەوە بۆ دکتور. دکتۆر پێیگوت: کێشەکە لەتۆوەیە، تۆ منداڵت نابێت، دکتۆر موجیبیان ئەوی نائومێد نەکرد و گوتی: بە زانستی ئەمڕۆ ناتوانیت ببیت بە خاوەنی منداڵ، بەڵام زانست لە پێشکەوتندایە. لەوەیە لەدوای چەند ساڵێکیتر زانست پێشبکەوێت و تۆش ببیتە خاوەن منداڵ، بۆیە نائومێد مەبە. دوای چەند ڕۆژێک ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: تۆ گەنجیت حەزیشت لە منداڵە، من تۆم زۆرخۆشدەوێت. ئەگەر دەتەوێت تەڵاقت دەدەم و بۆخۆت بڕۆ شوو بکەرەوە. مهری دەستیکرد بە گریان و گوتی: من تۆم زۆرخۆشدەوێت، کێ دەڵێ منیش منداڵم دەبێت؟ دوای چەند هەفتەیەک مهری بڕیاری دا بڕوات بۆلای دکتۆر. دکتۆر پشکنینی بۆ کردو پێیگوت: تۆ هیچ کێشەیەکت نییەو کێشەکەتان لە ئاغا ڕەزاوەیەو منداڵی نابێت. دکتۆر ئەویشی نائومێد نەکرد. چەندینجار ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: ئەگەر دەتەوێت تەڵاقت دەدەم. مهری پێشنیاری کرد بچن منداڵێک هەڵبگرنەوە. مهری و ئاغا ڕەزا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ یەکتریان زیاتر خۆشدەویست. ئاغا ڕەزا بە دایک و خوشک و براکانی گوت: کێشەکە لە ئەوەوەیە کە مهری دووگیان نابێت، دایکیشی خێرو نزای دەکرد کە کوڕەکەی ببێتە خاوەن منداڵ. ئیتر ئەویش هیچی بە بووکەکەی نەگوت، سێ ساڵ و چەند مانگێک بوو هاوسەرگیرییان کردبوو. ڕۆژێکیان مهری بە ئاغا ڕەزای گوت: باوکم گوتوویەتی پاسەوانەکان ڕەشوە وەردەگرن. ئاغا ڕەزا گوتی: هەندێک لە هاوکارەکانم ڕەشوە وەردەگرن. بەڵام من یەک ڕیاڵ لە خەڵکی وەرناگرم. من جگە لە مووچەکەم هیچ شتێکی ترم نییە.

## ڕوقیەی کافر

زستانی ساڵی (١٩٦٢/١٣٤١) مانگی دەی بوو، مهری گوێی لە دەنگی لێدانی دەرگا بوو، بەدەنگی دەرگاکەدا زانی کە ژنێک لە دەرگاکە دەدات، بەخێرایی ڕایکردو دەرگاکەی کردەوە. زینەت بە پەشۆکاویی خۆیکرد بەژووردا. مهری گوتی: خوشکەکەم چی ڕوویداوە؟ زینەت گوتی: عەباسی مێردی ئەکرەمەی خوشکمان ژنی هێناوە. مهری گوتی: خوشکەکەم چۆن شتی وابووە. زینەت گوتی: سوێند بەخودا بەڕاستیمە، عەباس ژنی هێناوە، لە ژنانی دراوسێ بیستوومە، من پێمگوتن ئەوە ڕاست نییەو تەنها قسەیە، منیش چووم بۆماڵیان. پورم گوتی: ژنی هێناوەو کارێکی باشی کردووە، خۆ کاری

خراپی نەکردووە، ئەو کارێکی کردووە خوداو پێغەمبەر ڕازییان لەسەرە. ئێستا ئێمە چی بکەین خۆ ئەگەر ئەکرەمەو دایکم بزانن شەڕ دروست دەبێت، لەم گەڕەکانەدا ئەگەر قسەیەک کەوتە سەرزاری خەڵکی بێ هۆ نییە، ئەوە ڕاستە کە گوتوویانە دەتوانیت دەرگای شارێک دابخەیت، بەڵام ناتوانیت دەمی خەڵکی دابخەیت.

دوو شەو لەوەودوا هەواڵی ژنهێنانی عەباس لەناو ژناندا بڵاوبووەوە، سەرەنجام لەدوای سێ ڕۆژ ئەکرەمە زانی هاوسەرەکەی ژنی هێناوە، هەڵساو ڕۆیشت، ماڵی هەوێکەی دۆزییەوە کە سەیریکرد هاوسەرەکەشی لەوێ بوو. لەوێ هەتا توانی قسەی ساردو سوکی پێگوتن و دوایی ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی دایکی و بەسەرهاتەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە. زینەت دووبارە هاتەوە بۆ ماڵی مهری و گوتی: وەرە با بڕۆین بۆ ماڵی دایکم، هەردووکیان بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ ماڵی دایکیان. ڕوقیە جوێنی دەداو لەخۆی دەداو کەسێک نەیدەتوانی ئارامی بکاتەوە. دراوسێکان هاتن بۆ ماڵی ڕوقیەو هەوڵیان لەگەڵدا دەدا تاکو هێمن ببێتەوە، بەڵام ئەو کات لەدوای کات تورەتر دەبوو. زینەت کوڕە دوازدە ساڵەکەی خۆی نارد بەدوای باوکیدا، کات دەوروبەری سێی دوانیوەڕۆ بوو کە محەمەد عەلی هاتەوە بۆ ماڵەوە، ڕوقیە جوێنی بە هاوسەرەکەی خۆی دەدا، محەمەد عەلیش هیچی نەدەزانی مات و بێدەنگ ڕاوەستابوو. ڕوقیە هاواریکرد بەسەریداو گوتی: عەباسی هاوسەری ئەکرەمە ژنی هێناوە. محەمەد عەلی گوتی: ژنی هێناوە تۆ دەتەوێت بڵێیت چی؟ ئەکرەمە بەگریانەوە گوتی: باوکە دایکم ڕاست دەکات، هاوسەرەکەم ژنی هێناوە، خۆم چووم بۆ ماڵەکەیان، ئەو و ژنەکەیم بەیەکەوە بینی. سەکینەی تەزرجانی و بومانجان و هاوسێکانی تر هەوڵیان دەدا ڕوقیە بێدەنگ بکەن. ئەعزەم ڕۆیشت بۆ ماڵی پوری، واتە دایکی هاوسەرەکەی ئەکرەمە داوای لێکرد بێت لەگەڵیدا بۆ هێورکردنەوەی دایکی. هەوا ساردبوو، بەڵام ڕوقیە لەسەر تەلاری خانووەکە دانیشتبوو.

نزیکی ئێوارە بوو، کوبرای خوشکی ڕوقیە گەیشتە ماڵی ڕوقیە. کاتێک ڕوقیە چاوی بە خوشکەکەی کەوت دایگرتەوە بە جوێن، جوێنی پێدەداو هەڕەشەی لێدەکرد، ژنانی گەڕەک ڕوقیەیان گرتبوو هێنایان بەرەو لای حەوزی ئاوەکە، هەندێک ئاویان بەدەموچاویدا کرد. نزیکەی دە کاتژمێر دەبوو ڕوقیە قسەی دەکردو جنێوی دەدا، ڕووبەڕووی دەرگاکە وەستابوو جوێنی بە کوبرای خوشکی دەدا. دە کاتژمێر بوو هیچی نەخواردبوو. خوشکەکەشی تورە ببوو بە جوێن وەڵامی خوشکەکەی دەدایەوە.

ژنەکان ویستیان کوبرا بکەنە دەرەوە، بەڵام ئەو نەدەڕۆیشت و جوێنی بە خوشکەکەی دەدا. ڕوقیە هاواریدەکردو دەیگوت: ئاخر کچ لە کچی من جوانترو ئاقڵتر هەیە وا ئەو سەگەی کوڕت ژنی بەسەرهێناوە. کوبراش دەیگوت: هەموو کەسێک دەبێت بزانێت چۆن گفتوگۆ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکات، هەرکەسێک دەبێت ڕێزی هاوسەری خۆی بگرێت، بەڵام کچەکەی تۆ بە جوانییەکەی خۆی دەنازێت، ئێستا کوڕەکەی من وازی لەو کچە جوانەی تۆ هێناوەو کچێکی ناشرینی بەتەمەنی هێناوە، خۆ عەباس کارێکی خراپی نەکردووە، تۆ موسڵمانیت و باسی خوداو پێغەمبەرو ئیمامەکان دەکەیت، عەباس هەر ئەو کارەی کردووە کە خودا فەرموویەتی. هەمان کاری کردووە کە پێغەمبەرو ئیمامەکان فەرموویانە. ڕوقیەش ئەوەندەیتر توڕە ببوو، قسەی ناجوری بە خوداو پێغەمبەرو ئیمامەکان دەدا. هەرچەند هاوسەرەکەی و کچەکانی و دراوسێکان هەوڵیان دا ئەو دوو خوشکە هێمن بکەنەوە، بەڵام بێسوود بوو. ڕوقیە لەسەر لێواری حەوزە ئاوی حەوشەکە وەستابوو. خوشکەکەی پێیگوت: تۆ چۆن موسڵمانێکی کە قسە بە پێغەمبەرو ئیمامەکان دەڵێیت.

ژنەکان هەرکارێکیان کرد نەیانتوانی کوبرا لە ماڵەکە بکەنە دەرەوە. کوبرا بە ڕوقیەی گوت: بەڕاستی تۆ بووکی شەهربانووی کافریت. ڕوقیە هاواری کردو دەیگوت: من کافرم، من کافرم، لەناکاو ڕوقیە وەکو پەڕۆیەک سەرەونگون بوو، سەری دای لە لێواری حەوزەکەو کەوتە نێو حەوزە ئاوەکەوە حەوزە پڕ لە ئاوەکە هەمووی بوو بە خوێناو. محەمەد عەلی بەزوویی پەلاماری داو لە حەوزەکەی هێنایە دەرەوە، بەڵام ڕوقیە هەناسەی لەبەر بڕابوو، وەک ئەوەی سەدساڵ بێت مردبێت.

ڕوقیە، واتە دایکی مهری، لە تەمەنی (٤٧) ساڵیدا بەهۆی لێدانی سەکتەوە مرد. ئەو ژنە لە هەموو تەمەنیدا نوێژێکی نەچووبوو، هەرگیز بچوکترین هەڵەی نەکردبوو بەرامبەر بە خواو پێغەمبەرو ئیمامەکان، بەڵام لەکاتێکدا مرد کە جوێنی بەخواو پێغەمبەر دەدا، ئەو کە خۆی بە موسڵمانێکی دیندار دەزانی، کەچی لەکاتێکدا مرد کە دەیگوت: من کافرم. لەو ڕۆژە بەدواوە خەڵکی لەجیاتی بڵێن شەهربانووی کافر، دەیانگوت ڕوقیەی کافر. وەک ئەوەی گەڕەکەکەی ئێمە هەمیشە پێویستی بە بوونی کافرێک هەبووبێت. ئایا خوداوەند لەپێش مردن نامەی کردەوەکانمان دەداتە دەست؟ چۆن ژنێک لە هەموو تەمەنیدا نوێژی نەکرد، کەچی لە سێ مانگی کۆتایی تەمەنیدا دەستی کرد

بە نوێژکردن. چۆن ژنێک لە تەواوی تەمەنیدا باسی خوداو پێغەمبەرو چاکەو گوناھ و بەھەشت و دۆزەخی دەکرد، کەچی لەکاتی مردنیدا ھاواری دەکردو دەیگوت: من کافرم. ئایا کوفرکردن لەکاتی تورەییدا دەچێتە خانەی کوفرەوە، جگە لەخودا چ کەسێک ئاگاداری دەروونی مرۆڤەکانە؟ ڕوقیە ژنێکی دینداری دەمارگیر بوو، دژی ھەموو جۆرە نوێخوازییەک بوو، دژی ھەر جۆرە پێشکەوتنێک بوو. ھەمیشە نزای دەکرد، ھەمیشە باسی خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری دەکرد، ئەو نموونەی کەسێکی بەدینی بیر وشک بوو، لەوکەسانە بوو کە ژیانی خۆی و منداڵ و ھاوسەری تێکدابوو. کەچی بیست ساڵ دوای مردنی، ھاوبیرانی ئەو زیادیان کرد.

ڕاستی بۆچی لایەنگرانی نوێخوازی شکستیان ھێنا؟ بۆچی بیرکردنەوەکانی ڕوقیە لایەنگری پەیداکرد؟ بۆچی لایەنگرەکانی شەھربانوو گۆشەگیر بوون؟ بۆچی کەسانی میانڕەوی وەکو محەمەد عەلی و منداڵەکانی و دراوسێکانی لەپەراوێزان؟ خودا عاقیبەتی ھەموومان و وڵاتمان بەخێر بگێڕێت. بنەماڵەی محەمەد عەلی نموونەی تەواوی کۆمەڵگای ئێمەن.

## ڕشـــوە

چەند مانگێک بوو ڕوقیە مردبوو، شەوێک دەنگی لێدانی دەرگای ماڵی ئاغا ڕەزا ھات، ئەویش بەزوویی چوو دەرگاکەی کردەوە، مھری سەیریکرد چەند کەسێک ھاتنە حەشەکەوەو چوونە ژووری میوانەوە. مھری گوێی لە گفتوگۆکانیان بوو. ئاغا ڕەزا بەردەوام دەیگوت نابێت و کاری وا ناکرێت، دواتر ئاغا ڕەزا ھات بۆ ژووری دانیشتن تاکو چایی ببات بۆ میوانەکان. مھری حەزی دەکرد لە ھۆی ھاتنی ئەو میوانانە بزانێت، لەنێوان ھەردوو ژوورەکەدا دەرگایەک ھەبوو، مھری گوێی لە قسەکانیان گرتبوو. یەکێک لە میوانەکان بە ئاغا ڕەزای گوت: کۆتا قسەمان ئەوەیە ئێمە سی ھەزار تومەنت پێدەدەین و خۆت کارەکە ڕاستەڕێ بکە. ئاغا ڕەزا کەمێک ڕاماو گوتی باشە. کاتێک میوانەکان ڕۆیشتن مھری لە ئاغا ڕەزای پرسی ئەو بابەتە چی بوو باستان لێوە دەکرد. ئەویش گوتی: ئەم حاجییە کاسبکاری بازاڕەو کارگەیەکی ھەیە، ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ کوڕەکەی شەڕی کردووەو بە چەقۆ دوو کەسی برینداکردووە، منیش دەستگیرم کردو بردم بۆ بنکەی پۆلیس. بە بنکەکەم گوت کە ئەم کوڕە چەقۆی لە دوو کەس

داوەو بریندارى کردوون، ئێستاش کوڕێکی منداڵکاری تەمەن شانزە ساڵیان هێناوە کە کرێکاری خۆیانە. کوڕەکە دەڵێت من چەقۆم لەو دوو کەسە داوەو بریندارم کردوون، ئێستاش ئەوان هاتوون و داوام لێدەکەن کە من بڵێم کوڕی ئەم حاجیەم بەهەڵە دەستگیر کردووەو بڵێم چەقۆوەشێن ئەم کوڕە شانزە ساڵە بووە. ئاغا ڕەزا هەڵوێستەیەکی کردو گوتی: ئێستا حاجی هاتووەو سی هەزار تومەنم پێدەدات کە من بڵێم کوڕەکەی ئەوم بەهەڵە گرتووە. لە بنکەی پۆلیس بڵێم ئەم کوڕە شانزە ساڵەیە چەقۆی لەو دوو کوڕە داوە.

مهری تەمەنی بیست ساڵ بوو، سێ ساڵ و نیو بوو هاوسەرگیریی لەگەڵ ئاغا ڕەزا کردبوو، ئاغا ڕەزا پاسەوان بوو، مووچەکەشی کەم بوو. خۆ دیارە کێشەی خەرجییان زۆر نەبوو، بەڵام بەو مووچەیە نەیاندەتوانی شتێکی تازەتر بکڕن. باوکیشی گوتبووی پاسەوان داهاتیان زۆرە، بەڵام مهری هەرگیز داهاتی ئاغا ڕەزای نەبینیبوو، تەنانەت لەبەر بێپارەیی گەشتێکیان بەیەکەوە نەکردبوو. ئاغا ڕەزا ئەو پاسکیلەش کە هاتوچۆی پێدەکرد، هی پێش هاوسەرگیرییەکەی بوو، ئەوەش براکەی کە میوەفرۆش بوو بۆی کڕیبوو. مهری بیری لەوە دەکردەوە بە سی هەزار تومەن دەتوانن زۆر شت بکەن، بەو پارەیە دەتوانن ئۆتۆمبێل بکڕن، دەتوانن بچن بۆ گەشت و سەیران، بەیەکەوە بڕۆن بۆ کەنار دەریا، لەو سەردەمەدا تازە هەندێک کەس دەچوون بۆ کەنار دەریا، دەیانتوانی بەیەکەوە بڕۆن بۆ مەشهەد.

نزیکەی کاتژمێر (٩)ی شەو بوو، ئاغا ڕەزا دەبووایە بڕوات بۆ شوێنێک، بەزوویی خۆی گۆڕی و لەماڵ ڕۆیشتە دەرەوە. مهری گوتی: بۆ کوێ دەچیت؟ ئەویش گوتی: کەمێک کارم هەیەو زوو دەگەڕێمەوە. مهری لەبەر خۆیەوە قسەی دەکردو دەیگوت: کاتێک باوکم دەڵێت پاسەوان پارەی باشیان دەست دەکەوێت، واتە بەمجۆرە دەستیان دەکەوێت. سی هەزار تومەن پارەی موچەی چوار ساڵی ئاغا ڕەزا بوو. مهری لەبەر خۆیەوە دەیگوت: خانووەکەمان دەفرۆشین و خانوویەکی باشترو گەورەتر دەکڕین. مهری بیری لە بیست ساڵی ئایندە دەکردەوە. ئۆتۆمبێل کڕین، خانوو گۆڕین. گۆڕینی ناوماڵ، گەشتکردن، کڕینی پێڵاو و جلوبەرگ، ڕۆیشتن بۆ مەشهەد. سەربڕینی مەڕو کردنی بەخێر، خوێندنی مەراسیمی قورئانخوێندن و نزاکردن. بانگهێشتی ئاغا شێخ جەوادی ئیمامی مزگەوتی دەکرد دوایی دەیگوت: ئاغا شێخ محەمەدی خزمی دایکیشی

بانگ دەکات. ئاغا شێخ محەمەد کەسێک بوو کاتی خۆی داوای مهری کردبوو بۆ هاوسەرگیری و ئێستا بووە بە مەلایەکی باش، مهری کەوتبووە دنیای بیرکردنەوە، لەلایەک خێری دەکرد لەلایەک هاوکاری هەژارانی دەکرد. لەناکاو شتێک هات بەبیریداو گوتی: ئەگەر ئاغا ڕەزا بەو پارەیە ژنێکی تری هێنا من چی بکەم؟ ئەگەر پارەکەی بە من نەداو هەمووی بۆ خۆشگوزەرانی خۆی خەرجکرد من چی بکەم؟ ئاغا ڕەزا بە بەردەوامی دەیگوت: حەزی لە منداڵە، بەڵام منداڵی نەدەبوو. دکتۆر جەلالی موجیبیان گوتبووی کێشەی منداڵ نەبوونیان لە ئاغا ڕەزاوەیە. چەندینجار مهری گوێبیست ببوو لە خوشکە گەورەکەی ئاغا ڕەزا کە گوتبووی پێویستە براکەم خۆی تاقی بکاتەوەو ژنێکی کاتی (سیغە) بهێنێت، دکتورەکان زۆر لەو قسانە دەکەن کە دەڵێن فلان کەس منداڵی نابێت. یا دەیگوت: دکتۆر بە فلان کەسی گوتووە منداڵی نابێت، کەچی ئەو ژنی دووەمی هێناوەو بووە بە خاوەنی منداڵ. دایک و خوشکی ئاغا ڕەزا بە بەردەوامی بە ئاغا ڕەزایان دەگوت: بڕۆ ژنی کاتی بهێنەو خۆت تاقیبکەرەوە. مهری گوتی: نا نابێت، ئەو پارەیە نابێتە بەڵا بۆ گیانی من، ئاغا ڕەزا منی خۆشدەوێت و ژنی تر ناهێنێت.

دوای دوو کاتژمێر ئاغا ڕەزا گەڕایەوە، لەکاتی نانخواردنی ئێوارەدا گوتی: دەبێت ژوورەکانمان خاوێن بکەینەوەو بەیانی زوو میوانمان دێت، مهری وا بیری دەکردەوە کە باوکی هەمان منداڵی چەقۆکێش بێت. مهری بەدرێژایی ئەو شەوە یەک قسەی لەبارەی ئەو بابەتەوە لەگەڵ ئاغا ڕەزادا نەکرد، لەوە دەترسا ئەگەر قسەیەک بکات بۆچوونی هاوسەرەکەی بگۆڕێت، مهری لە ژیاندا ماندوو و خەفەتبار بوو، منداڵی نەدەبوو، دایەگەورەو دایکی مردبوون، خوشکەکەشی ژنی بەسەر هاتبوو، لەناچاریدا محەمەد عەلی ئەکرەمەی بە سێ منداڵەوە بردبوو بۆ ماڵی خۆیان، عەباس خەرجی ژن و سێ منداڵەکەی نەدەکێشا. ئەکرەمە نەچوو بۆلای خەسوی خۆی، بەڵام مهری زوو زوو سەردانی دەکرد، ئەکرەمەش ئەوەندە قسەی بۆ دەکرد هەربۆیەش حەزی نەدەکرد زۆر بچێتە سەردانی.

مهری ژنێکی بەڕێزو خۆشەویست بوو، ئاغا ڕەزاش کەسێکی میهرەبان بوو، لە هەفتەیەکدا چەند شەوێک ئێشکگربوو، ئەو شەوانەی کە ئێشکگر نەبوو لەماڵەوەو لەکاتی نانخواردندا چەند پێکێک خواردنەوەی دەخواردەوە، پیاڵەیەکیشی دەدایە دەست مهری، هەرکاتێک ئاغا ڕەزا پێکەکەی بەرزدەکردەوە، دەبووایە مهریش پیاڵەکەی خۆی

کە کەمێک خواردنەوەو ئاوی تێدا بوو، بەرزبکاتەوە. مهری بەردەوام نوێژەکانی دەکردو مانگی ڕەمەزانیش بەڕۆژوو دەبوو، بەڵام ئاغا ڕەزا لە مانگەکەدا (٢١) ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو. دوای (٢١) ڕۆژ وەک ئەوەی مانگ تەواو بووبێت و بەلای ڕۆژووەکاندا نەدەڕۆیشت، بەڵام مهری تا کۆتایی مانگ بەڕۆژوو دەبوو. ئاغا ڕەزا هیچی بە هاوسەرەکەی نەدەگوت، لە بەیانیان زووەوە هاوکاری دەکرد، بەڵام دوای (٢١) ڕۆژی ڕەمەزان دەیگوت ڕەمەزان تەواو بووە. مهری بەو سی هەزار تومەنەوە بڕیاری دابوو لە سبەینێوە بچێتە ژیانێکی ترەوە. نزیکی کاتژمێر هەشتی بەیانی بوو لە دەرگاکە درا، ئاغا ڕەزا ڕایکرد دەرگاکەی کردەوە. مهری سەیری کرد کەسێک بەجلوبەرگی مەدەنییەوە لەگەڵ دوو کەس کە جلوبەرگی پاسەوانییان لە بەردابوو، هاتنە ژوورەوە. ئاغا ڕەزا ئەوانی نەبرد بۆ ژووری میوان، بەڵکو بردنی بۆ ژوورێکی تر لەپشتەوە. مهری پێی سەیر بوو کە بۆچی ئاغا ڕەزا ئەوانی نەبرد بۆ ژووری میوان، ڕۆیشت بۆ ژووری چێشتخانە تاکو چایان بۆ بەرێت. ئەو هەرگیز نەیبینیبوو کە دوو کەسی پاسەوان و کەسێکی جلوبەرگی مەدەنی بێت بۆماڵیان. لەبەرخۆیەوە گوتی: ئاغا ڕەزا هاوبەشی بۆ خۆی دروستکردووە. بەزوویی سی هەزار تومەنەکەی دابەشی چوار کرد، تەنها (٧٥٠٠) تومەن بەر ئەوان دەکەوێت، خەریکبوو هەموو خەون و خەیاڵەکانی بەبا دەچوو. ئاغا ڕەزا کە هاتبوو چایی بەرێت بۆ میوانەکان، گوتی: نابێت هیچ کەسێک بزانێت کە لەو ژوورەدا کەسێک هەیە. مهری گوتی: جگە لەم میوانانە خۆ کەسی تر لەم ماڵەدا نییە. ئاغا ڕەزا گوتی: مەبەستم ئەو میوانانەی دوێنێ شەوە، نزیکەی کاتژمێری (٩)ی بەیانی بوو دووبارە لە دەرگا درایەوە، ئاغا ڕەزا دەرگاکەی کردەوە. هەمان حاجی بوو کە شەو هاتبوو لەگەڵ کەسێکی تردا. ئاغا ڕەزا ئەوانی برد بۆ ژووری میوان، مهری سینییەک چای برد بۆ ژووری میوان، سەیریکرد وا خەریکە میوانەکان پارە دەدەن بە ئاغا ڕەزا. مهری بەهێواشی لە دەرگای ژووری میوانی داو ئاغا ڕەزا هات سینییەکەی لێوەرگرت. دەرگای ژوورەکە دەرگایەکی کۆن بوو لای سەرەوەی پەنجەرەیەکی بچووکی پێوەبوو. پەنجەرەکە (٢٠×٣٠) سانتیمەتر بوو. مهری سەیریکرد دەرگای نێوان هەردوو ژوورەکە کرایەوە، پیاوە جلوبەرگ مەدەنییەکەو دوو پاسەوانەکە چوونە ژووری میوانەوە. پیاوەکە بە حاجی گوت: تۆ دەستگیرکرایت، تۆ دەستگیر دەکەین، چونکە دەتەوێت ڕەشوە بدەیت بە کارمەندی حکومەت. یەکێک

لە پاسەوانەکان کەلەپچەی کردە دەستی حاجییەوە. حاجی ئاغا دەستیکرد بە گریان، هاواری دەکردو دەپاڕایەوە، سوێندی دەخوارد چیان بوێت پێیانی دەدات، هەرکارێکیان هەبێت بۆیان جێبەجێ دەکات بەمەرجێک لەو کۆڵاندا کەلەپچەی نەکەن. لە کۆڵانەکەدا ڕێگای ئۆتۆمبێل نەبوو، لانیکەم دەبووایە حاجی سێسەد مەتر بە کۆڵانەکەدا بڕۆیشتایە تا دەگەیشتە سەر جادەکە. حاجی دەیگوت: من لەم شارەدا (٤٥٠) کرێکارم هەیە! ئابڕووم هەیە، بەڵێندەدەم هەرچی سزایەکم دەدەن لەخزمەتتاندام، بەڵام بە کەلەپچەوە مەمبەنە کۆڵان و زیندان، حاجی جوێنی بە منداڵەکەی خۆی دەدا. ئەو پیاوەی لەگەڵ حاجیدابوو ئەویشیان دەستگیرکردبوو، بەڵام کەلەپچەیان نەکردبووە دەستی ئەو، ئەو بە قازییەکەی گوت: کەلەپچەکە بکەنە دەستی من و دەستی حاجی ئاغا بکەنەوە. حاجی هاواریدەکردو دەپاڕایەوە کەلەپچەکە لە دەستی بکەنەوە.

قازی گوتی: ئەوە ئاکامی پارە زۆریی تۆیە منداڵەکەت ئاوا بەلەسە بووە، تۆ منداڵەکانت پەروەردە نەکردووە، حەسەن ئاغای خاوەن کارگەو دەلالی زەویوزار تۆ ئاگاداریت کە کوڕەکەت ڕۆژانە لەم شارەدا چەندین کێشە بۆ خەڵکی دروست دەکات؟ بۆچی تۆ ڕێگریی دەکەیت کوڕەکەت بچێتە زیندان؟ بەڵکو لە زیندان کەمێک ئەدەب وەربگرێت، هەرکاتێک ئەو کارێکی نابەجێی کرد، تۆ هەوڵی ڕزگاربوونی دەدەیت، تۆ خۆشت گرفتار کردووە بەئەوەوە. قازی بەردەوامبوو لە قسەکانی و گوتی: لەماوەی دە ساڵدا لە شاری یەزد کەسێکی ئاژاوەگێڕو چەقۆ کێش نەبووە، تۆ بیرت لەوە کردۆتەوە بۆچی کوڕەکەت و هاوڕێکانی دەستیان کردووە بەم بەڕەڵاییە. من وا هەستدەکەم بەبوونی کارگەو موڵکایەتی، تۆ داهاتێکی زۆرت دێتە دەست، هەر ئەو داهاتە زۆرەیە ڕەوشتی تۆی گۆڕیوە، تۆ بەهۆی دەوڵەمەندی و سەرمایەکەتەوە ڕەوشتی کوڕەکەی خۆتت تێکداوە. ئێمە دەزانین منداڵی خوێڕی و بەڕەڵڵا هەمیشە هەر هەبووە، بەڵام هاوشێوەی کوڕەکەی تۆ لە یەزدا نەبووە، هەر بۆیە باوکی ڕەشوەدەریش پێویستە سزای خۆی وەربگرێت. هەموویان لەماڵ ڕۆیشتنە دەرەوە، ئاغا ڕەزاش لەگەڵیاندا ڕۆیشت، هەلێک دروست نەبوو تا مهری شتێک لە ئاغا ڕەزا بپرسێت.

کۆشکی خەیاڵەکانی مهری هەرەسی هێنا. ئۆتۆمبێل، گەشت، سەردان، هەمووی بەبا ڕۆیشت، بەڵام هێشتا ئومێدێک هەبوو لەناخیدا. ئەو دەیگوت: بەدڵنیاییەوە حکومەت پاداشتێک دەدات بەئاغا ڕەزا، پاداشتێکی سەد هەزار تومەنی، یان سی هەزار تومەنی،

یان دە هەزار تومەنی پێدەدەن. مهری هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو بیریکردەوە پاداشتی حکومەت پارەیەکی حەڵاڵە، بەو پارەیە دەتوانێت بە ویژدانێکی ئاسودەوە بڕوات بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا. ئەو یەکەمین داواکاری لە خودا ئەوە بوو بچێت بۆ مەشهەد، ئەو حەزی نەدەکرد بچێت بۆ کەنار دەریا، لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە چونکە ویستوویەتی بە پارەیەکی حەرام کاری حەرام ئەنجام بدات، بۆیە ئەوهای لێهات، بۆیە دەبێت بە پارەی حەڵاڵ بڕوات بۆ زیارەت. ئەو ئەوەی بیرهاتەوە کە هەمیشە دایەگەورەی بیری لە نانی حەڵاڵی دەکردەوە. ئەو ڕۆژە ئاغا ڕەزا ئێشکگر بوو، شەو گەڕایەوە بۆماڵەوە، ئەو ڕۆژە لە ڕۆژانی تر ماندووتر بوو. مهری ڕووداوەکەی لێپرسی ئەویش گوتی: ئەو پیاوەی کە کوڕەکەی چەقۆکێشی کردبوو، ویستی ڕەشوەم پێبدات، ئەو پیاوە دەوڵەمەندە، باوکی منداڵە شانزە ساڵەکەی ڕازیکردبوو بە منداڵەکەشی گوتبوو ماتۆڕسکیلی بۆ بکڕێت. گوتبووی چونکە ئەو منداڵە پانزە ڕۆژ تا یەک مانگ دەبرێتە خانەی نەوجەوانان. حاجی بە منداڵەکەی گوتبوو خۆی ئاگاداری دەکات، تەنها لەسەر ئەوە مابوو کە من بڵێم بەهەڵە کوڕی حاجیم گرتووە. دوێنێ شەو چووم بۆلای ئاغای حەیات داودی کە قازییەکی ڕاست و بەڕێزە. چوومە لای و بەسەرهاتەکەم بۆ باسکرد، ئەویش گوتی: دڵنیابەو ناونیشانی ماڵی خۆمانی لێوەرگرتم. گوتی: من کاتژمێر هەشتی بەیانی دێم. ئەوەبوو هات. مهری بە ئاغا ڕەزای گوت: بەدڵنیاییەوە بنکەی پۆلیس پاداشتێکی گەورەت دەکەن. ئاغا ڕەزا کە هەرگیز بیری لە پاداشتوەرگرتن نەکردبووەوە، گوتی: بۆچی دەبێت پاداشت بکرێم؟ بۆچی دەبێت پاداشت بدەن؟ خۆ ئەوان مووچە بەمن دەدەن؟

نزیکەی دوو مانگ تێپەڕیبوو. ڕۆژێک ئاغا ڕەزا بەخۆشحاڵەوە هاتەوە بۆ ماڵەوەو گوتی: پاداشت کراوم بە (٧٥٠) تومەن و پانزە ڕۆژ مۆڵەت. مهری گوتی: باشتر نەبوو ئەگەر سی هەزار تومەنەکەت وەربگرتایە؟ بۆیەکەمجار ئاغا ڕەزا مۆرەیەکی لە مهری کردو گوتی: خۆ تۆ کەسێکی نوێژکەریت. مهری پێکەنی و گوتی: ئاخر جارجارێک مەی دەخۆمەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: ئێمە ئاوی حەرام دەخۆینەوە، بەڵام نانی حەرام ناخۆین، هەر ئەو ئاوە حەرامەش بەپارەی حەڵاڵ دەخۆمەوە. هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین. شەو ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: من هیچ کاتێک تۆم نەبردووە بۆ گەشت، دەمەوێت ئەم پانزە ڕۆژە بەیەکەوە بچین بۆ گەشت. مهری گوتی: زۆرباشە،

بەڵام من پێم باشە برۆین بۆ مەشهەد. ئاغا ڕەزا گوتی: بەیانی دەچم بلیت وەردەگرم. هەردووکیان بڕیاریان دا ماوەی دە ڕۆژ لە مەشهەد بمێننەوە. بەڕێوەبەری گەراج بلیتی مەشهەدی بە بەلاش دا بە ئاغا ڕەزا. بەڕێوەبەری گەراج گوتی: تۆ پاسەوانێکی دڵسۆزیت، هەر بۆیەش پارەی بلیتت لێوەرناگرم. خەڵکی ڕێزی کەسانی دڵسۆز دەگرن. مهری و هاوسەرەکەی بە (٧٥٠) تومەن، واتە بە (٧٥٠٠) ڕیاڵ کاتێکی خۆشیان لە مەشهەد گوزەراند. کاتێک گەڕانەوە (١٥٠) تمەنیشیان پێ مابوو، جگە لەو دیارییانەی کڕیبوویان. لە حەرەمی ئیمام ڕەزا مهری زۆر نزای کرد. ئاغا ڕەزاش داوای ژیانی خۆش و لەشساغی دەکرد، نوێژێکی زۆریان کردو نزایان کردو بەخۆشی گەڕانەوە.

مهری و هاوسەرەکەی یەک مانگ بوو لە گەشتەکەیان گەڕابوونەوە. ڕۆژێکیان ئاغا ڕەزا شەکەت و غەمبار گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. مهری گوتی: بۆچی وا پەست و غەمباریت. گوتی: ئەو حاجییە بازاڕییە کاری خۆی کرد، پارێزەرێکی گرتووەو پارەیەکی زۆری پێداوە، ئەمڕۆ دادگاییان کردم، پارێزەر لە تارانەوە هاتبوو. کەسێکی زۆربڵێ و نەبیست بوو، ئەوەندە کێشەکەی هێناو بردو قسەی بێتامی کرد، خۆم گومانم لەخۆم پەیدا کردبوو، وام لێهاتبوو بڵێم من بەبێ هۆ کوڕەکەی حاجیم دەستگیرکردووەو ئەو چەقۆکێش نەبووە. پارێزەرەکە دەیگوت: تۆ بێ هۆ ئەو کوڕەت دەستگیرکردووە، گوایە من نیازم وابووە ڕەشوە وەربگرم. کاتێک بۆم دەرکەوت یەکێک لە هاوکارەکانم شکاتی لێکردبووم، منیش چووم قازیم لە بابەتەکە ئاگادارکردەوە، پارێزەر دەیگوت: بێهۆ تاوانی ڕەشوەدانم داوەتە پاڵ حاجی. پارێزەرەکە قازی بە نەزان و کەمتەرخەم تاوانبار کرد. گوتی: ئەم قازیە تازەیە بۆتە هۆی ئابڕووبردنی بازرگانێکی خاوەن کارگەیەکی گەورە. پارێزەرەکە دۆسیەکەی بە دۆسیەی سیاسی لێکدایەوە. دەیگوت: بەکرێگیراوانی حیزبی تودە بۆ حاجییەکی لایەنگری شا دۆسیەیەکی دروستکردووە. دەیگوت: ئەم دۆسیەیە یەکلاییکردنەوەی سیاسی نێوان حزبی تودەو لایەنگرانی شایە. مهری لە ئاغا ڕەزای پرسی حیزبی تودە چین و چ کارێکیان کردووە. ئاغا ڕەزا گوتی: هیچ شتێک لەبارەی ئەوانەوە نازانم.

دوای یەک هەفتە ئاغا ڕەزا بە سیمایەکی شێواوەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو گوتی: قازی دۆسیەکەی گواستۆتەوە بۆ شارۆچکەی بابەک، منیشی گواستۆتەوە بۆ زیندان. مهری بە پەشۆکاوییەوە گوتی: واتە تۆ زیندانی دەکرێیت. گوتی: نا، من ئیتر پاسەوانی

بنکەی پۆلیس و ئێشکگری سەرجادەکان نامێنم، ئاغا ڕەزا دڵی مهری دایەوەو گوتی: مەترسە دەبمە پاسەوانی زیندانییەکان، خۆم ناچمە زیندانەوە، مهریش گوتی: ئەوەش سەرەنجامی دڵسۆزی و ڕاستگۆییە. ئاغا ڕەزا گوتی: ئاکامی ڕاستگۆیی لەلای خودایە، خودا ئاکاممان بەخێر بگێڕیت، شەهربانوو دەیگوت: من بەکەڵکی کاری پاسەوانی نایەم. ئەو ڕاستی دەگوت، ئاغا ڕەزا گوتی: باری دەروونیم باش نییە. مهری مێزی خواردنەوەی ڕازاندەوەو بۆ یەکەمینجار ئەویش خواردنەوەی بەبێ ئاو خواردەوە، هەریەکەو چەند پێکێکیان بەسەلامەتی یەکتری خواردەوە، مهری دەستیکرد بە دەفلێدان و گۆرانیگوتن، هەردووکیان شادو کەیفخۆش بوون. ئاغا ڕەزا گوتی: لەوەیە گواستنەوەم بۆ زیندان سەرەنجامی بەخێر بگێڕێت، من هیچ کاتێک ئامۆژگارییەکانی شەهربانوو فەرامۆش ناکەم. ئەو دەیگوت: هەرکاتێک کێشەیەکت هاتە پێش، بەیادی خودا سەبربکەو سوپاسی خودا بکە. داستانی ئەیوب پێغەمبەر بخوێنەوە. شەهربانوو گوتبووی: لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیە، لە هەر پەندێکیشدا نیعمەتێک هەیە. ئاغا ڕەزا دەیگوت: ئەم کێشەیەش بۆخۆی نیعمەتێکە کە من نایزانم. کێشەیەکە، بەڵام من پەندەکەی نازانم، دواتر دوا پێکی هەڵداو گوتی: بەخۆشی ڕوحی شەهربانوو ئینجا گوتی: شەهربانوو ڕوحت شاد کە منت کرد بە مرۆڤ و منت سەرلەنوێ دروستکردەوە.

کۆتایی مانگی ئەسفەندی ساڵی (١٣٤٢/١٩٦٣) بوو، کە ئاغا ڕەزا گواسترایەوە بۆ زیندان، یەکەم ڕۆژ کە چوو بۆ زیندان، مهری زۆر نیگەران بوو، کاتی عەسر کە ئاغا ڕەزا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، زۆر شەکەت و ماندوو بوو. گوتی: ئەمڕۆ منیان کرد بە لێپرسراوی ناو زیندانەکە، ڕاستەوخۆ پەیوەندیم بە کاروباری زیندانییەکانەوە هەیە، دیارە ئەوکاتە لە زیندانی یەزدا تەنها (٣٥) زیندانی هەبوو، کە زیاتر لە بیست کەسیان خەڵکی یەزد نەبوون. ئەوکاتە لە هەموو شاری یەزدا یەک زیندان هەبوو.

یەک هەفتە تێپەڕی ئاغا ڕەزا هیچی لەبارەی زیندانەوە نەگوت. مهریش هیچی لێ نەپرسی، تەنها لە هەواڵی هاوسەرەکەی دەپرسی ئەویش دەیگوت باشم، بەڵام دیاربوو کە باش نەبوو. شەوێک ئاغا ڕەزا ئێشکگربوو، هەر شەوێک ئێشکگر بووایە کاتژمێر حەوتی بەیانی دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ڕۆژێک کە ئێشکگر بوو کاتژمێر (١٠) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. مهری زۆر نیگەران بوو، ئاغا ڕەزاش زۆر غەمبار بوو. گوتی: ئەمڕۆ بۆم دەرکەوت کە خواردنی زیندانییەکان دەدزرێت، بەشی زۆری گۆشت و

هێلکەو برنجەکەیان چەند ئەفسەرێکی پلەدار دەیدزن و دەیبەنەوە بۆ ماڵەوە، منیش دڵم بۆ ئەو زیندانیانە دەسووتا ڕۆیشتم بۆلای سەرۆکی زیندان و باسی ئەو دزییەم بۆ کرد. ئەویش گوتی: بەڵگەیەک، یان شاهیدێکت هەیە. منیش نە بەڵگەیەکم بەدەستەوە بوو، نە شاهیدیش. ئەویش سەرزەنشتی کردم و گوتی: تۆ بەبێ بەڵگە هاوڕێکانی خۆت تاوانبار دەکەیت. سەرۆکی زیندان پێیگوتم دەبێت لەسبەینێوە لەسەر بورجی بچووک ئێشکگری بکەم، من پێشتر پاسەوانی بنکەی پۆلیس بووم، هەمیشە لەسەر شەقامەکان دەسوڕامەوە، ئێستا دەبێت چەند کاتژمێرێک بەشەو و بەڕۆژ لەسەر بورجەکە ئێشکگری بکەم. مهری کەوتە دڵنەوایی و گوتی: لەهەر کێشەیەکدا پەندێک هەیە لە هەر پەندێکدا نیعمەتێک هەیە. ئاغا ڕەزا گوتی: خودا لێت خۆشبێت شەهربانووی ئاقڵ، وەرە با کەمێک شانامە بخوێنینەوە.

دوو سێ مانگ بەو جۆرە بوو. ئاغا ڕەزا ڕۆژبەڕۆژ گرفتارتر دەبوو. گوتی: یەکێک لە هاوکارەکانی گوتوویەتی سەرۆک و پاسەوانەکان لەو دزییەدا هاوبەشن، ئەگەر تۆش قسەت نەکردایە ئەوا بەشی تۆشیان دەدا. ئاغا ڕەزا دواتر بۆی دەرکەوت بە مۆڵەتی سەرۆکی زیندان مادەی هۆشبەر دەبرێتە ناو زیندان، ئەم کارەش سەرچاوەی داهاتێک بوو بۆ سەرۆکی زیندان. هەر ڕۆژێک ئاغا ڕەزا کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە شتێکی تازەی بۆ ئاشکرا دەبوو. زیندانییە دەوڵەمەندەکان سەردانیکردنیان زیاتربوو لە زیندانییەکانی تر، زۆرێک لە زیندانییە دەوڵەمەندەکان هەندێک شەو دەچوونەوە بۆ ماڵەوە. ئاغا ڕەزا لەسەر ئەو بابەتە پێشنیاری بۆ هاوڕێکانی کردبوو کە بەیەکەوە بچن بۆلای دادوەرو باسی کێشەکانی ناو زیندانی بۆ بکەن. هاوکارەکەی پێیگوتبوو تۆ بۆچی گواستراویتەوە بۆناو زیندان؟ ئاغا ڕەزا گوتبووی چونکە ڕەشوەم وەرنەگرتووە. هاوکارەکەشی پێیگوتبوو منیش چونکە ڕێگەم نەدا زیندانییەک ڕابکات، هەر بۆیەش گواسترامەوە بۆ ئێرە، پێیانگوتم پارەیەکی زۆرم پێدەدەن بۆئەوەی ڕێگە خۆش بکەم زیندانییەک لە نێوان بنکەی پۆلیس و دادگادا ڕابکات. منیش ڕازی نەبووم، ئێستاش ئەوە چارەنووسمە کە دەیبینی، پاسەوانی خراپترین شوێنی زیندانم. ئاغا ڕەزا نەنگییەکی هەبوو هەرگیز پرسی بە کەس نەدەکرد، ئەگەر بیویستایە کارێک بکات، بەبێ ڕاپرسی ئەو کارەی ئەنجام دەدا. بۆخۆی دەیگوت لەگەڵ ژنەکەیدا هاوڕێن، بەڵام بۆ هیچ کارێک پرسی پێ نەکردووە.

## نامەنووسین بۆ دادگا

ئاغا ڕەزا بەبێ ئەوەی پرسێک بە کەس بکات، نامەیەکی بۆ دادگا نووسی، لە نامەکەدا باسی کارە دژەکانی سەرۆکی زیندان و هاوکارەکانی سەرۆک و بردنی تلیاک بۆ ناو زیندانی کردبوو. لە نامەکەدا بەدرێژیی نووسیبووی، بەشێکی زۆری خواردنی زیندانیان دەدزرێت و بەقاچاخ تلیاک دەبرێتە نێو زیندانەوە. زیندانییە پارەدارەکان بەبێ مۆڵەتی ئاسایی دۆستان و کەسوکاریان سەردانیان دەکەن، چەند زیندانییەکیش هەفتەی چەند شەوێک دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە، ناوی لێپرسراوە سەرپێچیکارەکانیشی نووسیبوو.

دوای چەند ڕۆژێک بەڕێوەبەری پۆلیسی یەزد ناردی بەشوێن ئاغا ڕەزادا. ئاغا ڕەزاش ڕۆیشت بۆلای، دوای وەستانی لەبەر دەرگا بۆ ماوەی دوو کاتژمێرو نیو ئینجا مۆڵەتیان دا بچێتە ژوورەوە، سڵاوێکی کردو ڕێک وەستا. ماوەی (١٠) خولەک بەڕێوەبەر هیچ قسەیەکی لەگەڵدا نەکرد، ئەویش بێ جوڵە وەستابوو. لەناکاو بەڕێوەبەر هەڵسایە سەرپێی و بەتوڕەییەوە هاواریکرد بەسەریداو گوتی: ناپیاوێکی بێ شەرەفی وەکو تۆ بەکەڵکی ئەوەش نایەت گسکی ئەم ناوەی پێبدەین، هەر لەخۆتەوە بەبێئەوەی پرسێک بە لێپرسراوانی خۆت بکەیت ڕاستەوخۆ نامەت بۆ دادگا نووسیوە، هەی کەری بێ مێشک ، تۆ پاسەوانی پۆلیست، یان جاسوسی دادگایت؟ تۆ دەبووایە نامەت بۆ پشت خۆتەوە بنووسیایە، یا دەبووایە نامەکەت ئاڕاستەی من بکردایە، تۆ کێ مۆڵەتی پێدایت ڕاستەوخۆ نامە بۆ سەرۆکی دادگا بنووسێت؟ ئاغا ڕەزا نەیتوانی هیچ قسەیەک بکات. بەڕێوەبەر پێیگوت: بڕۆ دەرەوە ونبە لەبەرچاوم، دەبێت کارێکت پێبکەم بە کەس نەکرابێت. ئاغا ڕەزا لە ژووری بەڕێوەبەر هاتەدەرەوە، سکرتێری بەڕێوەبەر پێیگوت: سەردانێکی سەروان مەدەدی جێگری بەڕێوەبەر بکات، ئەویش کاری پێیەتی. ئاغا ڕەزا چووە ژوورەوە بۆلای سەروان مەدەدی، ئەویش جوێنێکی زۆر پێداو گوتی: ئەوە دەبێت بۆ ماوەی پانزە شەو و ڕۆژ بەسەریەکەوە لە زینداندا ئێشک بگریت و بۆت نییە لە ماوەی ئەو پانزە ڕۆژەدا بڕۆیتەوە بۆ ماڵەوە، بە سەرۆکی زیندانیشم گوتووە کە هیچ هاوکارییەکت نەکات و بچووکترین سەرپێچی بکەیت چاوت دەرکات، ئێستا بڕۆرەوە بۆ زیندان. ئاغا ڕەزا گوتی: مۆڵەت دەدەیت هاوسەرەکەم ئاگاداربکەمەوە. جێگری بەڕێوەبەر گوتی: تۆ ئێستا وەک زیندانییەک وایت، دەتنێرمەوە بۆ زیندان لەوێ ئێشکت پێبگرن، دەبووایە تۆ لە ژووری تاکەکەسیدا زیندانی بکرێیت، بەڵام ئێمە بەزەییمان پێتدا

هاتۆتەوە. ئینجا بانگی ئەکبەری پاسەوانی کردو گوتی: ئەم ناپیاوە ببەرەوە بۆ زیندان، بیدەرە دەستی سەرۆکی زیندان، مۆڵەت نەدەیت لە ڕێگادا لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسە بکات، یا پەیامێک بنێرێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەکبەری پاسەوان گوتی: گەورەم بەچاوان، ئاغا ڕەزای پێش خۆی داو ڕۆیشت. لە ڕێگادا ئاغا ڕەزا بە ئەکبەری گوت: دەتوانیت بچیت هەواڵم بگەیەنیت بە هاوسەرەکەم. ئەکبەر گوتی: دەتەوێت منیش وەک تۆ زیندانی بکرێم؟ ئاغا ڕەزا گوتی: بەندەی خودا برۆ لە دەرگاکەی ئێمە بدەو بە هاوسەرەکەم بڵێ ئاغا ڕەزا پانزە ڕۆژ بەسەریەکەوە ئێشکگرەو ناتوانێت بێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەکبەر گوتی: ئاغا ڕەزا ئێمە هەموومان ئەم بەسەرهاتەی تۆمان پێ ناخۆشە، ئێستا چوار ئەفسەری نایەزدی هاتوون بۆ ئەم شارەو بەحسابی خۆیان دەیانەوێت لێرە یاسا پیادە بکەن، بەڵام ئەوان دەیانەوێت گیرفانی خۆیان پڕبکەن. ئێمە ئێستا دەبێت لەگەڵ ئەواندا بسازێین. ئاغا ڕەزا گوتی: من ناتوانم لەگەڵیاندا بسازێم. ئاغا ڕەزا بە هاوکارەکەی گوت: ئەگەر تۆ بڕۆیت هەواڵەکە بە ژنەکەم بدەیت چی دەبێت؟ ئەکبەر گوتی: من خەڵکی (زارچ)م خەڵکی یەزد نیم، تەنها لە خودا دەترسم، ئێمەی خەڵکی زارچ کەسانی کارکردەین، کەسانی درۆزن و کەڵەکەچی و ڕەشوەخۆر و قاچاخچی نین. هەموو خزم و کەسەکانم لە زارچ و تاران و مەشهەد کاروکاسبییەکی باشیان هەیە، من بێهۆ هاتم لێرە بووم بە پاسەوان، خۆ ئەگەر بزانم لێرە بەکەم سەیرم دەکەن، دەڕۆم کارو کاسبی تر پەیدا دەکەم، پاروونانێکی حەڵاڵ لە هەموو شوێنێک دەستدەکەوێت.

ئەکبەری پاسەوان کاتی بانگی شێوان چوو بۆلای ماڵی ئاغا ڕەزاو هەواڵەکەی بە مهری ڕاگەیاند. مهریش زۆر پەشۆکاو گوتی: هەر ئێستا دەڕۆم بۆ زیندان بزانم هەواڵ چییە؟ ئەکبەریش پێیگوت: ئەگەر تۆ ئێستا بچیت بۆ زیندان، ئەوان دەزانن کە من هەواڵم پێ داویت، بۆیە پێویستە ئەمڕۆ نەچیت و بەیانی کاتژمێر (١٠) برۆ و بڵێ ئەمشەو هاوسەرەکەم نەهاتۆتەوە بۆ ماڵەوەو هاتووم تاکو هەواڵی بزانم. مهری شەو لە دڵەڕاوکێدا بوو تا بەیانی نەیتوانی بخەوێت. بەدرێژایی شەو لەسەر جێگاکەی تلی دەدا. چەندجارێک هەڵساو نوێژی کرد، نزای دەکردو دەپاڕایەوە خودا کارئاسانییان بۆ بکات. بەیانی زوو هەڵساو خۆی گەیاندە زیندان و گوتی: دەیەوێت هاوسەرەکەی ببینێت. گوتیان: ئەو لێرە دەستبەسەرە و تاکو پانزە ڕۆژی تر بۆی نییە هیچ کەسێک ببینێت. مهری بەدڵی شکاو و چاوی پڕ فرمێسکەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو ڕووداوەکەی

بۆ باوکی باسکرد. محەمەد عەلی بە کچەکەی گوت: خۆڕاگربە، یەکێک لە پاسەوانەکان هەواڵی ئاغا ڕەزای دەهێنا بۆ مهری و هەواڵی مهریشی دەبردەوە بۆ ئاغا ڕەزا. باوکی مهری دەیویست هۆکاری دەستبەسەربوونی زاواکەی بزانێت، دوایی تێگەیشتن کە ئەو چی کردووە، زۆر نیگەران بوو بۆی. دوای چەند ڕۆژێک مهری هەندێک میوەو جلوبەرگی بۆ هاوسەرەکەی برد لە زیندان.

دوای پانزە ڕۆژ ئاغا ڕەزا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، یەک ڕۆژ پشووی داو دووبارە دە ڕۆژی تر کرایەوە بە ئێشکگر. ئەو ڕۆژە ئاغا ڕەزا لەماڵەوە دەردەدڵی خۆی بۆ مهری هەڵڕشت و باسی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. ژن و مێرد بەیەکەوە میهرەبان بوون، ئاغا ڕەزا گوتی: ئەم چەند ڕۆژەم بەیادی ئەو و قسەکانی شەهربانوو بەڕێکرد. قسەکانی شەهربانووم هەر لەیادبوو کە دەیگوت، لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیە، لە هەر پەندێکیشدا نیعمەتێک هەیە. ئاغا ڕەزا گوتی: من ئیتر پاسەوانیی ناکەم و دەست لەکاردەکێشمەوە. ئەم کارە بەکەڵکی من نایات و دەستیکرد بە خوێندنەوەی هۆنراوەیەکی فیردەوسی.

**که گفتت برو دست رستم ببند　　نبند مرا دست چرخ بلند**

**کە گوتت بڕۆ دەستی ڕۆستەم ببەستە　　دەستی من مەبەستە چەرخی گەردوون**

مهری گوتی: خودا گەورەیە. ئاغا ڕەزا گوتی: ڕاستە خودا گەورەیە، بەڵام پێویستە هەوڵێک بدەین، تۆ لە ماڵەوە بە تەنهایی چی دەکەیت؟ مهری گوتی: زۆرترین کات دەچم بۆ ماڵی باوکم، شەوانەش ئەکبەری کوڕی زینەتی خوشکم دەهێنمە لای خۆم و وانەشی پێدەڵێمەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: خۆشت وانە بخوێنە، بەڵکو دبلۆمەکەت وەربگریت. مهری بەو قسەیە زۆر خۆشحاڵبوو، لەدڵەوە بیری کردەوەو گوتی: لەوانەیە پەندی ئەم کێشەیە ئەوە بێت. لە پانزە ڕۆژی یەکەمدا سەرۆکی زیندان زۆر خراپ بوو بەرامبەر ئاغا ڕەزا، چەندین کێشەی بۆ دروستکرد، کارە قورسەکانی ناو زیندان کە کاری ئەو نەبوون، خرابوونە ئەستۆی ئاغا ڕەزا، بەڵام لە (١٠) ڕۆژی دواییدا سەرۆکی زیندان کەمێک میهرەبانتر بوو. یەکێک لە هاوکارەکانی کە پاسەوانێکی کۆن بوو، گوتی: ڕەزا ئاگاداری خۆت بە لەپشتی ئەم میهرەبانییەوە فێڵێک هەیە، بەڕێوەبەری پۆلیس وا بەئاسانی لێت خۆش نابێت. کە ئەم دە ڕۆژە تێپەڕی ژیانێکی تر دەستپێدەکات.

چوار مانگ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی (١٢ی ئابانی ٣/١٣٤٢ تشرینی دووەمی ١٩٦٣) بوو. ئاغا ڕەزا هەروەکو ڕۆژەکانی تر ئێشکگری زیندان بوو. داوای لێکرا بچێت بۆ ژووری سەرۆکی زیندان، کەسێک بە جلوبەرگی مەدەنی و دوو کەس بە جلوبەرگی ئەفسەری لە ژوورەکە بوون، ئەوانە کارمەندی زیندانی نەبوون. ئاغا ڕەزا ڕێک وەستابوو، سەرۆک پێیگوت: گیرفانەکانت بەتاڵ بکە، ئاغا ڕەزا گیرفانی پانتۆڵەکەی بەتاڵکرد. ئەفسەرە پلەبەرزەکە بە ئەفسەرەکەی تری گوت: گیرفانی چاکەتەکەی بەتاڵ بکە، ئەفسەرەکە گیرفانەکانی ئاغا ڕەزای بەتاڵکرد. ئاغا ڕەزا ڕەنگی تێکچوو، چاوی ئەبڵەق بوو، واقی وڕمابوو، کاتێک بینی لەناو گیرفانی چاکەتەکەیدا یەک بەستە تلیاکیان دەرهێنا. ئەفسەرە پلەبەرزەکە گوتی: ئەوە چییە لە گیرفانتدا. ئاغا ڕەزا سەیرێکی ئەملاولای خۆی کردو گوتی: سوێند بەخودای گەورە ئەوە هی من نییەو هیچ ئاگاداری ئەوە نیم. سەرۆکی زیندان گوتی: بیگرن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن، ئەمە تلیاک دەهێنێتە نێو زیندانەوە؟ دیارە تۆ قاچاخچی ناو زیندانیت. بەزوویی دۆسیەیەکیان بۆ ئاغا ڕەزا کردەوە، هەر زوو هەواڵ لەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە کە ئاغا ڕەزا لە ناو زینداندا تلیاک دەفرۆشێت. لە گەڕەکدا هیچ کەسێک باوەڕی نەدەکرد، هەمووان دەیانزانی ئەوە فێڵ و کەڵەکەبازییە لەئاغا ڕەزا کراوە، هەمووان ئاغا ڕەزای پاسەوانیان دەناسی، دوای بیست ڕۆژ حوکمی دادگا دەرچوو بە سێ ساڵ زیندانی و لێسەندنی بڕی (١٧٨) هەزار تومەن. کاتێک قازی بڕیاری دادگای خوێندەوە، ئاغا ڕەزا قسەکانی بەڕێوەبەری پۆلیسی هاتەوە یاد کە پێیگوت، بڕۆ دەبێت کارێکت پێ بکەم بەسەر کەس نەهاتبێت. ئاغا ڕەزا تێگەیشت ئەوەی بەسەریدا هات هەمووی لە ئەستۆی بەڕێوەبەری پۆلیس و سەرۆکی زیندانەوە بووە، ئەوان بەیەکەوە لە گەندەڵییەکە هاوبەش بوون.

لە ماڵی ئاغا ڕەزادا ماتەم بوو، ئێوارەیەکی مانگی ئازەر (تشرینی دووەم) بوو، تیشکی خۆر بەبێڕەنگی لە کوێسەبانەکەی ماڵی محەمەد عەلی دابوو، دیکۆری ماڵەکە ناحەز دەردەکەوت، ئێوارەیەکی خەمناک بوو. ماسییەکانی ناو حەوزەکە جوڵەیان لێ بڕابوو. وەک ئەوەی ئەوانیش لەمانای تاوان تێبگەن، ئەو گیانلەبەرانە لە خەمی ئەو زوڵمە، بێ جوڵە بوون.

خوشکەکانی مهری کۆبوونەوەو لەگەڵ ژنانی دراوسێدا بە بێدەنگی بەدەوری حەوزەکەوە دانیشتبوون، منداڵانیش بە ئارامی دانیشتبوون، عەلی ئەسغەری برای ئاغا

ڕەزا و محەمەد عەلی و عەبدوڵلای ئاتەشکار لە هەیوانەکە دانیشتبوون و بیریان لە چارەنووسی ئاغا ڕەزا دەکردەوە. ئاغا ڕەزا هەمووی (٢٧٧) تومەن پارەی هەبوو، بەزیندانیکردنی ئەو، مهریش بێ پارەو بێ خەرجی دەمایەوە. مهری دەیگوت: هیچ کەسێک خەمی منی نەبێت من دەتوانم بۆخۆم کارێک بکەم و خەرجی خۆم دابین بکەم، دەزگاکانی چنین (جۆلایی) دایەگەورەم دەخەمە کارو خۆم کاری جۆلایی دەکەم. باوکیشی گوتی: ئێمە هەموومان هاوکاری تۆ دەکەین، ئەگەر دەزگاکانی چنین بخەیتە کارو کاریان پێبکەیت، ئێمەش لەبارەی تووە خەیاڵمان ئاسودە دەبێت. لەو کاتەوە ئەم دەزگایانە خەوێنراون و کاریان پێناکرێت، خێروبەرەکەت ڕووی لەم ماڵە نەکردووە. لەهەر ماڵێکدا تەمبەڵی و بێکاریی هەبێت، لەو ماڵەدا خێرو بەرەکەتیش نییە. ئەگەر ژنەکەی منیش وەکو دایکم کاری بکردایە، ئەوەندە باسی خەڵکی نەدەکردو ئەوەندە قسەی نەدەکردو بەو دەردەش نەدەچوو. ماڵە کۆنەکانی زوو پێش ئەوەی ماڵێکی کەلتووری بن، ماڵێکی بەرهەمهێن بوون. عەبدوڵلای ئاتەشگەر گوتی: بەیانی من ناچم بۆ کار، منداڵەکان کۆدەکەمەوە کە بێن ژێر زەمینەکە گسک بدەن و بیشۆرن، دەزگاکانیش خۆڵ و تەپوتۆزی چەند ساڵەیان لەسەرە با ئەوانیش پاک بکەنەوە، ئەگەر پەت و هەرشتێکی ترمان ویست بەزوویی دەچم پەیدای دەکەم. بە ئومێدی خودا مهری خانم دەکەویتە کارو پارەیەکی باشت دەست دەکەوێت. عەلی ئەسغەر گوتی: ئەی پارەی سزاکەی چۆن پەیدابکەین؟ مهری گوتی: خانووەکە دەفرۆشم و من دەچمە لای باوکم دادەنیشم. عەلی ئەسغەر گوتی: خانووەکە ئەوپەڕی (٢٥) هەزار تومەن دەکات ئەی (١٥٠) هەزار تومەنەکەی تر لە کوێ بهێنین. خۆ ئەو بڕە پارەیە هەروا کەم نییە، مهری گوتی: خودا گەورەیە.

بەیانی زوو ئاغا عەبدوڵلا ژن و منداڵەکانی کۆکردەوە تاکو ژێرزەمین و دەزگاکان پاک بکەنەوە. نزیکەی (١٠) ساڵ دەبوو دەزگاکان کاریان پێنەکرابوو، لەناو تۆزو خۆڵدابوون. ژنانی دراوسێش هاتن سەکینەی تەرزجان و بومان جان و بیبی سەکینەو چەند ژنێکی تریش هەموویان گسک و خۆڵڕێژ بەدەستەوە کەوتنە کارکردن، منیش چووم بۆ هاوکارییان. چەند منداڵێکی تری گەڕەکیش لەوێبوون، لەو منداڵانە ئەکبەری دەبیری و حوسێنی سەفاریم دێتەوە یاد. دەسرێکم لە دەموچاوم ئالاندو تۆزو خۆڵی سەر دەزگاکانم دەتەکاندو بە سەتڵ لە حەوزەکەوە ئاوم دەهێناو ژێرزەمینەکەم

دەشۆری. ژێرزەمینەکە زۆر پیس بوو، هەمووی تۆزو خۆڵ بوو، تەونی جاڵجاڵۆکە هەموو دەزگاکانی تەنیبوو، ژنان چەند دووپشکێکیان کوشت. منداڵان کە دووپشکیان دەبینی، دەیانکرد بە قیژەو هاوارکردن. سەفورای کچی زینەتیش بە بیستنی ناوی دووپشک هاواریدەکردو بە پلیکانەکاندا سەردەکەوت. من تەمەنم نزیکەی پانزە ساڵ دەبوو، سەفوراش تەمەنی چواردە ساڵ دەبوو. بەڕاستییەکەی من لەبەر خاتری سەفورا چووبوم بۆ هاوکاریکردنیان. من پێی لێدەنێم کە نیەتم هاوکاری نەبوو، لەبەر دراوسێیەتی و لەبەر خاتری ئاغا ڕەزا نەچووبووم. زۆر دەمێک بوو حەزم دەکرد لەگەڵ سەفورادا قسە بکەم، خەریک بووم سەتڵە ئاوێکم لە پلیکانەکانەوە دەهێنایە خوارەوە بۆ ژێرزەمینەکە، کە سەیرمکرد سەفورا لەترسی دووپشک هاوار دەکات و بە پلیکانەکاندا سەردەکەوێت، لەسەر پلیکانەکان چاوی پێمکەوت. گوتم: خۆ دووپشک هیچ ترسێکی نییە. ئەویش گوتی: دەبڕۆ بیکوژە. منیش وەک ئەوەی بچم شێرێک بکوژم بەخێرایی لە پلیکانەکانەوە ڕۆیشتمە خوارەوە، پێش ئەوەی ژنان و منداڵانی تر بیکوژن، خێرا بەتاکە پێڵاوەکەم دووپشکەکەم کوشت. دووپشکێکی گەورەی ڕەش بوو، دوای کوشتنیشی بە تاکە پێڵاوەکەم چەندجارێکی ترم پێکێشا، سەیرێکی سەفورام کرد وەک ئەوەی کارێکی زۆر گەورەم ئەنجامدابێت، دڵم لەتاو سەفورا کەوتە لێدان، باشبوو دوای کەمێک ڕامان، سەفورا بەخێرایی گوتی: سبەی نیوەڕۆ دوای قوتابخانە لەلای پلیکانەکانی پشت سەربانەکە. بەبیستنی ئەم قسەیە لە پێستی خۆمدا جێگام نەدەبووەوە، دەمتوانی لە خۆشیاندا لە یەزدەوە تاکو تەبەس ڕابکەم. خۆشحاڵییەکەم بەڕادەیەک بوو هەر کارێکیان پێ بسپاردمایە بەزوویی ئەنجامم دەدا. خاک و خۆڵم کۆدەکردەوەو دەمکردە گوێنییەوەو بەکۆڵی خۆمدا دەداو دەمبرد دەمکرە چاڵەوە، ئەو چاڵەی کە خاشاکی تێدەکرا تاکو ماڵی محەمەد عەلی (١٥٠٠) مەتر دوور دەبوو. ئەوکاتە کرێکاری شارەوانی نەبوو بۆ پاکردنەوەی شەقام و کۆڵانەکان کەسێک نەبوو خاشاکی ماڵان کۆبکاتەوە، دەبووایە خەڵکەکە خۆیان خاشاکەکەیان ببردایە ئەو چاڵەوە کە تایبەت بوو بە خاشاک. سبەی دوانیوەڕۆ لە پلیکانەکانی پشتی سەربانەکەوە خۆم گەیاندە ماڵی زینەت خانم. ئەوە یادەوەرییەکە هەرگیز لەیادم ناچێت، یادەوەرییەکە لە تەمەنی (٦٥) ساڵیدا لەسەد دەنکە حەپی خەو بۆ من باشترە. هەرکاتێک لە گرفتارییەکانی ڕۆژگار بێزار دەبم و هەرکاتێک خەڵکانی هەڵپەرست هێرشم دەکەنە سەر، هەرکاتێک زۆر

شەکەت دەبم و خەریکە سەکتە لێم دەدات، یادەوەرییەکانی لای پلیکانەکان و ڕێگای ئاوی قەنات و ماڵی هاوسێکان و سواربوون لەپشتی پیکابەوە لەڕێگای سەردەشت-مهابادو یادەوەریی ئایشێ و سەفوراو ئەوانی تر هێمنم دەکەنەوەو بەڕاحەتی دەخەوم. دیارە هیچ کاتێکیش خوداوەندی گەورەش لەیاد ناکەم. ئەی ئێوە چ یادەوەرییەکی سەردەمی لاوێتیتان هەیە؟ یادەوەرییەکتان هەیە بەکەڵکی تەمەنی (٦٥) ساڵی بێت.

شەهربانوو سێ دەزگای لەدوا بەجێمابوو، بەڵام هەرسێکیان کەموکوڕییان هەبوو، چەند شتێکیان کەم بوو. بیبی هاجەر بە قاچی شەلەوە لەسەر لێواری حەوزەکەی ماڵی محەمەد عەلی دانیشتبوو، ڕێنمایی دەکردن. گوتی: هەمووتان بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ میوانی منن. بیبی هاجەر گوتی: بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ چێشتی شۆرباو هێلکەوڕۆنی دروستکرووە. باسی بەستنی دەزگاکان دەکرا، بیبی هەلیش دوو دەزگای جۆلایی هەبوو چەند ساڵێک من و دایکم لە ژوورێکی ماڵی ئەودا کرێچی بووین، من لە خانووەکەی ئەودا لەدایک ببووم، تا گەیشتمە پۆلی دووەم ماڵمان هەر لەو خانووەدا بوو، لەگەڵ منداڵەکانی ئەودا حوسێن و ملوک و نۆرستەو حەسەن بەیەکەوە یاریمان دەکردو هەر بەیەکیشەوە گەورە بووین. تا لەو ماڵەدا بووین دایکم بە دەزگاکەی بیبی هەلی پارچەی دەچنی، واتە کرێکاری بیبی هەلی بوو. بیبی هەلی بۆخۆی کاری نەدەکرد، دایکم بە دەزگایەک کاریدەکردو سەکینە خانمی دەبیری ژنی ئەحمەد ئاغای دەبیری بە دەزگاکەی تر کاری دەکرد. بیبی هەلی لەسەر پێشنیاری شەهربانوو بۆخۆی پارچەکانی بۆ فرۆشتن دەبرد بۆ بازاڕ، تاکو بە بازرگانە یەهودییەکانی بفرۆشێت. لەو ساڵانەدا لە دەیەی (١٣٣٠-١٣٤٠/١٩٥٠-١٩٦٠) ژمارەی دووکانداران و بازرگانانی یەهودی لە بازاڕەکانی یەزد، بەتایبەتی بازاڕی خان زۆربوون. ژمارەیان لانیکەم دەگەیشتە (٣٥) دووکاندار، لە بازاڕی خان موسڵمانەکان ڕۆژانی هەینی و یەهودییەکان ڕۆژانی شەممە دووکانیان نەدەکردەوە، بەگشتی ڕۆژانی شەممە دووکانەکانی بازاڕی خان نیوەیان داخرابوون. لەم کاتەدا لە هەر بازرگانێکی کۆنی بازاڕ پرسیارم کرد، دەیانگوت یەهودییەکان کەسانێکی سەرڕاست بوون، هەرگیز لە کڕین و فرۆشتندا درۆو ساختەکارییان نەدەکرد.

ئەو ڕۆژە قسەوباس لەسەر دابینکردنی پارە بوو بۆ کڕینی دەزوو و پێویستییەکانی تر، دەبووایە بەزوویی دەزوو بکڕن تاکو دەزگاکان بخەنە کار. بیبی هەلی گوتی:

شەهربانوو پارچە چنراوەکانی لەبازاڕی خان بە بازرگانێکی یەهودی دەفرۆشت. پارچە قوماشەکانی بە ئیبراهیم بروشلی و جاجمەکانیشی بە هارون دادی دەفرۆشت. گوتی: منیش ئەو دووکەسە دەناسم، سبەی لەگەڵ مهری دەچین بۆ دووکانەکانیان. نیوەڕۆ هێلکەوڕۆن و شۆربایەکی زۆریان لەماڵی بیبی هاجەرەوە هێنا، هەر لەوکاتەدا ئەشرەفیش لەگەڵ دوو منداڵی بچووکدا گەیشتە ئەوێ، یەک مەنجەڵی گەورە ماست و نان و سەوزەی هێنابوو. ئەشرەف ئامۆژنی مهری بوو، لەوکاتەوەی ڕوقیە مردبوو، نەهاتبوو بۆ ماڵی برای هاوسەرەکەی. کاتی نیوەڕۆ ئەعزەم دەفەکەی هێناو دەستیکرد بە دەفلێدان. ژنان و منداڵان بەدەوری حەوزە ئاوەکەدا هەڵدەپەڕین، دەنگ و هەڵپەڕکێیەک کە خەم و شادی تێکەڵ دەکرد. دەنگ و هەڵپەڕکێیەک کە داوای دادپەروەریی دەکرد. وەک ئەوەی کە هیچ خەمێک لەئارادا نەبێت. مهری خەمی زیندانیبوونی هاوسەرەکەی فەرامۆشکردبوو. منیش زۆر شەیدای سەفورا ببووم، لە گۆنا سوورەکانی و نیگا ئاگرینەکەیدا دیاربوو کە ئەویش توانای نەمابوو. لە تەمەنێکدا کە دەچیتە قۆناغی پیاوەتییەوە، بەڵام هیچ کەسێک بەپیاوت نازانێت، دەتوانیت تێکەڵاوی ژنان ببیت و لەلایان دانیشیت. چەند مانگ لەوەدوا ئیتر نەمتوانی بچمە ماڵە دراوسێکان و لە کۆڕی ژناندا دانیشم، لەوەدوا دراوسێکان منیان بەپیاو دەزانی و پێم لە کۆڕو کۆبوونەوەی ژنان بەتەواوی بڕا.

کاتی ئێوارە دەزگاکان ئامادەکران بۆ کارکردن. ڕەبابەو خوشکەکەی هەریەکەو دەزگایەکی چنینیان خستەکار، هەر دەزگایەک دوو کەسی دەویست بۆ کارکردن، بەڵام بۆ دەزگای دروستکردنی بەڕەو جاجم یەک کرێکار بەس بوو. دابینکردنی کرێکار هەروا ئاسان نەبوو. ڕوبابە گوتی: تاکو مهری کرێکاری دەستدەکەوێت من بە دەزگاکەی خۆم کار ناکەم و دێم کار بۆ مهری دەکەم. حاجیکی ژنی ڕەمەزانیش گوتی: منیش کارەکەی خۆم دەوەستێنم و کار بۆ مهری دەکەم. ئەمەش خۆی جۆرێک بوو لە هاوکاریکردن، ئەوان دەزگاکانی خۆیان وەستاند، تاکو بە بەلاش کار بۆ دراوسێکەیان بکەن، دراوسێکانی تریش بەڵێنیان دا، کە هەوڵی پەیداکردنی کرێکار بدەن.

بەیانی مهری و بیبی هەلی ڕۆیشتن بۆ بازاڕ. سەرەتا چوون بۆ دووکانی ئیبراهیمی پورشلی، دووکانەکەی ئەو لە ناوەڕاستی بازاڕ بوو. بیبی هەلی ئیبراهیمی پورشلی دەناسی و مهری بە پورشلی ناساندو گوتی: ئەمە نەوەی شەهربانووەو کچی محەمەد

عەلییەو هاوسەری ئاغا ڕەزای پاسەوانە. ئیبراهیم پورشلی گوتی: چەندین ساڵ من بەرهەمەکانی شەهربانووم دەکڕی و لە پرسەکەشیدا بەشداریم کرد. مهری گوتی: من دەزگاکانی دایەگەورەم خستۆتە کار، ئێستاش کلافەی ئاوریشم و پێویستییەکانی تری چنینم دەوێت. پارەشم پێ نییە. پورشلی گوتی: هەرچییەکت پێویستە بەقەرز پێتی دەدەم، من زۆر دڵنیام لەتۆ. مهری گوتی: بەشی دوو دەزگا ئاوریشمم دەوێت. پورشلی گوتی: دەزانم هاوسەرەکەت بەناهەق خراوەتە زیندان. ئێستا مادام ئەو لە زینداندایەو تۆش دەتەوێت دەزگاکان بخەیتەوە کار، بەردەوام ئاوریشم و پێداویستییەکانی ترت پێدەدەم. ئەوەبوو مهریش بەشی دوو دەزگا ئاوریشم و هەندێک شتی تری لێوەرگرت. پورشلی گوتی: ئێستا تۆ پێویستت بە پارە هەیە، هەرچەندێک پارەت دەوێت پێشەکی پێتی دەدەم، ئینجا لە دەفتەرەکەیدا هەموو ئەوشتانەی نووسی کە دابووی بە مهری و (١٥٠) تومەنی پێشەکی پێدا. بیبی هەلی گوتی: باجاری ئەم شتانەمان لێرە بێت تا دەچین بۆ دووکانی (دادادی) بۆ کڕینی هەندێک دەزوو. ئەوکاتە بازاڕی یەزد بازاڕێکی بەرهەمهێن بوو، بازاڕێک بوو وابەستە بوو بە بەرهەمی ناوخۆوە، بازاڕێک نەبوو کە بەسترابێتەوە بە بازاڕی چین. نەفرەتی خودا لەوکەسەی بەدرێژایی پەنجا ساڵ بازاڕی بەرهەمهێنی ئێمەی گۆڕی بە بازاڕی بەکاربەر، ئەوەش بازاڕی سەرمایەداری چینە کە کالای بێکەڵک دەنێرێت تاکو بازاڕی ئێمە نابووت بکات.

بورشلی کاری کڕین و فرۆشتنی پارچەی ئاوریشمی دەکرد، دادادی کاری پارچەی لۆکە بوو. یەکێکیان دەزووی پێداو پارچەی ئاوریشمی لێوەرگرت، ئەوی تریان دەزووی لۆکەی پێداو پارچەی لۆکەی لێوەردەگرت. بورشلی پارچەقوماشی کۆنەشی دەکڕی و دەفرۆشتەوە. هەردووک ژن ڕۆیشتن بۆ دووکانی دادادی. دادادی دووکانێکی بچکۆلانەی هەبوو، ئەو مهری دەناسی. گوتی: من چەندین ساڵ لەگەڵ شەهربانوودا باسی قورئان و تەوراتمان کردووە. لە شەهربانووەوە فێری زۆر شت بووم، من خۆم بە خوێندکاری شەهربانوو دەزانم، منداڵەکانم لەلای شەهربانوو فێری زانستی تەورات بوون .ئەو دوو ژنە لەگەڵ دادادی باسی کارپێکردنی دەزگاکانیان کرد. دادادیش هەروەکو بورشلی تەواوی پێویستییەکانی بەقەرز دا بە مهری و گوتی: دایەگەورەت هەندێک قەرزی لەلای من هەیە، چەند تۆپ قوماشی چندراوی بەئامانەت لەلای من دانابوو، بەلام نەهاتەوە بۆیان، هەواڵیشم نارد بۆ مامەت ئەویش هەر نەهات،

دوایی سەیری دەفتەرەکەم دەکەم و هەرچی قەرزاربووم پێتی دەدەم. هارونی دادادی لە مهری پرسی ئایا میراتگرانی تر ڕازی دەبن ئەو قەرزە بدەمەوە تۆ. بیبی هەلی گوتی: شەهربانوو کاتێک لەژیاندابوو دەزگاکانی پێشکەش بە هاوسەرەکەی مهری کردووە. لەوسەردەمەدا هێشتا بازاڕەکان ئالودەی درۆو کەلەکچێتی و قولبڕین نەببوون. بەدرێژایی بیست ساڵ، واتە لە ساڵی (١٣٢٥-١٣٤٥/١٩٤٦-١٩٦٦) یەک کەس لە بازاڕەکانی یەزد بەهۆی قولبڕین و ساختەکارییەوە زیندانی نەکرابوون. من واهەست دەکەم کە پێشتریش تەواوی شارەکانی ئێران جگە لە تاران، هەر بەهەمانشێوە بووبن، بازاڕە گەورەکانی وەکو بازاڕی شاری تەورێز، قەزوین، ئەسفەهان، کرمان، شیراز لەسەر ڕاستی و دروستی بنیاتنراون. من کێشەکانی بازاڕم لە وتارێکدا نووسیوە.

بیبی هەلی عەرەبانەیەکی بەکرێگرت و کەلوپەلەکانی خستەسەرو بەرەو ماڵ ڕۆیشتن. ئاغا حەبیبی نیکۆکار دوای نیوەڕۆ خەریکی کار بوو تاکو دەزگاکان بخاتە کار. دوای سێ ڕۆژ دەزگاکان بەتەواوی ئامادەکرابوون، کرێکاریش پەیدا ببوو، ئاغا حەبیب ماوەی سێ ڕۆژ کاری کرد، بەڵام هیچ هەقدەستێکی وەرنەگرت، هەرچەندە مهری پێداگریی کرد ئاغا حەبیبی نیکۆکار گوتی: من بەمنداڵی خوێندکاری شەهربانوو بووم، ئەم چەند ڕۆژەش کە کار بۆ نەوەکەی دەکەم، بەیادی گیانی شەهربانووەوەیە. ئاغا حەبیب گوتی: لەدوای ئەم کارە ئەگەر کارێکی ترت هەبوو، ئەوکات پارەت لێوەردەگرم.

چوارشەممە ڕۆژی سەردانیکردنی زیندان بوو، مهری لەگەڵ باوکیدا پێویستییەکانیان کڕی و ڕۆیشتن بۆ زیندان، ئاغا ڕەزا بەبیستنی هەواڵی کارکردنی مهری بە دەستگاکان خۆشحاڵبوو، گوتی: من لە خەمی خەرجی مهریدا بووم، بەڵام ئەوا خەیاڵم ئاسودە بوو. ئاغا ڕەزا گوتی: لێرە چەند کەسێک پێیانگوتم کە تانە لە حوکمی زیندانەکەم بدەم، بەڵکو حوکمەکەم بۆ کەمبکرێتەوە، بۆیە دەبێت پارێزەرێک بگرم. محەمەد عەلی بە زاوەکەی گوت: ئێمە دەزانین تۆ بێتاوانیت و تلیاکت نەبردووە بۆ ناو زیندان، ئێمە هەرکارێک لەدەستمان بێت بۆتی دەکەین. دوای گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە، مهری لای دراوسێکان باسی ئەوەی کردبوو کە دەیەوێت پارێزەرێک بۆ ئاغا بگرێت.

لەدوای مردنی باوکم، دایکم بۆ وەرگرتنەوەی بەشەماڵی خۆمان بەردەوام بەڕێی دادگاوە بوو، حاجی بومان عەلی حەسەنی (١٢٩٦-١٣٨٥/١٩١٧-٢٠٠٦) پارێزەری ئێمە بوو، پیاوێکی بەڕێزو خۆشەویست بوو، هەموو ژیانی خۆی تەرخانکردبوو بۆ

وەرگرتنی مافی خەڵکانی هەژار. من تەمەنم شەش ساڵ بوو کاتێک باوکم مرد، ئەو بوو بە بریکاری من بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانم، بەبێئەوەی دڵنیابێت لەوەی کە کرێی پێدەدەین یان نا. حاجی بومان عەلی چەند خولەکێک پێش کۆچی دوایی ئەم هۆنراوەیەی بۆ ئەوانەی لە دەوروبەری بوون خوێندەوە.

**عمرم تباه گشت و به مرز نود رسید**
**شد نامەم سیاه و شد موی من سپید**
**بهر شعر مرا نبود زادو توشەیی**
**یارب به جود و فضل تو دارم امید**

**تەمەنم تەواوبوو گەیشت بە نەوەد**
**رابردووم ڕەش و مووی سەرم سپی**
**بەرهەمی هۆنراوەکەم نەبووە تێشووی ڕێگام**
**خودایە ئومێدەوارم بە گەورەیی تۆ.**

من سوودێکی زۆرم لە ئامۆژگارییەکانی حاجی بومان عەلی بینیوە، ماوەی حەوت ساڵ لەگەڵ یەکێک لە کوڕەکانی ئەو بەناوی ئاغای حەسەنی حەسەنی هاوپۆل بووم، لەپۆلی دەوە تاکو وەرگرتنی بەکالۆریۆس. خۆزگە کەسێک دەبوو ژیاننامەی ئەوکەسە بەڕێزەی بنووسیایەتەوە کە چۆن هەموو تەمەنی خۆی تەرخانکردبوو لە پێناو خەڵکی هەژاردا. دایکم مهری بە حاجی بومان عەلی ناساند. حاجی بومان عەلی گوتی: من بەمنداڵی خوێندکاری مەلا شەهربانوو بووم، تا تەمەنی (٣٥) ساڵی هەموو عەسرێکی ڕۆژانی دووشەممە بەشداریی لێکدانەوەی هۆنراوەکانی مەولەویم دەکرد لەلای شەهربانوو. هەرکاتێک لە تێگەیشتنی مانای ئایەتەکانی قورئان کێشەیەکم بۆ دروست ببووایە، پرسم بە ئەو دەکرد. حاجی بومان عەلی گوتی: من دەزانم لە دادگادا زوڵم کراوە، هەموو کەس ئاغا ڕەزای پاسەوان دەناسێت و دەزانن کە ئەو کارانە لە ئەو ناوەشێتەوە. من بەردەوام قسەم لەگەڵ قازیدا کردووەو پێمگوتووە کە ئەم حوکمە زوڵمە، بەڵام حاکم گوتی: هیچ چارەیەکم نییە ئەوەتا کۆمەڵێک کەس بوونە شاهید بەسەرییەوە. حاجی بومان عەلی گوتی: من بریکاری ئاغا ڕەزا قبوڵ دەکەم، سبەی دەچم

بۆ زیندان و ئیمزای ئاغا ڕەزا وەردەگرم. مهری گوتی: چەند پارەمان لێوەردەگریت بۆ ئەو ئەرکەی دەیکێشیت. ئاغا بومان عەلی گوتی: خۆم حساب لەگەڵ ئاغا ڕەزا دەکەم و باوکیشت هەر دەناسم کێشەی پارەت نەبێت. حاجی بومان عەلی (١٠) دانە (١٠) تومەنی لە گیرفانی دەرکردو دای بە مهری و گوتی: دەبێت ئەو پارەیەم لێوەربگریت. مهریش ناچار پارەکەی لێوەرگرت و گوتی: دەزگاکانی دایەگەورەم خستۆتەوەکارو ئیتر بۆخۆم کاردەکەم. هەربۆیەش پێویستم بەپارە نییە.

چەند ڕۆژ لەوەدوا مهری یەکەمین پارچە قوماشی بۆ دووکانی دادادی برد. هارونی دادادی گوتی: حسابە کۆنەکەی شەهربانووی دۆزیوەتەوەو نووسیویەتی ئەو چەند تۆپ قوماشی بەئامانەت لێرە دانابوو. بەهەمووی (٦٨٣) تومەنی شەهربانووی کەوتبووە لا. هارونی دادادی گوتی: لەوکاتەوە کە قوماشەکانی فرۆشتووە تاکو ئێستا، حەوت ساڵ و سێ مانگە. بەحسابی من دەبێت (١٠٧٦) تمەن بدەمە تۆ. مهری گوتی: من سووخۆر نیم و ئەو پارە زیادەیەم ناوێت. هارونی دادادی گوتی: ئەو پارەیە سوود نییە، بەڵکو من بەپارەی دایەگەورەت مامەڵەم کردووە، ئەوە قازانجی پارەکەیەتی، چەندجارێکیش هەواڵم بۆ باوکت و مامت ناردووە کە بێن و حیساب بکەین، بەڵام ئەوان نەهاتن، لەوەیە وایانزانیبێت شەهربانوو قەرزاری منە. هەتا شەهربانوو خۆشی مابوو دووجار هەواڵم بۆ ئەویش نارد، کەچی ئەویش هەر نەهات، ئێستاش وا من پارەکەم دا بە تۆ ئەگەر کەسێکی تر داوای ئەو پارەیەی لێکردم دەبێت تۆ وەڵامیان بدەیتەوە. دوای هەموو حسابێک و دانەوەی قەرز مهری نزیکەی هەشتسەد تومەنی وەرگرت. باسی پارە قەرزەکەی شەهربانووی لای باوکی و مامی کرد، ئەوانیش گوتیان ئەو پارەیە بەشی تۆیە. مهری بەو پارەیە مەکینەی بەرگدروونی کڕی. بۆخۆی لە ماڵەوە خەریکی کاری بەرگدروون بوو. لەماوەی چەند مانگێکدا برەوی کارەکەی زۆر باشبوو، ژنە دەوڵەمەندەکانی گەڕەکەکانی تریش درووومانیان بۆ ئەو دەهێنا. ئەو جلوبەرگی بە شێوازێکی زۆر نایاب دەدووری و ئەوانیش هەقدەستێکی باشیان پێدەدا. کرێکارەکانیش لە ژێرزەمینەکە کاری قوماش چنینیان دەکرد. خۆشی لە ژوورەکەی شەهربانوودا کاری بەرگدرووونی دەکرد. مهری هەندێک ڕۆژ ماوەی هەژدە کاتژمێر کاری دەکرد، چەند کچێکی گەڕەکیش دەهاتنە لای و فێری کاری بەرگدروون بوون. سەفورای کچی خوشکیشی هەر لەلای ئەو فێری کاری بەرگدروون ببوو.

مهری بەردەوام لەکارکردندابوو بۆئەوەی بتوانێت بڕی ئەو پارەیە دابین بکات کە وەک سزا کەوتبووە سەر هاوسەرەکەی، بەڵام ئەو هەرگیز نەیدەتوانی بڕی (٨٧٠٠٠) تومەن کۆبکاتەوە. دادگای تێهەڵچوونەوە بەهۆی حاجی بومان عەلی حوکمی زیندانی و سزای پارەکەی کەمکردەوە بۆ (٩) مانگ زیندانی و (٨٧٠٠٠) تومەن. بەپێی ئەو سزایە ئاغا ڕەزا لە پاسەوانیش دەردەکرا. ئەگەر بنکەی پۆلیس ڕێگای بدایە ئاغا ڕەزا ئازاد دەکرا، بەڵام ئەوان دەیانگوت پاسەوان دەبێت تەمێ بکرێت، بۆئەوەی ببێتە عیبرەت بۆئەوانی تریش. خۆ هەموو کەس دەیزانی تاوانبار کێیە؟ دیارە خۆ ئاغا ڕەزا تاوانبار بوو، تاوانەکەی ئەوەبوو نهێنی دزی ناو زیندانی ئاشکرا کردبوو. کاتێک ئاغا ڕەزا هەواڵی کەمکردنەوەی سزاکەی بیست، زۆر سوپاسی خودای گەورەی کرد، بە مهری گوت: خەم مەخۆ کەمتر لە پێنج مانگم ماوە لەزینداندا بم. مهری گوتی: ئەی بۆ پارەکە چی بکەین. ئاغا ڕەزا گوتی: خودا دەینێرێت، ئێستا نزیکەی پێنج مانگ کاتمان هەیە، خودا لە دایەگەورەت خۆش بێت کە تۆ دەتوانیت بە دەزگاکانی ئەو کاربکەیت و خەرجی خۆم وخۆت پەیدا بکەیت، بۆ پارەی سزاکەش خودا گەورەیە. مهری کەوتبووە دڵەکوتەو دەیگوت: چۆن خودا ئەو هەموو پارەیە دەنێرێت؟ ماوەی هەشت مانگ و دە ڕۆژ بوو ئاغا ڕەزا لە زیندان بوو. مهری هەفتەی دوو ڕۆژ سەردانی ئاغا ڕەزای دەکردو هەواڵەکانی پێڕادەگەیاند. هیچ ڕێگایەک بۆ دابینکردنی ئەو بڕەپارەیە نەبوو، زۆرترین نرخی خانووەکەش (٢٤) هەزار تومەن بوو. ئەو خانووە تەنها دووسەد مەتر لە مزگەوتی پشت باخەوە دوور بوو، کەوتبووە سەر شەقامی گشتی. ئەو خانووە زەوییەکەی لەساڵی (١٣٩٢-٢٠١٣) بە (٤٥٦) ملیۆن تومەن مامەڵەی پێوەکرا. بەدرێژایی هەشت مانگ مهری بڕی (٤٥٥٠) تومەنی کۆکردبووەوە، بەڵام ئەو پارەیە لەچاو (٧٨٠٠٠) تومەن زۆرکەم بوو. عەبدوڵڵای ئاتەشکار سەردانی چەند بانکێکی کرد بەڵکو بتوانێت قەرزێک بۆ مهری وەربگرێت. ئاغا کازمی ئەسەدوڵڵایی کارمەندی بانکی ڕەهن بوو، ئەو زۆر هاوکاری مهری کرد، بەڵام هەموو ئەو پارەیەی کە دەیتوانی بۆ ماڵی ئاغا ڕەزای وەربگرێت هەمووی (٩) هەزار تومەن بوو. بەرامبەر بەم پارە کەمە نەدەکرا خانووەکەیان بفرۆشن.

بەردەوام لە ماڵی محەمەد عەلی کۆبوونەوە بوو لەسەر دابینکردنی پارە، ئاغا ڕەزاش بەردەوام دەیگوت: لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیەو لە هەر پەندێکدا نیعمەتێک

هەیە. عەلی ئەسغەری برای ئاغا ڕەزاش هەر خەمی دەخواردو ئەویش ژن و منداڵی هەبوو، خەرجی دایکی و خەسوشی هەر لە ئەستۆی ئەودا بوو. نەیدەتوانی هاوکاری براکەی بکات، ئەوپەڕی دەیتوانی (١٥٠٠) تومەن تا دوو هەزار تومەن بدات. حاجی بومان عەلی هەوڵی دابوو لە دادگا پارەکە بکات بە قیست، بەڵام دادگا بەوە ڕازی نەبوو. حاجی بومان عەلی دەیزانی کە هۆی ڕازینەبوونی دادگا تەنها بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی یەزدە. حاجی بومان عەلی نەک تەنها پارەی بریکاری وەرنەگرتبوو، بەڵکو پارەی خۆشی بۆ دۆسیەو پول خەرجکردبوو. (٢٢) ڕۆژ ماوەی زیندانی مابوو، ئاغا ڕەزا یا دەبووایە بەزوویی پارەکە بدات، یا دەبووایە هەر لە زیندان‌دا بووایە تاکو پارەکەی دابین دەکات.

هەر لە هەمان ساڵدا لە گەڕەکی ئێمە قاچاخچییەکی گەورە هەبوو، ئەوکەسە قاچاخچییەکی نێودەوڵەتی بوو، زیاتر لە (١٥٠٠) کیلۆ تلیاکیان پێگرتبوو، ئەو تلیاکەی بەپشتی حوشتر دەگواستەوە، لە ناوجەرگەی کەوێردا دەستیان بەسەر تەواوی تلیاکەکەیان گرتبوو. ئەم قاچاخچییە گەورەیە دوای چەند مانگێک لە زیندان ئازاد کرا. بریکاری ئەم قاچاخچییە گەورەیە عەباسی ئوسادان بوو، عەباسی ئوسادان سەردەمانێک نوێنەری حیزبی تودە بوو لە یەزد، لەپێناوی بەدەستکەوتنی پارەدا نوێنەرایەتی حزبی تودەی لایەنگری سۆڤیەت و پارێزەرێکی قاچاخچی لایەنگری شاو ئەمریکاو ئینگلیز بوو. ئەو شەیدای پارە بوو، کۆمۆنیست و تودەی سەرمایەداری نەدەناسی. لە هەمان ساڵدا زیاتر لە (١٠) کیلۆ تلیاکیان بە مامی منەوە گرت، تلیاکەکەی لە ماڵەوە پێگیرابوو، ئەو دوای یەک مانگ کوڕە مامەکەم بۆی تێکۆشاو ڕەشوەیەکی باشی دابوو بە کاربەدەستان، بەو هۆیەشەوە مامەم ئازاد کرا، بەڵام ئاغا ڕەزای بێ پارە لەسەر یەک لولە تلیاک (٩) مانگ کرایە زیندانەوە، لەگەڵ لێسەندنی بڕی (٧٨) هەزار تومەن.

## هاوکاریکردن لەلایەن خەڵکییەوە

ڕۆژی هەینی بوو، چەند ژنێکی دراوسێ لە ماڵی محەمەد عەلی کۆببوونەوە، منداڵان و نەوەکانی محەمەد عەلیش هەر لەوێ بوون. سەفورا کچە چواردە ساڵانەکەی زینەتیش لەوێ بوو، منیش لەوێ ئامادەییم هەبوو. لەو ڕۆژانەدا لەبەر خاتری خودا بە هەر بەهانەیەکەوە بووایە دەچووم بۆ ماڵی محەمەد عەلی، ژنان لەسەر تەلارەکە دانیشتبوون و باسی پەیداکردنی پارەکەیان دەکرد بۆ ئاغا ڕەزا. سەفورا گوتی: با

نامەیەک بۆ فەرەحی شابانوو بنووسین و باسی ئەم کێشەیەی بۆ بکەین، شابانوو کەسێکی میهرەبانەو دەتوانێت کارێکمان بۆ بکات، بەڵکو ئاغا ڕەزا لەو پارەیە ببەخشێت یا پارەیەکمان بۆ بنێرێت. مەرزیەی ژنی حەسەن موتاب گوتی: ئەم منداڵە سادانە بە قسەی ڕادیۆ باوەڕ دەکەن، وادەزانن شابانوو کارێک بۆ ئێمەی بێچارە دەکات. مەرزیە دەفەکەی لە گۆشەی تەلارەکەوە هەڵگرت و دەستی کرد بە دەفلێدان و سەماکردن، دواتریش بە چڵوپۆپی دار هەنار تاجێکی بۆخۆی دروستکردو کردییە سەری، دووبارە دەستیکردەوە بە دەفلێدان و سوڕدان و گۆرانیگوتن و دەیگوت من شابانووم، بەخوا من شابانووم، لەپڕێکدا وەستاو گوتی: پێویستە ئێمە پارە کۆبکەینەوە. داوا لە خەڵکی گەڕەک دەکەم هاوکار بن، داوا لە پاڵەوانان دەکەم کۆببنەوەو لە نێوخۆیاندا پارە کۆبکەنەوە، بە مەلای مزگەوت و ئاغا شێخ جەواد و وەستا غەزنەفەر و حاجی موقتەدەرس و حاجی مورتەزای مسگەر دەڵێم هەموویان پارە بدەن، ئەوان هەموویان ئاغا ڕەزای پاسەوان دەناسن و دەزانن قاچاخچی نییە. مهری گوتی: نابێت ئەوە کارێکی باش نییە، ئاغا ڕەزا بەو کارە ڕازینابێت، ئێمە پارەکە بەقەرز وەردەگرین، بە زۆریش پارە لە کەس وەرناگرین، هەر کاتێک ئاغا ڕەزا پارەکەی هەبوو، با کەم کەم پارەکەیان بداتەوە. مەرزیە گوتی: من هیچ پارەیەکم نییە، بەڵام (٢٥) تومەن پەیدا دەکەم و دەیدەم، ژنانی تری دراوسێ بڕیاریاندا بڕە پارەیەک بدەن. سەیرمکرد وا سەفورا وەستاوەو سەیری ژنەکان دەکات، منیش بۆئەوەی خۆم دەرخەم و خۆم بنوێنم لەو کاروانە جێنەمێنم گوتم: منیش (٢٥) تومەن دەدەم. مهری گوتی: حسێن سوپاست دەکەم هەرگیز ئەو پارەیەی تۆم لەیادم ناچێت. بەڵام من ئەمڕۆ ڕاستییەکەی دەڵێم کە ئەو پارەدانەی من بۆ خۆدەرخستن بوو لەبەردەمی سەفورادا، لەبەرخاتری ئاغا ڕەزا و مهری نەبوو.

وا هەستدەکەم ئەگەر ئەوکاتە پارەم هەبووایە، تەواوی پارەکەم دەدا. کوڕی لاو پێش ئەوەی خودا بناسێت، کچی دراوسێ دەناسێت، پێش ئەوەی هەوڵ بدات خودا لەخۆی ڕازی بکات، هەوڵدەدات کچی دراوسێ لەخۆی ڕازی بکات. بەدرێژایی مێژوو ژیان ئەوها بووە، بێهۆ نابێت بێنەزمی بکەیت. دیارە من منداڵێکی بێ باوک بووم، سایەی باوکم لەسەرم نەبووە، پەروەردەیەکی تەواوی دینیم نەبووە، نازانم ئەگەر چاودێریی باوکم لەسەربووایە چیم دەکرد؟ بەڵام وا هەست دەکەم بەدرێژایی مێژوو باڵغبوونی لاوان لە تەمەنی (١٤-١٥)ساڵیدا بووە، هەربۆیەش هەموو ئاینەکان کاتی

هاوسەرگیرییان لە تەمەنێکی بەرەوخواردا دیاریکردووە، بەڵام ئێستا هاوسەرگیریی لە تەمەنێکی کەمدا قبووڵ نییە، من ئەوەندە دەزانم لە سەردەمی گەنجیدا ئامۆژگاری و هەڕەشەو تەمێکردن وەک بزمارێکی ئاسنین داکوتیت بەسەر بەردا وایە، بۆیە پێویستە بیرمەندان و دەروونناسان ڕێگەچارەیەکی مامناوەند بدۆزنەوە.

بیست و پێنج تومەنی ئەو سەردەمە پارەیەکی زۆر بوو، یەکسان بوو بە پارەی کڕینی نانی پێنج مانگی ئێمە. بەشێک لەو ئاردەی کە هەمانبوو لەلای ئاخوندی نانەوا، فرۆشتم، ئای چ زوڵمێکم کردووە بەرامبەر بە دایکم. مهری گوتی: من دەبێت بچم لە ئاغا ڕەزا بپرسم بزانم ئەوە قبووڵ دەکات پارە لە خەڵکی وەربگرم، ئەگەر قبووڵی کرد، ئەوکاتە پارە وەردەگرم. بۆ سبەینێ ڕۆژی سەردانیکردن بوو، مهری ئاغا ڕەزای ڕازیکردبوو کە پارە لە خەڵکی وەربگرێت. ئاغا ڕەزا بە مهری گوتبوو پارەکە زۆرە، دەفتەرێک هەڵگرەو هەرکەسێک پارەی دا ناوی لە دەفتەرەکەدا تۆمار بکە بۆئەوەی بزانم هەر کەسێک چەندی پارە داوە، بەڵکو ڕۆژێک بێت ئەو پارەیەیان بدەمەوە، بەڵکو ڕۆژێک بێت لە مەراسیمی هاوسەرگیریی، یان مەراسیمی خەتەنە سورانی منداڵەکانیان بتوانم کارێکیان بۆ بکەم. مهری لە گەڕانەوەیدا لە دووکانی محەمەد ئاغای ئابریشمی دەفتەرێکی چل پەڕەیی کڕی. محەمەد ئاغا گوتبووی دەفتەرت بۆچی دەوێت؟ مهریش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕابووەوە. ئاغا محەمەد گوتبووی یەکەم کەس ناوی من بنووسەو ئەوەش (٣٥) تومەن. ئاغا محەمەد دووکانێکی بچووکی بەقاڵی هەبوو لە کۆڵانەکەدا، چەندین ساڵ خزمەتی مزگەوتی کرد، بەبێ ئەوەی هیچ پارەیەک لە مزگەوت وەربگرێت. خەڵکی لەپێناو خودادا کاریان دەکرد، مزگەوتیش ماڵی خودا بوو، دەرگاشی بەڕووی هەمووان‌دا کراوەبوو. نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی (٢٧-٩-١٣٩٤/ ١٨-١٢-٢٠١٥) ڕۆیشتم بۆ مزگەوتی زەهرا لە مەشهەد، کە دەکەوێتە سەر پێنج ڕێیانی (سەناباد) دەرگای مزگەوتەکە داخرابوو، ئێمە چیمان بکردایە کە نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی دەرگای ماڵی خودا لە یەکێک لە گەڕەکە گرنگەکانی شاری مەشهەد داخرابێت. مزگەوتە کۆنەکان بەگشتی لەلایەن خەڵکەوە دروستکراون، ئێستا من تێناگەم هەندێک کەس مزگەوت دروست دەکەن، یان دامەزراوەیەکی ئابووری دروست دەکەن، بۆ یەک کۆڕی قورئانخوێندن چەند هەزار تومەن و هەندێک جاریش چەند ملیۆن تومەن پارە وەردەگرن، ئەوان سەرەتا پارەکە وەردەگرن و دوایی دەرگای مزگەوتەکە دەکەنەوە. لەنێوان دوو نوێژیشدا دەرگای

مزگەوت دادەخــەن، لە سـەردەمی حکومەتی کوفردا مزگەوت ماڵی خـودا بـوو، لە سەردەمی حکومەتی ئیسلامیدا گۆڕدراوە بەجێگای ئابووری و شوێنی کارو کاسبی. ئێستا کە سەردەمی حکومەتی ئیسلامییە هەندێک کەس دەزگـای ئیمام حوسێنیان گۆڕیوە بە بنکەیەکی ئابووری، خودا کارمان بەخێر بگێڕێت. بەدرێژایی مێژوو هیچ کاتێک مزگەوتەکان ئەوەندەی ئێستا دوور لەخودا نەبوون، لەخودا دووردەکەونەوە تاکو لە ئابووری نزیک ببنەوە.

کاتێک مهری گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ژنانی گەڕەک لەدەوری کۆبوونەوە، چاوەڕوانی بۆچوونی ئاغا ڕەزایان دەکرد سەبارەت بە کۆکردنەوەی پارە. مهری ڕازیبوونی ئاغای پێڕاگەیاندن، پارەکەی ئاغا محەمەدی ئابریشمی پیشانی ژنەکان دا. شەو مامۆستای مزگەوت چووە سەر مینبەر بۆ وتـاردان، گوێگرەکان نزیکەی بیست کەس دەبوون، بەڵام بۆ بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە ئەو بیست کەسە بەسبوو، لەو سەردەمەدا کاریگەری پەیوەندییەکان کورت بوون، بەڵام قوڵاییان زۆر بوو. پەیوەندییەکان هەستی و سۆزداریی بوون. پەیوەندییەکی دۆستانەو مرۆڤانەیان دروستدەکرد. لەو سەردەمەدا زانیارییەکان زیاتر لەلایەن ژنانەوە بڵاودەکرانەوە. مەلای مزگەوت گوتی: لە گەڕەکی ئێمە ستەم لە کەسێک کراوە، هەموومان دەزانین چ ستەمێک لەو کەسە داماوە کراوە، بۆیە من داواتان لێدەکەم هەمووتان هیمەتێک بکەن کێشەی ئەو کەسە ستەملێکراوە چارەسەر بکەن، هەرچییەکتان لەدەست دێت، بیدەن. ئەو لەسەر مینبەر نە ناوی ئاغا ڕەزای بردبوو، نە باسی زیندانیکردنی کەسێکی کرد، بەڵام هەمووان دەیانزانی کە بابەتەکە چییە؟ پیاوان لەدوای نوێژکردن، بەیەکەوە لەسەر ئەو بابەتە کەوتنە گفتوگۆ. حاجی مورتەزای زەڕابی کە سەرۆکی گرووپی مسگەرەکان بوو، پیرەمێردێکی سەرنجڕاکێش بوو. باری ئابووری زۆر باشبوو. لە یەزدو ئەردەکان چەند دووکان و زەوی و باخی بستەی هەبوو، ئەو لەباری ئابووری و خەرجکردنی پارە لە ماڵەوە زۆر دەستگرەوە بوو، یا بڵێین زۆر چرووک بوو. بەڵام ئەم حاجییە چرووکە خەرجیی مەسرەفی کفن و پرسەی خەڵکانی هەژاری دەکرد، ئەگەر کەسێکی هەژار بمردایەو پارەیان نەبووایە، ئەو دەیگوت ئەو خوا لێخۆشبووە ببەن بۆ گۆڕستان و پرسەی بۆ دابنێن، هەموو خەرجییەکەشی لەئەستۆی من.

سەید لکوک یان میر ئیسماعیل (یەزدییەکان ئەوکاتە بە کەسانی قەڵەویان دەگوت لکوک)، ئەو لێپرسراوی قەبرستانی سەید سەحراو ئاغا خەتیب لێپرسراوی قەبرستانی جوهەرهەر (جو هرهر) بوون. ئەوان مردووەکانیان بەڕێزەوە کفن و دفن دەکردو بەخاکیان دەسپاردن و پسوڵەی خەرجییەکەیان دەنارد بۆ حاجی مورتەزای زەڕابی باوکی حورِ محەمەدی زەڕابی مسگەرو عەلی والآ گەڕو باوکی محەمەد عەلی زەڕابی دکتۆری ددان لە مەشهەد. حاجی بەتەواوی تێکڕای پارەی خەرجییەکەی بۆ دەنارد، حاجی تەواوی خەرجی پرسەکەشی لەئەستۆ دەگرت. ئەوکاتە خەڵکی هەژارو مردووی بێ کفن کەم نەبوون. حاجی هەر مانگێک لانیکەم خەرجی دوو مردووی لەئەستۆ دەگرت. جگە لەوە حاجی کاری خێری تریشی ئەنجام دەدا. بەشێکی زۆری خەرجی مەراسیمی قورئانخوێن و یادەکانی ئیمام حوسێنی لەئەستۆ دەگرت، بەڵام هەمان حاجی ئاوی ڕانەدەکێشا بۆ ماڵەکەی خۆی، دەیگوت با منداڵەکان بچن بەشان ئاو لە تەنکییەکە بهێنن، ماوەی دووریی تەنکییەکە تاکو ماڵیان دووسەد مەتر بوو، ماڵەکەیان کارەبای نەبوو، بە منداڵەکانی دەگوت کارەباتان بۆچییە؟ بەیانیان زوو بڕۆن بۆ کارکردن و شەوانە زوو بخەون، هەر ئەو پیاوەی کە ناسرابوو بە کەسێکی چرووک و پوولەکی دەیگوت: ئاغا ڕەزای پاسەوان کەسێکی ڕاستگۆ بووە، من ئەو دەناسم، باوکی ژنەکەشی هەر دەناسم و بڕی پێنجسەد تومەنیشی بۆدەدەم. پێنجسەد تومەنی ئەوکاتە، پارەیەکی یەکجار زۆر بوو، نرخی پێنجسەد تومەن لە ساڵی (١٣٤٣/١٩٦٤) نرخی سێ ملیۆن تومەنی ساڵی (١٣٩٣/٢٠١٤) زیاتر بوو. خەڵکی نزای تەمەن درێژییان بۆ دەکرد، حاجی گوتی: سبەی پێنجسەد تومەن دەدەمە دەستی محەمەد عەلی.

ئاغا شێخ جەواد، زاوای میرزا حوسێن تەقی، مەلای مزگەوتی گوندی (دەنو) بوو، ئەوکاتە (دەنو) گوندێک بوو لە کەناری جادەی کرمان. ئێستا بەشێکە لە یەزد. ماڵی ئاغا شێخ جەواد تاکو مزگەوتی (دەنو)، کە ئەو ئیمامی مزگەوتەکە بوو، حەوت کیلۆمەتر بوو، سەرەتا ئەو بە پاسکیل لە ماڵەوە دەچوو بۆ مزگەوت. ئەوکاتە ڕێگاکە قیرتاو نەبوو، کاتێک ئۆتۆمبێل بەخێرایی بە جادەکەدا تێدەپەڕی، تۆزو خۆل و وردەبەرد و وردەشووشەی ئەو ناوەی دەکرد بەسەریدا، لە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٤/١٩٦٥) ئاغا شێخ جەواد ماتۆڕێکی کڕی و هاتوچۆکەی زۆر ئاسانتر بوو. من کاتێک ئەوم ناسی تەمەنی نزیکەی (٣٥) ساڵ دەبوو. کوڕەکەی هاوتەمەنی من بوو. دایکم دەیگوت:

ئاغا شێخ بەمندالّی بەیانیان زوو دەچوو بۆ قوتابخانەی زانست بۆ خوێندن، دوایی دەگەڕایەوە بۆ مالّەوە خەریکی چنینی پارچە دەبوو، نیوەڕۆیانیش دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژی دەکرد، نانی نیوەڕۆی لە مالّەوە دەخوارد، کاتی عەسریش هەندێک کاری پارچە چنینی دەکردو دواتریش هەندێک لە کتێبەکانی دەخوێندەوەو کاتژمێرێک پێش خۆرئاوابوون سواری ماتۆڕەکەی دەبوو و دەچوو بۆ مزگەوت. ئاغا شێخ جەواد کاتێک زانیبووی کە ئاغا ڕەزای پاسەوان زیندانی کراوە، بەردەوام نزای خێری بۆ دەکرد. هەندێک لە خەلّکی ئەو گوندە ویستبوویان بچنە سەر دادگاو داوای لێبووردن بکەن بەلّکو ئاغا ڕەزا ئازاد بکرێت، بەلاّم ئاغا شێخ جەواد گوتی: منیش دەزانم ئاغا ڕەزای پاسەوان بێتاوانە، بەلاّم ئەو کارە ناکرێت، ئەگەر ئێوە دەتانەوێت هاوکاری ئاغا ڕەزا بکەن، وەرن هەمووتان پارە کۆبکەنەوە بۆ ئازادبوونی. خەلّکەکەش هەرکەس لەڕاست خۆیەوە بڕەپارەیەکیان دانا بڕی پارەکە (٣١٤٨) تومەن بوو، بەلاّم بەداخەوە ئاغا شێخ جەواد ناوی ئەو کەسانەی لە دەفتەرەکەدا تۆمار نەکردبوو کە پارەیان دابوو. ئاغا شێخ جەواد (٣١٤٨) تومەنی دابووە دەست مهری.

دوو کەسی ئاوازخوێن بەناوەکانی ئەکبەرو مەهدی مالّیان لە گەڕەکی پشت باخ بوو، ئەوان برابوون و دووانەش بوون. یەزدییەکان بە کەسانی دووانە دەلّێن (جومولی) بەشێوە زمانی یەزدی (مول) واتە گەردن، یان مل (جو) بە واتای جووت خەلّکی بە ئەوانیان دەگوت ئاخوندەکانی (جومولی)، ئەوانە دەچوون بۆ مزگەوت، بەلاّم پێشنوێژییان نەدەکرد، دەچوون لەسەر مینبەر دەوەستان و بە ئاوازێکی خۆش بەسەر مردووەکانیان هەلّدەدا. ئەوکاتە وەکو ئێستا نەبوو، ئاوازخوێنێک بیست ئەوەندەو پەنجا ئەوەندەی مەلایەک پارە وەربگرێت. ئاوازخوێن ئەوکات تایبەت بوو بە یادی ئیمام حوسێن. ئەو دوو ئاوازخوێنە بەیەکەوە هۆنراوەیان دەخوێندەوەو بە چەند هۆنراوەیەکیش تاریفی ئاغا ڕەزایان دەکرد، ئەوان لەدوای پیاهەلّدانەکانی ئیمام حوسێن. هۆنراوەکی تایبەتیان بەمجۆرە خوێندەوە. هەمیشە یەزیدییەکان بە شمشێرەوە نایەن، هەندێکجار کێشەکانیان بە قەلّەم و کاغەز چارەسەر دەکەن، هەمیشە مەئمونەکان بە زەهر داخ ناکەنە دلّی ڕەزا و شیعەکانەوە. ڕەزا لە دلّی شیعەکاندا دەرناچێت، هەر بە قەلّەم و کاغەز چارەسەر دەبێت، یاڕەزا یاڕەزا. خەلّکەکەش لەدوای ئەوانەوە دەیانگوت یاڕەزا یاڕەزا. زۆر کەس لە بابەتەکە تێگەیشتن، ئەوانی تریان تێگەیاند. لە کۆتایی مەراسیمەکەدا بڕی (٥٣٨٥)

تومەن و دوو ڕیاڵ کۆکرابووەوە. خودا لەو دوو ئاوازخوێنە خۆشبێت و ڕوحیان شادبێت. لە دەیەی (١٣٤٠/١٩٦٠)دا ئەو دوو ئاوازخوێنە لە هەر کۆڕێکدا (٢٠) ڕیاڵیان وەردەگرت، ڕۆژێکیان حاجی کازمی پێنج تومەن (٥٠) ڕیاڵی پێدابوون، ئەو دوو برایە گوتبوویان حاجی لێت تێکچووە کرێی ئێمە دوو تومەنە. حاجی گوتبووی دەزانم دوو تومەنە، بەڵام من پێنج تومەنم بۆ دانـاون. ئەوانیس گوتبوویان ئاوازخوێندنی پێنج تومەنی بۆ ئیمام حوسێن نییە، بەڵکو بۆ یەزیدی کوڕی معاویەیە، ئاوازخوێندنی پێنج تومەنی خێرو بەرەکەتی نییە، خەرجی ئێمە تەنها دوو تومەنە، حاجی تکات لێدەکەین ئێمە بێبەش مەکە لە خێری ئیمام حوسێن و باقی پارەکەیان پێدایەوە.

لە ساڵی (١٣٩٢/٢٠١٣) مهری ئەو دەفتەرەی نیشانی من دا، کە ناوی ئەو کەسانەی لەسەر تۆمارکرابوو و پارەیان دابوو بۆ ئازادکردنی ئاغا ڕەزا، ناوی هەموو ئەو کەسانەی یەکە بەیەکە نوسیبوو، بڕی پارەکەشیانی لە بەرامبەر ناوەکاندا نووسیبوو، ئیستا زۆرێک لەوکەسانە مردوون، ئەوانەشی کە زیندوون لە کۆتایی تەمەندان. بەشێک لەوکەسانە لەو سەردەمەدا زۆر هەژار بوون، پێنج تومەن، یان بیست تومەن بۆ ئەوان پارەیەکی زۆر بووە، تەنانەت هەندێکیان بەڕادەیەک دەستکورت بوون، نەیانتوانیوە لە هەفتەیەکدا یەک جار گۆشت بکڕن. سەکینەی بیبی ڕوباب کە (٥٥) ڕیاڵی دابوو هەردووک چاوی کوێر بوون، ئەو ماسورەی هەڵدەپێچاو لە مانگێکدا (٥٥) ڕیاڵی دەست دەکەوت، براکانیشی محەمەدو حوسێن هەریەکەو (١٠) تومەنیان دابوو. ئەوان کرێکاری کارگەی ئیقبال بوون و ڕۆژانە بە (٣٤) ڕیاڵ کاریان دەکرد، ئاغا تەقی پور چاودێری کرێکار بوو لە کارگەی ئیقبال سندووقێکی لەمل کردبوو پارەی کۆدەکردەوە، هەموو ئەو پارەیەی کۆی کردەوە نەگەیشتە (٣٠) تومەن. ژمارەی کرێکاران نزیکەی (٣٢٠) کەس دەبوون. یەکێک لە کرێکارەکان بە ئاغا تەقی پوری گوتبوو ئەمڕۆ (٢١)ی مانگەو پارەیان پێ نییە، پێویستە تۆ تاوەکو سەری مانگ چاوەڕێ بکەیت، یاخود بە ژمێریاری کارگە بڵێیت هەندێک پارەمان بەقەرز پێ بدات تاکو سەری مانگ. ئاغا تەقی پور قسەی لەگەڵ لێپرسراوی ژمێریاریدا کردبوو، سەرۆکی ژمێریاری بۆخۆی بیست تومەنی دابوو گوتبووی هەرکەسێک دەیەوێت پارە وەربگرێت، با سبەینێ بێت بۆ ژووری ژمێریاری. سبەینێ دەرگای ژووری ژمێریاری کرایەوە بڕی (٤٧٢٥٤) ڕیاڵ کۆکرایەوە، ئەوکاتە کرێکار پارەی نەقدیان وەردەگرت، هیچ کرێکارێک حیسابی بانقی نەبوو. من ناتوانم

ناوی هەموو کرێکارەکان لێرەدا بنووسم، ناوی (٣١٧)کرێکار جێگای زۆر دەگرێت.

یەک هەفتە مابوو ئاغا ڕەزا لە زیندان ئازادبکرێت، پارەی سزاکەی ئامادەکرابوو، ژنانی گەڕەکی ئێمە دەورێکی باشیان بینی لە کۆکردنەوەی ئەو برە پارەیەدا، هەندێک لەو ژنانە سەردانی پیاوە دەوڵەمەندەکانی گەڕەکیان کردبوو، هەندێکیان سەردانی یانەی پاڵەوانبازەکان و یانە وەرزشییەکانیان کردبوو. پاشان هەموو پارە کۆکراوەکەیان دابوو بە حاجی بوومان عەلی حەسەن تاکو ئەو بچێت لە دادگا پارەکە تەسلیم بکات. دوای تەسلیمکردنی پارەکە (٥٧٠) تومەن لەبری پارەی سزاکە زیاد کۆکرابۆوە، هیچ کەسێک لەوانەی پارەکەیان دابوو، ئامادە نەبوون پارەکەیان وەربگرنەوە، ژنەکان گوتبوویان هەرکاتێک ئاغا ڕەزا لە زیندان ئازاد بوو، مەڕێک لەبەر پێیدا سەردەبڕین و خواردن دەدەین بە هەژاران. ژنان دەستیان کردبوو بەشایی و هەڵپەڕکێ و دەفلێدان بۆ ئازادبوونی ئاغا ڕەزا، هەر ئەوەیان کرد کە بیبی هەلی گوتبووی.

لەو ماوەیەدا کە ئاغا ڕەزا لە زیندان بوو، بەڕێوەبەری پۆلیسی یەزد گۆڕابوو، وابزانم عەمید میرگوڵ بەڕێوەبەری پۆلیسی یەزد بوو، کێشەکەنی ئاغا ڕەزای پاسەوانیان پێگوتبوو. ئەفسەرو پۆلیسەکان پێیانڕاگەیاندبوو کەوا خەڵک دەیانەوێت پارە بۆ ئاغا ڕەزای پاسەوان کۆبکەنەوە، لە مەراسیمێکدا هۆنراوەیان خوێندۆتەوە، هاواریان کردووە یا ڕەزا یا ڕەزا، بۆیە پێویستە پێش بە ئاخوندەکان و ئەو خەڵکانە بگرین. بەڕێوەبەریش گوتبووی: بڕۆن دۆسیەی ئەو پاسەوانە بهێنن با ببینم. کاتێک دۆسیەکەیان بۆ هێنابوو، بەڕێوەبەر گوتبووی ئەوە چ هەڵەیەکە کردووتانە بەم هەموو کارە هەڵانەی ئێوەوە چۆن بتوانم بەر لە خەڵکی بگرم پارە کۆنەکەنەوە، ئێوە بوونە هۆی ئەوەی خەڵکی ئەوها بە یەکگرتوویی پارە کۆبکەنەوە. تازە کار لەکار ترازاوە ئەم پاسەوانە هەفتەیەکی تر لە زیندان ئازاد دەکرێت، واباشترە ئێمەش هاوکاری بکەین تا ئابڕووی بەڕێوبەرایەتی پۆلیسیش نەچووە؟ ئەویش بۆخۆی بری پێنج سەد تومەنی بۆ ئاغا ڕەزا ناردبوو بۆ زیندان.

سەرەنجام ئاغا ڕەزا لە بەرواری (١٧ئابانی ٨/١٣٤٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٤) لە زیندان ئازادکرا. محەمەد تەقی، قەسابی گەڕەک بوو، مەڕێکی لەبەر پێی ئاغاڕەزادا سەربڕی، ژنان لە ماڵی زینەت دەفیان لێدەداو هەڵدەپەڕین، پیاوانیش لە ماڵی محەمەد عەلی کۆبوونەوەو هەندێکیان خەریکی ئامادەکردنی خواردن بوون. گفتوگۆکانیان لەبارەی

نادادپەروەری دادگاو زیندانیکردنی ئاغارەزا بوو. بەگشتی ئەو خەڵکە نارەزاییان هەبوو بەرامبەر هەموو کارە نابەجێکانی پۆلیس و دادگاکان و کاربەدەستانی دەوڵەت. هەر ئەو نارەزاییانەی کە هێواش هێواش کۆدەبنەوە، دوای چواردە ساڵ ئەو نارەزاییە دڵۆپ دڵۆپانە بوون بە دەریاو حکومەت رووخاو دادپەروەریش کەوتە ژێر پرسیارەوەو متمانەش لەبەینچوو. ئەوەش دەریدەخات کە هیچ رژێمێک بە هێزی چەکدار تا سەر بەردەوام نابێت.

خۆراسان لانەی شاعیرانە، شاعیرێکی ئازادیخوازمان هەبوو، ئەو شاعیرە مامۆستای زانکۆش بوو. ستەمێکی زۆر لەو مامۆستایە کرا، ئەو کەسێکی لاواز و بێهێز بوو، بەڵام روحێکی بەهێزی هەبوو. هاوسەرێکی بەرێزی هەیە هەفتانە مەراسیمی ئایینی بۆ رێکدەخات. ئەو مامۆستا بەرێزە ساڵی (١٩٩٧/١٣٧٦) کۆچی دوایی کردووە. دیارە مەبەستم لە ئاغای حوسێنی ئەمینیە هاوسەری ئامینە خانی فازیلی، ئەو بەرێزە هۆنراوەیەکی هەیە لەبارەی دادپەروەرییەوە بەناوی زەنگ.

**وەک بیستوومە لە دەمی سەردەمی زوودا**
**شارێک دابی وەها بوو لە مێژو دا**
**گەر هەژارێک کۆچی دوایی بکردبا**
**زەنگوان دەبووایە یەک زەنگ لێ بدا**
**خۆ ئەگەر میرێک لە ناویاندا بمردبا**
**ئەفسوس دەبوایە سێ جاران زەنگ لێدرابا**
**ئەگەر کەسێک لەو بەینەدا کۆچی کردبا**
**دووجار زیاتر ئەو زەنگەیان لێ نەدەدرا**

## ئاغا رەزا لە تاران

ئاغا رەزا بێکاربوو، چەند رۆژێک لەماڵەوە پشووی دا، بریاربوو بچێت بۆ دووکانی براکەی و لەوێ هاوکاری ئەو بکات، دەبووایە سەوزە و میوە بفرۆشێت، بەڵام ئەو حەزی بەو جۆرە کارکردنە نەبوو، دەبووایە رۆژانە چەند کاتژمێرێک لە دووکانەکەدا بمێنێتەوەو کاربکات، رۆژانە لە بەیانی زووەوە تا درەنگانی شەو لە دووکانەکەدا دەمایەوە، تەواو شەکەت دەبوو. ئەو بۆ خۆی دەیگوت: دەزانم لەم کێشەیەدا پەندێک هەیەو لەو پەندەشدا نیعمەتێک هەیە، بەڵام کام پەندو کام نیعمەت، درەنگانی شەو

شەکەت و ماندوو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، مهریش هەوڵیدەدا دڵخۆشی بداتەوە.

ڕۆژێک ئاغا ڕەزا لە دووکانەکەدا خەریکی سەوزە فرۆشتن بوو، سەیریکرد وا ئاغای حەیات داودی بە شەقامەکەدا دەڕوات، ئاغا ڕەزاش بەخێرایی ڕۆیشت بۆ لای ئاغای حەیات داودی، کە قازییەکی بەڕێزو دروستکار بوو، ئەو کارەکەی لە یەزدەوە گواستبووەوە بۆ شاری (بابەک). ئاغای داودی لە ئاغا ڕەزای پرسی کە چ کارێک دەکات؟ ئاغا ڕەزاش دووکانی براکەی نیشانداو گوتی: لەو دووکانەدا کاردەکەم. ئاغای داودی بە ئاغا ڕەزای گوت: ئێستا من گواستراومەتەوە بۆ تاران، ئەو قازییە بەڕێزە گوتی: داواکاری پێشکەشکردووە لە زانکۆی تاران بخوێنێت بۆ وەرگرتنی دکتۆرا لە بواری مافدا، هەربۆیەش وەزارەتی داد مۆڵەتیان داوە کە کارەکەی بگوازێتەوە بۆ تاران. ئەو گوتی: گواستنەوەکەی لە شاری بابەکەوە بۆ تاران تەنها بەهۆی ئەوەوە بووە کە لە زانکۆی تاران وەرگیراوەتەوە بۆ خوێندن. ئەو کە دەیزانی ئاغا ڕەزا بە بێتاوان خراوەتە زیندانەوە، پێیگوت: شاگردی دووکان و سەوزەفرۆشی بەکەڵکی تۆ نایەت، پێویستە تۆ بچیت بخوێنیت، تۆ پاسەوانێکی سێ خەت بوویت، چەند خزمەتت هەبوو، کەچی واش تۆیان کردە زیندانەوە، ئەگەر تۆ ئەفسەر بوویتایە وا بە ئاسانی نەیاندەتوانی دۆسیەی تاوانباریت بۆ بکەنەوەو بتخەنە کونجی زیندانەوە، خۆ ئەگەر تۆ خوێندنت تەواو بکردایە، شێوازی زیندانیکردنەکەت بەجۆرێکیتر دەبوو، ئەوکات تۆ شارەزاییەکت دەبوو ڕاستەوخۆ نامەت نەدەنارد بۆ دادگا. ئاغای داودی بە ئاغا ڕەزای گوت: چونکە تۆ هەژاریت و هیچ سەرمایەیەکت نییە، بۆیە پێویستە بخوێنیت، حەیفە تۆ لەم دووکانەدا سەوزە بفرۆشیت. ئاغا ڕەزا گوتی: من تەمەنم وا بوو بە (٣٢) ساڵ چۆن بتوانم لەم تەمەنەدا بخوێنم. قازی بەڕێز گوتی: من تەمەنم (٣٦) ساڵ دەبێت خێزان و سێ منداڵیشم هەیە. وا دەچم بۆ تاران و لەوێ دەخوێنم، تۆ کەسێکی ڕاستگۆیت، ئەگەر بخوێنیت کارێکی باشت دەستدەکەوێت، ئاغا ڕەزا لە ساڵی (١٣٣١/١٩٥٢) وازی لەخوێندن هێنابوو، لە ساڵی (١٣٣٣/١٩٥٤) ببوو بە پاسەوان.

ناوەڕاستی مانگی (دەی) بوو ئاغا ڕەزا بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، مهری کە سەیری ڕەنگ و ڕووی کرد، گوتی: ئەمشەو خۆشحاڵیت. ئاغا ڕەزا باسی بینینی قازی داودی کردو بەسەرهاتەکەی ئەو ڕۆژەی بەتەواوی بۆ گێڕایەوە. گوتی: خودا لێیخۆش بێت نەنە شەهربانووش هەمیشە دەیگوت تۆ پێویستە بخوێنیت، بۆ

ئەوەی پلەو پایەت بەرزبێت. ئاغا ڕەزا گوتی: بڕیارم داوە کە بخوێنم و داوا لە تۆش دەکەم کە هاوکارم بیت. مهریش گوتی: خۆشحاڵ دەبێت ئەگەر ئەو بخوێنێت و بەهەموو توانایەکیشییەوە هاوکاری دەبێت، مهری بۆ خۆشی لە ئامادەیی بەشی زانستی خوێندبووی و لەدوایین ساڵدا وازی لە خوێندن هێنابوو، دبلۆمی وەرنەگرتبوو. مهری بە ئاغا ڕەزای گوت: واباشترە تۆ بچیت بۆ بەشی ئەدەبی. ڕۆژی دواتر کاتی عەسر مهری و ئاغا ڕەزا ڕۆیشتن بۆ کتێبخانەی ئاغا جەوادیان لە سەرەتای شەقامی ئیمام خومەینی (پەهلەوی کۆن). ئاغای جەوادیان کاتێک زانی ئاغا ڕەزا دەیەوێت بخوێنێت، هەموو کتێبەکانی بەشی ئەدەبی بەبێ پارە پێداو لەو ڕۆژەوە ئاغا ڕەزا دەستیکرد بە خوێندنی کتێب و نووسین، مهریش هاوکاری دەکرد.

هەرچەند ژیانی ئاغا ڕەزا سەختتر دەبوو، بەڵام ئەو زیاتر هەوڵی خوێندنی دەدا، شەوانە تا درەنگ خەریکی خوێندن بوو، مهریش وەک مامۆستایەکی دڵسۆز وانەی پێدەگوت و هاوکاریدەکرد. هەرچەندە خۆشی خەریکی خوێندن بوو لە وانەی عەرەبیدا کێشەی هەبوو. بڕیاریدا بۆ وانەی عەرەبی مامۆستایەک پەیدا بکات. ئەوکاتە پۆلەکانی خوێندن وەک ئێستا نەبوون، مامۆستای تایبەت هەر نەبوو، خۆ ئەگەر هەبووبێت، زۆر کەم بوو. ئاغا ڕەزا بۆ گرتنی مامۆستا لەگەڵ چەند کەسێکدا قسەی کرد، کەسێکیان بەناوی محەمەد کەیانی بەو ناساند. محەمەد کەیانی مامۆستایەکی بەناوبانگ بوو. ئاغا ڕەزا چوو سەردانی کردو قسەی لەگەڵدا کرد. ئاغای کەیانی بڕیاریدا کە هەفتەی چوار کاتژمێر وانە بە ئاغا ڕەزا بڵێتەوە. ئاغا ڕەزا لێیپرسی، بۆ هەر کاتژمێرێک چەندی پارە لێوەردەگرێت. ئاغای کەیانی گوتبووی: وانەگوتنەوە بە هەرکەسێک بە ئەرکی خۆی دەزانێت و هیچ پارەیەک وەرناگرێت. ئاغا ڕەزا چەندجارێک ڕۆیشت بۆ کتێبخانەی شەرەفەدین عەلی، لەوێ ئاغای کەیانی وانەی پێدەگوتەوە، کتێبخانەکە بۆ وانەگوتنەوە شوێنێکی شیاو بوو. ڕۆژێکیان ئاغا ڕەزا ئاغای کەیانی بۆ نانخواردنی بانگێشتی ماڵی خۆیان کرد. ئاغای کەیانیش بە خۆشحاڵییەوە قبوڵی کردو ڕۆیشت بۆ ماڵیان، کاتێک زانی مهری نەوەی شەهربانووە، گوتی: بەمنداڵی خوێندکاری شەهربانوو بووە. ئەو زۆر باسی شەهربانووی کردو گوتی: لە ساڵی (١٣١٦-١٩٣٧/١٣٢١-١٩٤٢) تەنها لەگەڵ سێ کەسی تردا لەلای شەهربانوو وانەیان خوێندووە. لەو ساڵانەدا شەهربانوو وانەی بە ژمارەیەکی کەم دەگوتەوە. ئاغای کەیانی گوتی: لە زانکۆی تاران بەکالۆریۆسی لە

ئەدەبیاتی فارسیدا وەرگرتووەو لە سەردەمی خوێندکاریدا ئەگەر کێشەی بۆ دروست ببووایە لە وانەکانیدا، بەتایبەت لە بابەت هۆنراوەی عیرفانیدا، سەردانی شەهربانووی دەکرد. ئاغای کەیانی بەردەوامبوو لە قسەکانی و گوتی: هەندێک لە پرسیارەکان کە مامۆستایانی زانکۆ بەباشی سەریان لێدەرنەدەکرد، شەهربانوو زۆر بەئاسانی وەڵامی دەدانەوە. ئاغای کەیانی دەیگوت: شەهربانوو تەواوی هۆنراوەکانی سەنایی، عەتار، مەسنەوی، دیوانی شەمس، حافز، عەراقی و شێخ مەحمودی شەبستەری لەبەربوۆوە، جگەلەوەش هەموو ئایەت و سورەتەکانی قورئانی لەبەربوو و لەبەر دەیخوێندنەوە. ئەو مامۆستا بەڕێزە زۆر لە ئاکارەکانی ئاغا ڕەزاو مهری ڕازیبوو. ئاغای کەیانی دەیگوت: زۆر هەوڵم دا تاکو ئاغا ڕەزا لە تاقیکردنەوەی دەرەکیدا بەشداریی بکات. ئەوە بوو بەشداریکردو لە ئامادەیی وەرگیرا.

مهریش بڕیاری دابوو دبلۆم وەربگرێت. خانم (عیسمەتی نەشات) بەڕێوەبەری ئامادەیی کچان بوو، مهری سەردانی کردو داوای لێکرد هاوکاری بکات بۆ وەرگرتنی دبلۆم و کارئاسانی بۆ بکات تاکو بەشداربێت لە تاقیکردنەوەی دەرەکیدا. خانم نەشات کاتێک زانی مهری دەیەوێت بچێتەوە بەرخوێندن، زۆری هاندا کە بەردەوام بێت، چەند مامۆستایەکی بەڕێزیشی بە مهری ناساند، ئەوانیش بەڵێنیان دا کە ببنە هاوکاری و کێشەکانی بۆ چارەسەر بکەن. ئەوکات هێشتا پەیوەندی نێوان مامۆستاو خوێندکار نەببوو بە پارە، هیچ مامۆستایەک باسی لە وەرگرتنی پارەو دیاری نەدەکرد، کۆمەڵگاکەمان وەکو ئێستا نەببووە کۆمەڵگای پوولەکی. مهری زۆر بە هاندانەکانی خانم نەشات و مامۆستاکانی تر خۆشحاڵ بوو، ئەو لە خۆشیاندا لەڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە بەجۆرێک دەڕۆیشت وەک باڵی لێڕوابێت وابوو، لەخۆشحاڵیدا وەک سەردەمی منداڵی و تەمەنی (٧-٨) ساڵ بەکۆڵاندا ڕایدەکردو گۆشەیەکی عەباکەی هەڵدابووەوەو با دەیلەراندەوە. چەند ژنێکی گەڕەک پێیان سەیربوو کە بەوشێوەیە مهرییان بینی. هەواڵەکە لە گەڕەکدا بڵاوبووەوەو دەیانگوت مهری ژنی ئاغا ڕەزا هەروەکو منداڵێکی تەمەن (٦-٧) ساڵ بەکۆڵاندا ڕایدەکردو لچکی عەباکەی بەدەم باوە دەشەکایەوە. لەوکاتەوە مهری ئاغا ڕەزای لە هەموو کاتێک زیاتر خۆشدەویست، هاوسەرەکەی هەم پیاوێکی ڕاستگۆ بوو، هەم مۆڵەتی پێدابوو کە وانەکانی بخوێنێت، لەوکاتەدا شادی و خۆشییەکانی مهری بێڕادە بوو.

کاتی ئێوارە مهری ڕۆیشت بۆ ماڵی باوکی، باوکی تازە لەسەر کار گەڕابووەوە، بەتەنها لە ماڵەوە بوو، دایک و هاوسەرەکەی مردبوون، ماڵەکەی کپ و بێدەنگ بوو، خۆ دیارە ئەکرەمەو منداڵەکانی لەویَ بوون. ڕۆژانە کچەکانی و نەوەکانی سەردانیان دەکرد. ئەکرەمە خواردنی بۆ باوکی دروست دەکرد، بەڵام محەمەد عەلی تەنها بوو، هەستی بە تەنهایی دەکرد. محەمەد عەلی دەیگوت: هیچ کەسێک ناتوانێت شوێنی ژن بگرێتەوە، هەرکاتێک چاوی بە منداڵەکانی دەکەوت، دەیگوت: خۆزگە ئێستا دایکتان زیندوو بووایەو لەجارانیش زیاتر هاواری بەسەردا بکردینایە. مهری بەخۆشییەوە چووە ژوورەوە، باوکی کاتێک کچەکەی بەخۆشحاڵییەوە بینی، ئەویش خۆشحاڵ بوو. ئەو لە نێو باخەکەو لە کەناری حەوزە ئاوەکە دانیشتبوو، سەیری دەرگای حەوشەکەی دەکرد تاکو کچەکانی و نەوەکانی دەرکەون. ئەو کاتێک کچەکەی بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە بینی، پێی سەیربوو. دواتر بە مهری گوت: ئەمڕۆ زۆر خۆشحاڵیت وامزانی دووگیان بوویت. خۆم بۆ هەواڵی منداڵبوونت ئامادە کردبوو. مهری بەخۆشییەوە بە باوکی گوت: باوکە بڕیارم داوە بخوێنم و دبلۆم وەربگرم. باوکی کچەکەی ماچکردو گوتی: وەسێتی دایکمە، هەرچۆنێک بێت دەبێت بخوێنیت و بەردەوام بیت لە خوێندن.

مهری بە هاوکاری و ڕێنمایی خانم نەشات لە (خوردادی ١٣٤٤/حوزەیرانی ١٩٦٥) دبلۆمی وەرگرت. مامۆستاکان زۆر هاوکارییان کرد بە وانە پێگوتنەوەی. کاتێک دبلۆمی وەرگرت، خانم نەشات و چەند مامۆستایەک فەرهەنگێکی زمانی ئینگلیزییان بەدیاری پێبەخشی. مهری دبلۆمی وەرگرتبوو، خانم نەشات لێی پرسی بەرنامەت چییە بۆ ئایندە؟ مهری گوتی: لەگەڵ هاوسەرەکەمدا بڕیارمانداوە لەهەوڵدابین تاکو لە زانکۆ وەردەگیرێین، ئەو مامۆستا بەڕێزە مهری لەئامێز گرت و ماچیکرد. لەو سەردەمەدا هیچ دامەزراوەیەکی فێرکاریی لە یەزد نەبوو، بۆ بەردەوامبوون لە خوێندن دەبووایە بچیت بۆ یەکێک لە شارەکانی تاران، مەشهەد، ئەسفەهان، تەورێز، ئەهواز یان شیراز. لەو سەردەمەدا لە هیچ شارێکی تری ئێراندا زانکۆ نەبوو.

مهری هاوکارییەکی زۆری ئاغا ڕەزای دەکرد تا ئەویش بەزوویی دبلۆم وەربگرێت. ئاغا ڕەزا وازی لە کاری سەوزە فرۆشی هێنابوو، پیشەی چنینی ڕەچاوکردبوو، ئەوان هەشت دەزگای چنینیان لەکاردا بوو، هەر لە کڕینی دەزوو ئاوریشم و ڕستن و بردنە بازاڕ و فرۆشتن هەموو کارەکان خۆیان ئەنجامیان دەدا. ئاغا ڕەزا لە کاری چنیندا

هاوکاری چەند دراوسێیەکیشی دەکرد، مهریش بەردەوام بوو لە کاری بەرگدروون، بەڵام بەهۆی خوێندنەکەیەوە کەمتر دەیپەرژایە سەر کاری دروومان. هەوڵیدەدا پارە لە خەڵکە هەژارەکەی گەڕەک وەرنەگرێت، بەڵام خەڵکەکە بەوە ڕازی نەدەبوون. ژن و مێرد ویستیان بڕۆن داواکاری پێشکەش بکەن بەڵکو لە زانکۆ وەربگیرێن، بەڵام پارەیان نەبوو، نیگەرانی خەرجی بوون. ئاغا ڕەزاش لەساڵی (١٩٦٦/١٣٤٥) دبلۆمی وەرگرت، لە خۆشحاڵیدا هەردووکیان ئاهەنگیان سازکردو چەند پیاڵە شەرابێکیان بەیەکەوە خواردەوەو نوێژیان کردو زۆر سوپاسی خودایان کرد، خەڵکانی ئێمە هەمیشە دووکاری دژ بەیەک دەکەن، هەم مەی دەخۆنەوە، هەم نوێژیش دەکەن.

مهری بە هاوسەرەکەی گوت: نیگەرانی خەرجی خوێندنە، چونکە ناچارن لە تاران خانوو بەکرێ بگرن. بۆیە داوای لە هاوسەرەکەی کرد ئەو بەتەنها بچێت بۆ تاران و لەوێ بخوێنێت. ئاغا ڕەزا گوتی: لە کوێ دیارە من لە زانکۆ وەردەگیرێم؟ لە ئێستا بەدواوە من تۆ بەتەنها جێناهێڵم، هەتاکو بمێنم نامەوێت لەتۆ دووربکەومەوە، پارەی خەرجیمان بۆ پەیدا دەبێت، خودا گەورەیەو خودا نائومێدمان ناکات. بە گوتەی شەهربانوو لەهەر کێشەیەکدا پەندێک هەیەو لە هەر پەندێکدا نیعمەتێک هەیە، خۆ ئەگەر من تووشی ئەم کێشەیە نەبوومایە، هەرگیز بیرم لە خوێندن نەدەکردەوەو هەر بە پاسەوانی دەمامەوە، ئەوەتا ئێستا هەردووکمان دبلۆممان وەرگرتووە.

سەرەنجام هەردووکیان بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ تاران و چوونە ماڵی جەعفەر ئاغای کوڕی مامی ئاغا ڕەزا. هەردووکیان داواکارییان پێشکەشکردو دوای چەند مانگێک ناویان لە ڕۆژنامەی ئیتلاعات بڵاوکرایەوە. ئاغا ڕەزا لە بەشی ماف و مهریش لە بەشی زیندەوەرزانی وەرگیران، هەردووکیان خۆیان حەزیان لەو دوو بەشە دەکرد.

محەمەد عەلی بەبیستنی هەواڵی وەرگیرانی کچ و زاواکەی لە زانکۆ زۆر خۆشحاڵبوو، لەدوای مردنی ڕوقیەی هاوسەری هیچ کەسێک ئەوی ئەوەندە بە خۆشحاڵی نەبینیبوو. هەر بەوبۆنەیەوە هەموو خزم و کەسەکانی خۆی بە ژن و منداڵەوە بانگێشتی ماڵی خۆیان کرد، چەند کەسێکیشی لە دراوسێکان بانگکرد بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، خواردنێکی باشی بۆ ئامادەکردبوون.

لەو سەردەمەدا میوانداری و بانگێشتکردن وەکو ئێستا نەبوو، ئەگەر ماڵێک بانگێشت بکرانایە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، لە کاتژمێر (٨)ی بەیانی ژنان بەمەبەستی

هاوکاریکردنی خاوەن ماڵ لە چێشتلێنان و خواردن ئامادەکردندا دەچوون بۆ ماڵەکە، بەڵام میوانداریی ئێستا تەنها بۆ نانخواردنەو هیچی تر، کاتژمێر یەک، یان دوو دەچن بۆ ماڵەکەو نانەکەیان دەخۆن و دەگەڕێنەوە. خۆ میوانداریتی لە ڕێستۆرانتەکاندا لەوەش خراپترە. لە تەواوی دنیادا کاتێک چەند کەسێک بانگێشت دەکرێن بۆ نانخواردن و میوانداری، بەڵام میوانداریەکەیان لە ڕێستۆرانتەکاندا ئەنجامدەدەن، ئەوا تەواوی ڕۆژەکە ئەو مێزەی بۆ ئەوان گیراوەو مێزەکە تایبەت دەبێت بە ئەوان، هەمووان بەیەکەوە دادەنیشن و قسە دەکەن، چوار کاتژمێر دەخۆن و وتوویژ دەکەن، لەنێو خۆیاندا لێکۆڵینەوەی زانستی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، هونەری، وەرزشی دەکەن، نوکتە دەگێڕنەوەو بەیەکەوە پێدەکەنن، ئاگاداری خۆشی و ناخۆشی یەکتری دەبن، هاوکاری یەکتری دەکەن، دوای کاتژمێرێک ئینجا ڕێستۆرانتەکە جێدەهێڵن. ساڵی (٢٠١١/١٣٩٠) لە کابوڵ بووم، هاوڕێی خۆشەویستم دکتۆر عەبدولغەفوری ئارەزوو (سەفیری ئەفغانستان لە تاجیکستان ساڵی ٢٠١٣/١٣٩٢) میوانداری لێکردم لە ڕێستۆرانتێک لەگەڵ هاوڕێیان دکتۆر حەسەنی عەبدوڵلا (وەزیری شارەوانیی ئەفغانستان لە ساڵی (٢٠١٣/١٣٩٢)، جەنەڕاڵ محەمەد عەزیمی، ئەحمەد زیائی ڕەفعەت و چەند کەسێکی تر، بەمانای ڕاستەقینە ڕێستۆرانتێکی کۆنی گەورەی تایبەتم بینی، دوو کاتژمێر پێش نانخواردنی نیوەڕۆ گەیشتن، سەرەتا بە میوەو چایی و شیرینی پێشوازییان لێکردین. هاوڕێیان بەنۆرە دەستیانکرد بە خوێندنەوەی هۆنراوەو هەواڵپرسینی یەکتری، من ڕێستۆرانتی لەو جۆرەم لە تارانیش نەبینیوە. دوای چەند ڕۆژێکی تر دکتۆر حەسەن عەبدوڵلا لە ڕێستۆرانتێکی تر میوانداریی لێکردین، لەوێش هەمان ڕێوڕەسممان لەبەرچاو گرت.

بگەڕێینەوە سەر یادەوەریی مهری. مهری ڕۆیشت بۆ بازاڕ بۆ وەرگرتنی ئەو پارەیەی کە لای دووکانارەکان هەیبوو لەگەڵ دانەوەی ئەو قەرزەی کە لەلای بوو. دوای لێکدانەوەی حساباتەکانی ئەو پارەیەی کە بۆی مایەوە بریتی بوو لە (٣٥٧٠) تومەن. ئاغا حەبیبی نیکۆکار دەزگاکانی بە ئیجارە لێوەرگرتبوو بۆ ماوەی ساڵێک بەنرخی هەر مانگێک بە (٢٢٠) تومەن، کە ئەوەش پارەیەکی باشبوو بۆ ئەوان. مهری بڕیاری دابوو خانووەکەشیان بدات بەکرێ، ئیتر ئەوەبوو خانووەکەشی دا بەکرێ بۆ ماوەی یەک ساڵ و مانگانە بە نرخی (٩٠) تومەن. ئەو کەلوپەلە زیادانەی کە هەیانبوو هەموویان پێچایەوەو بردیانە ژێرزەمینەکە دایاننا، کتێبەکانیشان بردە ئەو ژوورەی کە

بۆ شەهربانوو تەرخانکرابوون. بڕیار وابوو ئاغا ڕەزا بڕوات بۆ تاران و خانوویەک بەکرێ بگرێت، دواتر مهری کەلوپەلەکان بەرێت و بڕوات بۆ تاران.

ئاغا ڕەزا بەژێر قورئانە ئاوێنییەکەدا تێپەڕی، هەموو خزم و کەسەکانی و خەڵکی گەڕەک لەوێ ئامادەبیان هەبوو، دایکی ماوەیەک قورئانەکەی لەسەر سەری ڕاگرت، دوو خوشکی ئاغا ڕەزا نزایان دەکرد، براکەشی پێیگوت: هیچ خەم مەخۆ، محەمەد عەلیش چەند پاکەتێک شیرینی هێنابوو، عەبدوڵڵای ئاتەشگەر پەنجا تومەن پارەی خستە نێو گیرفانی ئاغا ڕەزاوە، پەنجا تومەنی ئەوکاتە پارەیەکی زۆر بوو، دەتوانرا بە پەنجا تمەن دە کیلۆ گۆشت بکڕیت.

لە بەرواری (٢٢/٢/١٣٩٢-١٢/٥/٢٠١٣) سواری تەکسی ببووم، تاکسییەکە لە ترافیک لایتی چوار ڕێیانی جانبازانی مەشهەد وەستابوو، سواڵکەرێک داوای پارەی لە ئۆتۆمبێلەکەی تەنیشت ئێمەوە دەکرد، چاوم لێبوو شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە دووسەد تومەنیەکی پێدا. سواڵکەرەکە پارەکەی لێوەرگرت و فڕێیدایە سەر شەقامەکەو ڕۆیشت بۆلای ئۆتۆمبێلی دواتر. شۆفێری ئەو تەکسییەی من سواری ببووم گوتی: بەڕاستی کەسێکی بێڕەوشتە. من وامزانی بە سواڵکەرەکەی گوت. شۆفێرەکە گوتی: ئاخر دووسەد تومەن پارەیە بیدەیتە سواڵکەر؟ منیش گوتم: ئەوە خێرە، سواڵکەرەکە نەدەبووایە پارەکە فڕێبدات. شۆفێرەکە گوتی: سواڵکەرەکە کارێکی باشی کرد، ئەگەر من بوومایە پارەکەم دەدا بەدەموچاویدا. لێرەدا بۆم دەرکەوت بەهۆی پارەوە ئابووری و ئەخلاقی وڵات چی بەسەردێت. خەرجی من لە مانگی (مهری ١٣٤٦/تشرینی یەکەمی/١٩٦٧) لە مەشهەد( ١٢٥)تومەن بوو، کرێی خانووەکەشم سی تومەن بوو. کەچی ساڵی (١٣٩٢/٢٠١٣) سواڵکەرێک دووسەد تومەن فڕێدەداتە سەر شەقامەکە.

ژنخوشکەکانی ئاغا ڕەزا بە خۆیان و بە منداڵەکانیانەوە ئامادەی بەڕێکردنی ئاغا ڕەزا بوون. ئاغا حوسێنی ئینتیزاری گوتی: سەڵاوات لێبدەن، چەندکەسێک لە ماڵەوە مانەوە تاکو خواردنێک بۆ سەلامەتی ئاغا ڕەزا ئامادە بکەن. چەندکەسێکیش لەگەڵ ئاغا ڕەزادا ڕۆیشتن بۆ بەڕێکردنی. کاتی ئێوارە بەڕێکەرانی ئاغا ڕەزا گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، دووبارە دەستکرایەوە بە دەف لێدان و هەڵپەڕکێ. پیاوان لە ماڵی عەبدوڵڵای ئاتەشگەر دانیشتبوون، خەریکی نانخواردن بوون، باسی کارو ڕەوتی بازاڕیان دەکرد. مهریش نیگەرانی هاوسەرەکەی بوو بەردەوام لەبیری ئەودا بوو، دەیگوت: دەبێت لە تاران

چی بکات. دەبێت خانووی دەستبکەوێت، ئەی خەرجییەکانی چۆن دەربهێنێت، بەڵام لەهەمانکاتیشدا دڵخۆش و شاد بوو. ئەوان هەردووکیان دوو کەسی لەشساغ بوون، هەردووکیان دبلۆمیان وەرگرتبوو. لە سەردەمێکدا کە لە هەموو وڵاتی ئێراندا تەنها نۆ زانکۆ لە شەش شاردا هەبوون، وەرگیرانی کەسێک لە زانکۆ هەروا ئاسان نەبوو، خوێندکارانی زانکۆ ڕێزێکی تایبەتیان هەبوو، مامۆستایانی زانکۆ ڕێزیان لە وەزیر کەمتر نەبوو. ئەو ژنانەی دەچوون بۆ زانکۆ، ژمارەیان زۆر کەم بوو. ئاغا ڕەزا سێیەم پیاوی گەڕەکی ئێمە بوو کە چوو بۆ زانکۆ. یەکەمین کوڕی گەڕەکی ئێمە کە چوو بۆ زانکۆ ڕەزا موشتاقیون بوو، کوڕی سەید حەسەنی عەتار بوو، ئەوەبوو لە تاران کوژرا. لە گەڕەکی ئێمە خوێندکاری زانکۆ یەکسان بوو بە کوشتن، دیارە مهری یەکەمین ژنی گەڕەکی ئێمە بوو کە چووە زانکۆی تاران.

دوای چەند ڕۆژێک ئاغا ڕەزا لە تارانەوە نامەیەکی نارد، لە نامەکەیدا نووسیبووی خانووی بەکرێ گرتووەو چاوەڕوانی مهری دەکات. هەرچی ژنی گەڕەک بوو بۆ خوداحافیزی لەگەڵ مهریدا چوون بۆ گەراج، لەکاتی خوداحافیزیدا ئەوەندەیان مهری ماچکردبوو، دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، لەکاتی ڕۆیشتن مهری عەبای بەخۆیدا نەدابوو، سەرپۆشیشی بەسەریدا نەدابوو، جوتێک پێڵاوی تازەی لەپێکردبوو، گۆرەوی سپی درێژی لەپێکردبوو. مهری یەکەمین ژنی گەڕەک بوو بەوجۆرە جلوبەرگەوە دەربکەوێت. ژنان تانەیان لێدەداو دەیانگوت مهری نەدەبووایە ئەو جۆرە جلوبەرگە بپۆشێت، بەتایبەت کە ئەو لەکاتی گەشتکردندایەو هاوسەرەکەشی لەگەڵدا نییە، بەڵام ئەفسەری کچی سەکینەی تەرزجانی لە مهری پرسیبوو، ئەو گۆرەوییە جوانانەی لەکوێ کڕیوە؟ ئەویش پێیگوتبوو لە دووکانی گۆرەوی فرۆشەکە، چەند ڕۆژ لەوەدوا ئەفسەر لەلایەن دایکییەوە تێهەڵدانێکی باشی خوارد. کە بۆچی لە گەڕەکدا گۆرەوی سپی لەپێکردووە، ئەفسەر هاوسەری هەبوو، بەڵام لەلایەن دایکییەوە تێهەڵدانی خوارد.

ئاغا ڕەزا خانوویەکی لە نزیک پێچی شەمێران ئیجارە کردبوو، دەیتوانی بەیەکجار سواربوونی پاس بگاتە زانکۆی تاران. کوڕی مامەکەی زۆر هاوکاری ئاغا ڕەزای کردبوو، تاکو بتوانێت خانوویەکی باش بەکرێ بگرێت، ئەو خانووەی بە کرێی مانگانەی (١٠٥) تومەن گرتبوو. خانووی دراوسێکەیان خانوویەکی سێ قاتی تازەبوو. مهری بە هاوسەرەکەی گوت: خۆزگە لە جێگایەکی هەرزانتر خانووت بگرتایە. ئاغا ڕەزا

گوتی: خودا گەورەیە لێرە کارێکی باش پەیدا دەکەم، ئەوان لەگەڵ خۆیاندا فەرش و لێفەو سەرین و مەنجەڵیان لە یەزدەوە هێنابوو، هەندێک شتی سادەی ناوماڵیان کڕی. خاوەنماڵەکەشیان تورک بوو، خەڵکی ئازربایجان بوو، کەسێکی ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین بوو، هاوسەرێکی بەڕێزو میهرەبانی هەبوو. ئەو ماڵە یەکەم شەو ئاغا ڕەزاو مهرییان بۆ نانخواردن بانگێشتی ماڵی خۆیان کرد. مهری لە هەموو تەمەنیدا لەگەڵ هیچ ماڵە ئازەرییەک تێکەڵاو نەببوو، یەکەمین جاری بوو کە گوێبیستی زمانی تورکی بێت. لەو سەردەمەدا هاوژیانی ئایینی و مەزهەبی لەیەزد زۆربوو، بەڵام گرووپی نەتەوەیی کەم بوو، هەموو مەزهەبەکان لە موسڵمان و شیعەو سوننە، یەهودی و زەردەشتی بە زمانی فارسی قسەیان دەکرد. ئاغا ڕەزا تەنها یەک ئەفسەری ئازەری دەناسی، کە ئەویش هاتبوو بۆ یەزد، ئەو ئەفسەرەش کەسێکی بەڕێزو خۆشەویست بوو. لەو سەردەمەدا تێکەڵاویی نەتەوەکان لە وڵاتدا کەم بوو. لە ساڵی (١٩٦٢/١٣٤١) تەنها لە نێوان دوو شاردا ئۆتۆمبێل ڕاستەوخۆ هاتوچۆی دەکرد، ئەویش هەردوو شاری تاران و مەشهەد بوون، بەڵام ئێستا ساڵی (٢٠١٥/١٣٩٤) لە یەزدەوە بۆ هەموو شارەکانی ئێران ڕاستەوخۆ پاس هەیە.

خاوەنماڵەکەیان سێ منداڵی بچووکیان هەبوو، کرێچی قاتی سێیەم تورکێکی ئەرمەنی بوو، ئەوانیش ماڵێکی بەڕێزو خۆشەویست بوون، خەڵکی ئورومیە بوون و ماڵیان هاتبوو بۆ تاران، پیاوەکە کاری میکانیکی دەکرد، ژنەکەش لە ماڵەوە شیرینی دروست دەکرد. مهری تەمەنی (٢٤) ساڵ بوو، ئاغا ڕەزاش تەمەنی (٣٤) ساڵ بوو، بەیانیان زوو بەیەکەوە دەڕۆیشتن بۆ زانکۆ. مهری دەڕۆیشت بۆ کۆلێژی زانست و ئاغا ڕەزاش بۆ کۆلێژی ماف. مهری بە جلوبەرگێکی سادەو بە مانتۆوە دەچوو بۆ کۆلێژ، تەنها لەچکێکی لەسەری دەبەست و جلوبەرگی داپۆشراو (محەجەبە)ی لەبەر نەدەکرد. ئاغا ڕەزا بەدوای کاردا دەگەڕا. لە چەند شوێنێک کاری شەوانەی دەستکەوت، بەڵام مهری ڕێگریی لێدەکرد کە بچێت بۆ ئەو کارانەو وانەکانیشیان زۆربوون. مهری بە هاوسەرەکەی گوت: هیچ خەم مەخۆ ئێستا ئێمە ئەوەندەمان پارە هەیە کە بەشی ئەمساڵمان بکات، بۆ ساڵەکانی تریش خودا گەورەیەو پەکمان ناکەوێت. دوای چەند هەفتەیەک ژنە ئەرمەنییەکەی دراوسێیان بە مهری گوت: لە کاری شیرینی دروستکردندا هاوکاری بکات. مهریش قبوڵی کردو دەستیکرد بە هاوکاریکردنی (ملینا). ملیناش

کرێیەکی بە مهری دەدا، دیاربوو لە تاران کار بۆ ژنان هەبوو.

ماوەی چل ڕۆژ بوو ئاغا ڕەزاو مهری لە تاران نیشتەجێ ببوون. ئاغا ڕەزا بە هاوسەرەکەی گوت: وەرە سفرە ڕاخە با کەمێک بخۆینەوە، ماوەیەکی زۆرە دەممان بە مەی تەڕ نەکردووە، سفرە ڕاخراو هەریەکەیان دوو پێکیان بە سەلامەتی یەکتری خواردەوە.

شەش حەوت مانگیان بەوجۆرە بەڕێکرد، دەیانخوێندو دەچوون بۆ زانکۆ، لەگەڵ چەند کەسێک دۆستایەتییان گرت و تێکەڵی یەکتری دەبوون. لەگەڵ چەند بنەماڵەیەکی یەزدیش تێکەڵاوییان دروستکرد. هەفتەی جارێکیش لەگەڵ ماڵی کوڕە مامەکەی ئاغا ڕەزا یەکتریان دەبینی، بەڵام زیاتر هاتوچۆیان لەگەڵ ماڵە تورک و ئەرمەنییە دراوسێکانیان بوو. ئەوان کەسێکی گەرموگوڕو میواندۆست بوون. هەموویان بەیەکەوە دەڕۆیشتن بۆ تەجریش و شا عەبدولعەزیم و ئیمام زادەی داود و کەرەج. ئەوکات هێشتا کەرەج لە گوندێک زیاتر نەبوو، لەوێ تەنها چەند دووکانێکی قەسابی و نانەوا هەبوون، ئەویش بەهۆی ئەو گەشتیارانەوە کرابوونەوە کە ڕوویان لەو ناوە دەکرد. ئەوکات هاتوچۆ وەک ئێستا نەبوو، ئۆتۆمبێل کەم بوو، ڕۆیشتن بۆ دەربەند باو نەبوو. لە دەربەند ڕێستۆرانت و گازینۆ نەبوون، ئەو کەسانەی بۆ سەیران دەچوون بۆ ئەوێ، خواردنیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد، لەژێر درەختەکانی ئەو ناوەدا دادەنیشتن و سەیرانی خۆیان دەکرد. بە کەناری ڕووبارەکەدا دەڕۆیشتنە خوارەوەو دەچوونە سەرەوە، خواردنیان دەخواردو قسەی خۆشیان دەکردو دوای عەسر دەگەڕانەوە بۆ تاران. لە مەیدانی تەجریش و قودس تاکو پێچەکانی شەمێران باغ و زەوی کشتوکاڵی و چۆڵەوانی بوو، گوندی عەباس ئاوا هەر ئەو گوندە بوو کە مەلا عەباسی ئیروانی ناسراو بە حاجی میرزا ئاغا قاسی (١١٦٢-١٧٨٣/١٢٢٨-١٨٤٩) دروستیکردبوو. ئەوکات کەرەج شارۆچکەیەکی بچکۆلانە بوو، باخ و باخاتێکی خۆش و سەرنجڕاکێشی هەبوو، ئاووهەوایەکی خۆشی هەبوو، درەختەکانی بەرزو چڕو پڕ میوە بوون، جێگای بولبول و جۆرەها باڵندە بوو، دوکەڵ و ترافیک و قارەباڵغی لێ نەبوو، گۆشت و کەبابی شا عەبدولعەزیم خۆش و بەلەزەت و هەرزان بوو، نرخی یەک شیش بە (٤-٥) ڕیاڵ بوو.

مهری بەردەوام نامەی بۆ باوکی دەنووسی و لە باشی و هەواڵی خۆیان و زانکۆ ئاگاداری دەکردەوە. ئەوکاتەی ئەوان لە زانکۆ وەرگیرابوون، سەرەتای چاکسازییەکانی

شا بوو، سەرەتای شۆڕشی سپی بوو، باسی دابەشکردنی زەوی و خۆماڵیکردنی لەوەرگاکان و دەنگدانی ژنان و دامەزراندنی سوپای بەخوێندەواریکردن بوو. لە زانکۆدا هاواری دژەکانی شا بەرزببووەوە، ژمارەیەک لە خوێندکاران بەردەوام مانیان دەگرت، هەندێک کەسیش لایەنگری چاکسازییەکان بوون. ژنان بۆ یەکەمینجار چوونە سەر سندووقەکانی دەنگدان، دیارە لە ئێراندا چل ساڵ لەپێش هەندێک وڵاتدا ژنان مافی دەنگدانیان هەبووە. لە وڵاتانی عەرەبستانی سعودی دوای پەنجا ساڵ و بگرە ئێستاش هیچ هەواڵێک لە دەنگدانی ژنان نییە. لە ساڵی (١٣٩٤/ ٢٠١٥)دا لە وڵاتی عەرەبستاندا ژنان بۆیەکەمجار بەشدارییان کرد لە دەنگدانی هەڵبژاردنەکاندا. ئاغا ڕەزاو مهری هەوڵیان دا بەشداری لە مانگرتنی خوێنکاراندا نەکەن، ڕۆژانی مانگرتن ئەوان نەدەچوون بۆ زانکۆ. مهری چەند مانگێک بوو هاتبوو بۆ تاران، ڕۆژێک شتێکی سەیری بینی زۆری بەلاوە سەیربوو، ئەویش ئەوەبوو ژنێکی بینی ئۆتۆمبێلی لێدەخوڕی، لەخۆی پرسی بۆچی دەکرێت ژنان کاری شۆفێری بکەن و ئۆتۆمبێل لێ بخوڕن. خراپ نییە ئەگەر بزانیت ئێستاش لە چەند وڵاتێک شۆفێریی بۆ ژنان قەدەغەیە، یەکێک لەو وڵاتانە وڵاتی عەرەبستانی سعودیە. شەو مهری بە ئاغا ڕەزای گوت: ژنێکی بینیوە شۆفێری دەکرد. ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: حەزدەکەیت بڕۆین خۆمان فێری شۆفێری بکەین و مۆڵەتی شۆفێری وەربگرین.

ئاغا ڕەزا بە تەمەن لە خوێندکارەکانی تر گەورەتر بوو، ساردو گەرمی ڕۆژگاری چەشتبوو، یەکێک لە مامۆستاکان پێیگوت تۆ هاوسەرت هەیەو تەمەنیشت هەیە، وانەکانی خۆت بەباشی بخوێنەو خۆت دووربگرە لە خۆپیشاندان و مانگرتنی خوێندکاران. ئاغا ڕەزا چێژی زیندان و دووری مهری چەشتبوو، بۆیە هەمیشە خۆی بەدوور دەگرت لە خۆپیشاندان و مانگرتن، ئاغا ڕەزا ڕۆژانە لە زانکۆو لەکتێبخانەی زانکۆ بوو، کاتی عەسرانیش دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەو نانی ئێوارەی لەگەڵ مهریدا دەخوارد، هەندێکجاریش بەیەکەوە دەچوون بۆ سینەما، هەفتەی یەک جاریش دەچوون بۆ میوانی خاوەنماڵەکەیان، یان دەچوون بۆ سەردانی دراوسێ ئەرمەنییەکەیان. تاقیکردنەوەی کۆرسی دووەم دەستپێکردبوو، پارەکەشیان خەریکبوو تەواو دەبوو، ئاغا ڕەزا هیچ کارێکی دەستنەکەوتبوو، ئەو پارەیەش کە مهری بۆ دروستکردنی شیرینی لە دراوسێکەیان وەریدەگرت، ئەوەندە نەبوو کە کەلێنێکیان بۆ پڕبکاتەوە، بەڵام مهری

بەباشی فێری هونەری دروستکردنی شیرینی ببوو. ئاغا ڕەزا زۆر بەدوای کاردا گەڕابوو، بەڵام کارێکی باشی دەستنەکەوتبوو. یەکێک لە مامۆستاکانی کە لێپرسراوی چاودێری دامودەزگاکانی دادگا بوو، پێشنیاری بۆکرد کە بچێت لەلای ئەو کار بکات. چ شتێک لەوە باشتر هەیە، هەم داهاتێکی دەستدەکەوێت، هەم لەدوای تەواوبوونی تاقیکردنەوەکان ئاغا ڕەزا بەردەوام دەبوو لە کارکردن.

ژیانێکی خۆشیان هەبوو، ژن و پیاو بەیەکەوە میهرەبان بوون و دڵسۆزی یەکتری بوون، کەمێک باری ئابوورییان باش ببوو. کرێی خانوو و دەزگاکانیان لە یەزدەوە بەدەست دەگەیشت. زۆر بەباشی وانەکانیان دەخوێندو هەریەکەیان لە بەشەکەی خۆیدا یەکێک بوون لە خوێندکارە هەرە باشەکان. ئاغا ڕەزا لە تاراندا زۆر گەرموگوڕ بوو لەگەڵ خەڵکیدا. ئەوکاتە مۆڵەت دەدرا لە پۆلدا سڵاو و هەواڵپرسین بکرێت. ئاغا ڕەزا نزیکەی پانزە ساڵ لە خوێندکارەکانی تر گەورەتر بوو، خوێندکارەکان ڕێزێکی زۆریان لێدەگرت. هەر خوێندکارێک کارێکی هەبووایە ئاغا ڕەزا هاوکاری دەکرد، لەگەڵ زۆرێک لە خوێندکارەکان نێوانی باشبوو، مامۆستاکانیش بەچاوی ڕێزەوە وەک خوێندکارێکی خۆشەویست سەیریان دەکرد. ئاغا ڕەزا لەگەڵ دراوسێکانیشدا میهرەبان بوو، دووکاندارەکانی گەڕەک هەموو ئەویان دەناسی.

ساڵی یەکەمی زانکۆ بەباشی تێپەڕی، ئەنجامی خوێندنیان سەرکەوتوو بوو، هاوینەکەشی هەر لە تاران بوون. تەنها چەند ڕۆژێک چوون بۆ یەزدو لە ماڵی محەمەد عەلی مانەوە، دوای بینینی تەواوی خزم و دۆستان، دووبارە گەڕانەوە تاران. ساڵی دووەمی زانکۆ دەستیپێکردەوە. تاران لە ساڵی (١٩٦٧/١٣٤٦) هێشتا قەرەباڵغ نەببوو. خەڵکەکانیش هێشتا نەببوونە کەسانی پوولەکی، هێشتا دووکاندارەکان شتیان بەقەرز دەدا بە خەڵکی، دووکانەکان نەببوون بە سۆپەرمارکێت، نانەواکان نانی باشیان دروستدەکرد. هێشتا شاگرد نانەواکان پێش مەلا بانگدان دووکانەکانیان دەکردەوە، هەویریان دەشێلاو ئامادەیان دەکرد بۆ نانکردن، ئەوکات هێشتا شیرەمەنی باش هەبوو، ماستی نمرە یەک، کەرەو سەرشیری نموونەیی هەبوو، هێشتا خەڵکانی ئێرە نەچووبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە ڕۆژێک دێت شیرەمەنی سروشتی کەم ببێتەوە، هێشتا هەنگوینی ڕەنگدار نەکەوتبووە بازاڕەوە. ئێستا هەنگوینیش ڕەنگ دەکرێت، زەعفەران یان هەندێک ڕەنگی سوری تێکەڵ دەکەن و هەنگەکانیش شەکرە سورەکە دەخۆن، ئیتر هەنگوینی ڕەنگ سور

بەرهەمدەهێنن. ئەگەر هەنگوینی ڕوونیان بوێت، ئەوا گوڵە هێرۆ تێکەڵی شەکر دەکەن، ئەگەر هەنگوینی زەردیان بوێت، ئەوا ئاوی لیمۆ تێکەڵ بە شەکر دەکەن. ئەوجا هەنگوینی ڕەنگاوڕەنگ بەرهەمدەهێنن. دواییش سەد سوێند دەخۆن و دەڵێن ئەم هەنگوینەمان لە داردا دۆزیوەتەوەو هەنگوینی ساغی کوێستانەکانە. پەندێکی کۆنی مەشهەدی هەیە دەڵێت (چۆلەکە ڕەنگدەکات و بە بولبول دەیفرۆشێت). ئێستا هەنگوینی ڕەنگکراو بە خەڵکی دەفرۆشن. ئەوکاتە هێشتا ڕەنگی زەردێنەی هێلکە سروشتی بوو، ئەوکاتە هێشتا خاوەنی کێڵگەکانی بەخێوکردنی مریشک نەیاندەزانی بەپێدانی خواردنێکی ڕەنگی، بە مریشکەکانیان هێلکەی سوورو زەردی تۆخ بەدەست بهێنن، هێشتا نەیاندەزانی کە خەڵکی تووشی نەخۆشی بکەن و پارەیەکی زۆر بەدەستبهێنن. لەساڵی (١٩٦٧/١٣٤٦) لە تاران خواردن سروشتی بوو، کەباب و گۆشتی نمرە یەک شیشی بە چوار ڕیاڵ بوو، باشترین گۆشتی مەڕ کیلۆی بە (٨٠ تا ١٠٠) ڕیاڵ بوو. میوەش زۆرو هەرزان بوو. ئاغا ڕەزاو مهری لە یەزد گوێژو بەلاڵوکیان نەبینیبوو، زۆر حەزیان لە خواردنی ئەو دووجۆرە میوە سروشتییە دەکرد. پێچەکانی شەمێران جێگایەکی خۆشبوو بۆ حەوانەوەو هاتوچۆ. بلواری کەشاوەرزی ئێشتا خۆشترین جێگای باکوری شار بوو. جۆگە ئاوێکی گەورە بە ناوەڕاستی بلوارەکەدا دەڕۆیشت. هەروەکو ئەو سەردەمەی کە ئاغا قاسی جۆگەیەکی هەڵکەندبوو. شەقامی تالەقانی (تەختی جەمشید) تازە خەریکبوو دروستدەکرا. خەڵکی بەگشتی میهرەبان بوون، لە هەواڵی یەکتریان دەپرسی. زۆربەی ڕۆژ ئاغا ڕەزا و مهری بەپێ لە ماڵەوە دەڕۆشتن بۆ زانکۆ، ئەوەش هەم وەرزش بوو، هەم گەڕاندنەوەی کەمێک پارەبوو، هەم بەردەوامیی کەلتووری پیادەڕەوی یەزد بوو. زانکۆ لە پێشکەوتندا بوو، خوێندکارەکانیش بەباشی وانەیان دەخوێند، باسی سیاسەت دەکراو دەیانویست تۆڵە لە حکومەت بکەنەوە، ساواکیش هێواش هێواش بەهێز دەبوو، مامۆستاکانیش بەباشی وانەیان دەگوتەوە، هێشتا جگە لە مووچەکانیان پارەی زیادە نەدەدرا بە مامۆستاکان، هێشتا کارەساتی پارەو پارەپەرستی نەچووبووە ناو زانکۆوە، مامۆستاکان مووچەیەکی دیاریکراویان هەبوو.

مهری و ئاغا ڕەزا هەردووکیان مامۆستای زیرەک و میهرەبان و بەتوانایان هەبوو، ماموستاکان وانەیان دەگوتەوەو جارجاریش باسی سیاسەتیان دەکرد. ئەو دوو ژن و مێردە خۆیان لە باسی سیاسەت دەبوارد، تێکەڵی کوڕی مانگرتووانیان

نەدەکرد، ئەوان وەکو لەیل و مەجنون وابوون. لەکاتی پشوو و نەبوونی وانەدا لەژێر درەختە بەرزەکانی زانکۆدا پیاسەیان دەکرد، جارجاریش لە پەنایەکدا دادەنیشتن و باسی ئایندەی خۆیان دەکرد، لەگەڵ هاورێکانیاندا قسەیان دەکردو ڕێنمایی یەکتریان دەکرد. گرووپێکی سیاسی چالاک لەناو زانکۆدا هەبوون، هەوڵیان دەدا خوێندکارانی تر بکەن بە لایەنگری خۆیان. ئاغا ڕەزا دەیگوت: من لایەنگری سیاسەت نیم و حەز بە خوێندن و ژیانێکی ئاسایی دەکەم. مانگی (ئازەری ١٣٤٦/ تشرینی دووەمی ١٩٦٧) بوو، ڕەوشی زانکۆ لە گۆڕانکارییدا بوو، خوێندکاران لە گۆشەو کەناری زانکۆ کۆدەبوونەوەو وتاریان دەدا، باسی خۆپیشاندان و مانگرتنیان دەکرد. ئاغا ڕەزاو مهری بڕیاریان دابوو دوای تەواوبوونی دەوامی ڕۆژانە بەزوویی بگەڕێنەوە بۆماڵەوە، هەر لە بەرامبەر زانکۆ سواری پاس دەبوون و لەبەردەرگای ماڵی خۆیان لە پاسەکە دادەبەزین، ئەوکاتە کرێی پاس تەنها چوار ڕیاڵ بوو. مهری نان و چای ئامادە دەکرد تاکو ئاغا ڕەزا دەهاتەوەو جارجارێکیش سەردانی دراوسێکانی قاتی سەرەوەی دەکرد، ئەو ڕۆژانەش کە دەوامی نەبوو شیرینی دروستدەکرد. هێواش هێواش خەریکبوو لەگەڵ ئازەری و ئەرمەنی تێکەڵاویی دروست دەکرد. بە هاوسەرەکەی دەگوت: ئەمانە کەسانی بەڕێزو نموونەیین، وردە وردە فێری زمانی ئازەری و ئەرمەنی بوو.

یانزەی مانگی ئازاربوو، ئەو ڕۆژە مهری لە کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ تا عەسر لە زانکۆ بوو، ئاغا ڕەزاش تا کاتژمێر شەش لە زانکۆ دەمایەوە. مهری زووتر لە هاوسەرەکەی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئەو چاوەڕوانی هاوسەرەکەی بوو، کاتژمێر بوو بە هەشتی شەو، بەڵام هیچ هەواڵێک لە هاتنەوەی ئاغا ڕەزا نەبوو. مهری تەواو نیگەران بوو، سەرێکی لە ماڵە دراوسێکانی دا، ئەوانیش گوتیان نیگەران مەبە، هاوسەرەکەت خۆی دێتەوە. ئەو ماڵانە تەلەفۆنیان نەبوو، ئەوکاتە زۆربەی ماڵەکانی تاران تەلەفۆنیان نەبوو، دیارە ئەوکاتە مۆبایل هەر ناوی نەبوو. کات گەیشتە نۆی شەو هەمووان بەتەواوەتی نیگەران بوون. دراوسێکان گوتیان دەچین بەشوێن ئاغا ڕەزادا، بەڵکو هەواڵێکی پەیدا بکەین. نزیکی نیوە شەو بوو کە دراوسێکان گەڕانەوەو گوتیان لای ئێوارە خوێندکارەکان مانگرتنیان کردووەو پۆلیس چەند خوێندکارێکی دەستگیرکردووە. ئەوان سەردانی بنکەی پۆلیسیان کردبوو، بەڵام ئاغا ڕەزا لەوێش نەبوو. هەواڵیان لە هەرکەسێک پرسیبوو کەسێک وەڵامی نەدابوونەوە. سەردانی چەند نەخۆشخانەیەکیان

کردبوو، لەویش هیچ هەواڵێکیان دەستنەکەوتبوو. مهریش فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە، ژنانی دراوسێش دڵخۆشییان دەدایەوەو دەیانگوت: خەم مەخۆ هاوسەرەکەت سەلامەتەو سوپاس بۆ خودا کە لە نەخۆشخانە نەبووەو ئەگەر لە زیندانیش بێت سبەی ئازادی دەکەن. دراوسێ ئازەرییەکەیان دوو کچی خۆیان لەگەڵ مهری نارد تاکو شەو لەلای ئەو بخەون، بەڵام ئایا مهری خەوی لێدەکەوت، ئەو شەوە تاکو بەیانی خەو نەچووە چاوی و بەردەوام نزای دەکردو لە خوداو پێغەمبەر دەپاڕایەوە کە هاوکلری بن. مهری دەیگوت: خۆزگە باوکم لێرەبووایە، خۆزگە خوشکەکانم و هاوسەرەکانیان لێرەبوونایە. مهری ئەو شەوە تاکو ڕۆژ بووەوە یەک چرکە خەو نەچووە چاوی، بەردوام چاوی لەسەر پەنجەرەکە بوو. کاتێک کە تیشکی خۆری لە پەنجەرەکەوە بینی بەخێرایی لە ماڵەوە هاتە دەرەوەو ڕۆیشت بەرەو ماڵی ئامۆزای هاوسەرەکەی. ئاغا جەعفەر زۆر دڵخۆشی مهری دایەوە، گوتی: هیچ خەمت نەبێت من ئەمڕۆ ناچم بۆ سەرکار بە شوێن ئاغا ڕەزادا دەگەڕێم و سۆراغێکی دەکەم. ئاغا جەعفەر گوتی: با سەرەتا سەردانێکی ماڵی مهری بکەینەوەو بەڵکو ئاغا ڕەزا لەم کاتەدا گەڕابێتەوە بۆ ماڵەوە. هاوسەری ئاغا جەعفەر داوای لە مهری کرد کە نانی بەیانی بخوات ئەوکات بڕۆن، بەڵام مهری نەیتوانی پیاڵە چایەکیش بخواتەوە، لە نیگەرانیدا تووشی دڵەڕاوکێ ببوو، زۆر خەمی ئاغا ڕەزای هاوسەری بوو، هەر بۆیەش بەزوویی تەکسی گرت و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ئاغا ڕەزا نەهاتبووەوە، لیۆنی ئەرمەنی و ئاغا تەقی ئازەری لەبەردەرگا بوون، کاتێک چاویان بە مهری و ئاغا جەعفەر کەوت زانییان مهری بۆ کوێ چووە. ئەوان گوتیان ئێمەش لەبەر دیارنەمانی ئاغا ڕەزا نەچووین بۆ سەر کار. بڕیاربوو مهری و جەعفەر ئاغا سەردانی زانکۆ بکەن. لیۆن گوتی: چەند ناسیاوێکی لە بنکەی پۆلیسی نزیکی زانکۆ هەیەو دەچێت بۆ ئەوێ بەڵکو هەواڵێکی دەستبکەوێت. جەعفەر ئاغاش گوتی: چەند مامۆستایەکی زانکۆ دەناسێت. بڕیاردرا کە نزیکی نیوەڕۆ هەموویان لەسەر چوار ڕای کاخ (فەڵەستینی ئێستا) یەکتری ببیننەوە.

مهری دڵی وەکو سیرو سرکە دەکوڵا، لە دوێنێوە نانی نەخواردبوو، خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ ئەوی لەپێ خستبوو. جەعفەر ئاغاش بەردەوام دڵخۆشی دەدایەوە. ژمارەیەکی زۆر پۆلیس لەبەردەمی زانکۆ وەستابوون. مهری ناسنامەی نیشاندان و چووە ژوورەوە، بەڵام مۆڵەتیان نەدا جەعفەر ئاغا بچێتە ژوورەوە. مهری چوو بۆلای

هاوپۆلەکانی ئاغا ڕەزا، ئەوان گوتیان دوێنێ کاتی عەسر لەبەردەمی زانکۆ قەرەباڵغی دروستبوو، پۆلیس چەند خوێندکارێکیان دەستگیرکردووە. یەکێک لە خوێندکارەکان گوتی: دوێنێ عەسر چاوی لێبووە کە پۆلیسەکان ئاغا ڕەزایان دەستگیرکردووەو لەگەڵ خۆیاندا بردوویانە. خوێندکارەکان مهرییان برد بۆلای سەرۆکی کۆلێژی ماف، دایک و باوکی چەند خوێندکارێکی تریش لەوێ بوون، ئەوانیش لەخەمی منداڵەکانیاندابوون کە شەو نەگەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە. سەرۆکی کۆلێژیش هەر نیگەران بوو، بەردەوام خەریکی تەلەفۆنکردن بوو لەپشتی تەلەفۆنەکەوە دەیگوت: ئەم توندڕەوییەی ئێوە هەموو زانکۆ دەشێوێنێت. نزیکی نیوەڕۆ سەرۆکی کۆلێژ بە مهری گوت: هاوسەرەکەی تۆ دەستگیرکراوە، ناوی ئەویش لەگەڵ ئەو خوێندکارانەدایە کە لە زینداندان، سەرۆکی کۆلێژ پەیمانی دا هەموو هەوڵێکی بخاتەکار تاکو بەزوویی سەرجەم خوێندکاران ئازاد بکرێن. دوایی بە مهری و دایک و باوکی خوێندکارەکانی گوت: ئێوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، ئومێدەوارم ئەمشەو سەرجەم خوێندکارە دەستگیرکراوەکان بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە. سەرۆکی کۆلێژ گوتی: من و سەرۆکی زانکۆو تێکڕای مامۆستاکانی تر لەهەوڵداین بۆ ئازادکردنی خوێندکارە دەستگیرکراوەکان. ئەوکات هێشتا سەرانی کۆلێژو زانکۆکان کەسانی بێلایەن و ئازادیخواز بوون، هێشتا ئەو کەسانەی ساواک بوون لە زانکۆکاندا کاریان پێ نەسپێردرا بوو، بەجۆرێک نەبوون کە سەرانی سەر بە کۆلێژەکان ناوی خوێندکارەکان بدەن بە ساواک، هێشتا کەسانی دڵسۆزو بەڕێزی وەکو دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجایی بە سەرۆکی زانکۆ قبوڵ دەکران.

لەکاتی گفتوگۆکاندا مهری تێگەیشت هەندێک لە دایک و باوکانی خوێندکارانی دەستگیرکراو لە بابەتی حیزب و ڕێکخراوەوە قسەدەکەن. هەرکەسەو دەیویست بەرەو لای کەسانی دەسترۆیشتوو بڕوات، هەندێکیان باسی پێدانی ڕشوەیان دەکرد. مهری هاروهاج ببوو نەیدەزانی چی بکات، کەمێک وەستا تا خەڵکەکە ڕۆیشتن و ژووری سەرۆکی کۆلێژ چۆڵ بوو. بە سەرۆکی کۆلێژی گوت: من لەم شارەدا تەنهاو غەریبم هاوسەرەکەم تەمەنی (٣٥)ساڵ دەبێت، لە خوێندکارانی تر بەتەمەنترە، پێشتر پاسەوان و ماوەیەکیش لە زینداندابووە، ئەو پۆلیس بووەو دوایش دەرکراوە، لەوەیە ئەو ڕابردووە بۆ ئەو خراپ بێت و کێشەکەی زیاتر بێت. مهری سەرۆکی کۆلێژی مافی سوێنددا کە بێخەم نەبێت لە ئازادکردنی هاوسەرەکەی. سەرۆکی کۆلێژیش بەڵێنی پێدا کە هەموو

هەوڵێکی خۆی بخاتە گەڕ بۆ ئازادکردنی ئاغا ڕەزا.

نزیکی کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ بوو هەموویان لەسەر چوارڕێیانی کاخ کۆببوونەوە. لێۆن هیچ هەواڵێکی دەست نەکەوتبوو، ئاغا تەقی هەواڵی دەستگیرکردنی ئاغا ڕەزای بیستبوو، مهریش قسەکانی سەرۆکی کۆلێژی بۆ گێڕابوونەوە، هەموویان گوتیان با بڕۆینەوە بەرەو ماڵەوە. جەعفەر ئاغای ئامۆزای ئاغا ڕەزا مهری بردەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەڵام مهری نەیدەتوانی هێمن بیێتەوەو نەیتوانی نانی نیوەڕۆش بخوات، بە تەواوی دڵی گیرابوو، تووشی دڵەڕاوکێ ببوو، نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵبێت. گوڵناری ژنی جەعفەر ئاغا پیاڵەچایەکی تێکردو لەبەردەم مهریدا داینا، لەناکاو مهری دایە پڕمەی گریان. جەعفەر ئاغا بە گوڵناری گوت: لێیگەڕێ با بگری، با بە ئەو گریانە باری لەشی سوک بێت. مهری لە دەروونەوە ئازاری دەکێشا، بێهودە بیری دەکردەوە دەیگوت: ئەگەر هاوسەرەکەم لەسێدارەدرا، من چی بکەم؟ ئەگەر ئەشکەنجەدرا، من چی بکەم؟ ئەگەر لەژێر ئەشکەنجەدا جێگایەکی شکا، من چی بکەم؟ ئەگەر حوکمی زیندانی هەتاهەتایی درا، من چی بکەم؟ ئەو کە لایەنگری سیاسەت نەبوو، ئەی بۆچی دەستگیرکراوە، ئەو سەر بە هیچ لایەنێک نەبوو، ئەندامی هیچ حیزبێک نەبوو.

مهری نانی ئێوارەشی بۆ نەخورا، تاکو بەیانی دەگریاو هاواریدەکرد بیری لە شتی خراپ دەکردەوە، هاوسەرەکەی دەبینی بەداردا کرابوو، یان لەپشتی شیشی زیندان دەیبینی. بانگی بەیانی لە جێگاکەی خۆی هەڵساو دەستنوێژی گرت و چووە سەر بەرماڵ بۆ نوێژکردن، دوای نوێژکردن نزایەکی زۆری کرد، واهەستی کرد لە زانکۆ دەرکراوەو هەموو هیواو ئاواتیان بووە بە بڵقی سەر ئاو.

خۆزگە دەسەڵاتدارەکان دەیانزانی کاتێک کەسێک دەستگیردەکەن، چ کێشەو نارەحەتییەک بە کەسوکاریان دەدەن، ئەوکاتە بێهۆ هیچ کەسێکیان دەستگیر نەدەکرد. ئەگەر بیانزانییایە کاتێک کەسێک پەلکێشی زیندان دەکەن، چ کێشەو نارەحەتییەک بۆ کەسوکاریان دروست دەبێت. بەهیچ جۆرێک تاوانیان نەدەکرد.

نزیکەی (٣٦) کاتژمێر دەبوو مهری هیچی نەخواردبوو، تەنانەت چاویشی نەچووبووە خەو، کاتێک نوێژەکەی تەواو کرد، قسەکانی شەهربانووی هاتەوە یاد، کە دەیگوت: لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیەو لە هەر پەندێکدا نیعمەتێک هەیە، چەندجارێک ئەم ڕستەیەی دووبارە کردەوەو شێوەی دایەگەورەی هاتەوە پێش چاو

و پێکەنینەکەی ئەو پیرەژنەی دەبینی بەخۆی گوت ئەوجارە کە تووشی کێشە بووین پەندەکەیم بینی، هەستیکرد بەسەر خۆیدا زاڵبووەو هەستیکرد خودای گەورە ئاگاداری دەکات، هەستیکرد دەیەوێت لەگەڵ خودادا وتووێژ بکات، هەستیکرد هاوسەرەکەی لەلایەتی، هەستیکرد بەسەر زوڵمدا سەرکەوتووە، هەستیکرد تاریکیی خەریکە نامێنێت. کاتێک هاتەوە سەرخۆ، سەیریکرد دنیا ڕووناکە، هێشتا خۆریش هەڵنەهاتبوو، بەهۆی بێخەوییەوە بەرچاوی تاریک ببوو، بەڵام دڵی ڕووناکیی تێکەوتبوو. گوڵناز بە پیاڵەیەک چاییەوە لەپشت سەریەوە وەستابوو، ئەو ژنە میهرەبانە باکوورییە بە شێوازێکی شیرین گوتی: مهری گیان وەرە شتێک بخۆ بەدڵنیاییەوە ئەمڕۆ هاوسەرەکەت ئازاد دەبێت. مهری کەمێک دڵە ڕاوکێکەی کەمیکرد، هەستیکرد ئیتر نیگەرانی هیچ شتێک نییە. بە دەنگێکی بەرز گوتی: لەم کێشەیەدا پەندێک هەیەو لەو پەندەشدا نیعمەتێک هەیە. گوڵناز کەوتبووە قسەکردن لەگەڵ مهریدا. گوتی: مهری شێوەو ڕوخسارت هەر لە شەهربانووی دایەگەورەت دەچێت، نێو چاوانت ڕووناکیی لێدیارە. مهری پیاڵەچاکەی لێوەرگرت و خواردییەوە، گوڵناز بەوە خۆشحاڵ بوو.

ئاغا جەعفەر ماوەی بیست ساڵ بوو نیشتەجێی تاران بوو، گوڵنازی هاوسەری خەڵکی لاهیجانی باکووری ئێران بوو، ژنێکی میهرەبان و بەڕێز بوو، هەروەکو تەواوی خەڵکی باکووری ئێران، ئەویش کەسێکی زۆر گەرموگوڕو میواندۆست بوو، زۆر لە خەمی مهریدا بوو. گوڵناز بەردەوام دوو هێلکە قازی بە ڕۆنەکەرە دەکردە هێلکە و ڕۆن، لەگەڵ هەندێک سەوزەدا دەیدا بە مهری. ئاغا جەعفەر دەچوو نانی گەرمی دەهێنا. ئەو ڕۆژە کاتێک نانی کڕی و هاتەوە بۆ ماڵەوە، سەیریکرد وا مهری سینییەک خواردنی لەبەردەمەو خەریکی نانخواردنی بەیانییە. بەخۆشحاڵییەوە گوتی: سوپاس بۆخودا شووکر ئەوە نان دەخۆیت. گوڵنازیش بەخۆشحاڵییەوە گوتی: ڕوخساری مهری هەمان شێوەی ڕوخساری شەهربانووی گرتووە. گوڵناز چەند جارێک چووبوو بۆ یەزد، ئەو ژنە میهرەبانە باکوورییە، شاری کەمباران و خانووە لەخشت دروستکراوەکان و سەربانە بەقوڕ سواغدراوەکانی یەزدی بینیبوو، دەیزانی کە ئێمەی خەڵکی شاری یەزد لە هاویندا بەیانیان زوو لەسەربان دێینە خوارەوەو دەچینە حەوشە، لە گەرمای نیوەڕۆیانیشدا دەچینە ژێر زەمینەوە، شەوانەش دەچینە سەربانەکان. ئاسمانی جوانی شەوانی پڕ ئەستێرەی یەزدی بینیبوو، ئاسمانێک کە جوانیی شەوانەی کەمتر نەبوو

لە جوانیی دەریا. گوڵناز ژنێک بوو کە جوانییەکانی باکووری باراناوی لەگەڵ کەوێری گەورەدا دەبینی. ئەو خۆی دەیگوت: پاقلاوەی یەزد لەگەڵ مرەبای باکوور یەک تام و یەک ڕەنگ بە ئەو دەدەن. مهری لە ماڵی ئەو خانمە میهرەبانە باکوورییە هەستی بەئارامی و هێمنی دەکرد. بەهەمان شێوە بوونی لێۆنی ئەرمەنی و ئاغا تەقی ئازەری و خانەوادەکەی بە پەناگەی خۆی دەزانی.

سەیرە کەسانێک مووچە لە گەلی خۆیان وەردەگرن تاکو ئاسایش بۆ هاوڵاتییان دابین بکەن، کەچی بۆخۆیان دەبنە هۆکاری کێشە بۆ گەل و وڵاتیان. خۆیان هۆکاری کێشەو ترس و دڵەڕاوکەن بۆ خۆیان و لێپرسراوانیان، هەمیشە هەر وابووە. کاتێک حکومەتەکان وا بیردەکەنەوە کە هەموو شت لەژێر کۆنترۆڵی خۆیاندایە، وەک ئاو چۆنیان بوێت وای لێدەکەن، بەڵام لەناکاو بوومەلەرزەیەک لە دەریاوە شەپۆل دەدات و سۆنامی کۆمەڵایەتی دروستدەبێت و مەشروتییەت دێتەکایەوە.

مهری نانی بەیانی بەتەواوەتی خوارد، وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕوووینەدابێت، خۆی گورجوگۆڵ کردبووەوە، خەوی دەهات و چاوەکانی گران ببوون. گوڵناز جێگای خەوتنی بۆ چاککردو ئەویش چوو لەسەر جێگاکەی درێژ بوو، بەهێمنی چاوەکانی داخست و چووە خەوێکی قوڵەوە، کاتێک بەهۆش خۆی هاتەوە نزیکی نیوەڕۆ بوو. جەعفەر ئاغا چوو بۆ زانکۆ تاکو هەواڵێکی ئامۆزاکەی دەستبکەوێت، مهریش نانی نیوەڕۆی خوارد ڕۆیشت بەرەو زانکۆ. بەردەم زانکۆ قەرەباڵغییەکی زۆری لێبوو، ئەو ڕۆژە پانزەی ئازەر بوو، شانزەی ئازەر چاوەڕوانی خۆپیشاندان دەکرا، ڕێگا نەدەدرا هیچ کەسێک بچێتە نێو زانکۆوە. خوێندکاران لەنێو حەوشەی زانکۆ هوتافیان دەکێشا، خەڵکێکی زۆریش لەبەردەم زانکۆ کۆببوونەوە، ئەوانیش هاواریان دەکرد. مهری سەیریکرد وا جەعفەر ئاغاو لێۆن و ئاغا تەقی لە گۆشەیەکەوە وەستاون، ئەوان هەرسێکیان ئەو ڕۆژەش نەچوونە سەرکارەکانی خۆیان و بەدوای بەدەستخستنی هەواڵێکی ئاغا ڕەزاوە بوون، ئیتر لەو ڕۆژەوە مهری دڵی ئەوانی دەدایەوە. لێۆن پێی سەیربوو کە مهری هەمان ژنی ڕۆژی پێشتر بێت، کە وەک ژنێکی مێرد مردوو نیگەران بوو. مهری بە جەعفەر ئاغای گوت: من ئەمشەو دەگەڕێمەوە بۆ ماڵی خۆمان، لەوەیە ئەمشەو ئاغا ڕەزا ئازاد بکرێت و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. جەعفەر ئاغا پێیگوت: واباشە ئەمشەویش بێیتەوە بۆ ماڵی ئێمە، تاکو دڵنیا دەبێت لە ئازادبوونی ئاغا ڕەزا، بەڵام مهری گوتی:

هەرچۆنێک بێت ئەمشەو دەڕۆمـەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئیتر مهری ئەو ژنەی ڕۆژانی پێشوو نەبوو، بەتەواوەتی بەسەر خۆیدا زاڵ ببوو، باوەڕێکی تەواوی بەخۆی هەبوو، ئەو زۆر باوەڕی بە بیردۆزەکەی دایەگەورەی هەبوو، کە دەیگوت لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیەو لە هەر پەندێکدا نیعمەتێک هەیە، ئێوەش هەوڵبدەن کێشەکانتان بەو جۆرە ببینن، دیارە کارێک مەکەن کێشە بۆخۆتان دروست بکەن و دوایش بڵێن لە هەر کێشەیەکدا نیعمەتێک هەیە، من هەمیشە ئەو کێشانەی بەبێ ویستی خۆم بەرەوڕووم دەبنەوە بە نیعمەتێکی گەورەیان دەزانم.

لیۆن و ئاغا تەقی بە جەعفەر ئاغایان گوت: خەمی مهریت نەبێت، هاوسەرەکانمان ئاگاداری دەکەن. مهری ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئەو شەوەش هەروەک شەوەکانی تریش ئاغا ڕەزا هەر نەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. شانزەی ئازەر خۆپیشاندان دەستی پێکرد، کارمەندانی حکومەت زۆر خراپ بەڕووی خۆپیشاندەران وە چوونەوە. لە (٢٢)ی ئازەر بەدواوە خۆپیشاندانەکان هێمنبوونەوەو ژمارەیەک لە خوێندکارانی دەستگیرکراو ئازادکران، بەڵام هیچ هەواڵێک لە ئاغا ڕەزا نەبوو. مهری سەردانی زۆر شوێنی کرد، بەڵام هیچ هەواڵێکی دەست نەکەوت، لە زانکۆش چەند خوێندکارێک دڵیان دەدایەوە. هاوسەری لیۆن و ئاغا تەقی و گوڵناز بەردەوام سەردانیان دەکرد. مهری بەنامەیەک هەواڵی دەستگیرکردنی هاوسەرەکەی بۆ باوکی نووسی. محەمەد عەلیش بەزوویی گەیشتە تاران، محەمەد عەلی چەند ڕۆژێک لە تاران مایەوەو دڵنەوایی کچەکەی دەکرد، هەرچەندە خۆشی زۆر نیگەران بوو. مهری ڕۆژانە سەردانی کۆلێژی مافی دەکرد، مامۆستاکانیش هاوخەمیی خۆیان بۆ دەربڕی، بەڵام هیچ کەسێک ڕێگەچارەیەکی نیشان نەدەدا. ئەو مامۆستایەی کە ئاغا ڕەزا لە نووسینگەکەیدا کاریدەکرد، پێشنیاری بۆ مهری کرد کە پێویستە مهری بە دەستنووسی خۆی ئەو مامۆستایە بکاتە بریکاری هاوسەرەکەی. مهریش بەزوویی نووسینێکی نووسی کە ئەو مامۆستا بەڕێزەی کردووە بە بریکار. تاقیکردنەوەی مانگانە نزیک ببوو، مهری دەبووایە بخوێنێت، ئەگەر ئاغا ڕەزا ئازاد نەکرایەو بەشداری تاقیکردنەوەکانی نەکردایە، ئەوا لە تێکڕای وانەکاندا سفری وەردەگرت. مهری لەگەڵ سەرۆکی کۆلێژی ماف قسەی کرد. بڕیاربوو ئەگەر ئاغا ڕەزا ئازاد نەکراو بەشداری تاقیکردنەوەکانی نەکرد ئەوا کۆلێژ تاقیکردنەوەی تەواوی وانەکانی بۆ بکات بە مۆڵەت، هەرواش بوو ئاغا ڕەزا ئازاد نەکراو وانەکانی بۆ کرا

بەمۆڵەت. مهری بڕیاری دا کە دەبێت بەباشی وانەکانی خۆی بخوێنیت و ببێتە یەکەمی کۆلێژەکەی، بۆئەوەی کاتێک ئاغا ڕەزا هاتەوەو زانی مهری یەکەم بووە، خۆشحاڵ ببێت.

مهری بەباشی و بەئیرادەیەکی بەهێزەوە وانەکانی دەخوێند، زۆر نیگەرانی هاوسەرەکەی بوو، بەردەوام لە دڵەڕاوکێدا بوو، لەکاتی وانەخوێندندا لەپڕێکدا یادی هاوسەرەکەی دەکردەوەو ئارامبوونی خۆی لەدەست دەدا، دڵۆپە فرمێسک بەسەر گۆناکانیدا دەهاتنە خوارەوەو دەفتەرو کتێبەکانی تەڕ دەکردن، بەڵام دووبارە هاواری لێهەڵدەستاو بەردەوام دەیگوت: هەرچی خودا بیکات هەر ئەوە باشە، لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیەو لە هەر پەندێکیشدا نیعمەتێک.

سەرەنجام تاقیکردنەوەی دەوری یەکەم تەواو بوو، مهری یەکەمی کۆلێژ بوو، بەڵام هاوسەرەکەی ئازاد نەببوو تاکو هەواڵی یەکەمبوونی مهری بزانێت و خۆشحاڵ بێت. مهری لەسەر داواکاری گوڵناز هەندێک شەو دەچوو بۆ ماڵی ئەوان. گوڵناز هەوڵی دەدا کاتێکی خۆش بۆ مهری فەراهەم بکات. هاوسەری لێۆن و ژنی ئاغا تەقی هەمیشە ئاگاداری مهرییان دەکرد، خواردنیان بۆ دەبرد، کارەکانیان بۆ ئەنجامدەدا. کۆتایی مانگی ئازەر مهری کرێی خانووی بۆ ئاغا تەقی برد، ئاغا تەقی گوتی: هەتا هاوسەرەکەت نەیاتەوە، کرێی خانوو لەتۆ وەرناگرم. مهری زۆری هەوڵدا تاکو پارەکەی لێوەربگرێت، بەڵام ئاغا تەقی گوتی: دڵنیابە پارەت لێوەرناگرم! مهری گوتی: من دەزانم تۆ پارەی خانووەکە قەرزاریت، پێویستە تۆش بەزوویی بچیت پارەکە بدەیت. ئاغا تەقی بە شێوازێکی جوانی ئازەری گوتی: خودا گەورەیە، ئێستا من هاوڕێکەم بەبێ تاوان زیندانی کراوە، چۆن دەکرێت من کرێی خانوو لە هاوسەرەکەی وەربگرم. مهری گوتی: ئاخر من پارەم لایەو بێ پارە نیم. ئاغا تەقی گوتی: مهری خانم بەدڵنیاییەوە تۆ باقر خان و ستار خان دەناسیت، هەموو خەڵکی ئەو دوو پیاوە قارەمانە دەناسن، ئێمە لەسەر ڕێبازەکەی ئەوانین، گیانی خۆمان دەکەینە قوربانی لەپێناوی ئازادیدا، هاوسەری تۆ بەبێ تاوان زیندانی کراوە، لە وڵاتێکدا کە ئازادی و یەکسانی نەبێت، هیچ شتێک نابێت. ئێستاش ئەگەر وەکو ستار خان نەتوانم چەک هەڵگرم، لانیکەم دەبێت هاوکاری بێتاوانێک بکەم. مهری بێدەنگ بوو. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە ئاغا ڕەزا لە زیندان بوو، ئاغا تەقی کرێ خانووی لە مهری وەرنەگرت، هاوژیانی و هاونیشتمانیبوون ئەوە

ماناکەیەتی.

تاقیکردنەوەی دەوری دووەم دەستیپێکرد، هێشتا هەواڵێک لە ئاغا ڕەزا نەبوو. مهری داوایکرد کۆلێژی ماف مۆڵەت بۆ هاوسەرەکەی بکەن تاکو لە خوێندن دەرنەکرێت. ڕۆژی (٢٢)ی ئەسفەند هەواڵیان بە مهری دا کە دەتوانێت سەردانی هاوسەرەکەی بکات لە زیندان. مهری کەوتبووە دڵەکوتە بەچاوێک دەگریاو بە چاوێک پێدەکەنی. مهری ڕۆیشت بۆ زیندان، دوای چەند کاتژمێرێک ڕاگرتن لەدەرەوە، کردیانە ژوورەوەو هاوسەرەکەی لەپشت شووشەیەکەوە بینی. ئاغا ڕەزا لاوازو بێهێز ببوو. ئاغا ڕەزا گوتی: دۆسیە کۆنەکەیان هێناوەتە پێشەوە بۆ لێکۆڵینەوە، پێیان گوتبوو تۆ پاسەوانێکی دەرکراویت و ڕابردووی (٩) مانگ زیندانی بوونیشت هەیە، تۆ خوێندکارەکانت هانداوە بۆ مانگرتن. مهری بە ئاغا ڕەزای گوت: پارێزەرێکی بۆگرتووە، هەردووکیان کەوتنە دڵدانەوەی یەکتری. ئاغا ڕەزا زۆر نیگەرانی هاوسەرەکەی بوو. مهری ئەوەشی پێڕاگەیاند، کە یەکەمی کۆلێژەکەی خۆی بووە. ئاغا ڕەزا بەوە خۆشحاڵ بوو سەد جار خۆی کرد بە قوربانی و هانی مهری دا بەردەوام بێت لە خوێندن. هەروەها گوتی: من هیچ کارێکی خراپم نەکردووەو هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر من نییە، تەنها دەڵێن تۆ سڵاو لە خوێندکارەکان دەکەیت و لەگەڵ هەموویاندا هاورێییەتیت هەیەو هاوکاری هەموو خوێندکارەکان دەکەیت، ئەم ڕەفتارانەت بۆ ئەوەیە خوێندکاران پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ تۆدا هەبێت، دەتەوێت هەموویان تۆ بناسن، تۆ ئەوان دژی حکومەت هاندەدەیت، تۆ ڕقی ئەوەت لە حکومەت هەیە کە لە پاسەوانیی دەرکراویت و دەتەوێت تۆڵەی خۆت بکەیتەوە.

ئاغا ڕەزا دەیگوت: نازانێت چۆن بۆیان بسەلمێنێت کە ڕەوشتی ئەو بەو جۆرەیە و هەروەکو هەموو خەڵکانی ئاساییە، وەکو هەموو خەڵکانی شارە بچووکەکان، ڕەوشتی ئەو هەروەکو ڕەوشتی چەند هەزارساڵەی خەڵکانی سەر ڕووی زەوییە، وەکو هەموو خەڵکانی شوێنە دێرینەکانی ئەم وڵاتەیە. ئاغا ڕەزا چۆن بڵێت کاتێک ئەو لەگەڵ هاوپۆلەکانی گەرموگوڕە، تاوانی کەلتووری باوک و باپیرانییەتی، ئەو هێشتا فێری کەلتووری خەڵکانی شارە گەورەکان نەببوو، ئەو هێشتا بەمانای وشە ئێرانییەکی بەڕەوشت بوو، ئێرانییەک لەسەر کەلتووری چەند هەزارساڵەی ڕاستی، ڕاستگۆیی، هاوکاریکردن و خۆشەویستی و شادیخواستن بۆ خەڵکانی تر. ئەو لە شارێکدا ژیابوو

کە لەکاتی خوداحافیزی نزای خێریان بۆ یەکتری دەکرد. ئەو لە شارێکدا ژیابوو کە ماڵی سەرۆکی یەهودییەکان بەتەنیشت مزگەوتی موسڵمانەکانەوە بوو، لە شارێکدا کە گۆڕستانی یەهودییەکان و موسڵمانەکان بەتەنیشت یەکەوە بوون، لە شارێکدا کە یەکەمین قوتابخانەیان لەلایەن زەردەشتییەکانەوە دروستکرابوو، لە شارێکدا ژیابوو کە زیاتر لەسەدا سی موڵکی ئەو شارە هی زەردەشتییەکان بوو، لە شارێکدا ژیابوو کە پەیڕەوانی سێ دین لە یەک تانکی ئاویان دەبردو لە یەک نانەوا نانیانێ دەکڕی، لە شارێکدا کە موسڵمان و زەردەشتی و یەهودی لە یەک جۆگەئاودا هاوبەشی یەکتر بوون، چ هاوژیانی و ئاشتەواییەک، چ پلەوپایەو کەسایەتییەک، هەموو خەڵکانی ئەم وڵاتەی ئێمە بەوجۆرە بوون. مەگەر ئەو ئەخلاق و هاوژیانی و پێکەوەهەڵکردنە لە ئازربایجان، کوردستان، گێلان، خۆراسان، ئەسفەهان، بلوجستان و تەواوی شوێنەکانی تر نەبووە؟ کەچی ئێستا لە لێکۆڵینەوەدا بە ئاغا ڕەزا دەڵێن بۆچی سڵاوت لە هەموو هاوپۆلەکانت دەکەیت. بەڕاستی تۆمەت و تاوانێکی سەیریان لەمل پێچاوە. نەفرەت لەوکەسانەبێت کە بەدەستی ئەنقەست دووبەرەکی لەنێوان گەلان و مەزهەبەکاندا دروست دەکەن. کارمەندانی ساواک هەستیان بە کەلتووری دەوڵەمەندو ڕیشەداری دانیشتووانی وڵاتمان نەدەکرد، هیوادارم ئەوانیتر هەستی پێبکەن.

کارمەندانی ساواک لەو قسانە تێنەدەگەیشتن، یان نەیاندەویست تێبگەن، ئەوان دەیانویست لەجیاتی کەلتووری ئازادی و هاوکاری و پێکەوەژیان کەلتووری دیکتاتۆریی بچەسپێنن، ئەوان نەیاندەزانی ئاغا ڕەزا ڕۆژی سەد جار سوپاسی خودا دەکات کە لە پۆلیسی و پاسەوانی دەریانکردووە. کارمەندانی ساواک دەیانزانی کە ئاغا ڕەزا مەی دەکڕێت و دەخواتەوە، کەواتە ئەو کەسێکی موسڵمانی سیاسی نییە، لە بەرامبەر ئەوەدا دەیانگوت ئەو کۆمۆنستێکی تودەییە.

ئاغا ڕەزا هیچی لەبارەی کۆمۆنیست و کۆمۆنیستبوونەوە نەدەزانی. زیندان بۆ ئەو وەک پۆلێکی خوێندن وابوو، ڕۆژێک کارمەندێکی شەمەرئاسا فەلاقەیەکی باشی کرد، داوای ئەوەی لێدەکرد کە ددان بەوەدا بنێت کە ئەو کۆمۆنیستێکی تودەییە. داوای لێکرد کە ناوی هاوڕێ حیزبییەکانی بڵێت. کارمەندەکە پێیدەگوت: پاسەوانێک کە ڕەشوە وەرنەگرێت، کارەکەی بەباشی ئەنجام نادات. ئەم واستەکردن و ڕەشوەدانە تێکەڵ بەخوێنمان بووە. کاتێک دەچیتە بەردەرگای خودا، ئیمامێک یان ئیمامزادەیەک دەکەین

بە واستەو دوایی بۆ ئەو ئیمامە مەڕێک، یان هەر ئاژەڵێکی تر دەکەین بەخێر. کاتێک بۆ کارێک دەمانەوێت بچین بۆلای وەزیرێک، یان بەڕێوەبەرێک، یان هەر کاربەدەستێک، کەسێک دەکەین بە واستەو لەگەڵ خۆماندا دەیبەین، خۆ ئەو کەسەش کەوا واستەمانە برە پارەیەک، یان دیارییەکی دەوێت.

ئاغا ڕەزا ڕۆژانە لەدوای ئەشکەنجەدانی دەیانبرد بۆ ژووری تاکەکەسی،٠ لەو ژوورە بچووکەدا دەکەوتە یادی مهری، دڵی تەنگ دەبوو، هەندێکجاریش لەتاو ئازاری لێدان و دووریی مهری دەستیدەکرد بە گریان. بەردەوامیش قسەکانی شەهربانوو لە گوێچکەیدا دەنگیدەدایەوە. (لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیەو لە هەر پەندێکدا نیعمەتێک هەیە)، هەندێکجاریش بیری لەوە دەکردەوە دەبێت لەم لێدان و ئازاردان و سوکایەتیپێکردنە چ نیعمەتێکی شاراوە هەبێت. حسابی مانگ و ڕۆژی لێ تێکچوو بوو، تەنانەت تاقەتی ئەوەشی نەبوو بە نینۆکەکانی خەت بە دیواری ژوورەکەدا بهێنێت، هێزو توانای نەمابوو، ژووری تاکەکەسی چوار دیوارێکی بچووک بوو لەگەڵ بنمیچێکی بەرزو پەنجەرەیەکی بچکۆلانە کە ناڕاستەوخۆ ڕووناکییەکی لێ دەهاتە ژوورەوە، ڕووناکییەکە تەنها ئەوەندە بوو کە بزانرێت شەوە یان ڕۆژە. گڵۆپێکی بچووکیش لە بنمیچەکەوە هەڵواسرابوو، بنمیچێک کە بەرزییەکەی نزیکی چوار مەتر دەبوو. ئاغا ڕەزا لەو ژوورە تاریک و بچکۆلانەیەدا هەندێکجار بیری لە ئیمام موسای جەعفەر دەکردەوەو دەیگوت: هەرچۆنێک بێت ئەم زیندانە لە زیندانەکەی ئیمام موسای جەعفەر باشترە، هەندێکجاریش بۆ ئیمام موسای جەعفەر فرمێسکی دەڕشت، هەندێکجاریش یادی چارەنووسی یوسف پێغەمبەری لە زینداندا دەکردەوە.

لە ژوورە تاکەکەسییەکانی تری نزیکییەوە دەنگی هاوارو ناڵەو گریان دەهات، ئاغا ڕەزا پێی سەیربوو کە چۆن کەسێک دەتوانێت ئەوەندە ستەمکارو بێبەزەیی بێت، ئێستا ئەگەر کەسێک پێیگوتووە لەو بەندکراوە بدات، چۆن ئەوەندە بەهێز لێی دەدات، وای هەستدەکرد ئەوکەسەی زیندانەکان ئەشکەنجە دەدات، چێژ لە لێدان و ئازاری زیندانییەکان دەبینێت، وای هەستدەکرد ئەوانە جۆرێک لە شێتییان هەیە. کاتێک زیندانییەکان بەدەم ئازارەوە هاوار دەکەن، ئەوان پێدەکەنن، هەربۆیەش ئاغا ڕەزا لە دڵەوە سەدان جار سوپاسی خودای دەکرد کە کەسێکی ئەشکەنجەدەر نییە. هەندێک جار لەبەرخۆیەوە دەیگوت: نیعمەتێک لەم دەردو ئازارەدا دەبینم کە ئەویش خۆناسینە.

لە هەر چرکەیەکدا سەدان جار نەفرەتی دەکرد لە دایک و باوکی ئەو کەسانەی کە کاریان ئەشکەنجەدان بوو، ئەو هەرگیز نەیدەویست لە جێگای ئەوان بێت. لەو ژوورە نیوەتاریکەدا دەستی بەسەر برینەکانیدا دەهێنا، هەستی دەکرد خودا هێواش هێواش ئازارەکانی دەشکێنێت. ئەو بەردەوام درودی دەنارد بۆ دایک و باوکی خۆی کە بە نانی حەڵاڵ بەخێویان کردووەو فێر نەبووە بەو کارە حەرامە نان پەیدابکات. لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئەمەش خۆی لەخۆیدا نیعمەتێکە خودا پێی بەخشیوم، سوپاس بۆ خودا کە من کەسێک نیم خەڵکی ئەشکەنجە بدەم. ئەوەندەش خۆشحاڵبوو بەوەی کەسێکی ئەشکەنجەدەر نییە، لەخۆشییاندا هەموو ئێش و ئازارو دەردی دووری و نادادپەروەری فەرامۆش دەکرد. شوێنی لێدانی قامچییەکان هەمووی ببوون بە برین، بەشێک لە برینەکان چڵکیان کردبوو، بەڕادەیەکی وا تای لێهاتبوو.

ڕۆژێکیان کە بەهۆی برینەکانییەوە تای لێهاتبوو، دەیان قامچی لێدرا. لە تاو ئازار لەهۆش خۆی چوو، لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا بوورایەوە. یەک سەتڵ ئاوی ساردیان بە سەروچاویدا کرد، دوو کارمەند چوونە ژێر باڵییەوەو بردیانەوە بۆ ژوورە تاکەکەسییەکە، وێنەیەکی شا لەسەر دیوارەکە بوو. ئاغا ڕەزا چاوی بە وێنەکە کەوت، هەموو گیانی کەوتە لەرزە و لەبەرخۆیەوە گوتی: منی کاڵفام سوێندم بەسەری تۆ دەخوارد، کەچی ئەوەتا لە شوێنی ئەشکەنجەکەتان وێنەت هەڵواسراوە. لەدڵەوە گوتی: مردن بۆ دیکتاتۆر، مردن بۆ زاڵم و خوێنڕێژ، مردن بۆ هەرکەسێک زوڵم لە خەڵکی و لە میللەت بکات. لەپڕێکدا هەستی بەمانای ئازادیی کرد، لەپڕێکا ئازادیی لە مهری زیاتر خۆشەویست، ئازادیی خۆی و هەموو کەسێکی بە سڵاوکردن دەزانی. ئەو لەبیرکردنەوەی خۆیدابوو تێگەیشت کە دکتۆر بە کارمەندانی گوتووە، ئێوە زیادەڕۆییتان کردووەو زۆرتان لێداوەو پێویستە چەند ڕۆژێک پشووبدات و لێی نەدرێت. ئاغا ڕەزا لەبەرخۆیەوە دەیگوت: من تاوانبار نیم و کۆمۆنیست نیم. خۆ ئەگەر کۆمۆنیستیش بم، مردنم پێ باشترە لەوەی لەبەردەمی ئەم جەللادانەدا دانی پێدابنێم، ئینجا گوتی: نیعمەتێک لەم کێشەیەدا بەدیدەکەم ئەوەیە، کە هەست و شعوری مرۆڤ لێرەدا زیاد دەکات. قینی لە نەزانیی خۆی دەبووەوە. دەیگوت: من سوێندم بەسەری ئەم ناپیاوە ستەمکارە خواردووە، هەر لەوێدا بڕیاریدا کە هەرگیز سوێند بە گیانی هیچ دەسەڵاتدارێک نەخوات و شوێن هیچ زۆردارێک نەکەوێت.

سەرەنجام مۆڵەت بە ئاغا ڕەزا درا کە هاوسەرەکەی سەردانی بکات، ئەوەش نیشانەی خۆڕاگریی و سەرکەوتنی ئاغا ڕەزا بوو. کاتێک مهری چوو بۆ زیندان و چاوی بە ئاغا ڕەزا کەوت بە ڕوخساریدا بۆی دەرکەوت کە چییان بەسەردا هێناوە. ڕوخساری شێواو و ماندووی ئاغا ڕەزا خەنجەرێک بوو لە دڵی مهری درابوو. ئەو هاوسەرەکەی لە هەموو کات زیاتر خۆشدەویست، لەبەر خۆیەوە گوتی: پێویستە کارێک بکەم.

مهری سەری لێ شێوابوو نەیدەزانی چی بکات؟ ڕۆیشت بۆلای بریکارەکەی. ئەو مامۆستا بەڕێزە گوتی: تا ئێستا مۆڵەتیان پێنەداوە چاوی بە ئاغا ڕەزا بکەوێت. نزیکەی چوار مانگ بوو ئاغا ڕەزا لە زینداندا بوو، هێشتا بریکارەکەی چاوی پێی نەکەوتبوو. دکتۆر عەبدولحەمیدی ئەبولحەمد گوتی: هەوڵدەدا چاوی بکەوێت بە وەزیری داد تاکو مۆڵەتی لێوەربگرێت کە ڕێگای بدرێت چاوی بە ئاغا ڕەزا بکەوێت و سەیری دۆسیەکەشی بکات. مامۆستا داوای لە مهری کرد ئەگەر کێشەی بێپارەیی هەیە، پێی بڵێت تاکو هاوکاری بکات و بڕەپارەیەکی بە قەرز پێبدات. مهری گوتی: هیچ پێویستییەکی بە پارە نییە، تەنها داوای لە مامۆستا کرد هەرچی زووە کارێک بکات چاوی بە ئاغا ڕەزا بکەوێت و چاوێک بە دۆسیەکەیدا بخشێنێت، هەروەها ئەوەشی پێگوت لە زینداندا زۆریان لە هاوسەرەکەی داوە.

مهری لەژێر درەختێکدا لە حەوشەی زانکۆ دانیشتبوو، فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتنەخوارەوە، بیری لە داماوی و بێکەسی خۆی دەکردەوە، ئەو ڕەنگ و ڕوخسارە جوانەی جارانی نەمابوو، تەواو نیگەران ببوو، کەوتبووە ژێر بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە. لەناکاو گوێی لە دەنگێک بوو، دەنگی یەکێک لە هاوپۆلەکانی بوو، کچێکی گەنجی جوان بوو، میهرەبانی بەڕوخسارییەوە دیاربوو. ئەو هاوپۆلەی تا ئەوکاتە ئەوەندە لەگەڵ مهریدا قسەی نەکردبوو، هەواڵی ئاغا ڕەزای لێپرسی. مهریش دردەدڵی بۆکردەوە، باسی زیندانیکردن و لێدانی ئاغا ڕەزای بۆکرد، ئەو کچە تەواو گوێی بۆ گرتبوو. مهری زیاتر لە نیو کاتژمێر قسەی بۆکرد. ئەو کچە گوتی: ئەگەر کارێک، فەرمانێکت هەبێت من لەخزمەتتدام و خودا حافیزی کردو ڕۆیشت. دوای دوو ڕۆژ دوو کچی تر بۆ سۆراغی مهری هاتن و خۆیان پێناساند، ئەوان هەردووکیان خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیاری بوون، ئەوان گوتیان دەزانین هاوسەرەکەت زیندانی کراوە، زۆر میهرەبانانە قسەیان لەگەڵ مهریدا کردو پێیانگوت: زۆر دڵنیابێت لێیان و هەر کارێکی هەبێت پێیان

بڵێت. پەیوەندی ئەو دوو کچە ڕۆژانە لەگەڵ مهریدا زیاتر دەبوو. زۆربەی ڕۆژ لە کۆلێژ چاویان بە مهری دەکەوت و قسەیان لەگەڵدا دەکردو دڵخۆشییان دەدایەوە. چەندجارێک ویستیان پارە بەقەرز بدەن بە مهری. ناونیشانی ماڵەکەیان لێوەرگرت، ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ سەردانێکیان کرد بۆ ماڵەوەو هەندێک دیارییان بۆ بردبوو، ئەوانیش دوانیوەڕۆیەک مهرییان بانگێشت کرد بۆ ماڵی خۆیان، گوتیان خەڵکی دەرەوەی تارانن و لێرە خانوویەکیان گرتووەو بەیەکەوە دەژین.

مهری بەردەوام هاوتوچۆی ماڵی ئەو دوو کچەی دەکرد، ئەوان ماڵێکی سادەیان هەبوو، خانوویەکی سەربەخۆیان گرتبوو کە پێکهاتبوو لە سێ ژوورو ژووری چێشتخانە، ماڵەکە هەموو پێداویستییەکانی تێدابوو لە هیچ شتێکیان کەم نەبوو، دیاربوو هیچ کێشەیەکی ئابوورییان نەبوو، ئەوان بەردەوام گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتریدا دەکردو قسەی بەجێیان دەکرد، جۆرە باسێکیان دەهێنایە پێشەوە، کە مهری تاکو ئەوکاتە لەو قسەو باسانەی نەبیستبوو. ڕۆژێک یەکێک لە کچەکان لە مهری پرسی تۆ کتێبی (جەنگ و ئاشتی) تۆلستۆت خوێندۆتەوە. مهری گوتی: نەخێر هەر ناویشیم نەبیستووە، ئەو کچە کتێبی (جەنگ و ئاشتی) پێداو گوتی: بیخوێنەرەوە. مهری کتێبەکەی خوێندەوەو لە ڕوانگەی ئەوەوە کتێبێکی زۆرباش بوو، تاکو ئەوکاتە کتێبی لەو جۆرەی نەخوێندبۆوە. بە هاوڕێکانی گوت: کتێبەکەی تەواو کردووە، بڕیاڕبوو ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ بچێت بۆ ماڵیان و تاکو لەبارەی کتێبەکەوە گفتوگۆ بکەن. کاتێک مهری گەیشتە ماڵەکە کچێکی تریش لەوێ بوو. ئەو کچە خوێندکاری کۆلێژی زانست بوو، کەوتنە گفتوگۆ بەیەکەوە بەجۆرێک قسەیان دەکرد کە مهری تاکو ئەو ڕۆژە ئەو جۆرە قسەو باسانەی نەبیستبوو، ئەو قسانەی ئەوان دەیانکرد بەلایەوە تازە بوون و زۆری بەلاوە خۆشبوون، لەو ڕۆژە بەدواوە هاتوچۆی مهری بۆلای ئەو کچانە و تێکەڵاوییەکەیان زیاتر بوو. مهری جگە لە کتێبەکانی زانکۆ، ئەو کتێبانەشی دەخوێندەوە کە ئەو کچانە پێیان دەدا. لەوانە بەرهەمەکانی (دیسکۆ فسکی) برایانی کارامازۆف، ماڵە مردووەکان، قومارباز، ڕۆمانەکانی (چیخۆف) ڕۆمانی دایک لە نووسینی (ماکسیم گۆرگی) کتێبی کرێکارانی دەریاو بێنەوایان لە نووسینی (فیکتۆر هۆگۆ)، خوێندنەوەی ئەو کتێبانە کاتە بەتاڵەکانی مهرییان پڕدەکردەوە. ئەو ئیتر کاتی ئەوەی نەبوو بیر لە گرفتارییەکانی بکاتەوە.

## دایکی ئاغا ڕەزا لە تاران

تاقیکردنەوەی دەوری دووەم نزیک ببووەوە، دایک و برای ئاغا ڕەزا لە یەزدەوە هاتبوون بۆ تاران، دایکی ئاغا ڕەزا دەیویست سەردانی کوڕەکەی بکات. مهری ڕۆیشت بۆ زیندانی (قزڵ قەڵا) ڕۆیشت بۆلای سەرۆکی زیندان و تکای لێکرد مۆڵەت بدات دایک و برای ئاغا ڕەزا سەردانی کوڕەکەیان بکەن. سەرۆکی زیندان ئەفسەرێکی پلەبەرز بوو، کەسێکی باڵابەرزو میهرەبان بوو. بە مهری گوت: سبەی کاتژمێر (٩)ی بەیانی دایکی ئاغا ڕەزا بێهێنە. مهری گوتی: بەڵام براکەشی لە یەزدەوە هاتووەو دەیەوێت چاوی بە براکەی بکەوێت. ئەیوبی ئەفسەر گوتی: سەردانیکردنی هاوسەرەکەت قەدەغەیە، من لەسەر بەرپرسیارێتی خۆم و بەمۆڵەتی خۆم ڕێگا دەدەم دایکی سەردانی بکات. مهری زۆر تکای لێکرد. ئەفسەرەکە گوتی: من ناوم ئەیوبە براکەشی دەبێت سەبری ئەیوبی هەبێت، تۆ بەیانی براکەی بهێنە، بەڵکو دوایی بتوانم کارێک بۆ براکەی بکەم. سبەی مهری لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەیدا چوون بۆ زیندانی قزڵ قەڵا. ڕێگەیان بە دایکی ئاغا ڕەزا دا بچێت بۆ سەردانیکردنی کوڕەکەی، لەدوای سەردانەکە بەرەوماڵ گەڕانەوە، لە ڕێگادا دایکی ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: شووکردنی تۆ بەکوڕەکەم شووکردنێکی شووم بوو، هەموو دەردەسەرییەکانی ئاغا ڕەزا بەهۆی تۆوە بوو. مهری تاقیکردنەوەی هەبوو ڕاکەڕاکیشی بوو بەدوای ژیاندا، تانەو لۆمەی خەڵکیشی دەبیستەوە. براکەی ئاغا ڕەزا ئامۆژگاری دایکی دەکردو دەیگوت: ئەم مهرییە داماوە خۆی تووشی گرفتاری بووە، تۆش بەس تانەی لێ بدە. دایکی ئاغا ڕەزا قسەکانی دووبارە دەکردەوەو دەستیدەکرد بە تانەلێدان. دەیگوت کوڕەکەم وەجاخی کوێرە، تائێستا دووجاریش زیندانی کراوە... دوای هەفتەیەک ئەیوبی ئەفسەر دووبارە مۆڵەتی دایەوە بە دایکی ئاغا ڕەزا تاکو بچێتەوە بۆ دیدەنی کوڕەکەی، ئەمجارەیان ئەسغەریش توانی بچێتە زیندان و براکەی ببینێت. ئەوکاتە ناوەڕاستی تاقیکردنەوەی دەوری دووەم بوو، کاتێک دایکی ئاغا ڕەزا لە سەردانیکردنەکە گەڕایەوە، دەگریاو دەیگوت: کوڕەکەم لات و بێهێز بووە، دیارە زۆریان لێداوە. ڕوویکردە مهری و گوتی: چۆن دەتوانیت بخوێنیت و بچیت بۆ زانکۆ، وا هاوسەرەکەت لە زیندانەو تۆش سەرت بەسەر کتێبدا شۆڕکردۆتەوە، ئێستا کە ئاغا ڕەزا لە زیندانەو تۆ لە تاران ناتوانیت هیچ کارێک بکەیت، هەڵسە کەلوپەلەکانت کۆبکەرەوەو لەگەڵ ئێمە وەرەوە بۆ یەزد، چۆن ئێمە ژنێکی گەنج و جوان لە تاراندا

بەرەڵلا دەکەین؟ خەڵکی چیمان پێدەڵێن؟ هەڵسەو با بڕۆین؟ مهری گوتی: دوو هەفتەی تر تاقیکردنەوەکانم تەواو دەبێت و دوای چەند ڕۆژێکی تر خۆم دێمەوە بۆ یەزد.

مهری بەیانی زوو چوو بۆ زانکۆ بۆ تاقیکردنەوە، کاتێک گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، سەیریکرد دایکی هاوسەرەکەی کەلوپەلی ناوماڵەکەی کۆکردۆتەوە. گوتی: بۆچی ئەم کەلوپەلانەت کۆکردووەتەوە، دایکی هاوسەرەکەی گوتی: هەر ئەمڕۆ تۆش لەگەڵ ئێمەدا دێیتەوە بۆ یەزد، کەلوپەلەکانم کۆکردووەتەوە ئەمڕۆ کاتی عەسر هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ یەزد. مهری گوتی: لەم کاتی تاقیکردنەوەیەدا من چۆن بێم بۆ یەزد؟ خۆ دەبێت پرسێک بە هاوسەرەکەم بکەم. دایکی هاوسەرەکەی گوتی: من قسەم لەگەڵ ئاغا ڕەزادا کردووە ئەو بەوە ڕازییە تۆ بگەڕێیتەوە بۆ یەزد. مهری ڕۆیشت بۆ ماڵی ئاغا تەقی. سولماز خانم و ملینا خانم بەیەکەوە چوون بۆلای دایکی ئاغا ڕەزا، براکەی ئاغا ڕەزا لەماڵ نەبوو، دیاربوو لەگەڵ دایکیدا کردبووی بە شەڕو لە ماڵەوە ڕۆیشتبووە دەرەوە. ئەو ژنانە زۆر قسەیان لەگەڵ سەکینە خانمدا کرد، بەڵام هیچ سودێکی نەبوو، ئەو دەیگوت: خەڵکی چۆن بووکێکی جوان و گەنج لەم شارە بۆگەنەدا بەرەڵلا دەکات.

سەکینە خانمی دایکی ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: هەڵسەو پێشمکەوە با بەزوویی بڕۆین بۆ گەراج، دەبێت هەر ئەمڕۆ بگەڕێینەوە بۆ یەزد. هەرچەند مهری هاواریکرد کە سبەی تاقیکردنەوەم هەیە، بەڵام هیچ سودێکی نەبوو. سەکینە خانم خێرا خێرا دەیگوت: هەر ئەمڕۆ بەیەکەوە دەڕۆینەوە بۆ یەزد. ملینا گوتی: زۆرباشە، تۆ بڕۆ بلیتی یەزد وەربگرە، منیش مهری ئامادە دەکەم تاکو لەگەڵ تۆدا بگەڕێتەوە بۆ یەزد. سەکینە خانم گوتی: بەڵام من نازانم گەراج لە کوێوەیە، نازانم چۆنچۆنی بلیت وەربگرم؟ سولماز خانم بە مهری گوت: کتێبەکانت کۆبکەرەوە وەرە بۆ ماڵی ئێمە لەوێ وانەکانت بخوێنە، هەرکاتێک خەسوت ڕۆیشت بۆ وەرگرتنی بلیت، ئێمەش بەزوویی تۆ دەبەین بۆ گەراج. سەکینە خانم لەلایەکەوە دانیشتبوو چەند تانەو تەشەرێکی لە دراوسێکان داو هەڵساو ڕۆیشت بۆ وەرگرتنی بلیت. نزیکی ئێوارە بوو. براکەی ئاغا ڕەزا لەگەڵ جەعفەری ئامۆزای و گوڵناز هاتن، سەکینەخانم نەگەڕابووەوە، ئەو دوو پیاوە ڕۆیشتن بۆ سۆراغی سەکینە خانم. گوڵناز بە مهری گوت: وەرە با دووبارە کەلوپەلەکانت ڕێکبخەینەوە. مهری گوتی: بەخودا سبەی کاتژمێر هەشتی بەیانی سەختترین تاقیکردنەوەم هەیە. سولماز و ملینا گوتیان: خەم مەخۆ وەرە بۆ ماڵی ئێمەو وانەکانت بخوێنە، ئێمە بەهاوکاری گوڵناز

خانم ماڵەکەت بۆ ڕێکدەخەینەوەو خاوێنی دەکەینەوە.

سێ ژن، ئەرمەنی و تورک و باکووری کەلوپەلەکانیان ڕێکخستەوە، ناو ماڵەکەیان گسک داو چاییان لێنا. کاتژمێر (٩)ی شەو بوو ئەو دوو پیاوە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، دایکی ئاغا ڕەزاشیان لەگەڵ خۆیان هێنابووەوە ئەو ژنە ون ببوو، نەیتوانیبوو بلیتی یەزد بکڕێت، دوای گەڕانێکی زۆر دۆزیبوویانەوە، جەعفەر ئاغا سەکینە خانم و ئەسغەر ئاغای بردەوە بۆ ماڵی خۆیان. براکەی ئاغا ڕەزا بە مهری گوت: براژن من لەسەر قسەکانی دایکم داوای لێبووردن لە تۆ دەکەم، تۆ دڵنیابە هەرکارێکت هەبوو خۆم بۆتی ئەنجام دەدەم، سبەی من و دایکم دەگەڕێینەوە بۆ یەزد، هەر لەوێ خودا حافیزییان کرد. سەکینە خانم دەیگوت: من کوڕەکەم لە زینداندابێت و هاوسەرەکەشی لەم شارەدا بەرەڵڵابێت، چۆنچۆنی وەڵامی خەڵک بدەمەوە. مهری بەگریانەوە خەریکی خوێندنی وانەکانی بوو، سوڵماز خانم خواردن و میلنا خانمیش کێک و شیرینی بۆهێنا. ئەو دوو ژنە یەکێکیان شیعەی ئازەری و ئەویتریان ئەرمەنی ئازەری، لەگەڵ مهریدا زۆر میهرەبان بوون، ئاغا تەقی و لیۆنیش زۆردڵیان دایەوە، ئەو شەوە کاتێک مهری چووە سەر جێگای خەوتن، هەموو خەمەکانی فەرامۆشکردبوو. کاتێک دوایین تاقیکردنەوەی دا، ڕۆیشت بەرەو زیندان، ئەو ڕۆژە ڕۆژی دیداری زیندانییەکان نەبوو، خۆ ئاغا ڕەزا بە هیچ جۆرێک مۆڵەتی دیداری نەبوو، بەڵام مهری بە ئومێدی ئەیوبی سەرۆکی زیندان ڕۆیشت بۆ زیندان. سەرۆکی زیندان ئاغا ڕەزای خۆشدەویست و ڕێزی لێدەگرت. پاسەوانێک کە خرابووە کونجی زیندانەوەو بەرگەی خراپترین ئەشکەنجەی گرتبوو، نە دانی بەشتێکدا نابوو، نە ئامادەی هاوکاریکردن بوو، هەربۆیەش ئەمجۆرە کەسانە هەمیشە خاوەنی ڕێزن. مهری داوای لە ئەیوبی ئەفسەر کرد مۆڵەت بدات چەند خولەکێک چاوی بە ئاغا ڕەزا بکەوێت. ئەیوبی ئەفسەر گوتی: ناکرێت ئەوە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی من، بۆیە واباشترە سەبر بکەیت. مهری گوتی: بەخودا من ئەیوب نیم تاکو سەبرم هەبێت. ئەیوبی ئەفسەر پێکەنی، گوتی: تۆ چ کارێکت بە ئاغا ڕەزا هەیە، کە ئەوەندە پێداگریی دەکەیت چاوت پێی بکەوێت؟ مهری گوتی: تاقیکردنەوەکانم تەواو بووە وا هەستدەکەم من یەکەمی کۆلێژ بم، دەمەوێت خۆم ئەم هەواڵە بە ئاغا ڕەزا بگەیەنم و بزانم بەم هەواڵە چەند خۆشحاڵ دەبێت. ئەیوبی ئەفسەر دیدارێکی لە ژوورێکدا بۆ ڕێکخست و پێیگوت: ماوەی یەک کاتژمێر مۆڵەتت پێدەدەم لای ئاغا ڕەزا بمێنیتەوە.

ساڵی ( ٢٠١٣/١٣٩٢) بوو، مهری دەیگوت: ئەگەر ئەیوبی ئەفسەر لە ژیاندا مابێت خودا سەلامەتی بکات، ئەگەر مردووشە ڕوحی شادبێت. ئاغا ڕەزا دوایی گوتبووی خۆزگە هەموو کارمەندانی زیندانەکان وەکو ئەیوبی ئەفسەر دەبوون.

## خانووکڕین لە تاران

مهری پارەکانی کەمیکردبوو، ئاغا حەبیب گوتبووی ئیتر ناتوانێت کرێی دەزگای چنینەکانی بدات، گوتبووی: سەردەمی دەستگای چنینی ماڵان بەسەر چووە، کرێکارەکان دەیانەوێت بچنە کارگە گەورەکان بۆ کارکردن، لەوێ هەم بیمەیان دەبێت و هەم پارچە چنراوەکانی کارگەکان باشترن و خۆشیان کەمتر ماندوو دەبن.

سەردەمی پیشەسازی دەستی تەواو ببوو، کارگە گەورەکان دامەزرابوون تاکو کارگە بچووکەکانی شارەکان لەناوبەرن، ماڵە کۆنەکانی شارو لادێکانی ئێران کارگەیەکی بەرهەمهێن بوون. گۆڕانکارییەکی گەورە بەڕێگاوە بوو، ماڵە بەرهەمهێنەکان دەبووایە بگۆڕن بۆ ماڵانی خەرجکەر، بەشێک لە پارەی نەوتی ئێران دەبووایە بڕوات بۆ ئەوروپاو ئەمریکا، ئێستاش ساڵی (٢٠١٥/١٣٩٤) سەرەی وڵاتی چینە. ئەم کاڵا بێکەڵکەی چین ئابووری و پیشەسازی وڵاتی ئێمەی وێرانکردووە. ئەگەر ئەمریکاو بەریتانیا پیشەسازی ماڵانیان پەکخست، ئەوا وڵاتی چین و هاوکارەکانی لەناوخۆی وڵات کارگەکانی وڵاتیان مایەپووچ کرد. وڵاتێک کە سەردەمانێک هەرماڵێکی کارگەیەک بوو، ئێستا گەنجەکانی بێکارن. ئەگەر چەند گەنجێک بیانەوێت لەژێر زەمینی ماڵەکانی خۆیاندا کارو کاسبییەک بکەن، دەبێت بچن مۆڵەتی پیشەسازی وەربگرن. دەبێت ماوەی یەک ساڵ لەم فەرمانگەیەوە بچن بۆ ئەو فەرمانگە تاکو مۆڵەت وەربگرن. ئەوکاتەش پێیان دەڵێن بۆچی بێکارییە. ئەگەر حکومەت سێ کار بکات، من بەڵێندەدەم لەماوەی یەک ساڵدا لانیکەم یەک ملیۆن هەلی کار دەرەخسێت بەبێ ئەوەی حکومەت هاوکاریشیان بکات.

١-بەزوویی و لەماوەی یەک هەفتەدا مۆڵەتی کارکردن بدەن بە گەنجەکان.

٢-مۆڵەت بدەن-بە دامەزراندنی کارگەی بچووک لەو شوێنانەدا کە نا پیشەسازییە، ئەوەتا ئەگەر دوو کەس دوو کۆمپیوتەر لە ژێرزەمینی ماڵی خۆیان دابنێن و کاری پێبکەن، دەبێت بەترس و لەرزەوە کاری پێبکەن.

٣-حکومەت باج لەسەر کارەکەیان دانەنێت و بیمەیان بۆ دەستەبەر بکات.

ئیتر کرێی دەزگاکان نەدەگەیشتە دەستی مهری، کرێی خانووەکەی یەزدیش کەم بوو، بەشی خەرجیی ئەوی نەدەکرد. ئاغا تەقی خاوەنماڵەکەش کرێی لێوەرنەدەگرت، دەیگوت: تاکو هاوسەرەکەی لە زیندان بێت، پارەی لێوەرناگرێت. ئەو پیاوە ئازەرییە زۆر لەوە باشتربوو کە مهری بیری لێدەکردەوە، لێونی ئەرمەنیش ڕۆژانە هەواڵی مهری دەپرسی و پێدەگوت هەرکارێکت هەبێت بۆتی ئەنجام دەدەم، ڕۆژانە میوەو پەتاتەو نانی بۆ دەکڕی، مهریش بەزۆر پارەکەی پێدەدایەوە. لێون کاری میکانیکی دەکرد. ملینا شیرینی بۆ مهری دەهێناو سۆلمازیش خواردنی بۆ دەهێنا. گوڵنازیش هەفتەی یەک دوو جار ئەوی دەبرد بۆ ماڵی خۆیان.

تاقیکردنەوەکان تەواو بوون، بەهارەو مینا گەرموگوڕ بوون لەگەڵ مهریدا. بەهارەو مینا هەر ئەو دوو خوێندکارەی هاوڕێی مهری بوون کە چەند جارێک ئەویان بردبووەوە بۆ ماڵی خۆیان. شەوێک ئەویان لە ماڵی خۆیاندا هێشتەوە، ئەوان لەنێوان خۆیاندا وتووێژیان دەکرد. جارێکیان کە مهری چوو بۆ ماڵیان چەند خوێندکارێکی تریش لەوێ بوون. ڕۆژێکیان مهری لە کۆلێژ چاوی بە بەهارەو مینا کەوت. سەیری کرد وا ئەوان لە گۆشەیەکدا لەگەڵ کوڕێکی هاوپۆلی مهریدا قسە دەکەن، هەمان ئەو کوڕە بوو کە ڕۆژی پێشتر هەواڵی ئاغا ڕەزای لە مهری پرسیبوو. مهری تێگەیشت کە ئەو کوڕە بەهارەو مینای ناردوویانە بۆلای، هیچ قسەیەکی لەگەڵ کچەکاندا نەکرد. چەند ڕۆژێک لەوەدوا مهری سەیریکرد ئەو کوڕە جانتایەکی دایە دەست میناو بەخێرای لێی دوورکەوتەوە. مهری دڵنیابوو لەوەی ئەو کوڕە پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ بەهارەو میناد. بەهارە و مینا و هاوڕێکانیان بەجۆرێک قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد کە مهری لێیان تێنەدەگەیشت. گفتوگۆیان لەبارەی کرێکاران و کێشەی کرێکاری دەکرد. باسی سۆڤیەت و کۆباو ڤێتنامیان دەکرد. لە گفتوگۆکانیاندا جۆرە وتەیەک بەرگوێی مهری دەکەوت کە پێی ئاشنا نەبوو، فیدڵ کاسترۆ، چێ گیڤارا، لینین، ستالین، ماوتسی تۆنگ، هۆشی مینە. مهری تێکەڵاوی گفتوگۆکانیان نەدەبوو. ئەوانیش ئەویان نەدەهێنایە ناو گفتوگۆکانیانەوە، بەڵام ئەو گوێی بۆ گفتوگۆکانیان گرتبوو، ئەوانیش بەجۆرێک قسەکانیان دەردەبڕی تاکو مهری گوێبیستی قسەکانیان ببێت.

هاوین بوو کاتی بێکاریی بوو، مهری لەماڵەوە خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو، هاوکاری ملینازی دەکرد لەکاری شیرینی دروستکردندا. زیاتر لەکاتی عەسردا دەچوو

بۆ ماڵی بەهارە و مینا بۆ سەردانیکردنیان، دڵی زۆر بە ئەوان دەکرایەوە، حەزی بە گفتوگۆکانی ئەوان دەکرد، لەلای ئەوان جۆرە وتەیەکی دەبیست کە تاکو ئەوکاتە لە هیچ شوێنێک بەرگوێی نەکەوتبوون، هاوڕێکانی بەهارەو میناش کەسانی بەڕێز بوون. مهری کتێبەکانی، بینەوایان، جەنگ و ئاشتی، هاوڕێیانی کارامازۆف و ماڵە مردووەکانی تەواوکردبوو. کتێبەکانی دایەوە دەست بەهارە، بەهارەش کتێبێکی تازەی پێدا، کتێبێکی بچووکی بەرگ سپی بوو. بەهارە گوتی: ئەمە کتێبێکی زۆرباشە کاتێک خوێندتەوە زۆر هۆگری دەبیت، بەڵام هۆشیاربە کەس ئەم کتێبەت پێنەبینێت. لەسەر بەرگی کتێبەکە هیچ نووسراوێک نەبوو، مهری لەماوەی دوو ڕۆژدا ئەو کتێبەی خوێندەوە، ئەو کتێبە لەبارەی ژیانی مارکس و ئەنگلسەوە بوو.

مهری زۆر بیری باوکی و خوشکەکانی دەکرد، بەڵام حەزی نەدەکرد بچێت بۆ یەزد. حەزی بەدیدارو قسەکانی دایکی هاوسەرەکەی نەدەکرد. دەیویست هەر لە تاراندا بمێنێتەوە تاکو هەلێکی بۆ هەڵکەوێت و چاوی بە هاوسەرەکەی بکەوێت، چونکە زۆری بیر دەکرد، بەڵام بێپارەییش فشارێکی زۆری بۆ هێنابوو، بۆیە بڕیاریدا مەکینەی دروومانەکەی لە یەزدەوە بهێنێت بۆ تاران تاکو بتوانێت لە تاران دروومانی پێبکات و بەڵکو پارەیەکی پێ پەیدا بکات، ئەو بابەتەی لەلای ملینا و سوڵماز باسکرد. ئاغا تەقی و لیۆن تێگەیشتن کە مهری بێ پارەیە، ئەوان دەیانزانی کە ئاغا ڕەزا لە یەزد خانوویەکی هەیە. ڕۆژێک لیۆن و ئاغا تەقی چوون بۆلای مهری و پێیانگوت لە نزیکی پێچەکانی شەمیران دووکانێک هەیە. ڕووبەرەکە (٤٧) مەتر دووجایە، لەسەر دووکانەکەش دوو ژوورو حەمام و ئاودەست هەیە. خاوەنەکەی دەیەوێت بیفرۆشێت، لەوەیە بە (٣٥) هەزار تومەن بتوانن لێی بکڕن. ئەوان داوایان لە مهری کرد لەگەڵ ئاغا ڕەزادا قسە بکات، ئەگەر ڕازی بوو خانووەکەی یەزد بفرۆشێت و ئەو خانووە بکڕێت. لیۆن گوتی: ئەو خانووە دووکانەکەی مانگانە حەوتسەد تا هەشتسەد تومەن کرێ دەکات. خۆشتان دەتوانن لە قاتی سەرەوە دانیشن. مهری گوتی: بەزووترین کات هەوڵدەدەم بۆچوونی ئاغا ڕەزا وەربگرم، دووبارە ئاغا ئەیوب پیاوەتییەکی گەورەی کرد، مۆڵەتی دا ماوەی یەک کاتژمێر مهری لەگەڵ ئاغا ڕەزادا بەیەکەوە بمێننەوە. ئاغا ڕەزا لەسەر کاغەزێک بە دەستوخەتی خۆی مۆڵەتی فرۆشتنی خانووی یەزدی بۆ مهری نووسی. مهریش بەزوویی ڕۆیشت بۆ یەزد. بەزوویی خانووەکەی بە بڕی (٢٨) هەزار تومەن فرۆشت.

کڕیار گوتی: مهری و ئاغا ڕەزا ڕازین بەوەی هەرکاتێک ئاغا ڕەزا لە زیندان ئازادکرا تاپۆی خانووەکەی بخەنە سەر. ئەوکاتە قسەو دەستنووس متمانەی هەبوو. مهری کەلوپەلەکانی گواستەوە بۆ ژێرزەمینی ماڵی باوکی، ئەو کتێبانەش کە مابوونەوە، ئەوانیشی گواستەوە بۆ ئەوێ. کتێبەکانی لەهەمان ژووری شەهربانوو دانا، لەپڕێکدا مهری قسەکانی دایەگەورەی وەبیرهاتەوە کە گوتبووی ئەم کتێبانە زۆر بەنرخن. مهری گوتی: چەند دانەیەک لەم کتێبانە لەگەڵ خۆمدا دەبەم بۆ تاران بەڵکو لەوێ کەسێک لێمان بکڕێت. شەش کتێبی جیاکردەوەو لەگەڵ کەلوپەلەکانی پێچانەوە، تا لەگەڵ خۆیدا بیانبات بۆ تاران. لەگەڕانەوەیدا بۆ تاران محەمەد عەلی باوکیشی لەگەڵیدا چوو بۆ تاران.

لە تاران بەهاوکاری لیۆن و ئاغا تەقی مامەڵەی دووکان و خانووەکەیان کرد، فرۆشیار لە (٣٤) هەزار تومەن نەهاتە خوارەوە، مهریش شەش هەزار تومەنی کەم بوو. دەیگوت: ناتوانم ئەم دووکان و خانووە بکڕم. لیۆن گوتی: من دەتوانم دوو هەزار تومەنت بەقەرز پێبدەم. ئاغا تەقیش کەسێکی دۆزییەوە کە بۆماوەی دوو ساڵ دووکانەکەی بەکرێ پێبدەن، بە پێدانی پێشەکی پێنج هەزار تمەن و مانگی بە پێنجسەد تمەن. بەوجۆرە پارەکە ئامادەکرا، لەماوەی یەک هەفتەدا کاری کڕین و فرۆشتن ئەنجامدرا. محەمەد عەلیش بڕی پێنجسەد تومەنی دا بە کچەکەی. مهری نیوەی پارەکەی لیۆنی دایەوە، لیۆن پارەکەی وەرنەگرتەوە، بەڵام مهری پێداگری کرد تاکو هەزار تومەنی لێوەربگرێتەوە. سەرەنجام مهری کەلوپەلی ماڵەکەی گواستەوە بۆ قاتی سەرەوەی ئەو خانووەی کە کڕیبووی.

ئەو خانووە لە ماڵی ئاغا تەقییەوە زۆر دوور نەبوو، مهری لەگەڵ باوکیدا ڕۆیشتن بۆ زیندان، محەمەد عەلی شیرینی یەزدی بۆ ئاغا ئەیوب هێنابوو. مهری لەبارەی باشی و میهرەبانی کارمەندانی زیندانەوە زۆر قسەی بۆ باوکی و دەورووبەری کردبوو. مهری شیرینییەکەی پێشکەش بە ئاغا ئەیوب کرد. ئاغا ئەیوبیش شیرینییەکەی لێوەرنەگرت. مهری زۆر هەوڵیدا تاکو ئاغا ئەیوب شیرینییەکەی لێوەرگرت، پاشان مهری تکای لە ئاغا ئەیوب کرد کە مۆڵەتی خۆی و باوکی بدات سەردانی ئاغا ڕەزا بکەن. ئاغا ئەیوب مۆڵەتی پێدان کە دووسبەی مۆڵەتی چاوپێکەوتنیان بۆ جێبەجێ بکات. دوای دوو ڕۆژ محەمەد عەلی چاوی بە ئاغا ڕەزا کەوت. ئاغا ڕەزا تەواو لات و بێهێز ببوو، بەڵام

دەروونێکی بەهێزی هەبوو، گوتی: ماوەی دە ڕۆژ دەبێت ئەشکەنجەدانی تەواوبووەو دادوەرەکەی سەردانی کردووە. دکتۆر ئەبدولحەمد پێیگوتووە سەیری دۆسیەکەی کردووە، هیچ شتێکی خراپ لە دۆسیەکەیدا نییە. ئاغا ڕەزا ئومێدی هەبوو کە ئازاد بکرێت، ئەو هەشت مانگ بوو لە زینداندا بوو، بەهەواڵی بیستنی خانوو و دووکانەکە زۆر خۆشحاڵبوو. بە مهری گوت: ئێستا دڵنیام و بێخەمم، چونکە هەم خانووت هەیەو هەم مانگی پێنجسەد تومەن وەردەگریت. محەمەد عەلی دڵی زاواکەی دایەوەو گۆتی: دڵنیابە بەزوویی ئازاد دەکرێیت و دووبارە دەچیتەوە زانکۆو وانەکان دەخوێنیت.

ماوەی دە ڕۆژ بوو محەمەد عەلی لە تاران بوو، ڕۆیشت بۆ سەردانیکردنی دکتۆر ئەبولحەمد هەندێک شیرینی بۆ ئەویش هێنابوو، دکتۆر پێیگوت: دڵنیابە کە ئاغا ڕەزا ئازاد دەکرێت، هەروەها گوتی: هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییەو خۆشی هیچ دانپێدانانێکی نییە، محەمەد عەلی گەڕایەوە بۆ یەزدو مهریش لە تاران مایەوە.

## دوژمنایەتی لەپاڵ دۆستایەتیدا

مهری سەردانی بەهارەو مینای هاوڕێی دەکرد، پێیراگەیاند کەوا خانووی کڕیوە. ئەوانی بانگهێشتی ماڵی خۆیان کرد. بەهارەو مینا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تریان سەردانی ماڵی مهرییان کرد، لەوێ گفتوگۆ دەستپێکردەوە. گفتوگۆکانیان لەبارەی بیردۆزەکانی (تروتسکی)و ناسیۆنالیزم و سۆڤیەت و چین بوو. مهری بەهۆی ئەو کتێبانەی کە خوێندبوونییەوە جارجارێک بەشداری گفتوگۆکانی دەکردن، هاورێکانی چەند کتێبێکی تریان پێدا تاکو بیانخوێنێتەوە. مهری کتێبەکانی زۆر بە تامەزرۆییەوە خوێندەوە، ئەو هەستی بەوە نەدەکرد وا هێواش هێواش دەکەوێتە داوی کۆمۆنیستەکانەوە، نەیدەزانی چ کێشەیەک خەریکە ڕوو بەڕووی خۆی و هاوسەرەکەی دەبێتەوە.

مهری ئەو ژنە تەنهایە سادەیەی یەزدی، گۆڕابوو بە کەسێکی لایەنگری سۆڤیەت. ئەو ژنێک بوو ژیانی پڕبوو لە کوێرەوەری، هاوڕێیانی زانکۆ دەیانویست وەک نێچیرک ڕاوی بکەن. کچەکان کتێبی سەرمایە، یان کابیتاڵی (مارکس)یان پێدابوو تاکو بیخوێنێتەوە، لەبارەی بابەتەکانی نێو کتێبەکە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکرد، ئەوان بەکردەوە پۆلێکی فێرکارییان بۆ کردبووەوە. کاتێک کتێبی سەرمایەی مارکسی سێ جار خوێندەوە بیری کردەوە کە بچێت هەمان کتێب بکرێت، لەلای خۆیەوە بڕیاری داو گوتی: ئەمڕۆ کتێبەکە دەدەمەوە بە بەهارەو دوایی خۆم دەڕۆم هەمان کتێب دەکڕم.

ئەو ژنە یەزدییە سادەیە بێئاگا لە دنیای سیاسەت، بەیانی زوو ڕۆیشت بۆ ماڵی بەهارە، لەوێ ماوەی دوو کاتژمێر لەبارەی کتێبەکەوە گفتوگۆیان کرد، نانی نیوەڕۆشی هەر لەوێ خوارد، کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ گەڕایەوە بەرەو ماڵی خۆیان، لەسەر ڕێگەدا بە بەردەمی کتێبفرۆشەکانی بەردەم زانکۆی تاراندا ڕۆیشت، بە هاوڕێکانی نەگوتبوو کە دەیەوێت کتێبی سەرمایەی مارکس بکڕێت. ئەو وابیری کردبووە ئەگەر بڵێت دەیەوێت کتێبی سەرمایەی مارکس بکڕێت، هاوڕێکانی لە ڕوو دادەمێنن و پێیدەڵێن ئەو کتێبە ببە بۆ خۆت. گەیشتە لای کتێبخانەیەک و سەیری کتێبەکانی کرد، بەڵام کتێبی سەرمایەی مارکسی نەبینی. لە کتێبفرۆشەکەی پرسی کتێبی سەرمایەی مارکس هەیە؟ کتێبفرۆشەکە بە تووڕەییەوە گوتی: نەخێر خانم ئەو جۆرە کتێبانە لای ئێمە دەست ناکەوێت، لە کتێبخانەی دووەم و سێیەمیش هەر بەهەمان جۆرو بگرە خراپتریش وەڵامیان دایەوە، ئەو بیری کردەوە کە بۆچی کتێبفرۆشەکان بەتوڕەییەوە وەڵامی دەدەنەوە.

مهری گەیشتە کتێبخانەیەکی تر. بەوردی سەیری کتێبەکانی دەکرد، بەڵام کتێبی سەرمایەی مارکسی نەبینی. کەسێکی تەمەن مامناوەند لەپشت مێزەکەوە دانیشتبوو، ئەو پیاوە گوتی: فەرموو خانم چیت دەوێت؟ مهریش گوتی: ئێوە کتێبی سەرمایەی مارکستان لا دەستدەکەوێت. ئەو پیاوە گوتی: خانم وابزانم تۆ زۆر هۆشت لەسەرخۆت نییە. مهری بەم قسەیە سەری سوڕما. ئەو پیاوە لە مهری پرسی تۆ خەڵکی کوێیت؟ بەشێوەی زمانتدا دیارە خەڵکی کوێیت؟ مهری گوتی: من خەڵکی شاری یەزدم. پیاوەکە گوتی: تۆ خەڵکی یەزدیت و زۆر سادەو بێئاگایت، تۆ دەزانیت بەدوای چیدا دەگەڕێیت. مهریش بەهەمان سادەیی یەزدی گوتی: بەڵێ، بەدوای کتێبی سەرمایەی مارکسدا دەگەڕێم. ئەو پیاوە کاتێک زانی مهری خوێندکاری بەشی زیندەوەرزانییە. گوتی: کتێبی سەرمایەی مارکست بۆچییە؟ گوتی: هاوڕێیەکم ئەو کتێبەی پێداوم و سێ جار خوێندوومەتەوە، دوایی کتێبەکەم بۆ گەڕاندووەتەوە، ئێستاش حەز دەکەم خۆم لەو کتێبەم هەبێت ئەو پیاوە گوتی: زۆر باشە تۆ لێرە بوەستەو لەگەڵ کەسدا قسە مەکە، من دەڕۆم و دوای کەمێکیتر دێمەوە.

پیاوی کتێبفرۆش ڕۆیشت دوای دە خولەک گەڕایەوەو بە مهری گوت: لەگەڵ مندا وەرە، ئەو پیاوە مهری برد بۆ قاتی دووەمی کتێبخانەکە، بردییە ژوورێکەوە.

پیاوێکی تەمەن (٤٥) ساڵ لەو ژوورەدا دانیشتبوو، ئەو پیاوە بە هێمنی بە مهری گوت: فەرموو دانیشە، مهری دانیشت و چایەکیان بۆ هێنا، ئەو پیاوە گوتی: پێیانگوتووم کە تۆ خوێندکاریت و خەڵکی شاری یەزدیت و هاتوویت کتێبی سەرمایەی مارکس بکڕیت. مهریش زۆر بەسادەیی گوتی: بەڵێ، نرخەکەی هەرچەندێک بێت دەیدەم، پیاوەکە گوتی: تۆ دەزانیت مارکس کێ بوو؟ مهری گوتی: نازانم، بەڵام چەند بەرگێک لە کتێبەکانی ئەوم خوێندۆتەوە، جگە لە چەند وتارێکیشی. ئەو پیاوە گوتی: کێ ئەو کتێبەی پێداویت و پێیگوتوویت بیخوێنەرەوە. مهری گوتی: چەند کەسێک لە هاوڕێ خوێندکارەکانم. پیاوەکە گوتی: هاوڕێکانت بەتۆیان نەگوت ئەم کتێبە قەدەغەیەو پێتی بگرن گۆشت و ئێسقانت لەیەکتری جیادەکەنەوە. مهری بەسەرسوڕمانەوە گوتی: چۆن ئەو کتێبە قەدەغەیە. پیاوەکە گوتی: ئەگەر ئەو کتێبە بەدەستەوە بگیریت، لانیکەم پانزە ساڵ زیندانی دەکرێیت. مهری بە سەرلێ شێواوییەوە گوتی: پانزە ساڵ زیندانی بۆ خوێندنەوەی دوو بەرگ کتێب. پیاوەکە گوتی: ئەوان بە تۆیان نەگوتووە ئەو کتێبانە چین و دەبنە چ مەترسییەک لەسەر تۆ. مهری گوتی: ئەوان تەنها ئەوەندەیان پێگوتووم کتێبەکان بخوێنمەوە. پیاوەکە گوتی: تۆ ناوی تودەییەکانت بیستووە؟ ئنجا مهری بیری هاتەوە کە هاوسەرەکەی بەتۆمەتی تودەییبوون گیراوەو براوە بۆ زیندان. پیاوەکە بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: خەڵکی بە خوێندنەوەی ئەم کتێبانە دەبن بە تودەیی، دەبنە لایەنگری سۆڤیەت، زۆر کەس لەسەر ئەو کتێبانە زیندانیکراون و لەسێدارە دراون. ئەو پیاوە بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: کارمەندی کتێبخانەکە هاتە لام و پێیگوتم وا خانمێکی سادە بەشێوە زمانی یەزدی قسە دەکات و داوای کتێبی سەرمایەی مارکس دەکات، هەرئەویش داوای لێکردم کە لەگەڵ تۆدا قسە بکەم، ئێستا وەرە پێم بڵێ ماڵت لە کوێی تارانە و لەگەڵ کێدا دەژیت؟

مهری هەستیکرد تازە خەریکە چاوی دەکرێتەوە، هەستیکرد تووشی دوو دڵی و دڵەڕاوکێ بووە، ئەو کاتە تێگەیشت بەهارەو مینا چ ئامانجێکیان هەبووە لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵیدا، هەر لەوێش لەڕووی سادەیی خۆیەوە دەردەدڵی خۆی بۆ ئەو پیاوە کردەوەو گوتی: لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ خوێندن هاتوون بۆ تاران، دوایی تەواوی بەسەرهاتەکەی ئاغا ڕەزای بۆ ئەو پیاوە باسکرد. ئەو پیاوە گوتی: لەو جۆرە کتێبانەت لەماڵەوە هەیە. مهری گوتی: یەک دوو کتێبی بچووک و چەند مەقالەیەکم

لایە. ئەو پیاوە بەڕێزە گوتی: خۆ ئەگەر ساواکییەکان تەنها یەک دانە لەو کتێبانەت پێبگرن، ئەوا لانیکەم هاوسەرەکەت پانزە ساڵ زیندانی دەکرێت، بەزوویی بگەڕێرەوە بۆماڵەوەو کتێبەکان لە ماڵەکەتدا مەهێڵەوە، لەگەڵ هاوڕێکانیشت زۆر قسە مەکەو تێکەڵاویان مەبە، چونکە بەدڵنیاییەوە ئەوان کۆمۆنیستن، خۆ ئەگەر ئەوان دەستگیر-بکرێن، تۆش دەستگیردەکرێیت.

ئەو پیاوە نیو کاتژمێر لەبارەی سۆڤیەت وستالین و تودەییەکانی ئێران و کودەتای (٢٨ی موردادی ١٩/١٣٣٢ئابی١٩٥٣) قسەی کرد، بەگژداچوونەوەی ساواکی لەگەڵ کۆمۆنیستەکان و تودەییەکانی بۆ باسکرد، ئامۆژگارییەکی زۆری مهری کردو گوتی: ئێرە تارانە، هێشتا خەڵکانی میهرەبان و ڕاستگۆ لێرە زۆرن، بەڵام کەسانی ترسناک و ناپیاویش لەم شارەدا زۆرن، نابێت باوەڕت بەهەموو کەسێک هەبێت. لە پەنجەرەکەوە ژوورەکانی زانکۆی تاران دەبینران، ئەو پیاوە ئاماژەیەکی بۆ زانکۆ کردو گوتی: ئەو شوێنە چەقی دژەکانە، پیاوان و ژنانی بیرمەندو وڵاتپەرست لەوێ وانەیان خوێندووەو وانەیان گوتۆتەوە، بەڵام هەر لەو گۆڕەپانەدا ڕۆژ بەڕۆژ نامەردان و نۆکەران لەزیادبووندان، ئەوان هەندێکیان نۆکەری بۆ شاو ئەمریکا دەکەن، هەندێکیشیان نۆکەری بۆ سۆڤیەت دەکەن.

ئەو پیاوە لە قسەکانیدا دڵسۆزی و ڕاستگۆیی بەدیدەکرا، بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: ئێرە تارانە، خەریکە نرخی مرۆڤایەتی لێرە لەدەست دەچێت، شاری پارەو داوێنپیسی و ساختەچێتی و هەڵخەڵەتاندنە، ئاگاداربە تاران سەد ساڵ جیاوازی هەیە لە شارەکانی یەزدو کرمان و تەبەس. مهری باسی دراوسێ میهرەبانەکانی خۆی بۆکرد. پیاوی کتێبناس گوتی: ئەوانە کەسانی پاک و دڵسۆزن، بەدڵنیاییەوە ئەوان تازە لە ئازەربایجانەوە هاتوون، وەکو تۆ کە تازە لە یەزدەوە هاتوویت. لەم شارەدا خەڵکی وەکو مەڕ وان، بەڵام دوایی دەبن بە گورگ، ئەگەر کارێک یا کێشەیەکت هەبوو برۆ بۆلای هاوسێ دڵسۆزەکانت. ئەو پیاوە چەند کتێبێکی بە مهری ناساندو گوتی: هەرکاتێک ویستت کتێب بخوێنیتەوە، ئەو کتێبانە بخوێنەرەوە. ئەو پیاوە گوتی: هەرکاتێک ویستت کتێب بخوێنیتەوە برۆ بۆ کتێبخانەی زانکۆو بچۆ بۆلای ئاغای ئیرەجی ئەفشار یەزدی، ئەو کەسێکی داناو بەڕێزەو ڕێنماییت دەکات.

مهری کاتێک لەژووری ئەو پیاوە میهرەبانەوە هاتەدەرەوە وەک ئەوە وابوو کە

چل ساڵ گەورەتر بوو بێت، بەردەوام سوپاسی خودای دەکرد... لەبەر خۆیەوە دەیگوت: خۆ خەریک بوو گیانی هاوسەرەکەم بەتەواوی بخەمە مەترسییەوە. بەخێرایی ڕۆیشت، سواری پاس بوو و بەزوویی خۆی گەیاندە ماڵەوە. ئەو کتێب و نووسینانەی بەهارەو مینا پێیان دابوون، کردنیە نێو کیسەیەکەوەو ڕۆیشت لەدەرەوە لە ڕۆخی شەقامەکە فڕێیدان و گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو لەسەر جێگاکەی لێی ڕاکشاو دەستیکرد بەگریان. سبەی بەیانی زوو هەڵساو ڕۆیشت بۆلای ملینا بۆئەوەی هاوکاری بکات لە دروستکردنی شیرینیدا. دوای چەند شەوێک بەهارەو مینا هاتن بۆ سەردانی، لەسەر ئامۆژگارییەکانی ئەو پیاوە کتێبفرۆشە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردن، بە میهرەبانی لەگەڵیاندا جوڵایەوەو ڕێزێکی زۆری لێگرتن و پێیگوتن کێشەیەکی بۆ دروستبووە. ئەویش ئەوەیە ساواک و پۆلیس گومانی لێدەکەن، لەوەیە ئەویش ژیانی بکەوێتە مەترسییەوە، باشتر وایە یەکتری نەبینن و بێهەواڵ بن لە یەکتری.

دوای یەک ساڵ مهری دووبارە چاوی بە پیاوە کتێبفرۆشەکە کەوتەوەو ئەو پیاوە هەواڵی هاوسەرەکەی لێپرسی و خۆشی بە مهری ناساند گوتی: من هومایۆنی سەنعەتی زادەم. هەرکارێکت هەبێت لەخزمەتتدام. دواتریش مهری و ئاغا ڕەزا بەردەوام سەردانی هومایۆنی سەنعەتی زادەیان دەکردو لە وتەو ڕێنماییەکانی ئەو سودمەند دەبوون.

## دادگاییکردن

دەورەی یەکەمی زانکۆ دەستی پێکردەوە، هێشتا ئاغا ڕەزا ئازاد نەکرابوو، ئەمجارەش کۆلێژ مۆڵەتی پێدایەوە. سەرۆکی کۆلێژ بە مهری گوت: ئاغا ڕەزا سێ دەورەیە لە کۆلێژ ئامادە نییە، ئەگەر تا کۆتایی ئەم دەورەیە ئازاد نەکرێت، ئەوا ناگەڕێتەوە بۆ کۆلێژ، چونکە ناتوانین بۆ دەورەی چوارەم هیچ کارێکی بۆ بکەین، ئەگەر ئازاد نەکرێت، لە زانکۆ دەردەکرێت.

ڕق گەرووی مهری گرتبوو. ئەو شادمانی و خۆشییەی جارانی نەمابوو، تەنانەت دەستی بۆ کتێبەکانیشی نەدەبرد، ئیتر بەلایەوە گرنگ نەبوو کە یەکەمی کۆلێژەکە بێت، یان دوایین کەس بێت، بەلایەوە گرنگ نەبوو وانەکانی بخوێنێت، یان نەخوێنێت، تەنها لەبەر خودا دەپاڕایەوە هاوسەرەکەی ئازاد بکرێت. بیری لەوە دەکردەوە پایەو بنەمای هەموو شتێک ئازادییە، هەرگیز بەبێ ئازادی هیچ کارێک ئەنجام نادرێت، بەبێ ئازادی

دادپەروەری هیچ مانایەکی نییە، ئەگەر ئازادی هەبێت، دەتوانیت زۆر کاری باش ئەنجام بدەیت، ئاخر ئەمە چ وڵاتێکە کەسێکی بێتاوان (١٠) مانگ بەبێ دادگاییکردن بخرێتە زیندانەوە. ئاخر ئەو تاوانی چییە؟ بۆچی ئەوەندە لێی بدرێت؟ ئاخر ئەمە چ وڵاتێکە بە تاوانی خوێندنەوەی چەند کتێبێک خەڵکی چەندین ساڵ زیندانی بکرێن؟ مهری لەدڵی خۆیدا سەدان جوێنی بە شاهنشاو دارو دەستەکەی دەدا، نەفرەتی لە خۆی دەکرد کە سەردەمانێک لایەنگری شابانوو بووە. دەیگوت: وای لەو ڕۆژەی کە میللەت بەئاگا دێت، وای لەو ڕۆژەی کە ئەو خەڵکە تێدەگەن ئەم حوکمەتە چ درۆیەکی لەگەڵ کردوون، ئای لەو ڕۆژەی کە ملوێنەها گەنج و لاوی ئەم وڵاتە تێدەگەن کە وانەکانی مێژوو چۆن بەدرۆو ناڕاست نووسراونەتەوە. ئەوکاتە ڕقی گەل ڕەنگدانەوەی ڕقی خودایە.

مهری دەچووە پۆلەکانی خوێندنەوە، بەڵام گومانی لە هەموو هاوپۆلەکانی خۆی هەبوو، لەوە دەترسا نەوەک کەسێک تووشی کێشەیەکی بکات. کاتێک کچە خوێندکارێک یان کوڕە خوێندکارێک هەواڵی هاوسەرەکەیان لێ دەپرسی، ئەو دەیگوت: هیچ لە هەواڵی نازانم ئیتر، دەردە دڵی خۆی لای هیچ کەسێک باس نەدەکرد، ئەو تەنها ئومێدی بەخودا هەبوو، دوایش بە ئاغا تەقی و لێون و جەعفەر ئاغاو هاوسەرەکانیان. کاتێک دەچووە پۆلەوە لەوە دەترسا نەوەک کەسێک قسەی لێدەربکات، یان کەسێک ڕای بکێشێتە ناو گرووپێک. ڕۆژێک کوڕێکی هاوپۆلی هاتە لایەوە تاکو لە هەواڵی بپرسێت، ئەویش بەسەریدا قیژاندی و کوڕەکە بەخێرایی لێی دوورکەوتەوەو ئیتر زاتی نەکرد جارێکیتر هەر سەیریشی بکات. ئەو لەگەڵ هیچ هاوپۆلێکیدا قسەی نەدەکرد، بەزوویی لە کۆلێژ دەگەڕایەوەو دەڕۆیشتەوە بۆماڵەوەو لە پێشدا سەردانی ماڵی ملینای دەکردو لە دروستکردنی شیرینیدا هاوکاری دەکرد. مەکینەی بەرگدروونەکەشی لە یەزدەوە بەدەست گەیشتبوو، خۆی بە کاری بەرگدروونەوە خەریک دەکرد. لە تاران خەڵکی پارەی باشیان دەدا بە بەرگدروون، بەڵام مهری نەیدەتوانی بەردەوام کاری بەرگدورون بکات، چونکە دەبوایە وانەکانی بخوێنێت، کاتێک لە ماڵەوە بەتەنها خەریکی بەرگدروون دەبوو، دەکەوتە بیرکردنەوەی قوڵەوە، هەربۆیەش زوو زوو دەچوو بۆ ماڵی ملیناو لە شیرینی دروستکردندا هاوکاری دەکرد، هەندێک جار بیری لەوە دەکردەوە کاتێک مۆڵەتی بەکرێدانی دووکانەکەیان تەواوبوو، واز لە خوێندنی زانکۆ دەهێنێت و دووکانداری دەکات. تەواو بێتاقەت ببوو، تەنانەت تاقەتی ئەوەشی نەمابوو کە بچێت بۆ

زیندان و داوا لە ئەیوبی سەرۆکی زیندان بکات سەردانێکی هاوسەرەکەی بکات. ملیناو سولمازو گوڵناز هەستیان بە بێتاقەتی و تێکچوونی دەروونی مهری کردبوو. ئەوان هەوڵیان دەدا دڵنەوایی بکەن، بەڵام ئەو ڕۆژ بەڕۆژ بێتاقەتتر دەبوو. شەوانە لە ماڵەوە بەتەنها بوو، لەگەڵ خودادا ڕازو نیازی دەکرد، هەندێک جار بیری لە قسەکانی بەهارەو مینا دەکردەوە. ئەو پێشتر لە مانای قسەکانی ئەوان تێنەدەگەیشت، بەڵام ئێستا قسەو باسەکانی ئەوانی بەیادی خۆی دەهێنێتەوە، کە ئەوان دەیانگوت حکومەتی زۆردار تەنها بە شەڕو خوێنڕشتن لەناو دەچێت، مهری هەندێکجار خراپ نارەحەت دەبوو، دەیگوت دەڕۆم چەکێک پەیدا دەکەم و ڕوو بەڕوو شا دەکوژم، یان دەیگوت خۆ ئەگەر نەتوانم شا بکوژم، دەچم سەرۆکی زیندان دەکوژم. دوایش دەیگوت ئای سەرۆکی زیندان چەندە کەسێکی میهرەبانە، خۆ ئەگەر ئەو بکوژم، ئەوا منیش دەکوژرێمەوە. ئنجا دەیگوت زۆرباشە با بکوژرێم خۆ مردن باشترە لەم ژیانەی من، پاشان دەیگوت ئەوکاتە هاوسەرەکەشم دەکوژن، بیری دەکردەوە کە ئێستاش ئاغا ڕەزا ئومێدی بە ژیان هەیە.

مهری شەوێکیان لە خەم و نائومێدیی خۆی زۆر گریا، قسەکەی دایەگەورەی وەبیر هاتەوە (لە هەر کێشەیەکدا پەندێک هەیە، لە هەر پەندێک نیعمەتێک هەیە)، لەناکاو هاواریکرد دایەگەورە کام پەند؟ کام نیعمەت؟ لەسەر جێگاکەی هەڵساو نوێژی کردو ڕۆیشت دیوانی حافزی هێناو کردییەوەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەم غەزەلە.

**بەگیانی پیری مەیخانە و هەقی خەڵاتی ئەو**

لەسەرمدا نییە جگە لەخزمەتکردن بە ئەو

تا گەیشتە ئەم دێڕە

**تێکە بادە شەو درەنگەو جیهان ون**

**مژدەی پێداین هەمووان لەژێر ڕەحمەتی ئەوداین**

ئەو لەو غەزەلەی حافزدا مانایەکی ڕووکەشی وەرگرت، باری دەروونی بە جۆرێک بوو کە (تێکە بادە)ی بەڕوکەش لێکدایەوە. بۆیە بەخۆی گوت: دەچم بۆ ماڵی لێۆن و داوایان لێدەکەم کەمێک شەرابی ساڵی (١٣٤٦- ١٩٦٧)ی پێبدەن.

ڕۆژی دوایی لەدوای گەڕانەوەی لە زانکۆ ڕۆیشت بۆ ماڵی ئاغا لێۆن، ملینا پێیگوت:

نانی ئێوارە لێرە بخۆ، مهری ڕازیبوو ئێوارە لە ماڵی ئەوان بێت. کاتی ئێوارە ملینا گوتی: مهری کەمێک شەراب بخۆرەوە بەڵکو باری دەروونیت باشتر ببێت. ئەویش گوتی: زۆرباشە بەیادی ئاغا ڕەزا دەخۆمەوە. ئەو بۆیەکەمجار دوو سێ پەرداخی بەسەریەکەوە بەبێ ئاو خواردەوە، خوێن لە دەمارەکانیدا گەرمبوون، تەواو گێژ بوو. ملینا تێگەیشت شەرابەکە بەتەواوی کاری تێکردووە. بۆیە پێیگوت: تۆ باش نیت، زۆرت خواردەوە، شەویش هەر لێرە بمێنەرەوە، ئەویش شەو لە ماڵی ملینا خەوت. ئیتر بیری لەوە نەدەکردەوە چەک هەڵبگرێت و خەڵکی بکوژێت. ئەو کەوتبووە دنیای بێئاگاییەوە. نەیدەویست پیاو بکوژێت و دەیویست بڕوات شوێن کارەکانی هاوسەرەکەی بکەوێت.

ڕۆژی دواتر چوو بۆ کۆلێژی ماف، دکتۆر ئەبولحەمد پێیگوت: هەواڵێکی خۆشم لایە، ڕۆژی دادگاییکردن دیاریکراوە، ئاغا ڕەزا ڕۆژی نۆی ئازەر دادگایی دەکرێت، ئومێدەوارم ئازاد بکرێت. مهری گوتی: تاکو نۆهەمی ئازەر (٢٥) ڕۆژی ماوە. دکتۆر ئەبولحەمد گوتی: بەبۆچوونی من بەئانقەست نۆی ئازەریان دیاریکردووە، دەیانەوێت پێش شانزەی ئازەر چەند کەسێک لەوانەی پار دەستگیرکراون، ئازاد بکرێن، ئەوان دەیانەوێت بەهانە نەدەنە دەست خوێندکاران تاکو ڕۆژی شانزەی ئازەر خۆپیشاندان نەکەن، مهری گوتی: خوا بکات وابێت.

مهری زۆر بیری ئاغا ڕەزای دەکرد، بەردەوام نوێژی دەکرد، دوای نوێژکردن سفرەی ڕادەخست و دوو پەرداخی لەسەر دادەنا یەکێکیان بۆ خۆی و ئەوی تریشیان بۆ ئاغا ڕەزا. نیو پەرداخ خواردنەوەی بۆ خۆی تێدەکردو نیو پەرداخیشی بە خەیاڵ بۆ ئاغا ڕەزا تێدەکرد، هەردووک پەرداخەکەی بەیەکەوە بڵند دەکردو دەیگوت: بە سەلامەت. لەپێشدا پەرداخەکەی ئاغا ڕەزای دەخواردەوەو دوایش پەرداخەکەی خۆی، ئەو بەگشتی سێ چوار نیوە پەرداخی تێدەکرد، بەڵام دوو ئەوەندەی جارانی دەخواردەوە، چونکە لەجیاتی ئاغا ڕەزاش هەر دەیخواردەوە. ئەو نەک ڕۆژی دەژمارد، بەڵکو چرکەشی دەژمارد چاوەڕوانی ڕۆژی دادگاییکردن بوو، هەندێکجار وا بیری دەکردەوە کە ئاغا ڕەزا ئازاد دەکرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، هەندێک جاریش وا بیری دەکردەوە ئاغا ڕەزا حوکم دەدرێت و لە زیندان دەمێنێتەوە، هەندێکجاریش هاوسەرەکەی بەسێدارەوە دەبینی، بەتەواوەتی کەوتبووە دڵەڕاوکەوە. لەو ماوەیەدا بەتەواوی ئارامیی لێبڕابوو، بۆ هێورکردنەوەی مێشکی خۆی، دەچوو خواردنەوەی دەخواردەوە. شەوانە بەردەوام

دەیخواردەوەو بە سەرخۆشی خەوی لێدەکەوت، بەیانیانیش بە قوڕگی گیراو و چاوی خەوالووەوە هەڵدەستا، بەهیچ جۆرێک ئاگای لە وانەکانی نەمابوو، چاوی هاوپۆلەکانی خۆی نەدەبینی، قسەکانی مامۆستاکەی نەدەبیست، کەوتبووە دنیای خەیالاتی خۆیەوە. کەوتبووە بیری گەشتوگوزار لەگەڵ ئاغا ڕەزادا، کەوتبووە بیری ژیانێکی ئازادەوە، کەوتبووە بیری بوون بە خاوەن منداڵ، کەوتبووە بیری کوشتنی شاهنشا و ئازادبوونی تەواوی خەڵکی، کەوتبووە بیری ئازادبوونی تەواوی زیندانیان.

مهری لەناو جێگاکەیدا جوڵەیەکی کردو گوتی: من لەکوێم؟ زانی کە لەماڵەوەیە، دەبووایە خۆی ئامادە بکات و بڕوات بەرەو دادگا. جلوبەرگی لەبەر کردو لەبەر پەژارەو دڵەڕاوکێ نەیتوانی نانی بەیانی بخوات، دڵەڕاوکێیەکی زۆری هەبوو. دڵەڕاوکێکەی لەو ڕۆژە زیاتر بوو کە ئاغا ڕەزا ون ببوو. دڵەڕاوکێکەی لەو ڕۆژە زیاتربوو کە هاوسەرەکەی بەداماویی لە زیندان بینیبوو، شوێنی ئەشکەنجە بەهەموو گیانییەوە دیاربوو، دڵەڕاوکێکەی لەو ڕۆژە زیاتربوو کە بڕیاربوو باوکی بێت بۆ ماڵیان و مهری تەلاق وەربگرێت، لەو ڕۆژەوەی کە ئاغا ڕەزا خواردنەوەی خواردبووەوە دایکی بەسەر باوکیدا دەیقیژاندو دەیگوت: دەبێت بەزوویی کچەکەی لەو پاسەوانە تەلاق وەربگرێت. ئێستا دڵەڕاوکێکەی بەجۆرێک بوو وەک دڵەڕاوکێی دایکێک کە کوڕەکەی خۆی بەسەر داری سێدارەوە بێت. ئەوجۆرە دڵەڕاوکێیانە کێ دەتوانێت پێناسەی بکات؟ خودا بکات هەموو داری سێدارەکان بسووتێن، هەرچەندە ئێستا لەسێدارەدان بە کرێن ئەنجامدەدرێت.

مهری جلوبەرگی گۆڕیبوو، نەیدەزانی چ جۆرە جلوبەرگێک لەبەر بکات، جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و کراوە، یاخود جلوبەرگێکی ڕەش و خراپ. ئەو دوو سێ جار جلەکانی گۆڕی سەرو قژی شانە کرد، جوانکاری لە ڕوخساریدا کرد، دەیویست ئاغا ڕەزا بە شادی و جوانی ببینێت، دەیویست دڵی ئاغا ڕەزا شاد بکات. دووبارە دەیگوت: ئەگەر ئەوان ئاغا ڕەزا حوکم بدەن، جلوبەرگی جوان و ڕوخساری سوورو سپی بەکەڵکی چی دێت، لانیکەم سێ جار مکیاجی کردو دووبارە پاکیکردەوە، سەرەنجام پارچە جلێکی لەبەرکردو ڕۆیشت بەرەو شەقامەکە، نزیکی سەد مەتر ڕۆیشت و دووبارە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، نێو شووشە شەراب لە یەخچاڵەکەدا بوو، شەرابەکەی خستە نێو جانتاکەی و ڕۆیشت، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ڕەزا زۆر لات و بێهێز بووە، پێویستی بە

وزەیە، لەوسەرەوە کە گەڕاینەوە بە یەکەوە ئەم شەرابە دەخۆینەوە، ئەگەر ئاغا ڕەزا حوکم درا، ئەوا مێشکم تێکدەچێت و ئەوکاتە خۆم بەتەنها دەیخۆمەوە، ئەگەر ئاغا ڕەزا ئازادکرا، ئەوا بەخۆشییەوە بەیەکەوە دەیخۆینەوە.

مهری کاتژمێر هەشتی بەیانی لەبەردەم دادگا ئامادەبوو، دکتور ئەبولحەمدیش گەیشتبوو، ئەو بە ڕەنگ و ڕووخساریدا بۆی دەرکـەوت کە مهری لە چ بارێکی دژواردایـە، بۆیە وەک مامۆستایەکی بەڕێز، وەک دادوەرێکی کارناسی و دڵنیا، دڵی مهری دەدایەوە. ئەوکاتە هێشتا بریکاری نەگۆڕابوو بۆ کارێک لەپێناوی نان و ئاودا بێت، هێشتا دادوەرەکان بەدوای ڕاستی و سەرکەوتن و دادپەروەرییەوە بوون، ئەوکات نەیاندەویست بەهۆی دانی پارەو ڕەشـوەوە ڕاستییەکان بشارنەوە. دیارە ئێستاش دادوەری باش و بەڕەوشتمان زۆرە. دکتۆر ئەبولحەمد بە مهری گوت: دووان لە قازییەکانی دادگا هاوڕێی کۆنی ئەون، پێشتر لەبارەی دۆسیەی ئاغا ڕەزاوە لەگەڵ ئەواندا قسەی کردووە، بەرپرسانی سەرەوەش هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە تاکو وەک تاوانبارێک سزا بدرێت. ئەوان دەیانەوێت لە مانگی (ئازەر/ ئەیلول )ی ئەمسەڵدا هیچ بەهانەیەک نەدەنە دەست خوێندکاران بۆ خۆپیشاندان. مهری کەمێک هێور بووەوە سەیریکرد لیۆن و ملیناو ئاغا تەقی و سۆڵماز و ئاغا جەعفەر و گوڵنازیش هاتوون، ئەوان هەموویان دڵنەوایی مهرییان دەکرد. ملینا ئەو ژنە ئەرمەنییە میهرەبانە یەک پاکەت شیرینی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بە مهری گوت: ئەمە شیرینی ئازادبوونی ئاغا ڕەزایەو ئەمشەو دروستمکردووە، مهری فرمێسک بەچاوانیدا دەهاتە خوارەوەو دەستیکردە ملی ملیناو ماچیکرد.

نزیکی کاتژمێر (٩) بوو ئاغا ڕەزایـان بەدەستی کەلەپچەکراو و بەجلی تایبەتی زیندانەوە هێنا، حاڵی کەمێک لەو ڕۆژانـە باشتر بوو کە لەنێو زینداندا بـوو، چەند کەسێکیش لە هاوپۆلانی هاتبوون. دادگاییکردنەکە بەئاشکرا بوو، دادگایکردنەکە شێوەی یاسایی خۆی وەرگرتبوو. دکتۆر ئەبولحەمد بە مهری گوت: دادگاییکردنەکە بەئاشکرایە، ئاغا ڕەزا بزە بەسەر لێویەوە دیاربوو، پاسەوانەکان مۆڵەتیان پێدا هاوسەرەکەی ماچ بکات، بەڵام مۆڵەتی قسەکردنیان نەدا، ماچکردنێک ئەوەندەی نووسینی سەد کتێب پەیامی پێبوو، ماچکردنێک ئەوەندەی سەد غەزەلی حافز پەیامی تیابوو. کاتێک مهری بەگەرمی ڕوخساری هاوسەرەکەی بە ڕوخساری خۆیەوە هەستپێکرد، دڵەکوتەکەی

کەمیکردو هەستی بە برسێتی کرد، ئارام بووەوە، داوای لە ملینا کرد پارچەیەک شیرینی بدات بە ئاغا ڕەزاو پارچەیەکیش بدات بە خۆی. پێش دادگاییکردنەکە شیرینییەکە تەواو بوو، شیرینی ئازادیی پێش دادگاییکردن دابەشکرا.

دانیشتنی دادگا دەستیپێکرد. هەر پرسیارێک لە ئاغا ڕەزا دەکرا وەک شیشە ئاسنێک وابوو کە بکێشرێت بەسەری مهریدا، هەر وەڵامێکیش کە دەدرایەوە تیرێک بوو لەدڵی دەدا. مهری بۆ پرسیارەکانی قازی و وەڵامەکانی ئاغا ڕەزا تووشی دڵەڕاوکێ ببوو، لەدڵی خۆیدا دەیگوت: خۆزگە ڕەزا بەمجۆرە وەڵامی بدایەتەوە، خۆزگە دکتۆر ئەبولحەمد وایدەگوت. قازی لە ئاغا ڕەزای پرسی تۆ تودەیت، ئاغا ڕەزا گوتی: من تاکو پێش ئەوەی زیندانی بکرێم نەمدەزانی تودەیی مانای چییە؟ قازی گوتی: چۆن نەتدەزانی تۆ سەردەمێک پاسەوان بوویت، تۆ لە ساڵی (١٣٣٢/ ١٩٥٣) بوویت بە پاسەوان. ئاغا ڕەزا گوتی: بەڵێ من پاسەوان بووم، وشەی تودەییم بیستبوو، بەڵام نەمدەزانی ماناکەی چییە؟ ئەگەر بمزانیبایە تودەیی مانای چییە، نە دەبووم بە پاسەوان، بەڵکو دەبووم بە ئەفسەر، دەبووم بە وەزیر، یان پارێزەر، من پاسەوانێکی سادە بووم تەنها ئەوەندەم دەزانی ئەگەر کەسێک چەقۆکێشی کرد، بڕۆم دەستگیری بکەم، ئەو کارانەشم بەباشی نەدەزانی، نەمدەزانی کام چەقۆکێشانە دەستگیربکەم و کامانە دەستگیر نەکەم. قازی گوتی: بۆچوونت چییە لەبارەی مارکس و کتێبەکانییەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: کاتێک شتێکم نەخوێندبێتەوەو نەمبینیبێت هیچ بۆچوونێکم لەسەری نابێت، من ناوی مارکس و ستالینم لەنێو زینداندا بیستووە، من کۆمۆنیست نیم، بەڵکو من کەسێکی موسڵمانم. قازی گوتی: ئەگەر تۆ موسڵمانیت بۆچی خواردنەوە دەخۆیتەوە، ئاغا ڕەزا گوتی: قازی بەڕێز من لەتۆ دەپرسم لە ئێران و لە هەموو وڵاتانی ئیسلامیدا چەندین ملیۆن خەڵکی نوێژکەرو شەرابخۆر هەیە؟ خۆ هەرکەسێک کە شەرابی خواردەوە نابێت بە کۆمۆنیست، ئەی بۆچی لە وڵاتانی ئیسلامی کارگەی دروستکردن و خواردنەوەو دووکانی فرۆشتنی خواردنەوە هەیە. مەگەر ئەو وڵاتانە وڵاتی ئیسلامی نین. قازی گوتی: بەم وتانەدا بۆمان دەرکەوت تۆ پاسەوانێکی ناشارەزا نەبوویت. ئاغا ڕەزا گوتی: من چەند ساڵ لەوەوپێش پاسەوان بووم، ئێستا خوێندکاری کۆلێژی مافم، خوێندکارێکم لەسەر هیچ و خۆڕایی سێ دەورەیە منتان خستۆتە زیندانەوە. دکتۆر ئەبولحەمد بەرگرییەکی باشی لە ئاغا ڕەزا کرد. دانیشتنی دادگا کۆتاییهات و پاسەوانەکان ئاغا ڕەزایان برد بۆ ژوورێکی تایبەت.

کات لەدوای کات ژمارەی ئەو خوێندکارانەی دەهاتن زیادی دەکرد، نزیکەی سەد خوێندکار هاتبوون، بابەتەکە بەلای ئەوانەوە گرنگ بوو، چەند هەواڵنێریکیش لەوێ بوون. کاتژمێر یەکی دوانیوەڕۆ دانیشتنی دادگا دەستپێکردەوەو مهری دەلەرزی قاچەکانی توانای وەستانیان نەبوو، قاچەکانی کەوتبوونە لەرزە، خەریکبوو بەزەویدا بکەوێت، تووشی سەرئێشە ببوو، ملیناو سولماز تێگەیشتن کە حاڵی باش نییە، چوونە ژێر باڵییەوە. مهری بۆئەوەی نەکەوێت، خۆی بە ئەوانەوە گرتبوو، چاوەکانی لێڵ ببوون، لەبارێکی ترسناکدا بوو. سولنازو ملینا هەستیان بە لێدانی دڵی دەکرد. سولناز گوتی: ورەت بەرزبێت و هیچ مەترسەو خۆت توند بگرە. قازی دەستیکرد بە خوێندنەوەی بڕیاری دادگا، بڕیاری دادگا ئازادبوونی ئاغا ڕەزا بوو.

ئیتر ئاغا ڕەزا ئازاد بوو، خوێندکارەکان بەسەر دەستیانەوە بەرزیان کردەوەو لە هۆڵی دادگا هاتنە دەرەوە، بەڵام هەندێک کەس هەبوون ئازادبوونی ئاغا ڕەزایان پێخۆش نەبوو، ئەوانەی کە پێیانخۆش نەبوو بۆ بەهانەیەک دەگەڕان بۆ دروستبوونی شۆڕش، بەهانەیەک بۆ ئەوەی لە ڕۆژی شانزەی ئازەردا قەرەباڵغییەک دروست بکەن، بەهانەیەک تاکو بە خەڵکی بڵێن حزبی تودە حزبێکی کاریگەرەو ئێستاش حیزب لایەنگرەکانی لە زینداندان و پانزە ساڵ حوکمدراون. لە ساڵۆنەکەدا دەنگەدەنگ و قەرەباڵغییەکی زۆر هەبوو، مهری لە قەرەباڵغییەکەدا ون ببوو، دوایی ئاغا تەقی و لێۆن و ئاغا جەعفەر، ئاغا ڕەزایان لەدەستی خوێندکارەکان ئازادکرد. ئەوان زۆربەیان لەماوەی یەک ساڵی زیندانی ئاغا ڕەزادا هیچ هەواڵێکیان نەپرسیبوو، ئاغا ڕەزا تەنها بیانووی سیاسی ئەوان بوو. گرووپەکانی تریش ئازادکردنی ئاغا ڕەزایان بە هەوڵ و فشاری خۆیان دەزانی.

ئاغا ڕەزا لەگەڵ مهری و دراوسێکان بەرەوماڵ گەڕانەوە، ئاغا تەقی دراوسێ ئازەرییەکە گوتی: وا کاتژمێر بوو بە سێی دوانیوەڕۆ، فەرموو هەموو بەیەکەوە دەچین بۆ ماڵی ئێمە و لەوێ نانی نیوەڕۆ دەخۆین. لێۆن گوتی: نەخێر، هەمووتان میوانی منن. ئاغا تەقی گوتی: هەمووتان میوانی منن. ئاغا جەعفەر گوتی: من ئامۆزای ئاغا ڕەزام، هەمووتان میوانی منن، من خۆم بڕیارم دابوو هەمووتان نیوەڕۆ میوانی من بن. لێۆن و ئاغا تەقی ڕەزامەندییان نواند، هەر هەشتیان بەیەکەوە لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتن. مهری، ملینا، سولماز، گولنازو هاوسەرەکانیان. ئاغا ڕەزا دەستی مهری خستبووە نێو

دەستییەوە، نەیدەزانی چی بڵێت. ئەو یانزە مانگ و (٢٥) ڕۆژ زۆر بەسەختی و بێتاوان ژیانی بەسەربردبوو، ئەشکەنجەیەکی زۆر درابوو، ئێستا ئازادکراوە، ئێستا مانای ئازادی و دادپەروەری دەزانێت، ئێستا نەفرەت لە پاسەوانیبوونی خۆی دەکات، ئێستا پەشیمانە لەوەی سوێندی بەسەری ئالیحەززەت دەخوارد. مهریش لە مانای ئازادیی تێگەیشتبوو، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ئەگەر کارمەدانی ساواک بهاتنایە ماڵەکەمان و کتێبەکانی مارکسیان ببینیایە، دەبووایە من خاکی کوێم بەسەرمدا بکردایە، خۆ ئەوکاتە خۆشم و ڕەزاش بێچارە دەبووین. ملینا ژنێکی تێگەیشتوو بوو، گوتی: بەزوویی نانەکەمان بخۆین و هەرکەسەو بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی، ئاغا ڕەزاو مهری قسەیەکی زۆریان هەیە با بەیەکەوە بیکەن.

ئاغا ڕەزاو مهری ڕۆیشتن بەرەو ماڵی خۆیان. ئاغا ڕەزا خۆشحاڵبوو بە خانووەکەیان، حەمامەکە گەرم بوو، ئاغا ڕەزا چووە حەمامەوە. ئاغا ڕەزا دوو ڕۆژ لە ماڵەوە بوو، شوێنی لێدان و ئەشکەنجە بە گیانییەوە دیاربوو، هەندێک لە شوێنی لێدانەکان تاکۆتایی ژیانی پێوەی دیاربوو. ئاغا ڕەزا بەڵێنی بە مهری دابوو بۆ هەمیشە لە سیاسەت و سیاسەتمەداران دوور بکەوێتەوە. ڕۆژێک سەردانی کۆلێژی کرد، لێپرسراوان گوتیان: بۆ بەردەوابوونت لە خوێندن هیچ کێشەیەکت نییە. لەو سەردەمەدا بەو هەموو دیکتاتۆری و بیرۆکراسی ئیدارییەوە سەرۆکی کۆلێژ هەموو دەسەڵاتێکی هەبوو. ئەگەر نۆکەر بووایەو ئەگەر سەر بە شوێنێک بووایەو هەرچییەک بووایەو هەرچییەک هەبوو، خۆی دەیتوانی بڕیار بدات. ئاغا ڕەزا لە دەورەی دواترەوە دەیتوانی وانەکانی بخوێنێت، ئەو لەو کاتەدا ببووە خاوەن کۆلێک ئەزموون، دەیویست ببێت بە دادوەر، بەڵکو کەمێک بەرگری لە مافی کەسانی هەژار بکات. ئەو لە ماوەیەکی کەمدا سێ پارێزەری بینیبوو. حاجی بومان عەلی بریکاری ئەوی بە بەلاش ئەنجامدابوو، پارەو پۆل و خەرجی دادگاش هەر خۆی دابووی. هیچ شتێکی لە ئاغا ڕەزاو مهری وەرنەگرتبوو. دادوەرێکی تر لە تارانەوە هاتبوو بۆ یەزد، ئەو دادوەرە لەبەر خاتری پارە ڕاستییەکانی دەگۆڕییەوە بە ناڕاست و لەبەر خاتری وەرگرتنی بڕێک پارە لە دژی ئاغا ڕەزا کاری کردبوو. ئێستاش ئەم پارێزەرە بەڕێزە (دکتۆر عەبدولحەمید عەبدولحەمد) مامۆستایەکی دادپەروەرو بەڕێز بوو، نەک تەنها پارەی وەرنەگرتبوو، بەڵکو ویستبووی پارەش بەقەرز بدات بە مهری. ئەم وڵاتەی ئێمە سەرانسەر پڕە لە

دژ، ئەم کەلتوورە چەندە هەورازو نشێوی تێدایە، هەروەکو هەموو شوێنەکانی تری ئەم جیهانە. ئەوەتا هەزاران کەس هاوکاری دەنێرن بۆ ئەو شوێنانەی بە بوومەلەرزە وێران دەبن، لەولاشەوە چەند کەسێک باندێک دروست دەکەن و بەناوی هاوکارییەوە ئەو هاوکارییانە دەدزن کە بۆ لێقەوماوانی بوومەلەرزەکە دێت، لە کوێی ئەم جیهانەدا بەمشێوەیە نییە. ئاغا ڕەزا دەیویست ببێتە پارێزەری هەژاران و لێقەوماوان، ئەو زۆر بەسەختی دژی حکومەت و ڕژێم بوو، بەڵام کەسێکی ئاقڵ بوو. کاتێک مهری پێیگوت: زانیوتە کتێبەکانی مارکس و لینین و تروسکیم خوێندۆتەوە، هەموو گیانی کەوتە لەرزە، بەڵام حەزی دەکرد ئەویش ئەو کتێبانە بخوێنێتەوە، مەگەر لەو کتێبانەدا چی نووسراوە؟ بۆچی ئەو لەسەر ئەو کتێبانە ئەوەندە لێدانی خواردووە؟ ئەو گوتی: سەدان جار پرسیاری ئەو کتێبانەیان لێکردووەو لەسەر ئەو کتێبانە کە نە بینیبوونی و نە خوێندبوونییەوە، سەدان جار لێدانی خواردووە. ئاغا ڕەزا سێ ساڵ لەوەو دوا هەموو ئەو کتێبانەی خوێندەوە، بەڵام هەرگیز نەبووە لایەنگری مارکس و ئینگلیس ئەو دەیگوت: بنەمای خۆی لەسەر پێنج پایە بنیاتناوە ئازادی، نوێژ، دادپەروەری، خۆشەویستی و هاوکاریکردنی خەڵکی، ئەو شەرابخواردنەوەیەشی بە بەشێک لە خۆشییەکانی خۆی دەزانی. تا کۆتایی ژیانی کە لە ساڵی (١٣٨٩/٢٠١٠) کۆچی دوایی کرد، پابەندی ئەو بنەمایانە بوو، ڕۆژانە درودی دەنارد بۆ گیانی شەهربانوو، دوو ڕکات نوێژی بۆ ئەو دەکردو یەک پەرداخ شەرابی دەخواردەوە.

## ژیان لە دوای ئازادی

مهری وەکو دایکێک، وەک عاشقێکی وەفادار خزمەتی ئاغا ڕەزای دەکرد، خۆشەویستییەک کە دوای هاوسەرگیریی سەریهەڵدابوو، خۆشەویستییەک کە دوای یەکترناسین بەدیارکەوتبوو. ئاغا ڕەزاش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر شەیدای مهری دەبوو. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لە زیندان بوو، ئاغا ڕەزا (٢٦) کیلۆ کەمیکردبوو. تەنها پێست و ئێسقانەکانی مابوو، لەدوای ئازادبوونیشی شەوان خەوی ترسناکی دەبینی، هەموو گیانی ئیسقانەکانی ئازاریان هەبوو، شوێنی برینەکانی دەسووتانەوە، بنەپێی قاچەکانی پێستەکەی لێدەبووەوە، سوکایەتییەکانی ناو زیندانی وەبیردەهاتەوە، ئەو هەرگیز باوەڕی بە درۆکانی ئەوان نەدەکرد، بەڵام ئەو درۆیانە ڕوحیان ئازار دەدا. ئەو

تۆمەت و بوختانەی لە زیندان بۆ مهرییان هەڵدەبەست، فەرامۆشی نەدەکرد.

یەکێک لە ناخۆشترین و ناشرینترین ئەشکەنجەدانی زیندانیان، تۆمەت هەڵبەستنە بۆ ژن، یان هاوسەری تۆمەتبار. لە سەردەمی دیکتاتۆرییداو لە هەموو ڕژێمە دیکتاتۆرییەکاندا، تاوانباری سیاسی پیاوانەو دادپەروەرانە دادگایی ناکرێت، سەرەتا دەیانەوێت ڕوحی ئازار بدەن، دەیانەوێت ئالودەی بکەن و دواتر سزای بدەن. لە ڕژێمە دیکتاتۆرەکاندا هەر تاوانبارێک جگە لە تاوانەکەی کە لەسەری دەستگیرکراوە، چەندین تاوانی تریشی دەخەنە ئەستۆ، هەروەکو پەیوەندی نابەجێ، گەندەڵی، ڕەوشت، خواردنەوەی شەراب، قوماربازی، گەندەڵی ماڵی و خیانەت بە گەل و وڵات و ئاسایشی ناوخۆ... مرۆڤەکان بۆ وەدەستهێنانی هێزو توانا چ کارێک ناکەن، بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، هەندێک کەس بە ماف و مووچەیەکی کەم و بە بەلاش دەبنە نۆکەرو ئەڵقە لەگوێی دیکتاتۆرەکان، ئەشکەدەران بۆ ئەوەی بە بەهێزی بمێننەوە، لە هاوجۆرەکانی خۆیان دەدەن و ئازاریان دەدەن، ئەوان خۆیان دەکەن بە غولامی کەسانێک کە مۆڵەت نادەن چاویشیان پێی بکەوێت.

میهرەبانییەکانی مهری ئاغا ڕەزای هێمن کردبووەوە، ئەو چێشت و شیرینیانەی کە دروستی دەکرد، ئاغا ڕەزای بوژاندبووەوە، بڕیاریان دا لە پشووی نێوان وەرزی یەکەم و وەرزی دووەمدا سەردانێکی یەزد بکەن. دایکی ئاغا ڕەزا کاتێک زانی کوڕەکەی ئازادبووەوە، ڕۆژانە دەچوو بۆ فەرمانگەی تەلەفۆنی گشتی و لەوێوە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کوڕەکەیدا دەکرد. کرێچی دووکانەکەی ئاغا ڕەزا تەلەفۆنی هێنابوو. مهری تاقیکردنەوەکانی تەواو ببوو، ئاغا ڕەزاش ناوی خۆی تۆمارکردەوە لە زانکۆو هەردووکیان ڕۆیشتن بەرەو یەزد. لەگەڵ خزم و کەسەکاندا دیدارەکانیان نوێکردەوە، بەڵام یەزد بەلای ئاغا ڕەزاوە ئەو یەزدەی چەند ساڵێک لەوەوبەر نەبوو، ئەو هەموو شوێنەکانی بەجۆرێکیتر دەبینی، هێشتا خەڵکی لەبارەی چاکسازییەکانی شاوە دەدوان، هێشتا هەندێک کەس باسی سوودەکانی چاکسازی زەوییان دەکرد، هێشتا هەندێک کەس لەبارەی میهرەبانیی شەهربانووەوە قسەیان دەکرد. ئاغا ڕەزا بەجۆرێکی تر بیری دەکردەوە، بەبۆچوونی ئەو، حکومەت و شا بەهۆی پروپاگەندەو هێزەوە خۆی ڕاگرتووە. ئاغا ڕەزا بەزوویی چوو بۆلای دکتور جەلالی موجیبیان، دکتۆر چەند ئازمایشتێکی بۆ ئەنجامداو هەر هەمان قسەی پێشووی کردەوە. گوتی: هێشتا دەرمانێک

بۆ ئەم نەخۆشییەی تۆ نەدۆزراوەتەوە، بەڵام نائومێد مەبە خودا گەورەیەو زانستیش لە بەرەو پێش چووندایە.

خوشک و کەسەکانی ئاغا ڕەزا ئیرەییان دەبرد بە شێوازی قسەکانی مهری و جۆری جلوبەرگەکەی، هەندێک جاریش پێشنیاریان بۆ ئاغا ڕەزا دەکرد تاکو بەزوویی ژن بهێنێت، بەجۆرێک قسەیان لەگەڵدا دەکرد تاکو مهری تێبگات. لەکۆتاییدا ڕۆژێک ئاغا ڕەزا لەکاتی نانخواردندا لە ماڵی دایکی پەستی دایگرت و گوتی: دایکە کێشەی منداڵ نەبوونمان لە منەوەیە، نەک لە مهری، ئێوە بۆچی ئەوەندە ئەم ژنە داماوە ناڕەحەت دەکەن، ئێوە بۆچی ئەوەندە هەستی ئەم ژنە بریندار دەکەن. خوشکەکەی هات تاکو قسەیەک بکات. ئاغا ڕەزا گوتی: ئەگەر لەبارەی ئەو بابەتەوە ورتەتان لەدەم بێتەدەرەوە یەکجارێکی تر بە یەزد دا نایەمەوەو جارێکی تر چاوتان بە چاوم ناکەوێتەوە، هەموویان بێدەنگ بوون. مهری نانەکەی بەتەواوی نەخواردبوو، گوتی: واپێویست دەکات سەردانێکی ماڵی باوکم بکەم، لەڕێگادا بەرەو ماڵی باوکی دەگریاو فرمێسکی دەڕشت، بۆ یەکەمین جار لەدڵی خۆیدا گوتی: دەبێت هەرچۆنێک بێت بەرگەی بێ منداڵی و بەرگەی قسەو قسەڵۆکی ئەم کەمفامانە بگرم، ئەو وتە کانی ڤیکتۆر هۆگۆی لە ڕۆمانی بێنەواکاندا هاتەوە یاد کە دەڵێت (پێویستە ئاغای مۆریل چارەنووسی هەموو ئەوکەسانە قبوڵ بکات کە لە شارە بچووکەکاندا دەژین، شارە بچووکەکان شوێنێکن زمانی زۆریان تێدایە بۆ قسەکردن و مێشکی کەمی تێدایە بۆ قسەوەرگرتن).

مانگی ئەسفەند گەیشتبووە نیوە، ئاغا ڕەزا وای بە باشزانی لەگەڵ مهریدا سەردانێکی شاری مەشهەد بکەن، بەڵام پارەیەکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نەبوو، بە مانگی پێنجسەد تومەنی کرێی دووکانەکەیان نەیاندەتوانی ژیانێکی ئاسایی بژین، بەو پارەیە نەیاندەتوانی گەشت بکەن. ئاغا ڕەزا لەبەرخۆیەوە گوتی: خودا گەورەیەو خودا کارسازە، پێویستە پشت بەخودا ببەستین. مهری لە دانشتگا بوو. ئاغا ڕەزا بەتەنها لەماڵەوە بوو، لەسەر پشت ڕاکشابوو بیری دەکردەوە، لەناکاو چاوی بە کتێبەکانی شەهربانوو کەوت و بیری هاتەوە، ئەو پیرەژنە هەرگیز قسەی بێمانای نەکردبوو، بۆچی ئەو گوتبووی ئەم کتێبانە ئاڵتوونن، لەپڕێکا هەڵساو خۆی گۆڕی یەکێک لە کتێبەکانی هەڵگرت و ڕۆیشت بەرەو شەقامەکە. کتێبەکە زۆر کۆن بوو، دەیزانی شەقامی مەنوچەهری شوێنی کڕینی کتێبە.

پەڕەی یەکەمی کتێبەکە بەرواری لەسەربوو، ئاغا ڕەزا سەیریکرد بەروارەکە ساڵی

(١٥٦٧/٩٢٦) نووسراوە. کتێبەکە کتێبێکی دانسقە بوو، کتێبێکی تەواو بوو، بەرگی کتێبەکە دڕابوو. لە شەقامی مەنوچەهری ڕۆیشت بۆ یەکەم دووکانی کتێبفرۆشی، لێی پرسین ئایا کتێبی کۆن دەکڕن. کتێب فرۆشەکە ناردی بۆلای کەسێکی تر پیاوێکی بەتەمەن لەوێ دانیشتبوو، ئەو پیاوە تەمەنی هەشتا ساڵ دەبوو. ئاغا ڕەزا گوتی: کتێبی کۆن دەکڕیت. ئەو پیاوە سەیرێکی کتێبەکەی کردو چەند پەڕەیەکی لێهەڵدایەوەو گوتی: ئەم کتێبە زۆر دانسقەیە، پێویستە نرخی ئەم کتێبە بزانیت، ئەم کتێبە زۆر بەنرخە میراتێکی نەتەوەییە، ئاگاداربە نەکەوێتە دەست کەسانێک لە وڵات بیبەنە دەرەوە. ئاغا ڕەزا گوتی: ئێستا نرخی ئەم کتێبە چەندە؟ ئەو پیاوە گوتی: من کڕیار نیم، من واهەست دەکەم تۆ خەڵکی یەزد بیت و کتێبناس نیت، منیش کەسێکی قۆڵبڕ نیم، بۆیە ناتوانم نرخی ئەم کتێبە دیاری بکەم، بەڵام ئەوەندەت پێدەڵێم ئەم کتێبە پارەیەکی باش دەکات، نرخی ئەم کتێبە لە خانوویەکی پێنجسەد مەتری زیاترە، بۆیە وریابە لەدەستتی دەرنەهێنن، ئەو پیاوە لە ئاغا ڕەزای پرسی تۆ کارت چییە؟ ئاغا ڕەزا گوتی: خوێندکاری کۆلێژی مافم لە زانکۆی تاران. پیاوەکە گوتی: مادام خوێندکاری زانکۆی تارانیت، بڕۆ بۆ کتێبخانەی زانکۆ، بچۆ بۆ لای ئاغای (تەقی دانش بژوە) لەبارەی ئەم کتێبەوە قسەی لەگەڵدا بکە. ئاغا ڕەزا لەبەرخۆیەوە دەیگوت ڕاستی و ڕاستگۆیی هەر وەکو ئەم کتێبە نرخی زۆرە.

ئاغا ڕەزا ئیتر کەسەکەی جاران نەبوو، ئەو پێشتر بۆ ئەنجامدانی کارەکانی پرس وڕای بە هیچ کەسێک نەدەکرد، بەڵام ئێستا هیچ کارێک بەبێ پرس و ڕا ئەنجام نادات، وانەی لە گرفتەکانی پێشووی وەرگرتبوو، لەبەرخۆیەوە دەیگوت ئەم کتێبانە تایبەتن بە مهری، پێویستە پرس و ڕا بەو بکەم، واباشترە بۆچوونی لیۆن و ئاغا تەقیش وەربگرم. گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو کتێبەکەی لەگەڵ خۆی بردەوە. مهریش گەڕابووەوە بۆ ماڵەوە. ئاغا ڕەزا باسی کتێبەکەی بۆ مهری کرد. مهری گوتی: دایەگەورەم بەبێ هۆ هیچ قسەیەکی نەدەکرد، ئێمە نرخی قسەکانی ئەو دەزانین. ئاغا ڕەزا گوتی: با پرسێک بە لیۆن و ئاغا تەقیش بکەین. مهری گوتی: لیۆن و ئاغا تەقی هیچ شتێک لەبارەی کتێبی کۆنەوە نازانن، ئێستا مادام ئەو پیاوە وای پێگوتوویت بڕۆ بۆلای ئاغا دانش بژوەو کتێبەکەی نیشان بدە.

مهری و ئاغا ڕەزا نرخی فرۆشتنی کتێبی کۆنیان نەدەزانی، بەهاوکاری ئاغا تەقی دانش بژوە شەش بەرگ لە کتێبە دانسقەکانی شەهربانوویان پێشکەشی وەزارەتی

ڕۆشنبیری کرد. واتە کتێبەکانی بەبێ پارە پێشکەش بە وەزارەتی ڕۆشنبیری کرد. وەزارەتیش وەک دیارییەک (١٤٥٠) مەتر زەوییان لە گەڕەکی یوسف ئاباد پێدان لەگەڵ بڕی سەد هەزار تومەن. ئاغا ڕەزا گوتی: دەبێت زەوییەکە بەناوی مهرییەوە بکرێت. مهری گوتی: من ناتوانم هاتوچۆی فەرمانگەکان بکەم، بۆیە واباشترە زەوییەکە بەناوی خۆتییەوە بکەیت، چەند مانگێکی پێ چوو تا کارەکەیان تەواو بوو، لەم مامەڵەیەدا ئاغا ڕەزا وانەیەکی گەورەی وەرگرت.

ئاغا ڕەزا وەرزی دووەمی زانکۆی تەواوکردبوو. ورەی ڕۆژ بەڕۆژ بەرزتر دەبووەوە، لەگەڵ مهری کات لەدوای کات زیاتر وابەستەی یەکتری دەبوون، هەردووکیان زیاتر نرخی ئازادییان دەزانی، ئەوان ئازادییان نەک تەنها بۆ خۆیان، بەڵکو بۆ هەموو کەسێکیان دەویست، ئازادیی بەلای ئەوانەوە زۆر پیرۆز بوو. ئاغا ڕەزا دەیگوت: ئازادیی یا ڕزگاری لە کۆتو بەند، پیرۆزترین نرخی هەیە، هەندێکجاریش دەیگوت: تەنها شتێک کە نرخی هەبێت ئازادییە، مرۆڤەکانیش گیانیان لەپێناو ئازادیدا بەخت دەکەن. لە هاوینیساڵی (١٩٦٨/١٣٤٧) ئاغا ڕەزا ببووە خاوەنی (١٤٥٠) مەتر زەوی لە گەڕەکی یوسف ئاباد. کتێبەکانی تریشیان لە یەزدەوە هێنا بۆ تاران. زەوییەکەی کرد بە سێ بەشەوە، لە ماوەی دوو ساڵدا لەسەر ڕووبەری پێنجسەد مەتر زەوی جوانترین و باشترین خانوویان بۆ خۆیان دروستکرد. بە فرۆشتنی کتێبەکانی تری شەهربانوو، ژیانێکی باشیان بۆ خۆیان دابینکرد. بە پارەی کتێبەکانی تر دوو خانووی گەورەو چەند دووکانێکیان لە شەقامی یوسف ئاباد کڕی و مۆڵەتیان بۆ وەرگرتن. مهری بەکالۆریۆسی لە زیندەوەرزانی داوەرگرت و بوو بە مامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی لە تاران، دواتریش توانی ماجستێر وەربگرێت، ساڵی (١٩٩٩/١٣٧٨) خانەنشین کرا. ئاغا ڕەزا هیچ کاتێک تێکەڵاوی سیاسەت نەبوو، لە هیچ فەرمانگەو شوێنێکی حکومەتدا کاری نەکرد، ئەو دەیگوت: نانی حکومەت حەرامە، دەیگوت فەرمانبەریی مرۆڤ ڕسوا دەکات. خەڵکی لەپێناو پارووە نانێکدا سوێند بەسەری شا دەخۆن. ئەو ئەم سێ دێڕ هۆنراوەیەی (ئیبن یەمین)ی لەسەر تابلۆیەک نووسیبوو و لەسەر مێزەکەی دانابوو.

**ئەگەر دووگاو زەوییەکت بوو**

**یەک میرو یەک وەزیرت بوو**

**بژێویت ئەگەر دابین نەبوو**

**شەو و ڕۆژ هەردەم لە کاردا بە**
**هەزاران جار لە بەربەیاندا**
**کەمەر ببەستەو لە کاردابە**

ئاغا ڕەزا دووکانێکی وردەواڵە فرۆشی دانا، زیاتر پارچەی کۆن و مێژوویی تیا دەفرۆشت، چەند شاگردێکی هەبوو، هەمیشە ئامۆژگاری شاگردەکانی دەکرد، کە شتی حەرام، حەڵاڵ نەکەن و دەستی خەڵک نەبڕن، بۆ هەر کەلوپەل و پارچەیەک نرخی ڕاستی خۆی بڵێن.

بەخواستی خوداو بەرەکەتی کتێبەکانی شەهربانوو باری ئابووری ئاغا ڕەزا باش بوو، ئاغا ڕەزا ساڵی (١٩٧٦/١٣٥٥) ماجستێری لە زانکۆی تاران وەرگرت، ئەو هەمیشە بەدوای مافی ئەو کەسانەوە بوو کە تاوانیان لێدەکرا. هەرگیز بریکاری تەڵاق و کیشەی خێزانی وەرنەگرت، بەهۆی خانوو و دووکانە کرێکانی و دووکانی وردەواڵەفرۆشییەوە داهاتێکی باشی دەست دەکەوت، ژیانی بەتەواوی مسۆگەر ببوو، هیچ هەڵپەو تەماحێکی نەبوو.

لە ساڵی (١٩٧٨/١٣٥٧) باری شاری تاران بەتەواوی تێکچووبوو، ڕۆژانە خۆپیشاندان هەبوو. ئاغا ڕەزا و مهری لەماڵەوە دانیشتبوون و بەردەوام کتێبیان دەخوێندەوە. ئاغا ڕەزا زۆربەی کات کتێبی مێژووی شۆڕشەکانی دەخوێندەوە. ئاغا ڕەزا بەشداری خۆپیشاندانەکانی نەدەکرد، ڕۆژێک مهری لێیپرسی بۆچی ناچیت بۆ خۆپیشاندان. ئاغا ڕەزا گوتی: من دژی خۆپیشاندانم. مهری گوتی: بۆچی؟ تۆ لەسەر دەستی ئەم ڕژێمە ئەم هەموو کوێرەوەرییەت بەسەرهات، چۆن دژی خۆپیشاندانیت، مهری بەردەوام دەڕۆیشت بۆ خۆپیشاندان، بەڵام ئاغا ڕەزا لەماڵەوە دانیشتبوو کتێبی دەخوێندەوە. مهری پێداگری کرد کە ئاغا ڕەزاش بچێت بۆ خۆپیشاندان، ئاغا ڕەزاش دەیگوت: خۆت ئازادیت دەچیت یا ناچیت لێم گەڕێ با منیش ئازادبم، ئەوان ڕۆژانە باسی خۆپیشاندانیان دەکرد، ئەوان هەردووکیان دژی شا بوون. مهری لایەنگری شۆڕش و ڕوخانی شا بوو. ئاغا ڕەزا لایەنگری چاکسازی بوو، ئەو هەرگیز بەشداری شۆڕشی ئێرانی نەکرد، بەڵام ڕێگری لە مهری نەکرد بۆ خۆپیشاندان. ئاغا ڕەزا (٤٤) ساڵ لە تاران ژیا، بەڵام هەرگیز خووی تارانییەکانی نەگرت، تەنانەت شێوە زمانی یەزدیشی

نەگۆڕی، ئەو هەمان پیاوی ڕاست و دروستکارو ڕاستگۆی کۆلانەکانی یەزد بوو، بەڵام لەماوەی ئەو (٤٤) ساڵەدا هەستی بە گۆڕانکاریی تاران و تارانییەکان کرد. ئەو دەیگوت: ئەم شارە هەر ڕۆژەو ڕەوشتێک تاقی دەکەنەوە، تاران کارگەی گۆڕانکاری مرۆڤەکانە، ملیۆنەها کەسانی سادەو ڕاستگۆی لادێیی و شارەکانی تر دێنە ئەم شارەوە، بەڵام دوای چەند ساڵێک خووی گورگ و ڕێوی دەگرن. ئاغا ڕەزا ڕۆژ بەڕۆژ پیرتردە بوو، بەڵام میهرەبانتر دەبوو. ساڵی چەندجارێک دەچووەوە بۆ یەزد. بۆ مردنی محەمەد عەلی و دایکی فرمێسکی زۆری ڕشت، هەمیشە خێری دەکرد بۆ شەهربانوو، هاوکاری خوێندکارە هەژارەکانی دەکرد، منداڵەکانی ئەکرەمەی ژنخوشکی خۆشدەویستن و وەک منداڵی خۆی سەیری دەەکردن، هاوکارییەکی زۆری ئەو منداڵانەی دەکرد. ئەکرەمە هیچ داهاتێکی نەبوو جگە لەو هاوکارییەی ئاغا ڕەزا نەبێت. لە ساڵی (١٣٨٩/٢٠١٠) ئاغا ڕەزا بەهۆی نەخۆشییەکی کتوپڕەوە کۆچی دوایی کرد.

مهری لەوکاتەوەی کە خانەنشینکرا، بەتایبەتی دوای مردنی هاوسەرەکەی زیاتر هاتوچۆی یەزدی دەکرد، هاوکارییەکی زۆری خوشکەکانی، بەتایبەتی ئەکرەمەو منداڵەکانی دەکرد، ئەکرەمە هەرگیز تەڵاقی وەرنەگرت و دوای پەنجا ساڵ و ئێستاش هەر چاوەڕوانی عەباسی هاوسەریەتی تاکو لە دەرگای ماڵەکەی بدات. ئەکرەمە لەدوای کۆچی دوایی محەمەد عەلی باوکی بەهاوکاری مهری خوشکی بەشە خانووەکەی خوشکەکانیشی کڕییەوە، ئێستاش لەو خانووە کۆنەدا ژیان بەسەردەبات، ئێستاش چاو لەڕێی عەباسی کوڕە پوریەتی ڕۆژێک بگەڕێتەوە بۆلای.

## هاوڕێیانی ئەشکەوت

لە مانگی (ئابانی١٣٩٢/تشرینی دووەم ٢٠١٣) سەردانێکی کۆڵانە کۆنەکانی یەزدو شوێنی لەدایکبوونی خۆمم کرد، لە (چواری دەی ٢٥/١٣٩٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٥) جارێکی تریش چوومەوە بۆ هەمان شوێن، واتە هەمان کۆڵان کە ماڵی محەمەد عەلی لێبوو، کاتێک سەیرمکرد هەموو شتێک گۆڕابوو، هەرجارێک سەردانی ئەو گەڕەک و کۆڵانە دەکەم، وەک یارانی ئەشکەوتم لێدێت، ڕووداوی هاوڕێیانی ئەشکەوت چیرۆکێکە، هەر چیرۆکێک کە خودای گەورە لە قورئاندا باسیکردبێت، بەدڵنیاییەوە پەندێکی گەورەی تێدایە، هەموو کەسێکی ئەمڕۆی تەمەن (٧٠-٨٠) ساڵ بۆ خۆی یەکێکە لە هاوڕێیانی ئەشکەوت، ئەوەتا هەموو شتێک لە ئاووهەوا، تەکنەلۆژیا، نرخی پارە، ڕەوشت، هاتوچۆ

و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی، ڕووی بیناکان و داب ونەریت و گەڕەکەکان گۆڕاون. هەروەکو هەموو گەڕەکە کۆنەکانی شارەکانی تر، گەڕەکەکەی ئێمەش گۆڕاوە، نرخی ئاو، نان، زەی، گۆڕ، بەجۆرێکی ناشیرین گۆڕاون. نرخی ناسنامەو پێناس و بیرکردنەوەکانیش گۆڕاون. خوداوەند باسی هاوڕێیانی ئەشکەوتی بۆ ئێمە کردووە، ئێمەش کە لەخەوداین، کاتێک بۆ ماوەیەکی کورت بەئاگا دێینەوە دەبینین خۆمان بووین بە هاوڕێیانی ئەشکەوت.

لە گەڕەک و کۆڵانی ئێمەدا بەشێکی زۆر لە خانووە کۆنەکانی تێکدراون، خانووی خشتی تازە جێگای خانووی خشتی قوڕی گرتوتەوە، بەدڵنیاییەوە ئێوە هەمووتان ئەوەتان بیستووە کە بە شاری یەزد دەڵێن شاری (بادگیر، واتا شاری باگر)، بەڵام لە گەڕەکی ئێمەدا لە هیچ ماڵێکدا (باگر) دروست نەکرابوو، لە هەموو گەڕەکی ئێمەدا یەک یان دوو ماڵ باگریان هەبوو. ئایا زۆربەی خەڵکانی گەڕەکی ئێمە خەڵکانی هەژار بوون کە توانای دروستکردنی باگریان نەبوویێت، یاخود گەڕەکی پشت باغ لە سەردەمێکی نوێدا دروستکراوەو سەردەمی باگر تەواوبووە، وا هەست دەکەم بەمجۆرەبێت، کەمبوونی باگر لە گەڕەکی ئێمەدا نیشانەی هەژاریی مێژوویی گەڕەکەکەمان بووە. لە ساڵی (٢٠١٣/١٣٩٢)دا خانووەکەی محەمەد عەلی دەستی لێنەدرابوو هەروەکو خۆی مابووەوە، تەواو هەروەکو پەنجا ساڵ لەوەپێش، هەرهەمان خانوو کە پەنجا ساڵ زیاترە ئەکرەمەی تێدا دەژی، بەڵام خانووەکەی بەرامبەری کە تایبەت بوو بە خوشکەکەی ئەکرەمە، تێکیانداو لە جێگایدا خانوویەکی تازەیان لێدروستکرد، خانوویەک لەسەر شێوازی نوێ و پەنجەرەی ئەلەمنیۆم کە لەسەری کۆڵانەوە ڕووناکی بەردەکەوێت، خانوویەک کە پێشتر لە کۆڵانەوە دەرنەدەکەوت، بەڵام لە ئێستادا لە سەری کۆڵانەوە بەڕوونی دەبینرێت.

کوڕێکی لاو لەبەردەم ماڵی ئەکرەمە خەریکی چاککردنی ماتۆڕسکیلەکەی بوو، دەمزانی خانووەکەی محەمەد عەلی لەکوێیە، بەڵام هەر لە ئانقەست ناونیشانی ماڵەکەیانم لە کوڕەکە پرسی، ئەویش گوتی: نازانم، محەمەد عەلی کێیە؟ گوتم: ماڵی لێرەبوو. گوتی: تۆ بەهەڵە هاتوویت، کەسێک نییە بەناوی محەمەد عەلی. گوتم: چەند ساڵ دەبێت ماڵتان لەم کۆڵانەو لەم خانووەدایە؟ گوتی: نزیکەی هەشت ساڵ دەبێت، بەبێ ئەوەی یەک قسەی تر بکەم، لە دەرگای ماڵی ئەکرەمەم دا، دەنگی ژنێک لەژوورەوە هات، منیش بەدەنگێکی بەرز گوتم: ئێرە ماڵی محەمەد عەلییە؟ ئەو کوڕەی بەردەرگا سەری هەڵبڕی

و سەیرێکی کردم وەک ئەوەی منی پێ شێت بێت، ئەو ژنەش لە ژوورەوە وەڵامیدامەوە، گوتی: فەرموو. گوتم: ئەکرەمە خان منم حوسێن پاپولیم. گوتی: حوسێن ئاغا بەخێرهاتی فەرموو، فەرموو وەرە ژوورەوە. ئەکرەمە خانم ئەوکاتە ساڵی (٢٠١٣/١٣٩٢) تەمەنی (٧٥) ساڵ دەبوو. بەو کوڕە مێردمنداڵەم گوت: ئێرە ماڵی محەمەد عەلی و شەهربانووە، ئەگەر جارێکی تر کەسێک هەواڵی ماڵی ئەوانی پرسی، ئێرەی پێنیشان بدە.

ئێستا ئەو ڕۆژگارە بەسەرچووە کەسانی گەڕەک و باوک و باپیرانی یەکتری بناسین، ئێستا ماڵەکانی یەزد بوونە خاوەن پەنجەرەی دەرەوە، واتە پەنجەرەیەک کە بەسەر دەرەوەدا دەڕوانن. خانووە کۆنەکانی یەزد هەرگیز پەنجەرەیان بەسەر کۆڵانەوە نەبوو، بەڵام ئێستا پەنجەرەکانیان بەڕووی کۆڵاندا دەکرێنەوە، پەنجەرە ئەگەر ڕووناکی لێنەیاتە ژوورەوە بەکەڵکی چی دێت؟ ئیتر سەردەمی دراوسێیەتی و نان دان بەقەرز بە یەکتری بەسەرچوو.

لەسەر باڵکۆنی ماڵی ئەکرەمە دانیشتبووم، لەهەر گۆشەیەکی ئەو خانووەدا یادەوەرییەکی خۆشم دەهاتەوە یاد، ڕوخساری جوانی شەهربانوو، کەلوپەلی بەقاڵییەکەی ئاسیە خانمی یەهودی، ڕوخساری محەمەد عەلی میهرەبان، ڕوخساری هەمیشە توڕەی ڕوقیەو سەیرکردنە میهرەبانییەکەی سەفورا لەبەر چاوم بوون. کوشتنی دووپشک و هەست بە قارەمانیەتی خۆم و هاتوچۆی ئەو ڕۆژەی کە ژێرزەمینەکەمان پاکدەکردەوە، لەبەرچاوم بوو، لە حەوزەکەدا ئاو نەبوو، وشک ببوو، ئیتر ئەو سەردەمە بەسەرچوو بوو کە لە ماڵەکانی یەزدا حەوزی ئاو هەبوو، دیارە لە ماڵە دەوڵەمەندەکاندا لەجیاتی حەوزی بچووک حەوزی مەلەوانگە پەیدابووبوو، سەردەمی زوو لە یەزد هەروەکو شارەکانی تر ئاو بەشێوەیەکی یەکسان دابەشدەکرا، بەڵام ئێستا بەکارهێنانی ئاو بووە بە چینایەتی.

لەسەر باڵکۆنەکە دانیشتبووم و چاییم دەخواردەوە، حەوزی ناوەڕاست حەوشەکە ئاوی تێدا نەبوو، ئیتر سەردەمی حەوزی پڕئاو بەسەر چوو بوو، ئاوی هەژاران تەواو ببوو، بەڵام باخچەکان جوانتر ببوون. ئەکرەمە خانم لەو خانووەدا بەتەنها دەژیا، منداڵەکانی هەموویان هاوسەرگیرییان کردبوو و بەدوای ژیانی خۆیانەوە بوون، ئەو (٩) نەوەو دوو منداڵی نەوەی هەبوو، جگە لە مووە سپییەکانی سەری، هیچ شتێک لە جوانییەکەی نەمابوو، ڕوخسارێکی نورانی هەبوو، دەزانم ئەکرەمە خانم هیچ جۆرە کرێم و دژە خۆر و بۆدرەیەکی جوانکاریی بەکار نەهێناوە.

## محەمەد عەلی و ماتۆڕی ئاو

لە ئەکرەمە خانمم پرسی: گۆڕانکاریت لەم خانووەدا کردووە؟ گوتی: نەخێر هیچ گۆڕانکارییەکم تێدا نەکردووە، تەنها چەند ساڵێکە سەری بیرە چل گەزییەکەم داپۆشیوە، ئێستا نە ژێرزەمینەکە ئاوی هەیەو نە کەسێکی ئاوکێشی هەیە. کارو قسەکانی محەمەد عەلیم وەبیرهاتەوە. لە خانووەکەی محەمەد عەلیدا بیرێک هەبوو کە لە جۆگەی ئاوی قەناتەوە ئاوی بۆ دەهات، بە سەتڵی لاستیکی ئاویان لێدەردەکرد. لەساڵی (١٣٤١/١٩٦٢) کارەبا هات بۆ یەزد. محەمەد عەلی ماتۆڕێکی ئاوی کڕی. ئەو دەیویست ئەرکی هەڵکێشانی ئاو لە بیرەکەوە کەمتر بکاتەوە، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک محەمەد عەلی ماتۆڕی ئاوەکەی لابردو بەکارینەهێنا، لێیان پرسیبوو بۆچی ماتۆڕەکەی لابردووە، بۆچی دەتەوێت دووبارە بە سەتڵ ئاو لە بیرەکە دەربکەیت؟ لە وەڵامدا گوتبووی باپیرانی ئێمە مۆڵەتیان دابوو جۆگا ئاوەکە بەژێر خانووەکانیاندا بڕوات، لەجیاتی ئەوە خاوەن ئاوەکەش مۆڵەتی بە ئەوان دابوو کە هەرماڵەو بەشی پێویستی خۆی لە ڕێی ئەو بیرەوە ئاوی جۆگاکە بەکاربهێنێت، بۆیەش ماتۆڕی ئاوەکەم لابرد، چونکە ماڵەوەمان بەهۆی ئەو ماتۆڕەوە زیاد لەپێویستی خۆیان ئاو بەکاردەهێنن. ماتۆڕەکە کارئاسانی زۆری بۆکردین، بەڵام بەکارهێنانی ئاو زیادی کرد، خۆ ئەگەر ئاوها بێت تەواوی ئاوی جۆگاکە ڕادەکێشینە دەرەوەو ئاو بۆ خاوەنەکانیان ناچێت، ئەم زیاد بەکارهێنانی ئاوە حەرامە، من ماتۆڕی خۆمم لابردووە هیوادارم دراوسێکانیشم ئەگەر ماتۆڕیان هەیە بەزوویی لایبەرن.

دوای چەند ساڵێک ئەوەندەیان ئاوی بیر لەسەر جۆگەکانەوە ڕاکێشا تاکو جۆگای ئاوی قەنات بەتەواوی وشکیکرد، کاتێک ڕەوشت نەما ئاویش نەما، ئێستا دەبێت هەزار ئەوەندەی ئەو پارەیەی کە لەو ئاوەدا خەرجدەکرا، خەرج بکەین، تاکو ئاوی ئەسفەهان بەو دەشتە وشکەدا بگاتە یەزد.

نوقمی دەریای بیرکردنەوە ببووم کە ئەکرەمە خان چایی دووەمی لەبەردەمم دانا. گوتم: دەمەوێت لە پلیکانەکانەوە سەرکەوم و بچمە سەربان تاکو سەیرێکی ئەو دەوروبەرە بکەم. گوتی: فەرموو بڕۆ دەرگاکە کراوەیە. لە پلیکانەکانەوە سەرکەوتم، لەگەڵ هەر هەنگاوێکمدا یادەوەری (٥٢) ساڵ لەوەپێش دەهاتەوە یادم. بۆخۆتان دەزانن ئەو پلیکانانە چەندە قسە هەڵدەگرن بۆ گوتن، دڵی مرۆڤ لە پیریشدا پەیوەست دەبێت

بە خشت و گڵی سەردەمی لاوێتی، ئەویش هەمان هەستە کە کەلتوورەکان پێیدەڵێن (نۆستالۆژی).

ئیتر لەو گەڕەکە کۆنەی ئێمەدا هیچ کافرێک بوونی نەبوو، هەموویان موسڵمان بوون، بەڵام هیچ دراوسێیەک لە هەواڵی دراوسێکەی خۆی نەدەپرسی، ئیتر ژنان لەسەری کۆڵان دانەدەنیشتن، هەر بەو هۆیەشەوە دراوسێکان ئاگایان لە دەردەدڵی یەکتری نەبوو، ئیتر کوڕان و کچان بە پلیکانەکاندا نەدەچوونە سەربان، ئەوان هەواڵەکانیان بەهۆی ئایپادو ئینتەرنێت و فایبەر وەردەگرت، لەوەیە هەر بەوهۆیەوە بێت هاوسەرگیریی کەمبووەتەوە، ئیتر هیچ کەسێک لە پاسەوانە فریشتەکان ناترسێت، هەمووان لە کامێراو مۆبایل و ئینتەرنێت دەترسن.

پێش ئەوەی بێم بۆ سوید، چەند ڕۆژێک لە تاران بووم، بە مهری خانم گوت: یادەوەرییەکانتم نووسیوەتەوەو ڕێکم خستووە پەڕو باڵی تەواوم بۆ کردووە، هەرچیم بەدڵدا هاتبێت نووسیومە، بەڵام هیچ شتێکی نابەجێم نەنووسیوە. مهری گوتی: بۆخۆت ئازادیت کەم و زۆر هەرچییەک دەنووسیت، بەڵام کارێک بکە هیچ کەسێک لەم یادەوەرییەدا دڵی گەرد نەگرێت. گوتم: نووسیومە تۆ تەمەنت (٧٨-٨٠)ساڵ دەبێت باوەڕتان بە پێنج بنەماکەی هاوسەرەکەتان هەیە. گوتی: بنووسە، ئێمە لەوە تێپەڕیوین کە بمانەوێت وەڵامی بەندەکانی خودا بدەینەوە، خودا بۆخۆی بەخشندەو میهرەبانە، چۆنت دەوێت وا لێکیبدەرەوە. تەواوبوونی ئەم بەسەرهاتە، ئوبسالای سوید، ڕۆژی هەینی (٢٦-١٠-١٦/١٣٩٣-١-٢٠١٤) ژووری خوێندکار هومای پاپولی یەزدی، پلەی گەرمی لە دەرەوە (٩) پلە ژێر سفرە، سبەی دەڕۆم بۆ ئۆسلۆی پایتەختی نەرویج، لە ئۆسلۆوە دەڕۆم بۆ ترمسۆ (Tromso) لەوێشەوە دەچم بۆ کۆمەڵە دوورگەکانی (ئسوالبارد) یان (سپتز برو شاری لانگ یربایِن)، شوێنی نیشتەجێبوونی ورچە سپییەکانی باکوور. جێگایەک کە زیاتر لە (چوار مانگ و ١٧) ڕۆژی لە ساڵێکدا بەتەواوی شەوەو (چوار مانگ و ١٧) ڕۆژیش بەتەواوی ڕۆژە. دەڕۆم تاکو (١١٠) کاتژمێر لەسەر زەوییەکی بێ خۆر ببمە سەهۆڵ، دەڕۆم تاکو یادەوەرییەکم لەم دوورگە دوورەدەستە سەهۆڵبەندانە هەبێت. دوورگەیەک لە بەرزترین شوێنی ئەم جیهانەدا ژیانی تێدایە، دوورگەیەک کە (١١٠٠) کیلۆمەتر باکوورتر لە باکووری ئالاسکاوە، خوا بکات لەوێ دڵم نەیبەستێت.

## هیچ کاتێک درەنگ نییە

## شوانێک لە تەمەنی (٩-١١) ساڵیدا

منداڵێکی تەمەن یازدە ساڵ ڕۆژانە لەجوڵەدا بوو، هەروەکو میلی کاتژمێر ڕۆژانە بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوەو هەموو ڕۆژێکیش خۆر بەدەوری سەری ئەودا دەسوڕایەوە. بەیانیان زوو کاتێک تیشکی خۆر دەردەکەوت، ئەویش مێگەلە بچکۆلەکەی لە ڕەشماڵەکانی هەوارەکەوە دەبردە دەرەوە، خۆی بە بیابان دەسپارد تاکو هەتاو گیانی گەرم دابێنێت. باپیرەی زیاتر لە شەست سەر بزن و کاری هەبوو، لەو بیابانەدا تەنها خۆی و خوداو وڵاخ و بزنەکانی بوون. وڵاخەکە نان و ئاوی بۆ هەڵگرتبوو، ئەو بێزمانە درکی دەخواردو باری دەکێشا، هەرگیز نارەزایی دەرنەدەبڕی و جوتەی نەدەوەشاند، ئاژەڵێکی بەڕێز بوو، هەروەکو ملیۆنەها مرۆڤ کە سیفەتی بەڕێزیی بۆ خۆیان دەکڕن، تاکو بەڕێزداریی بەرچاوبکەون و لە هەموو تەمەنی خۆیاندا یەک نارەزایی دەرنابڕن، تاکو سیفەتی ڕێزداریی و بەڕێزیی خۆیان لەدەست نەدەن. بەڕاست بۆچی وڵاخ بەڕێزە، بەڵام ڕێزدار نییە؟ (العاقل یکفی فی الآشارە)، یەک هێما بەسە بۆ کەسی ژیر. ئەو منداڵە خووی بەو دەشت و بیابانەوە گرتبوو، بیابان و چەو و لم و خۆڵ و خاک و بیری کەم ئاو ببوونە ناسنامەی شوێن و جوگرافیای ئەو.

تەمەنی چوار ساڵبوو کاتێک باپیرەی سواری وڵاخی دەکردو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ دەشتودەر، کاتێک گەورەتر بوو، چەندینجار بە زۆرەملی بەدوای باپیرەی دەکەوت و لەگەڵیدا دەڕۆیشت، باپیرەی بە خۆی و حوشترەکەیەوە دەڕۆیشت بۆ گوندەکانی دەوروبەر، بۆ گوندێک لە دووریی (٣٥) کیلۆمەتر لە خۆرئاوای ڕەشماڵەکانیانەوە،

گوندێک کە پوورو خاڵەکانی لەوێ دەژیـان، گوندێک بە دووری (٥٠) کیلۆمەتر لە وڵاتێکی دراوسێیان، واتە وڵاتی (مالی)، گوندێکی گەورە، کە باپیرەی لەو گوندەدا کڕین و فرۆشتنی دەکرد، گوندێک کە کەسانی شینپۆش تێیدا دەبینران، کەسانی میواندۆست هەروەکو (حاتەمی تەی)، کەسانێک لە تیرەی (تەواریق)، هەمان کەسانی ئەو ناوچەیە کە دوایی بوو بە گاڵتەچی موعەمەر قەزافی سەرۆکی لیبیاو هەندێک جاریش داوای سەربەخۆییان دەکرد، هەندێک جاریش لەو بیابانە گێرەشێوێنییان دەکرد. عەلی بیرە ئاوەکانی دەوروبەری چادرەکانی بەباشی دەناسین، دەیزانی چۆنچۆنی ئاو لە بیرەکان دەرکات و بزنەکان تێرئاو بکات، دەیزانی کە دەبێت تەنها لە بیرە ئاوەکەی خۆیان ئاو دەربکات، ئەو باش دەیزانی کە نابێت لە بیرەئاوی خەڵکی ئاو دەربکات، چونکە ئەگەر وابکات ئەوا دراوسێکان بیرە ئاوی باپیرەی بە لم و چەو پڕدەکەنەوە، ئەو کارەش دەبووە هۆی دروستبوونی شەڕ. چەندجارێک لەسەر کێشەی ئاو خەڵکی کوژراون، ئاخر ئەو بیرە ئاوانەی کە زۆر قوڵ نەبوون، بەدرێژایی شەو و ڕۆژێک دوانزە سەتڵ زیاتر ئاویان تێدا نابێت. ئەوکات دراوسێکان زوو دەزانن کە کەسێکی دراوسێیان ئاوەکەیانی دزیوە. چەندینجار باپیرەی باسی شەڕی ئەو خەڵکەی بۆ کردبوو لەسەر ئاو، چەندینجار گوتبووی ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڵلای دراوسێیان لەسەر ئاو بووە بە شەڕی و کوژراوە. باپیرەی زۆر باسی شەڕی دەکرد لەسەر ئاو، ڕۆژانە دووبارەو چەندبارەی دەکـردەوە، بۆچی ئەوەندە باسی دەکـرد؟ بۆ ئـەوەی کوڕەکەی ئاگادار بکاتەوە تاکو نەچێت بەلای بیرە ئاوی خەڵکیدا. عەلی دەیزانی لەکوێ کەمێک لەوەڕو دڕک پەیدا دەبێت تاکو بتوانێت بزنەکانی تێر بکات، دەیزانی نابێت بەرەو سنووری ڕەشماڵی دراوسێکانی بڕوات، دەیزانی دەبێت کاتی عەسر کەمێک دڕک و خاشاک کۆبکاتەوە، تاکو ئاگری دایەگەورەی ڕۆشنتر بێت.

ئەو هەموو شتێکی دەزانی و خۆی باش دەناسی. خۆناسین و ناسینی دەوروبەر یەکێکە لە سەرەتاییترین بنەماکانی شارستانییەت و پێویستییەکی بە شارستانیبوونە، کاتێک سـنووری خۆناسین ڕەچـاوکـرا ڕێـزو ئاسایش پـایـەدار دەبێت، زۆرێـک لە هۆکارەکانی شەڕو ئاژاوەو نەگونجان و دەردەسەرییەکانی ئەمڕۆ ئەوەیە کە هەندێک کەس سنووری خۆیان و دەوروبەریان ناناسن. هەربۆیە پێویستە مرۆڤ لە تەمەنی منداڵییەوە پەروەردە بکرێت و فێربکرێت چۆن خۆی بناسێت، خۆ ئەگەر لە منداڵییەوە

پەروەردە نەکرێت، ئەوا لە تەمەنی گەورەییشدا دەبێتە هۆی نانەوەی کێشەو شەڕو ئاژاوە. شەڕو ئاژاوەیەک کە هەندێکجار چەندین ساڵ درێژە دەکێشێت، لەئاکامی ئەو شەڕو ئاژاوەیەدا وڵات وێران دەبێت و خەڵکیش دەربەدەر.

عەلی خۆی و دەوروبەری باش دەناسی، تەمەنی (٩) ساڵ بوو کە باپیرەی نەخۆشکەوت، دراوسێکان دەیانگوت ئەبوخەلیل دەمریت، ئەو پیرەمێردە نەمرد، بەڵام نەیتوانی لەسەر پێی خۆی بوەستێت، قاچەکانی ئازارێکی زۆریان هەبوو، نەیدەتوانی بەپێ بڕوات، منداڵەکانی لە هەوارەکەی خۆیان و لەو بیابانە کۆچیان کردبوو. ئاخر ئەو بیابانە وشکە بەرگەی خەڵکێکی زۆری نەدەگرت، بەرگەی مێگەلی گەورەی بزن و کاریلەی نەدەگرت. ئەبو خەلیل یانزە منداڵی هەبوو، ئەو لەگەڵ هاوسەرە پیرەکەی و عەلی نەوەیدا دەژیا. ئەو منداڵە لە تەمەنی (٩) ساڵیدا ناچار بوو بەتەنها بزنەکانی باپیرەی ببات بۆ لەوەڕ، هەموو بەیانییەک بزنەکانی لە ڕەشماڵی هەژارانەوە دەبرد بۆ بیابانی هەژارەکان. بزن بۆ پیاوی هەژار وەکو مانگا وایە. بیابانی کەمئاو و لەوەڕ، موڵکی خوداو هەژارانە، زیخ و لمی بیابان ماڵی هەژارانە. ئەگەر بەخت یاوەریان بێت لەژێر زیخ و لمدا نەوت دەدۆزرێتەوە. ئەوانەی بەختیان هەبوو، نەوتیان دۆزییەوە، بەڵام گرفتاری کەسانی سەرشێتی وەکو قەزافی بوون. نەوت بەشێکی زۆر کەمە لە بەخت، نەرویجییەکانیش نەوتیان هەیە، لیبیاو عێراقیش هەر نەوتیان هەیە، ئەم نەوتە مایەی شەڕوماڵوێرانییە. ئایا نەوت مایەی ماڵوێرانییە، یان کەم عەقڵی و ئاژاوەگێڕیی کەسانی وەکو قەزافی و سەدام؟ ئایا نەوت مایەی شەڕوماڵوێرانییە، یان نەبوونی دیموکراسی.

دە دوانزە ڕەشماڵ بەلای یەکەوە هەڵدرابوون، هەموویان وەکو یەک ڕەشبوون و لە مووی بزن دروستکرابوون، خەڵکەکەش هەموویان خزم و کەسی یەکتری بوون. ئەو منداڵە تەمەن (٩) ساڵانە بەباشی فێری شیردۆشین ببوو، دەیزانی ماست دروست بکات و مەشکە بژەنێت. لە ساڵێکدا شەش مانگ ئەو بیابانە وەکو تەنوری ئاگر گەرم و سووتێنەر بوو، شەش مانگەکەی تریش ئەوەندە ساردبوو کە ئێسقانی مرۆڤی دەهێنایە ئازار. گەورەیی و فراوانی ئەو بیابانە سنگ فراوانیی پێبەخشیبوو، باپیرەی هەر وەکو هەموو ڕەشماڵ نیشتەکانی تر میواندۆست و دەستکراوە بوو، ئەگەر میوانیک ڕووی لە ماڵەکەیان بکردایە، ئەبوخەلیل هەرچییەکی هەبووایە لەپێش میوانەکەی دادەنا، پیاوانی

ئەو دەشتە فراوانە، دڵیشیان فراوانە. ئێواران کاتێک بزنەکان دەهاتنەوە بۆ (پەچە) ئەو منداڵە لەبەردەم ڕەشماڵەکەو لەلای باپیرییەوە دادەنیشت، دایەگەورەشی چایەکی بۆ تێدەکرد، ئەویش چایەکەی بە دەنکە خورمایەکەوە خوارد، باپیرەشی چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە، شەوانەش ئەستێرەکان نزیک و نزیکتر دەبوونەوە. ئەو منداڵەش دەستی درێژ دەکردو بەدوای ئەستێرەی بەختی خۆیدا دەگەڕا. خاوێنیی هەوای ئەو دەشتە ئەوی خۆشحاڵ دەکرد. دایەگەورەی بەیانیان زوو ئەوی لەخەو هەڵدەستاندو دەیگوت: (نوێژ مرۆڤەکان لە خودا نزیک دەکاتەوە)، ئەبوخەلیل بە هاوسەرەکەی دەگوت: عەلی منداڵە، هێشتا تەمەنی نەگەیشتۆتە تەمەنی نوێژکردن، ئەو ئێستا نوێژی لەسەر نییە، لێی گەڕێ با بخەوێت. دایەگەورەش دەیگوت: ئەم منداڵە دەبێت فێربێت، دەبێت لەگەڵ نوێژکردنی بەیانیدا ڕابێت، پێویستە تێبگات نوێژی بەیانی لەخەو باشترە.

عەلی تەمەنی گەیشتبووە یازدە ساڵ، کاتی نیوەڕۆ بوو، بزنەکانی کۆکردەوەو بەرەو ڕەشماڵەکان گەڕایەوە. ڕۆژێکی گەرم بوو، بیرە ئاوەکە کەمئاو ببوو، ئەو منداڵە بەشە ئاوی خۆی دابوو بە کاریلە تینووەکان، بۆخۆشی لەتینواندا خەریک بوو زمانی دەشکا. دەمی وشک ببوو، زمانی بە مەلاشوویەوە نووسابوو، لێوەکانی وشکتر لە درکی بیابان بوو، چاوەکانی لە تینوێتیدا تاریک ببوون، لە بیری ئاوەوە دوور بوو. لە ڕۆژانی پێشتر زووتر بزنەکانی بردەوە بەرەو ڕەشماڵەکان، کاریلەیەک لە مێگەلەکە جێمابوو. ئەو کاریلە شەیتانە خۆی گەیاندبووە سەر گردۆڵکەیەک. ئەو منداڵە چەندێک هەوڵیدا ئەو کاریلەیە لە گردۆلکەکە نەهاتە خوارەوە. عەلی بەردو دارلاستیکەکەی لە گیرفانی دەرهێناو بەردی خستە بەر دارلاسیکەکەو بەهەموو هێزی خۆی ڕایکێشا، عەلی لەتاو تینوێتی چاوەکانی لێڵ ببوون کاریلەکەی بەدووانە دەبینی، ئەو هەمیشە ئەو بەردەکەی بە دارلاستیکەکەی دەیهاویشت ئامانجی دەپێکا، واتە هەمیشە بەردەکەی لە نیشانی دەدا، عەلی کاتێک بەردەکەی هاویشت، کاریلەی بێچارە لە گردەکەوە بە تەقلە هاتە خوارەوە، ئەو منداڵە بەرەو لای کاریلەکە ڕایکرد، تاکو ئەژنۆی لە لمی بیابانەکە چەقی، گەیشە لای سەری کاریلەکە. بەردەکە ڕاست لە چاوی کاریلەکەی دابوو، چاوی کاریلەکە هاتبووە دەرەوەو بەلای گۆنایەوە بە دەمارێکەوە هەڵواسرابوو، ئەو بێزمانە لەتاو ئازار باعەباعی دەکرد. عەلی بن سالح سەری ئەو ئاژەڵەیەی خستە باوەشییەوەو لە تاواندافرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوە. عەلی بەزوویی پارچەیەکی لە

کراسەکەی دادڕی و سەروچاوی کاریلەکەی پێبەست، ئەو تازە لەگەڵ ئەو بێزمانەدا ملی ڕێگای گرت و بەرەو لای ڕەشماڵەکان کەوتنە ڕێ. بزنەکان چەند خولەکێک لەپێش عەلی و کاریلەکان گەیشتبوونە لای چادرەکان و چووبوونە کۆزەکەوە. کۆزێک کە لەدڕک و داڵ دروستکرابوو، شەوانەش کەمتیارەکان تاکو نزیک ڕەشماڵەکان دەهاتن و بەشێوەیەکی دڕندانە هێرشیان دەکردە سەر کۆزی بزنەکان. باپیرەی بە عەلی دەگوت: کەمتیار مردووخۆرن، بەڵام کاتێک زۆر برسی بوون زیندووش دەخۆن. پیرەمێرد بە نەوەکەی دەگوت: خۆت لە کەسانێک بەدوور بگرە کە ڕەوشتیان لە ڕەوشتی کەمتیار دەچێت. (منیش ئامۆژگاری ئێوە دەکەم کە ئاگاداری ئەو جۆرە کەسانەبن، هەرچەندە خۆشم ئاگادار نەبووم).

دایەگەورەی عەلی لەبەردەم ڕەشماڵەکەدا وەستابوو، کاتێک عەلی بەگریانەوە بینی، لە گریانی کوڕەکەیان نیگەران بوو، بەزوویی یەک پەرداخ ئاوی نەعنای بۆ تێکرد، ئەوان نەیاندەزانی چایی چییە، نەعنایان دەکوڵاندو بە خورماوە دەیانخوارد. باپیری جارجار بەستەیەک قاوەو کەمێک شەکری دەکڕی. ئەو شەکرو قاوەیەش تەنها بۆ ئەو پۆلیسانە بوو کە سەردانی ڕەشماڵەکانیان دەکردو دەهاتن بۆ ئەوەی بیانوو بەو خەڵکە هەژارە بگرن و ڕشوەیان لێوەربگرن، ئەوان ئەو خەڵکەیان ئازاردەدا، تاکو خەڵکی بزانن کە حوکمەت و وڵات هەیە، حکومەتێک کە ناوەندەکەی لە پاریس بوو. باپیرەی عەلی چاوە دەرهاتووەکەی کاریلەکەی بەچەقۆ بڕی و کەمێک مەلهەمی لەچاوی کاریلەکەداو بە پارچە پەڕۆیەک بەستی. عەلی بەگریانەوە بە باپیری گوت: ئیتر هەرگیز ناچمە لای بزن و کاریلەکان و نایانبەم بۆ لەوەڕ. دایە گەورەی عەلی لەباوەش گرت و گوتی: باشە ڕۆڵەکەم ئیتر بزنەکان مەبە بۆ لەوەڕ. باپیرەی گوتی: ئەی ئەگەر نەچێتە لای بزنەکان چ کارێک بکات؟ کێ بزنەکان بلەوەڕێنێت؟ دایەگەورەی خۆی گرژ کرد، واتە جارێ هیچ مەڵێ. بەیانی عەلی دوای نوێژکردن لێی خەوتەوە. باپیری عەلی هەڵساندو گوتی: بزنەکان برسی و تینوون هەڵسە بڕۆ بیانبە بۆ ئەو دەشتە. عەلی گوتی: من ئیتر بزنەکان نابەم بۆ دەشت. باپیری بە توڕەییەوە چەند وتەیەکی پێگوت. عەلی دەستی کرد بەگریان و ڕایکرد بەرەو بیابان، کاتی ئێوارە برسی و تینوو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. باپیرەی هاواریکرد بەسەریداو گوتی: لەکوێ بوویت؟ وا بزنەکان لە تینوێتیدا دەمرن. عەلی لە تەمەنیدا بۆ یەکەمجار نارەزایی دەربڕی و بە باپیرەی گوت: ئەگەر بەزۆر دەمنێرنە لای

بزنەکان، ئەوە دەڕۆم و ئێرە جێدەهێڵم. دایەگەورەی کەوتە نێوانیان و بڕیاردرا کوڕی دراوسێکەیان بزنەکەیان ببات بۆ لەوەڕ، بەڵام ئەو کوڕەش کرێی دەویست.

عەلی هێشتا لە سکی دایکیدا بوو، دایکی بە ئەوەوە دووگیان بوو کە باوک و دایکی لەیەکتری جیا ببوونەوە، عەلی هەرگیز دایک و باوکی بەیەکەوە نەبینیبوو، تەمەنی پێنج مانگ بوو کە دایکی شووی بە پیاوێکی تر کردبووەوە. عەلی هەرگیز نەیزانی بۆچی دایکْ و باوکی لەیەکتری جیابوونەتەوە. دایەگەورەی، واتە دایکی دایکی، عەلی بەخێوکرد بوو. عەلی خۆشەویستی دایەگەورەی بوو. باوکی عەلی ناوی ساڵح بوو، ساڵح چەند ژنێک و حەڤدە منداڵی هەبوو، واتە عەلی شازدە خوشک و برای هەبوو. عەلی ئیتر بزنەکانی باپیرەی نەدەبرد بۆ لەوەڕو دەشت. کوێربوونی چاوی کاریلەکە ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە ژیانی عەلیدا، تا دوو ساڵ دوای ئەو بەسەرهاتە، عەلی کاری جۆراوجۆری دەکرد. ئاوی بۆخۆیان و دراوسێکان دەهێنا، چیلکەو داری کۆدەکردەوە، برینی وڵاخەکانی تیمار دەکرد، هاوکاری دراوسێکانی دەکرد. دراوسێکانی یەک لە یەکتری هەژارتر بوون، هیچ کەسێک توانای ئەوەی نەبوو کرێیەک بە عەلی بدات، بەڵام جارجارێک کەمێک نان و کەشک و ماستیان پێدەدا. دایەگەورەی چەند ئایەتێکی قورئانی فێرکردبوو، ئەو تەنها چەند سورەتێکی بچووکی لە قورئان دەزانی، دایەگەورەی فێری نوێژکردنی کردبوو. عەلی تەمەنی (١٢-١٣) ساڵان بوو، هەفتەی یەک جار دەچوو بۆ گوندەکە، تاکو کەشک و ماست و دۆی باپیرەی و دراوسێکانی ببات بۆ دوکاندارێکی گوندەکە، لە گەڕانەوەشیدا ئاردو شەکرو نەعنای دەکڕی و دەیهێنایەوە. گوندەکە (٣٥) کیلۆمەتر لە ڕەشماڵەکانەوە دووربوو، عەلی هەمیشە کە دەگەیشتە گوندەکە، سڵاوی لە مامۆستاکانی قوتابخانەی گوندەکە دەکرد، بە زمانی عەرەبی قسەی لەگەڵ منداڵانی قوتابخانەکە دەکرد. منداڵانی قوتابخانە فێری زمانی فەڕەنسی ببوون، ئەوان لە قوتابخانە بە زمانی فەڕەنسی وانەیان دەخوێند. ئەوکاتە هێشتا مەراکیش ژێردەستەی فەڕەنسا بوو، هێشتا پاریس حوکمڕانی نیوەی بیابانی ئەفریقای دەکرد. عەلی هەندێکجار چەند ڕۆژێک لە گوندەکەدا دەمایەوە، بەهۆی منداڵانی قوتابخانەکەوە کەمێک فێری زمانی فەڕەنسی ببوو، تەمەنی ببوو بە سیانزە ساڵ، منداڵێکی هەژار، منداڵێک کە دایکی بەرەڵڵای کردبوو بۆخۆی ڕۆیشتبوو، باوکیشی هەر بەرەڵڵای کردبوو لێی نەدەپرسییەوە. هیچ کەسێک هاوکارییەکی ئەو منداڵەی نەدەکرد، باوکی هەرگیز پارچە جلوبەرگێکی بۆ نەکڕیبوو و لە هەواڵی

نەدەپرسی، بەهیچ جۆرێک عەلی تاکو تەمەنی (٨)ساڵی نەیدەزانی کە ساڵح باوکی ئەوە، باوکی عەلی لە گوندێکی دوور نیشتەجێ بوو، نزیکەی (٥٠) کیلۆمەتر دووربوو لە ڕەشماڵەکانی ئەوانەوە. عەلی کوڕێکی هێمن بوو، هیچ کەسێکی ئازار نەدەدا، کەسێکی بەڕەوشت و بە بەزەیی بوو.

## عەلی دەچێت بۆ قوتابخانە

ئەو ڕۆژە عەلی وڵاخەکەی پێش خۆی دابوو و هێواش هێواش لێیدەخوڕی، باری وڵاخەکەی مەشکەی دۆ بوو، عەلی دۆکەی دەبرد بۆ گوندەکە تاکو لەوێ بیفرۆشێت. ئەو هەرکاتێک دەچوو بۆ ئەو گوندە، دەچوو بۆ ماڵی پوری، لەوێ نان و ئاوی دەخواردو دەگەڕایەوە بەرەو ڕەشماڵەکان. عەلی هەمیشە پێپەتی بوو، بنی پێیەکانی گەورەو پان بوون، هەروەکو سمی حوشتر. بەردەلان و زیخ و لم و دڕکی بیابان بنەپێکانی ئەوی لە شێوە سرووشتییەکەی لادابوو. ئەو هەموو جارێک دۆیەکەی دەدا بە دوکانداری گوندەکەو چەند کاتژمێرێک لە گوندەکەدا دەمایەوە، ئەو ڕۆژەش هەروەکو ڕۆژەکانی تر وڵاخەکەی پێش خۆی دابوو، گەیشتە بەردەم قوتابخانەکە، منداڵەکان لە قوتابخانەکە دەهاتنە دەرەوە. کۆڵانەکە قەرەباڵغ بوو، وڵاخە بێچارەکە بەڕێگادا دەڕۆیشت، لەناکاو لە قەرەباڵغی و دەنگەدەنگی منداڵەکان سڵەمییەوەو مەشکە دۆیەکان بە زەویدا کەوتن، یەکێک لە مەشکە دۆکان تەقی و دۆکە کۆڵانەکەی سپی کرد، گڵ و خۆڵی ناوکۆڵانەکە بە دۆکە بوو بە قوڕێکی سپی ڕەنگ. عەلی قاچەکانی قوڕاوی بوون، لەتاوی دۆکە مات و زوير ببوو، منداڵان لە دەوری کۆبوونەوە، ئەوان چونکە عەلییان دەناسی، هاوکارییان کرد تاکو مەشکە دۆکەی تر لە زەوی هەڵبگرنەوە. ئەوان هەوڵیان دەدا تاکو قاچیان قوڕاوی نەبێت. خوێندکارەکان بە زمانی فەڕەنسی پرسیاریان لە عەلی دەکردو ئەویش بە عەرەبی وەڵامی دەدانەوە، ئەو نەیدەتوانی بەباشی بە زمانی فەڕەنسی قسە بکات، بەڵام لە مانای ڕستەکان تێدەگەیشت. عەلی غەمبار بوو، دەیزانی باپیرەی پێویستییەکی زۆری بە پارەی دۆکە هەبوو، چەند ڕۆژێک بوو دایەگەورەشی نەخۆش بوو. منداڵان دەوریان لە عەلی و وڵاخەکە دابوو، عەلی قاچەکانی قوڕاوی ببوون، قوڕێک کە بە دۆ و خۆڵی کۆڵانەکە دروست ببوو. یەکێک لە مامۆستاکان بە ناوی (بن جەلال) گەیشتە لایان، ئەو عەلی دەناسی و خزمایەتییەکی دووریان هەبوو، برای هاوسەری پوری عەلی بوو. بن جەلال هاوکاری عەلی کرد تاکو مەشکە دۆکەی لەسەر پشتی وڵاخەکە

قایم بکات. عەلی مەشکە دڕاوەکەی لەسەر زەوی بەرزکردەوە، لە ناکاو ڕایکێشا قوڕو دۆ بەسەروچاوی مامۆستادا پرژا، دەنگی پێکەنینی منداڵان بەرزبووەوە. مامۆستاش وەک ئەوان دەستیکرد بە پێکەنین، بەڵام پێکەنینێکی خەماوی. مامۆستا بە جلوبەرگی قوڕاوییەوە عەلی و وڵاخەکەی بەڕێکردو مەشکە دۆکەیان برد بۆ دوکاندارەکە.

بن جەلال عەلی برد بۆ ماڵی خۆیان، ئەوە یەکەمجاربوو عەلی بچێت بۆ ماڵی بن جەلال. ژنی بن جەلال هاوکاری عەلی کرد تاکو قاچاکانی بشۆرێت، عەلی دەیویست بچێت بۆ ماڵی پوری. بن جەلال ڕێگای پێنەداو گوتی: وا نانی نیوەڕۆ ئامادەیە، نانبخۆو دوایی بڕۆ. عەلی لەگەڵ بن جەلال و منداڵەکانیان لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتن، ئەوە یەکەمجار بوو عەلی لەسەر مێز دابنیشێت. بن جەلال چوار منداڵی هەبوو، منداڵەکان هەموویان خوێندکار بوون، هەموویان بەدەوری مێزەکەدا دانیشتبوون و بە زمانی فەڕەنسی قسەیان دەکرد. عەلی گوێی گرتبوو، ئەو نەیدەتوانی وەکو ئەوان بە زمانی فەڕەنسی قسە بکات. پورو خاڵەکانی عەلی و منداڵەکانیان لە ماڵەوە بە عەرەبی قسەیان دەکرد، بەڵام بن جەلال لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانی دا بە زمانی فەڕەنسی قسەی دەکرد. ماڵی بن جەلال بە کەوچک و چەتاڵ نان و چێشتیان دەخوارد، ئەوە یەکەمینجاربوو عەلی بۆ خواردن کەوچک و چەتاڵ بەکاربهێنێت. وڵاخە بێزمانەکەشی لە گۆشەیەکی حەوشەی ماڵی بن جەلالدا وەستابوو، هێواش هێواش ئالفی دەخوارد. بن جەلال لە خانوویەکی لادێدا دەژیا، چەند سەربزنێکی هەبوو لەگەڵ گەوڕێکی بچکۆلەدا. بن جەلال لە عەلی پرسی حەز دەکەیت بچیتە قوتابخانە؟ عەلی لە خۆشیدا ئەبڵەق بوو، گوتی: بەڵێ زۆر حەزدەکەم، بەڵام چۆن بچم؟ مامۆستا گوتی: ئەمڕۆ بڕۆرەوە بۆلای ڕەشماڵەکان، بەڵام دوای چەند ڕۆژێکیتر بگەڕێرەوە بۆ ئێرەو بچۆ بۆ قوتابخانە من خۆم ناو نووسینت بۆ ئەنجام دەدەم. دوای نانخواردنی نیوەڕۆ عەلی بەرەو لای ڕەشماڵەکان گەڕایەوە، ئەو لە بیرکردنەوەدا بوو، لە بیری قوتابخانەو دووریی لە باپیرەو داپیرەیدا بوو، لەبیری دابینکردنی خەرجیی قوتابخانەدا بوو. عەلی شەو گەیشتە ماڵەوە، بە دایەگەورەی گوت: کە دەیەوێت بچێتە قوتابخانە. باپیرەی گوتی: بەکام پارەیە دەچێتە قوتابخانە. عەلی گوتی: بن جەلال گوتوویەتی هاوکاریم دەکات. داپیرەی، باپیرەی ڕازیکرد کە عەلی بچێت بۆ قوتابخانە. دایەگەورەی گوتی: لەم بیابانەدا عەلی بووە بە قوربانیی ئێمە، لێیگەڕێ با لێرە دووربکەوێتەوە. بابەگەورە وەڵامیدایەوەو

گوتی: بەڵام ئێمە بەبێ عەلی ژیانمان دەوەستێت، لەکۆتاییدا دایەگەورە هاوسەرەکەی ڕازیکرد.

دوای چەند ڕۆژێک عەلی لاوی سیانزە ساڵ، ڕێگای گوندو قوتابخانەی گرتەبەر، ئەو بەپێی پەتی و دژداشەیەکی درێژی عەرەبییەوە قاچی خستە حەوشەی قوتابخانەوە، ئەو ناسنامەشی نەبوو. بەڕێوەبەر گوتی: عەلی ناسنامەی نییەو تەمەنیشی لە منداڵانی پۆلی یەک زیاترە. بن جەلال بەڕێوەبەری ڕازیکرد کە عەلی ناونووس بکات، ئەو بۆخۆی ناسنامە بۆ عەلی وەردەگرێت. بۆ وەرگرتنی ناسنامە دەبووایە عەلی لەگەڵ باپیرەی و بن جەلال بڕۆن بۆ شار. شارێک کە ژمارەی دانیشتووانی دوو سێ هەزار کەس بوو. بن جەلال بەرەو ماڵی باپیرەی عەلی ڕۆیشت. باپیرەی عەلی سواری حوشتری دراوسێکەیان کردو دوو شەو و ڕۆژ بەڕێگاوە بوون تا گەیشتنە شاری ئاسا (Assa)، عەلی لە ژووری ئوتێلەکە مایەوە. بن جەلال و بابەگەورەی عەلی ڕۆیشتن بۆ فەرمانگەی ڕەگەزنامە، کارمەندی ڕەگەزنامە ناسنامەی بۆ عەلی کرد، منداڵێکی تەمەن حەوت ساڵیان لەجیاتی عەلی بردبوو بۆ فەرمانگەکە، تەمەنی عەلییان لە ناسنامەدا بە حەوت ساڵ نووسیبوو، دیارە بن جەلال دیارییەکی دابوو بە کارمەندەکە، دیاری و ڕەشوە لە هەموو جیهاندا کارسازە، فەرمانگەکانی وڵاتی مەراکیشی ژێردەستەی فەڕانسا لەم بابەتەدا بێبەش نەبوون.

عەلی تەمەن سیانزە ساڵ بە ناسنامەی تەمەن حەوت ساڵییەوە چووە قوتابخانە، ساڵی لەدایکبوونی عەلی لە ناسنامەدا (١٩٤٩) بوو، لەکاتێکدا کە ئەو لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٢) بوو. عەلی بەخێرایی وانەکانی دەخوێند، هەستێکی باشی هەبوو لە خوێندندا. منداڵێکی تەمەن سیانزە ساڵی بیابانگەڕی شوانە وێڵەی زەحمەتکێش وانەی دەخوێندو کاری سەختی دەکرد. عەلی لە گوندەکەدا شوێنی دیاریکراوی نەبوو، هەر ڕۆژەو لەماڵی یەکێک لە پورەکانی دەبوو. هەندێک جاریش یەک هەفتە لە شوێنێکدا دەمایەوە.

عەلی چەند مانگێک لە گوندەکە مایەوەو دەچووە قوتابخانە، بەباشی بە زمانی فەڕەنسی قسەی دەکرد، تەواوی وانەکانی بە زمانی فەڕەنسی بوون، قسەکردن بە زمانی فەڕەنسی نیشانەی ئەوە بوو کە بووە بە خوێندەوار. بن جەلال لە وانەکانیدا زۆرهاوکاری عەلی دەکرد. عەلی کوڕێکی زرنگ و بەتوانا بوو، لە پێشبڕکێی پاسکیل سواری گوندەکەدا یەکەم بوو. ئەو خۆی پاسکیلی نەبوو، یەکێک لە مامۆستاکانی

بۆ ماوەیەکی کاتیی پاسکیلی پێدابوو. عەلی لەماوەی چەند مانگێکدا لە هەمووان باشتر پاسکیل سواری دەکرد. ئەو لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بەپێی پەتی دەچوو بۆ قوتابخانە، دوای چەند مانگێک عەلی بۆ سەردانیکردنی داپیرەو باپیرەی گەڕایەوە بۆلای ڕەشماڵەکان. باپیرەی قاچەکانی فەلەج ببوون و لەسەر زەوی ڕاکشابوو، دایەگەورەشی هەر نەخۆش بوو. کوڕی دراوسێکەیان بزنەکانی بۆ دەلەوەڕاندن و کرێشی لێوەردەگرتن، بەگشتی داهاتێکی ئەوتۆ بۆ باپیرەی نەدەمایەوە. عەلی نەیتوانی بەرگەی ئەو ژیانە ناهەموارەی باپیرەی و داپیرەی بگرێت، هەربۆیە وازی لە قوتابخانە هێناو گەڕایەوە بۆ لای ڕەشماڵەکان و دووبارە دەستیکردەوە بە بزن لەوەڕاندن و سێ ساڵ بەردەوام بوو لە کاری شوانیدا.

## عەلی واز لە قوتابخانە دەهێنێت

بن جەلال چەندجارێک پەیامی بۆ عەلی نارد تاکو بگەڕێتەوە گوندەکەو بچێتەوە بۆ قوتابخانە، بەڵام ئەو نەیتوانی دایەگەورەو بابەگەورەی بەو دۆخەوە کە تێیکەوتبوون و لەو دەشتە بەتەنها جێیان بهێڵێت. باپیرەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ باری تەندروستی خراپتر دەبوو، سەرەنجام پوورو خاڵەکانی عەلی هاتن بۆلای ڕەشماڵەکان و بڕیاریاندا داپیرە و باپیرەی عەلی ببەن بۆ گوندەکەی خۆیان. بزنەکانیان فرۆشت، فرۆشتنی بزنەکان کۆتایی بە یەک تەمەن ڕەشماڵ نشینی ئەوان هێنا.

عەلی تەمەنی ببووە شانزە ساڵ و ڕۆیشتەوە بۆ گوندەکە، لە گوندەکەدا کاری دەکرد، کاری قورس و سووک، هەمووجۆرە کارێکی دەکرد، ئەوەندەی پارە بەدەستەوە نەبوو تاکو بتوانێت بەردەوام بێت لە خوێندن، لەگەڵ ئەوەشدا دەبووایە پارەیەک پەیدا بکات و داپیرەو باپیرەشی بەخێوبکات. عەلی کاری شوانیی پەیداکردو بوو بە شوانی مێگەلە بزنی خەڵکی، عەلی ئەوکات تەمەنی ببووە حەڤدە ساڵ، بەڵام خۆشی بە تەواوی نەیدەزانی تەمەنی بووە بە چەند ساڵ، تەنها ئەوەندەی دەزانی لە ناسنامەدا ساڵی لەدایکبوونی (١٩٤٩) نووسراوە. فێری خوێندنەوەو نووسینی چەند وشەیەکی زمانی فەڕەنسی ببوو، خەریک بوو قسەکردنی بە زمانی فەڕەنسی بیربچێتەوە، ئەو بەیانیان مێگەلەکەی دەبرد بۆ دەشت و ئێواران دەگەڕایەوە. کاتێک ئێواران دەهاتەوە هەوڵی دەدا بە زمانی فەڕەنسی لەگەڵ ئەو کەسانەدا قسە بکات کە فەڕەنسییان دەزانی، تاکو بەباشی فێری زمانی فەڕەنسی ببێت، ئەو هەرچەندە خوێندەواریی نەبوو، بەڵام دوای

ماوەیەک بەباشی بە زمانی فەڕەنسی قسەی دەکرد.

ساڵی (١٩٥٦) ساڵێکی گرنگ بوو، ساڵی سەربەخۆیی و جیابوونەوەی مەراکیش بوو لە وڵاتی فەڕەنسا، لەو ساڵە بەدواوە خەڵکێکی زۆری مەراکیش کۆچیان کرد بۆ فەڕەنسا. عەلی تاکو ساڵی (١٩٥٩) ڕازی نەبوو بڕوات بەرەو فەڕەنسا، بەڵام سەرەتای ساڵی (١٩٥٩) چەند کەسێک لە هاوڕێکانی گەیشتنە فەڕەنسا، تەنانەت کەسێک لە ڕەشماڵ نشینەکانی هەواری باپیرەشی گەیشتە فەڕەنسا. عەلیش وەسوەسەی ڕۆیشتن بەرەو فەڕەنسا کەوتە سەری، بەڵام چۆن دەیتوانی بەو ئارەزووەی بگات؟ ئەو ترسێکی زۆری لە گەشتکردن هەبوو بەرەو فەڕەنسا، لە هەموو تەمەنیدا تەنها یەک جار ڕۆیشتبوو بۆشار، ئەویش بۆ دەرکردنی ناسنامە بوو، بەڵام ئەو جارەش پێیانگوتبوو لە ژووری ئوتێلەکەدا بمێنێتەوەو ئەویان نەبردبوو بۆ فەرمانگەی ڕەگەزنامە، یەکەمین گومانی عەلی لە شار، زیندانیبوون بوو لە ژوورێکی ئوتێلداو ساختەکاریی و ڕشوەدان بوو. گەورەترین شوێن کە عەلی لە هەموو تەمەنیدا بینیبووی، چەند گوندێکی دەوروبەری ڕەشماڵەکان و شارێکی دووهەزار کەسی بوو، درێژترین گەشت کە کردبووی، بۆ گوندێک بوو کە دوورییەکەی لە ڕەشماڵەکانی خۆیانەوە پەنجا کیلۆمەتر بوو، ئەو بەو هەموو گومانەوە چۆن دەیتوانی بڕوات بەرەو فەڕەنسا.

## ڕۆیشتن بەرەو فەڕەنسا

ئەو ڕۆژە کاتی عەسر بوو کە عەلی بزنەکانی هێنایەوە بۆ گوندەکە، چەند کەسێک لە هاوتەمەنەکانی پێیانگوت ئەوان بەنیازن بڕۆن بۆ فەڕەنسا، داواشیان لەو کرد لەگەڵیاندا بڕوات. عەلی گوتی: پارەم نییە، ئەوانیش گوتیان: ئێمەش پارەمان نییە. هاوڕێکانی عەلییان هاندا کە ئەویش لەگەڵیاندا بڕوات. عەلی حەزیدەکرد بڕوات بەرەو فەڕەنسا، هاوڕێی باشی هەبوو. بن جەلال هانی دا بڕوات بۆ فەڕەنساو گوتی: تۆ کەسێکی بەتوانایت لەم گوندو دەشتە وێرانەیەدا چی دەکەیت؟ پێویستە تۆ بڕۆیت و ئێرە جێبهێڵیت. بن جەلال سەد فەرەنگی بەقەرز پێدا، نزیکەی سەد فەرەنگیشی لە پورو خاڵەکانی قەرزکرد.

دوای چەند ڕۆژێک عەلی لەگەڵ پێنج کەس لە هاوڕێکانی گەیشتنە شاری زاگورا (Zagora)، یەک ڕۆژ لەوێ مانەوەو لەوێوە ڕۆیشتن بەرەو شاری مەراکیش

(Marakesh)، دواتر گەیشتنە بەندەری ڕەبات (Rabat). عەلی و هاوڕێکانی هەوڵیان دەدا پارە خەرج نەکەن، پارەشیان ئەوەندە پێنەبوو تاکو خەرجی بکەن، ئەوان لە ڕێگادا کاریان دەکردو هاوکاری خەڵکیان دەکرد، کۆڵبەرییان دەکردو لەجیاتی پارە خواردنیان لێوەردەگرتن. چەند ڕۆژێک بوو لە بەندەرەکەدا کرێکارییان دەکرد، دەیانویست بەزوویی بگەنە ناوچەی لۆرێنی فەرەنسا، دەیانزانی کانە خەڵوزەکانی لۆرێن پێویستیان بە کرێکار هەیە. ناونیشانی چەند کەسێکیان لە کالاسی فەرەنسا لابوو. چەند کەسێکی مەراکیشی لە کالاس (Calais) کاریان بۆ کۆچبەران دەدۆزییەوە، واتە ئەوان دەلاڵ بوون. کرێکاریان بۆ کانە خەڵوزەکان دەدۆزییەوە، ئەو دەلالانە هەم پارەیان لە خاوەن کانەکانی خەڵوز وەردەگرت، هەم لە کۆچبەرە هاولاتییەکانی خۆیان. لە ساڵی (۱۹۹۱/۱۳۷۰) ئەو ڕەوشەم لە پارکی (هری جکۆ)ی یابان بینی کە چۆن کاریان بۆ ئاوارە ئێرانییەکان دەدۆزییەوە، ئەو ڕۆژە من لە یابان زۆر گریام بۆ هاولاتییەکانی خۆمان. ئەو بەسەرهاتەش لە شوێنێکی تردا دەنووسم. لە بەندەری ڕباتەوە کەشتییەکی بارهەڵگر دەڕۆیشت بەرەو بەندەری کالاسی (Calais) فەرەنسا، کەشتییەکە دوو کرێکاری بێ کرێی دەویست. عەلی و یەکێک لە هاوەڵەکانی وەکو دوو کرێکاری بێ کرێ سواری کەشتییەکە بوون، بڕیار وابوو کرێ نەدەن. ئەوان لە هاوڕێکانی تریان جیابوونەوە، ئەوان کرێیان نەدەدا لەجیاتی کرێ دەبووایە لە کەشتییەکەدا کاربکەن و نانیش بخۆن، ئەوان دەبووایە لە کەشتییەکەدا هەموو کارێکیان بکردایە. تەوالێتەکانیان پاکدەکردەوەو جلوبەرگی کرێکارەکانیان دەشۆری، پیازو پەتاتەیان پاک دەکرد، قاپ و کەوچکەکانیان دەشۆری. کەشتییەکە نەدەچووە دەریای ناوەڕاستەوە، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەچووە ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە، یەکڕاست دەڕۆیشت بەرەو باکووری فەرەنسا. گەورەیی و فراوانی ئۆقیانووس بەلای عەلییەوە وەکو گەورەیی و فراوانی بیابانی گەورەی ئەفریقیا وابوو، بەڕۆژ تیشکی خۆر گیانی ئەوانی دەسووتاندو بەشەویش ئاسمان پڕ ئەستێرە بوو. لە بەندەری (لشبونە) عەلی و هاوڕێکەی بە هاوکاری کرێکاری تر دەبووایە دەیان تەن بار دابگرن. عەلی هەروەکو فرۆکە لەناو کەشتییەکەدا فەردەکانی دەدا بەپشتیاو دەیبردنە کەنار ئاوەکە، عەلی و هاوڕێکەی دووکەسی ئازاو بەهێز بوون. کەشتیوان لە سەرەوەی کەشتییەکەوە سەیری کرێکارەکانی دەکرد. دوای سێ ڕۆژ مانەوەیان لە لیشبۆنە کەشتییەکە بەرەو باکوور بەڕێکەوت. عەلی ڕۆژانە لە کەشتییەکەدا هاوکاری

چێشتلێنەرەکەی دەکردو فەرمانەکانی تری جێبەجێ دەکرد، ژووری کەشتیوان و سەرنشینانی تری کەشتییەکەی پاکدەکردەوە. جوانیی ئاوابوونی خۆر لە ئۆقیانووسدا لە جوانیی خۆرئاوابوونی دەشت و بیابان کەمتر نەبوو، بەڵام عەلی بۆی نەدەلوا لە سەرەوەی کەشتییەکە دابنیشێت و سەیری ئەو دیمەنە جوان و سەرنجڕاکێشە بکات، ئەو دەبوایە بەردەوام کاری بکردایە، ئەو هەرشتێکی لەناو کەشتییەکەو لە بەندەرەکە ببینیایە، فێری دەبوو، لە هەمووی گرنگتر ئەوەبوو زمانی فەرەنسییەکەی باشتر دەبوو. هەموو کرێکارەکانی ناو کەشتییەکە بە زمانی فەرەنسی قسەیان دەکرد. کەشتییەکە لە بەندەری بیرست (Berest)ی فەرەنسا لەنگەری گرت. داگرتن و بارکردنی بار، کارێکی ئێجگار تاقەتپڕووکێن بوو، لەسەر ئەوەشەوە عەلی و هاوڕێکەی بەدڵسۆزانە کاریان دەکرد. لەوێوە کەشتییەکە بەرەو بەندەری کالاس بەڕێکەوت. تەم ڕووی ئۆقیانووسی داپۆشیبوو، ئەوە دیاردەیەک بوو عەلی هەرگیز نەیبینیبوو، لەماوەی دووریی یەک مەتردا هیچ شتێک نەدەبینرا، عەلی بە کەشوهەوایەکی تر ئاشنا دەبوو، ئەو هەرگیز تەمی نەبینیبوو. هەندێکجار لە بیابان تۆفانی لم دروست دەبێت کە لەماوەی یەک مەتردا کەسێک نابینرێت، ئێستا عەلی تێگەیشت کە هەڵمی ئاو هەمان کاردەکات، هەتاوی بیابان پێستی دەسووتاند، بەڵام ئێستا تەم و شێ پێستی نەرم دەکات.

سەرەنجام لە کالاس باری کەشتی داگیراو عەلی و هاوڕێکەشی کەلوپەلەکانیان هەڵگرت تاکو لە کەشتییەکە دابەزن. ئەوان بۆ خوداحافیزی چوون بۆلای کەشتیوان، کەشتیوان پێشنیاری بۆ عەلی کرد لە کەشتییەکەدا بمێننەوەو کار بکەن، بەڵێنی پێدان کە مانگانە مووچەیەکی باشیان پێبدات. عەلی سەیرێکی هاوڕێکەی کرد، بەڵام ئەوان بڕیاریان دابوو بڕۆن بۆ لۆرین و لەوێ لە کانێکی خەڵوزدا کاربکەن، ناونیشانی چەند هاوڕێیەکیشیان لابوو. عەلی پێشنیاری کەشتیوانی قبوڵ نەکرد، کەشتیوانی میهرەبان بۆ هەریەکێکیان بڕی سێسەد فەرەنگی پێدان. عەلی چاوەڕوانی ئەو پارەیەی نەدەکرد، بەهیچ جۆرێک بڕیار نەبوو کرێ وەربگرن، گەشتەکەیان لە بەرامبەر کارو خواردن بوو، نەک پارە وەربگرن. سێ سەد فەرەنگی بۆ عەلی و هاوڕێکەی پارەیەکی باش بوو، دەسەڵاتدار کەسێکی زۆر چەوسێنەر نەبوو.

## کارکردن لە کانی خەڵوزی بەرد

هاوین بوو عەلی بە ئاووهەوایەکی تر ئاشنا ببوو، ئاووهەوای گەرم و شێدارو تەمومژ، دوای دوو ڕۆژ ئەوان گەیشتنە ئەو شوێنەی کە ناونیشانەکەیان پێدرابوو.

ژمارەیەک لەو کەسانەی کە بەرەچەڵەک مەراکیشی بوون، لە یەکێک لە کانە خەڵوزەکاندا کاریاندەکرد. خاوەن کانەکان بەدوای کرێکاری گەنج و ئازادا دەگەڕان، چالّی تازەو زیاتریان هەڵکەندبوو. لێپرسراوی کرێکارەکان کاتێک فۆرمی دامەزراندنی خستە بەردەم عەلی، زانی کە ئەو نەخوێندەوارە، دواتر بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت بنووسێت و بخوێنێتەوە. ئەو تەنها چەند مانگێک چووبوو بۆ قوتابخانە. بەهۆی نەخوێندەوارییەوە لەسەدا یانزەی مووچەکەی کەمکرایەوە، پێشنیاریان بۆ کرد شەوانە دوای هاتنەدەرەوەی لە کانەکە بچێت بۆ قوتابخانەی شەوانەو وانەکانی بخوێنێت. عەلی بەخۆشحاڵییەوە پێشنیارەکەی وەرگرت.

## کانی خەڵوز لە دەیەی (١٩٥٠)

کانی خەڵوزی دورگیس(Dorges)جێگایەک بوو کە ساڵی (١٩٠٦) بەهۆی تەقینەوەیەک (١٠٩٩) کەسی لێکوژرابوو. عەلی تەمەنی (١٨) ساڵ بوو کە لایتێکیان بۆ ڕووناکی ناو کانەکە لەسەری بەست، چونکە ناشارەزابوو بردیان بۆ کانی ژمارە (٩/٩)یان کانی بایس (Bis) لە قوڵی (١٨٥) مەتری ژێرزەویدا. ڕاڕەوی کانەکە پڕئاو و نیوە تاریک و هەوایەکی پیس و قورسی هەبوو، تۆزو خۆڵی خەڵوزی بەردین سنگ و سییەکانی دەسووتاندەوە، لە پێدەشت و ڕووناکی و تیشکی خۆر هیچ هەواڵێک نەبوو. عەلی دەبووایە ژیانێکی مشکەکوێرانە تاقیبکاتەوە. ڕۆژانی سەرەتا تووشی سەریەشەو چاو ڕەشهاتنەوە دەبوو، زوو ماندوو دەبوو، قاچەکانی بێهێز بوون. هاوڕێکانی پێیاندەگوت لەگەڵ هەوای کارکردنی ناو کانەکە ڕادێیت.

## ناکۆکی لەسەر نوێژکردن

عەلی لە قوڵایی کانەکەدا نەیدەزانی کەی کاتی نیوەڕۆیەو دەبێت چ کاتێک نوێژەکەی بکات، کاتێک لە دەشت و بیابان بوو هەمیشە لەکاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکرد. مانگی مورداد (تەمموز) بوو، ڕۆژ درێژ بوو، لە کالاس کاتژمێر (٩:٣٠) خۆرئاوا دەبوو. عەلی

لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لە یەک ژووردا دەژیا، بەیەکەوە خەرجییان دەکێشا، عەلی کاتێک لە دەشت و لە ناو ڕەشماڵدا دەژیا بەهۆی خۆرەوە کاتی دیاریدەکرد، ئەو هەرگیز کاتژمێری نەبوو، بەڵام بەباشی کاتەکانی دیاریدەکردو پێنج فەرزە نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا دەکرد، ئەو لە کەشتییەکەشدا بەردەوام نوێژەکانی کردبوو، بەڵام ئێستا لە قوڵایی کانەکەدا نازانێت کەی کاتی بانگی نیوەڕۆیە. کاتژمێری بایۆلۆژی گیانی تێکشکاند بوو، ماوەی یەک مانگ بوو لە کانەکەدا کاریدەکرد، وردە وردە دەیتوانی کاتی نیوەڕۆ دیاری بکات. ڕۆژێکیان لەکاتی نیوەڕۆدا بە دەنگێکی بەرز لەناو تونێلی کانەکەدا بانگی دا. ئەو زۆر بێتاقەت ببوو، زۆر بیری دەشت و بیابان و گوندو ڕەشماڵەکانی دەکرد. یادی داپیرەو باپیرە و بزنەکانی دەکردەوە، لە بێزاریی خۆیدا دەستیکرد بە بانگدان. کرێکارە (مەراکیشی و تونسی و جەزائیرییە)کان خۆشحاڵییان دەربڕی بەرامبەر بەو بانگدانە، دەستیان لە کارکردن هەڵگرت و ڕیشتن بەلای نوێژەکانیانەوە. دەستهەڵگرتن لە کارکردن و ڕۆیشتن بۆ نوێژکردن، بوو بەهۆی ناکۆکی لەنێوان کرێکاران و خاوەن کار، وەستان لەکارکردن بۆ چەند خولەکێکیش ڕێگای پێنەدەدرا. کرێکارە موسڵمانەکانی کانەکە زۆربەیان نەخوێندەوار بوون، واتە خوێندن و نووسینیان بە زمانی فەرەنسی نەدەزانی، لەو ڕووەوە نەیاندەتوانی نووسراوی بەڵێننامەکانیان بخوێننەوە. عەلی شوان، ببووە عەلی بانگدەر، ئەو بوو بە ڕابەری کرێکارە موسڵمانەکانی کانەکە. ئەوان داوایان دەکرد ڕێگەیان پێبدرێت لەکاتی خۆیدا نوێژەکانیان بکەن. ڕۆژنامە ناوخۆییەکان ببوون بە چەند دەستەیەکەوە، دژ، هاوڕا، میانڕەو، کێشەو ئاڵۆزییەکان ڕۆژانە زیادی دەکرد.

پاییز گەیشت، ڕۆژ کورت و هەوا سارد بوو، لە ناوەڕاستی مانگی ئابانەوە (تشرینی دووەم)ەوە عەلی بەهیچ جۆرێک خۆری نەدەبینی. بەیانیان کاتێک دەچووە ناو کانەکەوە بۆ کارکردن، هێشتا خۆر دەرنەکەوتبوو، ئێواران کاتێک دەستی لە کارکردن هەڵدەگرت خۆر ئاوا ببوو. کێشەی عەلی بۆ نوێژکردن زیاتر بوو، ئەوکاتەی کە ڕۆژ درێژ بوو کاتێک لە کانەکە دەهاتەدەرەوە، هێشتا ڕووناک بوو، دەیتوانی نوێژ بکات، بەڵام کاتێک ڕۆژ کورت و کورتتر دەبوو، عەلی و هاوڕێکانی بەدرێژایی ڕۆژ لە کانەکەدا بوون. عەلی تەمەنی گەیشتبووە نۆزدە ساڵ، ئەو بەشداری یەکەمین مانگرتنی کرێکارانی موسڵمانانی کانەکەی کرد بۆ بەدەستهێنانی مافی نوێژکردن. سەندیکای کرێکاران لەو بارەیەوە هەڵوێستی جیاوازیان هەبوو، ئەوان دەیانگوت: بەرگریکردن لە مافەکانی

ئیسلام لەئەستۆی ئەواندا نییە. یەکێتییەکانی کۆمۆنیستی کرێکاران دژی نوێژکردن بوون، دەیانگوت: نوێژکردن بەلای ئێمەوە هیچ پیرۆزییەکی نییە. یەکێتی کرێکارانی سۆشیالیستی دەیانگوت: نوێژ کاری تاکەکەسییە، ئێمە بەرگری لە کاری گشتی دەکەین، بەرگریکردن لە مافە دینییەکان لەئەستۆی ئێمە نییە. سەندیکای ڕاستڕەوەکانیش دەیانگوت: ئێوە چوار کرێکاری عەرەب هاتوون لێرە کار بکەن، کێشەو ئالۆزیی دروست مەکەن، ئێرە ئەورووپایەو ئەفریقا نییە.

## کارکردن لە قوڵترین کاندا

کۆتایی مانگی ئاب بوو. لە دابەشکردنی کاری تازەدا عەلی گواسترایەوە بۆ کانێکی تر بە قوڵی (٨٠٩) مەتر، کە قوڵترین کانی خەڵوز بوو. عەلی لە هاوڕێکانی جیاکرایەوە، ئەویان نارد بۆ کانێکی قوڵ، شوێنێکی گەرم، هەر لە دۆزەخ دەچوو، لەوێدا هەوا زۆر گەرم بوو، لەو کانەدا بەتاڵکردنەوەی هەوای پیس کارێکی دژوار بوو. چاودێری کرێکارەکان موسڵمانێکی ئەفریقیایی بوو، ئەو بە عەلی گوت: ئێستا لێرە چەند حەز دەکەیت نوێژ بکە، بەڵام دەبێت ڕۆژانە یەک تەن و نیو خەڵوز ڕادەستی من بکەیت. یەکەمین شەو کە عەلی لە کانە (٨٠٩) مەترییەکەوە هاتەدەرەوە، نیوەمردوو ببوو، ئەو بە گێژەگێژو هێڵنجدان هاتە دەرەوەو دەستیکرد بە ڕشانەوەو بەخێرایی ڕۆیشت بەرەوماڵەوە، لە ماڵەوە هاوڕێکانی هاتنە لایەوەو هاوکارییان کرد. لەو ساڵانەدا جەنگی جەزائیر بۆ سەربەخۆیی لە پەرەسەندندا بوو، تێکۆشانی موسڵمانان لەپێش هەموو شتێکەوە بوو. عەلی دەیگوت: نوێژکردن لە سەروو هەموو شتێکەوەیە، بەڵام تەنها چەند کەسێک لایەنگری ئەو بوون. کەمتەمەنی و نەخوێندەواری و کەمئەزموونی هۆکارێک بوون کە نەتوانێت ڕابەرایەتی گرووپێک بکات. شێوەی کارکردن لە کانەکەدا زۆر نالەبار بوو. عەلی هەموو تەمەنی لە دەشتودەر بەسەربردبوو، ئەو لە دەشت گەورە ببوو، دەشتێکی پان و بەرینی بێکۆتایی. عەلی تاکو لە دەشت بوو، شەوانە سەیری ئاسمانی دەکردو بەدوای ئەستێرەی بەختیدا دەگەڕا، بەڵام ئێستا لە قوڵایی زەمیندا وەکو مشکەکوێرە گیری خواردووە.

کۆتایی پاییز بوو. شەو درێژو ڕۆژ کورت بوو، هەوای باکووری فەڕەنسا ساردو باراناویی بوو. عەلی بەڕۆژ لەناو کانەکەدا بوو، شەوانەش هیچ ئەستێرەیەکی نەدەبینی. ئیتر نەیدەتوانی لە ئاسماندا بەدوای ئەستێرەی بەختیدا بگەڕێت. هەستێکی ناخۆشی

هەبوو. کاتێک دەچووە ناو کانە خەڵوزەکەوە هەستیدەکرد دەچێتە قوڵایی دۆزەخەوە. ڕێڕەوە پێچاوپێچ و تاریکی کانەکە ئەوی دەترساند. چەندین جار لە قوڵایی ژێر زەمینەدا هەستی بەتەنیایی و بێکەسی خۆی دەکرد. لەناو ئەو دۆزەخی خەڵوزەدا هیچ کەسێک لە بیری نوێژکردن و پشووداندا نەبوو، دەبووایە هەموویان ئەو برە خەڵوزەی بۆیان دیاریکراوە ئامادەی بکەن. ئەو حەزی دەکرد لەو کونە تاریکەدا خۆی ڕزگار بکات. ژووری خەو و پشوودانی ژوورێکی خۆش و دڵگیربوو، بەڵام ئەو پەسندی نەدەکرد، جوان و ڕازاوەییەک کە زیاتر وابەستە بوو بە کەلتووری فەڕەنساوە، نەک کەلتووری موسڵمانی و دەشت و بیابان. کاتێک لە کانەکە دەهاتە دەرەوە ئەوەندە شەکەت دەبوو، هیچ لە وانەکانی تێنەدەگەیشت، هەربۆیە ئیتر نەچووەوە بۆ قوتابخانە، نەخوێندەواریی ئەوی زیاتر شەکەت دەکرد، هەستی دەکرد لەم سەرزەمینەدا دەبێت بۆ سەرەتاییترین و پیرۆزترین ماف بجەنگێت، دەبێت لەپێناوی نوێژکردندا بجەنگێت. ئەو هیچ یارو یاوەرێکی نەبوو، ماوەی یەک ساڵ لەو چاڵە قوڵەدا خەڵوزی دەردەهێنا، تەمەنی گەیشتبوو بە نۆزدە ساڵ، بەڵام هەستی دەکرد خەریکە تەمەنی لە قوڵایی زەویدا بەسەردەچێت. وای هەستدەکرد تەمەنی بووە بە شەست ساڵ.

بەگشتی کارکردن لە کانەکان هەفتانە گۆڕانکاریی تێدا دەکرا، هیچ کەسێک بۆ ماوەیەکی زۆر لە کانێکی قوڵدا کاری نەدەکرد. عەلی چوار مانگی تەواو لە کانێکی (٨٠٩) مەتر قوڵدا کاری دەکرد. هەموو گیانی ببوو بە بلۆق، بلۆقەکانی دەسووتانەوە، لە ئازمایشی دکتۆردا دەرکەوت بلۆقەکان بەهۆی گازی کانەکەوە بووە، بەهۆی نەخۆشییەکەوە لە کانێکی (٨٠٩) مەتر قوڵەوە گواسترایەوە بۆ کانێک بە قوڵی (٣٣٥) مەتر. عەلی لەکاتی خۆیدا بەبێ هەست نوێژی خۆی دەکرد، بەڵام حەزی دەکرد لە فەڕەنسا بڕوات. چەند کەسێک لە هاوڕێکانی پێیانگوت هۆڵەندییەکان پارەی زیاتر دەدەن بە کرێکارانی کانە خەڵوزەکان. عەلی هەندێک لەو پارەیەی پەیدایکردبوو، ناردییەوە بۆ دایەگەورەی. بەڵێننامەکەی بۆ یەک ساڵ بوو، عەلی تووشی نەخۆشی پێست ببوو، بەڵام عەلی بەباشی کاری دەکرد. ئەو لاو بوو، ڕاپۆرتی چاودێری کرێکارەکان ئەویان بە باشترین و نموونەییترین کرێکار ناساندبوو. عەلی ماوەی یەک ساڵ لە کانەکانی کالاس کاریکرد.

## کارکردن لە هۆڵەندا

ساڵی (١٩٦١) بوو عەلی ڕۆیشت بەرەو هۆڵەندا، ئەوکات وەرگرتنی فیزا وەک ئێستا گران نەبوو، ئەو مانگی تەممووزی ساڵی (١٩٦١) لە کانێکی خەڵوزدا لە وڵاتی هۆڵەندا خەریکی کارکردن بوو، شێوازی کارکردن هەروەکو کارکردنی کانە خەڵوزەکانی کالاس بوو. عەلی لەوێ بەهۆی نەزانینی زمانی هۆڵندییەوە کێشەی زیاتری بۆ دروستبوو، بەڵام کرێکاری عەرەبی فەرەنسی زمان لە کانەکانی هۆڵەندا زۆر بوون. خەمێکی زۆر هەموو گیانی گرتبووەوەو تووشی نەخۆشی خەمۆکیی ببوو، کاری سەخت و ناخۆشی کەشوهەوا، ئەویان تووشی خەمۆکیی کردبوو. خواردنێکی باشی نەدەخوارد، دووریی لە داپیرەو باپیرەو کەم بینینی تیشکی خۆر، ئەویان خەمبار کردبوو، دووچاری نەخۆشی خەمی دووریی ببوو، خەمی دووریی وڵات. عەلی لە هۆڵەندا بوو بە خاوەنی ژنێک و سێ منداڵ. بۆ چوونە قوتابخانە تەمەنی عەلی کەمکرابووەوە، ئەو کاتێک کە تەمەنی سیانزە ساڵ بوو، لەڕووی ناسنامەکەیدا بە حەوت ساڵ نووسرا بوو. کاتێک ویستی بڕوات بۆ فەرەنسا تەمەنیان بۆ زیادکرد تاکو بتوانێت بچێتە ناو وڵاتی فەرەنساوە. لە پاسپۆرتدا ساڵی لەدایکبوونی (١٩٣٦) نووسرابوو تاکو بتوانێت بچێتە وڵاتی فەرەنساوە، کاتێک گەیشتە هۆڵەندا دەڵاڵەکان بەڵگەیان بۆ دروستکرد کە بەڕووکەش وای نیشاندەدا کە خاوەنی ژنێک و سێ منداڵە، هەرچەندە نە ژنی هەبوو نە منداڵ، هەر بەو هۆیەشەوە لەلایەن حکومەتی هۆڵەندەوە هاوکاری دەکرا. عەلی خەریک بوو بکەوێتە داوی ساختەچێتییەوە، ئەو دەیگوت: ئەم پارەیە حەڵاڵ نییە، هاوڕێکانی پێیان سەلماند کە ئەو پارەیە حەڵاڵەو حەرام نییە. بۆ سەلماندنی قسەکانیان حیلە شەرعییەکیان بۆ دروستکرد. دەیانگوت: وەرگرتنی پارە لە کافری داگیرکەر حەڵاڵە. لە هۆڵەندا ڕێکخراوی مافیا هەبوو، پارەیان لە کرێکارەکان وەردەگرت، بەو پارەیە بەڵگەی پێویستیان دروست دەکرد بۆ کرێکارانی سەڵت، بەڵگەی خێزانداریيان بۆ دروست دەکردن. عەلی هێواش هێواش شارەزایی لە سیستەمی بیرۆکراسی ساختەچێتی و ڕەشوە پەیداکرد، سیستەمی بیرۆکراسی تەمەنی ئەویان زیادو کەم دەکرد. هەر ئەو سیستەمە لە هۆڵەندا ئەویان کرد بە خاوەنی ژنێک و سێ منداڵ. عەلی بەهۆی کاری سەختی کانە خەڵوزەوە نەخۆشی پێستی زیادیکرد، بلوقەکانی سەر لەشی گەورەتر دەبوون. دکتۆرەکان دەیانگوت بەهۆی گازی ناو کانەکان و هەڵمی ئاوەوە نەخۆشییەکەی بەرەو زیادی چووە. عەلی تووشی

نەخۆشی لاشەیی و دەروونی ببوو، هەوڵی دەدا بگەڕێتەوە بۆ مەراکیش و بچێتەوە بۆ گوندەکەو خەریکی کاری لەوەڕاندی بزنەکان بێت.

## ڕۆیشتن بۆ سوید

هاوڕێکانی عەلی گوتیان لە سوید کار هەیە، کار لەسەر ڕووی زەوی نەک لەژێر زەوی. عەلی لە تونێل و ڕاڕەوەکانی کانەکان شەکەت ببوو. دەلاڵێک گەشتی سویدی بۆ ڕێکخستبوو، تەمەنی بیست ساڵ بوو کاتێک گەیشتە شاری ئۆبسالای سوید، هەرچەندە لە ناسنامەدا ئەو کەسێکی بەتەمەنتر دەردەکەوت. بۆ ڕۆیشتن بۆ سوید ناچاربوو تەمەنی خۆی لە ناسنامەدا بچووک بکاتەوەو وەک تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی لێ بکات. واتە نزیکەی بیست ساڵ، ئەو لە ساڵی (١٩٦٣) گەیشتە شاری ئۆبسالاری سوید. عەلی یەکەم ڕۆژی گەیشتن بە سویدو ئۆبسالای لەیادماوە. ئەو بەخۆی و دوو جانتاوە گەیشتە ئەو شوێنەی کە ناونیشانەکەیان پێدابوو، شوێنەکەش ڕێستورانتێک بوو، دوو کەس لە خەڵکی مەراکیش لەوێ کاریان دەکرد. عەلی ئەو دوو کەسەی هەرگیز نەبینیبوو، ئەو دوو کەسە تەنها مەراکیشی بوون. لە ئاوارەییدا هاوولاتی و هاوشاری و هاودین و هاوزمانی کاری خۆی دەکات. دیارە ئەو دەلالانە پارەیان لێوەرگرتبوو ناونیشانی تەواوی ئەو کەسانەی سویدیان پێدابوو. لە ڕۆژێکی تەمتومانی مانگی حوزەیران و لە کاتژمێر شەشی دوانیوەڕۆ عەلی گەیشە شاری ئوبسالا. خۆر دەوروبەری کاتژمێر یانزەی شەو ئاوا دەبوو. عەلی کەم کەم بە ئەم دیاردەیە ئاشنا دەبوو. شەو و ڕۆژ لە یەکتری جیا نەدەکرایەوە. ئەو گەیشتە ڕێستورانتەکەو ئەو شوێنەی بڕیاربوو هاوڕێ مەراکیشییەکانی لێ ببینێت، هاوڕێکانی دەبووایە تاکو درەنگانێکی شەو لە ڕێستورانتەکەدا کاربکەن و نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە بۆماڵەوە. نەشیاندەتوانی لەگەڵ عەلیدا بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە، هەر بۆیەش ناونیشانی ماڵەکەی خۆیان بە عەلی دا، کلیلی ماڵەکەشیان پێ دا، ماڵەکە زۆر لە ڕێستۆرانتەکەوە دوور نەبوو. بە عەلییان گوت: بڕواتە ماڵەوەو لەوێ پشوو بدات تاکو ئەوانیش دەگەڕێنەوە.

تاکو ئەو ڕۆژە عەلی هەرگیز نەچوو بووە ناو کۆشکێکی چەند قاتەوە، خانووی کرێکارانی کانەکان خانووی بچکۆلەو یەک قات بوون، ژوورەکانیش بچکۆلە بوون و لە ڕاڕەوێکی تەسکدا بوون. یەکەمجاری بوو بچێتە کۆشکێکی بەرزی چەند قاتەوە. لەو ساڵانەدا ئەوروپا زۆر ئاسایش بوو، هیچ هەواڵێک لە کاری تیرۆریستی نەبوو.

عەلی ڕۆیشت بۆ هەمان شوێن کە هاوڕکانی پێیانگوتبوو، ڕۆیشت بۆ قاتی دووەمی کۆشکەکە، ویستی بە کلیل دەرگای ژوورەکە بکاتەوە، بەلام کە سەیریکرد دەرگاکە کراوەیە، نەک تەنها دەرگاکە دانەخرابوو، بەڵکو دەرگاکە کراوەش بوو. چووە ژورەوە، ژوورێکی گەورەو خاوێن بوو. هەردووک جانتاکەی لە ڕاڕەوی ژوورەکە دانان، زۆر شەکەت و ماندوو بوو. لە هۆڵەنداوە تاکو سوید بە کەشتی هاتبوو، لە ستۆکهۆڵمەوە تاکو ئۆبسالاش بە سواری پاس هاتبوو. ئەو زۆر خۆشحاڵ بوو کە ماڵی هاوڕێکانی گەورەو خاوێنە، بەهیچ جۆرێک لە ژووری هاوڕێ کرێکارەکانی فەڕەنساو هۆڵەندا نەدەچوو. لە کۆشکەکەدا چوار ژوور ڕووەو خۆربوون، لە هەرلایەکەوە دەیانڕوانی بەسەر باخچەی سەوزاییدا. پێڵاوەکانی دانا، پەرداخێکی هەڵگرت لە بۆری ئاوەکە پڕی کردو بەتامەزرۆییەوە خواردییەوە، چووە ناو یەکێک لە ژوورەکانەوە، سیسەمێکی جوانی تێدابوو. عەلی لە هەموو تەمەنیداو تەنانەت لە خەویشدا سیسەمی وا جوانی نەبینیبوو، لەسەر سیسەمەکە ڕاکشاو سەیری بنمیچی خانووەکەی دەکرد، وەک ئەوەی لە بنمیچەکەدا بەدوای ئەستێرەی بەختیدا بگەڕێت.

هێشتا دە خولەک تێنەپەڕی بوو بەسەر گەیشتنی عەلی بۆ ماڵەکە. کە زیقەیەکی دوورودرێژی ژنێک ئەوی لەسەر جێگاکەی ڕاپەڕاند. دەنگەدەنگ لە هۆڵی کۆشکەکە پەیدابوو، ژنێکی تەمەن سی ساڵی قژ درێژ لە بەرامبەر عەلیدا وەستابوو، هاواری دەکرد بەسەریدا، عەلیش دەستەکانی خستنە سەر سەری و لەسەر زەوییەکە دانیشت. دوای چەند خولەکێک چەند ژن و پیاوێکی تر گەیشتنە لایان. عەلی بە زمانی فەڕەنسی و عەرەبی قسەی دەکرد، خۆشی نەیدەزانی چی دەڵێت، دوای چەند خولەکێک پۆلیس گەیشتنە لایان. پۆلیسەکان دەستبەندیان لە دەستی عەلی کردو بردیان بۆ بنکەی پۆلیس، ژنە سویدییەکەش لەگەڵ هاوسەرو چەند کەسێکی تردا چوون بۆ بنکەی پۆلیس. پۆلیس هیچ لە قسەکانی عەلی تێنەدەگەیشت. نەیاندەزانی بۆچی ئەو چۆتە ژووری خەڵکانی ترەوە؟ وەرگێرێکیان هێنا. عەلی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، پۆلیس هاوڕێکانی عەلییان هێنا بۆ بنکە، ئەوان لە بنکەی پۆلیس گوتیان: عەلی تەنها نیوکاتژمێر دەبێت گەیشتۆتە ئۆپسالا، ئەو تەنها لە کۆشکەکەدا هەڵەیەکی کردووە، لەجیاتی ئەوەی بچێتە قاتی دووەم، چووە بۆ قاتی یەکەم، ئەو قاتی زەمینی ئەژمار نەکردبوو. دوای لێکۆڵینەوە پۆلیس بۆیان دەرکەوت کە عەلی هیچ نیازێکی خراپی نەبووە. ماڵە سویدییەکەش

بۆیان دەرکەوت کە عەلی بەهەڵە چۆتە ژوورەکەی ئەوانەوە. ئەوان هاوڕێکانی عەلییان دەناسی، دەیانزانی کە ئەوان لە قاتی دووەمدا دەژین، پیاوە سویدییەکە عەلی ماچکردو داوای لێبووردنی کرد، هاوڕێکانی عەلیش گەڕانەوە بۆ سەر کارەکەیان. ئەوان هەردووکیان لە ڕێستۆرانتەکە چێشتلێنەر بوون. ئەو ماڵە سویدییە هاوکاری عەلییان کرد تا جانتاکەی لە ماڵەوە دەربکات و بیبات بۆ قاتی دووەم، ژنەکە مامۆستا بوو هاوسەرەکەشی ئەندازیاری کارەبا بوو، عەلی لە ژووری هاوڕێکانیدا جێگیر بوو، هەر ئەو هەڵەیە چارەنووسی عەلی گۆڕی.

ساڵی (١٩٦٣) ساڵی ئاڵتوونیی ئەورووپا بوو، سوید بوو بە یەکێک لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، پێویستییەکی زۆری بە کرێکار هەبوو، عەلی لە ڕێستۆرانتێک دەستی بە کارکردن کرد، دوای چەند ڕۆژێک ژنە دراوسێکەی کتێبێکی فێربوونی زمانی سویدی دا بە عەلی و پێیگوت: دەتوانێت ڕۆژانە یەک کاتژمێر وانەی پێ بڵێتەوە.

## دووبارە چوونەوە بۆ قوتابخانە

کارکردنی عەلی لە ڕێستۆرانتەکەدا لە کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆوە دەستی پێدەکرد، دەبووایە تاکو کاتژمێر دوازدەی شەو کاری بکردایە، دەبووایە گسک بدات، قاپ و کەوچک بشوات، مێزەکان پاک بکاتەوە، دوای چەند مانگێک پاککردنەوەی ئەو کۆشکەی گرتەئەستۆ کە تێیدا دەژیا، پاککردنەوەی ئەو کۆشکەشی لەئەستۆ گرتبوو کە ژن و پیاوە سویدییە میهرەبانەکەی تێدا دەژیان. دوای سێ مانگ هاتن بۆ ئۆپسالا نۆرەی کارکردنی گۆڕا. لە کاتژمێر هەشتی بەیانی تاکو چواری دوانیوەڕۆ لە ڕێستۆرانتەکەدا کاریدەکرد. کەمێک فێری زمانی سویدی ببوو، بە هاوکاری ئەو خانمەی دراوسێیان توانی لە قوتابخانەی گەورەکاندا خۆی ناونووس بکات. عەلی تەمەنی (٢١) ساڵ بوو کە دەستی کردەوە بە خوێندن، ئەو بەردەوام هەوڵی دەدا فێری زمانی سویدی ببێت، هەمیشە فەرهەنگێکی بچووکی فەڕەنسی لەگیرفاندا بوو. ئەو هەمیشە لەناو ڕێستۆرانتەکەو لەسەر شەقامەکان پرسیاری لە خەڵکی دەکرد، هەمیشە دەیخوێندو فێردەبوو، هاوڕێکانی سەریان دەکردەسەرو بە پرۆفیسۆر عەلی بانگیان دەکرد، پێیان دەگوت پرۆفیسۆر عەلی چایەکمان بۆ بهێنە، پرۆفیسۆر عەلی ئەو ژوورو تەوالێتە پاک بکەرەوە، تەنانەت هۆنراوەیەکیشیان بۆ دانابوو، هۆنراوەکەیان بۆ دەخوێندەوەو پێدەکەنین. ڕۆژێکیان یەکێک لە هاوڕێکانی ماسکێکی ڕیشی بزنی

بۆ کڕیبوو، ماسکەکەیان لە دەموچاوی عەلی بەستبوو، پێی پێدەکەنین، لە بەستنی ئەو ماسکەدا دوو مانای شاراوە هەبوون، یەکێکیان واتە بزن پرۆفیسۆری ئاژەڵەکانە. ئەویتریان واتە عەلی کاری بزن لەوەڕاندن بووە. عەلیش بەرگەی گاڵتەجاڕی ئەوانی دەگرت و وانەکانی دەخوێند.

دوای سێ چوار مانگ، دراوسێ سویدییەکە ئاگاداری و چاودێریی منداڵەکانیان بە عەلی سپارد، یەکێک لە منداڵەکان تەمەنی پێنج ساڵ بوو، ئەوی تریشیان تەمەنی حەوت ساڵ بوو. چاودێریکردنی ئەو منداڵانە بۆ عەلی بوو بەهۆی زووتر فێربوونی زمانی سویدی. عەلی ڕۆژانی پشووش بەردەوام ئاگاداری ئەو منداڵانەی دەکرد. ئەو ژن و پیاوە سویدییە هەندێکجار عەلییان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد بۆ میوانی تاکو ئاگاداری منداڵەکانیان بۆ بکات. عەلی چەند ماڵێکی سویدی ناسیاوی پەیداکرد، ئەو ماڵە سویدییانە هەموویان لەگەڵ عەلی دا میهرەبان بوون. عەلی لاوێکی بالابەرزو چاپووک و دروستکار بوو، لەکۆتایی مانگەکانی ساڵی خوێندندا پێشکەوتنێکی باشی بەخۆوە بینی، هەربۆیەش بەڕێوەبەری قوتابخانە پێشنیاری بۆکرد لەجیاتی پۆلی یەکەم، بچێت تاقیکردنەوەی پۆلی سێیەم بدات. عەلی بەخۆشحاڵییەوە پێشنیارەکەی قبوڵکرد. تاقیکردنەوەی پۆلی سێیەمی کردو نمرەیەکی باشی بەدەستهێنا. عەلی بەهەموو توانایەوە کاریدەکردو زۆر بەباشی وانەکانی دەخوێند، جارجارێکیش کەمێک پارەی بۆ دایەگەورەو بابەگەورەی دەناردەوە. ئەو ساڵە عەلی زستانێکی بینی کە پێشبینی نەدەکرد، شەو درێژو ڕۆژ کورت و هەورو بەفراویی بوو. کوڕی بیابان و هاونشینی هەتاو و گەرما، ئێستا هەفتەی یەک جار خۆر نابینێت، ئەو هەرچەندە لە دەشت و بیابان لەناو لمدا بوو، بەڵام لە ئۆپسالا لەناو بەفرو سەهۆڵدا بوو. لە بیابان دەبووایە چەندین کاتژمێر بەدوای ئاودا بڕوات، دەبووایە خۆی و بزنەکانی چەند کاتژمێرێک بەتینوێتی ڕێگا ببڕن تاکو دەگەیشتنە سەر بیرە ئاوێک. عەلی دەبووایە بە گوریس سەتڵ شۆڕ بکاتەوە بۆ ناو بیرە ئاوەکەو بەدەستەکانی سەتڵە ئاوەکە لە بیرەکەوە بهێنێتە دەرەوە. عەلی نرخی دڵۆپ دڵۆپی ئاوەکەی دەزانی، باش دەیزانی کە ئاو مانای چییە؟ بەڵام ئێستا لە ئۆپسالا، دارو دیوارو زەوی و ئاسمان ئاوە. پلوسکی سەربانی ماڵێک ئاوەکەی زۆر زیاتر بوو لە ئاوی بیری باپیرەی. ڕووباری ئۆپسالا لە مانگی تشرینی دووەمەوە دەیبەست و مراوییەکان لەسەر سەهۆڵی ڕووبارەکەوە جێگەیان خۆش دەکرد.

سەدانجار عەلی لەو دەشت و بیابانە قاچەکانی لە لم چەقیبوون، ئێستاش قاچەکانی لە بەفرو سەهۆڵبەندان دەچەقێت و بەخرایی دەتوانێت هەنگاو هەڵبهێنێتەوە. تازە زستان دەگەیشت، بەڵام سەرما هەموو شوێنێکی گرتبووەوە. عەلی ئەگەر بیویستایە گەرم ببێتەوەو سەرما کاری تێنەکات، دەبووایە هەموو پارەکانی خەرج بکات بۆ کڕینی جلوبەرگ. ئەو لەسەرما بێزار بوو، ڕۆژێک خەریکی پاککردنەوەی بەفری بەردەم کۆشکەکە بوو، جلی کەم لەبەردا بوو، لەسەرماندا هەڵدەلەرزی، یەکێک لە خاوەنماڵەکان کە عەلی بەو شێوەیە بینی بانگی کردو جلی ژێرەوەو چاکەتێکی گەرمی پێدا. ئەو جلوبەرگانە تازە بوون و تەنها چەندجارێک لەبەرکرابوون. ڕۆژی دواتر خاوەن ماڵێکی تر عەلی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ فرۆشگایەک گۆرەوی گەرم و پێڵاوی تایبەتی ناو بەفری بۆ کڕی. عەلی تێگەیشت کە دراوسێکانی ناو کۆشکەکە بڕیاریان داوە هاوکاری بکەن، تێگەیشت کە میهرەبانی و میواندۆستی لە دڵی خەڵکەکاندا هەیە، تێگەیشت کە تەنها باپیرە ڕەشماڵ نشینەکەی ئەو نییە میواندۆستە، تێگەیشت لەناو بەفرو سەهۆڵیشدا دڵی گەرم هەیە.

## دامەزراندن بەناونیشانی کارگوزاری قوتابخانە

ساڵی دوایی عەلی لە پۆلی چوارەم ناونووسکرا، عەسران لە کاتژمێر پێنج تاکو کاتژمێر هەشت دەچوو بۆ قوتابخانە، بەهاوکاری خانمی دراوسێی کتێبی پۆلی پێنجەمیشی دەخوێند. هەمان ئەو ژنەی کە بۆ چەند چرکەساتێک لەڕووی بێئاگاییەوە عەلی چووبووە ژوورەکەیانەوە، هەربۆیەش ئەو ژنە هەمیشە خۆی بە لێپرسراوی کێشەو نارەحەتییەکانی عەلی دەزانی، بەردەوام پارێزگاری لێدەکردو ڕێنوێنی دەکرد. عەلی گەیشتبووە پۆلی چوارەمی سەرەتایی، هاوڕێکانیشی کەمتر سەریان دەکردە سەری. ڕۆژێک یەکێک لە هاوڕێکانی ماسکی ڕیشی بزنەکەی هەڵگرت و فڕێی دا، گوتی: ئیتر بەسە، ئەوەتا عەلی بەڕاستی دەیەوێت بخوێنێت.

ڕۆژێک بەفرێکی زۆر باریبوو، بەردەم حەوشەی قوتابخانەکە پڕ لە بەفر بوو. عەلی دوای تەواوبوونی وانەی ئەو ڕۆژە، خاکەنازی هەڵگرت و بەفری ئەو ناوەی پاککردەوەو ڕێگای بۆ مامۆستاو خوێندکاران کردەوە، بەفری ناو حەوشەکەی فڕێدایە ناو باخچەی قوتابخانەوە. کاتژمێر یانزەی شەو کارەکەی تەواوکرد، ڕۆژی دواتر بەڕێوەبەری قوتابخانە بانگی عەلی کردو پێیگوت: حەز دەکەیت وەکو کارگوزاری قوتابخانەکە لێرە

کاربکەیت؟ عەلی بەخۆشحاڵییەوە گوتی: بەڵێ. دوایی لەگەڵ خاوەنی ئەو ڕێستۆرانتەی کە کاری لێدەکرد قسەی کردو بوو بە کارگوزاری قوتابخانە. دیارە بەڵێنی بە خاوەن ڕێستۆرانتەکە دابوو کە ڕۆژانی پشوو بچێت بۆ هاوکاریکردنی، لە قوتابخانەکەدا ژوورێک تایبەتکرابوو بە کارگوزار، دوای چەند ڕۆژێک عەلی بە هاوکاری هاوڕێکانی کەلوپەلەکانی کۆکردەوەو بردنی بۆ ژووری قوتابخانەکە، ئیتر عەلی هەم کارگوزاری قوتابخانەو هەم خوێندکاریش بوو، ئەو ئیتر نیگەرانی کرێی ئاووکارەبا و سووتەمەنی زستان نەبوو، دەیتوانی پارە زیاتر کۆبکاتەوە، زیاتر پارە بنێرێتەوە بۆ داپیرەو باپیرەی. مامۆستاکان زۆر هاوکاری عەلییان دەکرد، هەم لەڕووی وانەوتنەوەو هەم لەڕووی پارەوە.

عەلی لە تەمەنی (٢٦)ساڵیدا لە پۆلی دەیەم بوو، مانگێک بەسەر خوێندنی ئەو ساڵەیدا تێنەپەڕیبوو کە هەواڵی گیانلەدەستدانی باپیرەی پێگەیشت، بەو هەواڵە زۆر نیگەران بوو، بەڕێوەبەری قوتابخانە ئەوی بەڕێکردەوە بۆ مەراکیش، بلیتی ڕۆیشتن و گەڕانەوەی فڕۆکەی بۆ وەرگرت، هەندێک پارەشی پێدا. کاتێک عەلی گەیشتەوە وڵاتی خۆی، تێگەیشت کە شەش مانگ لەوەوپێش داپیرەی مردووە، بەڵام هەواڵی مردنی ئەویان پێنەدابوو، چەند ڕۆژێک لە گوندەکە مایەوە، بن جەلال بە بینینی زۆر خۆشحاڵ بوو، عەلی لەڕێگەی گەڕانەوەی بەرەو سوید هەستی بەنامۆیی دەکرد، وای هەست دەکرد وەکو درەختێک وایە کە ڕەگەکانی وشکبووبێت، هەستی دەکرد ڕیشەی سۆزداریی لە مەراکیش وشکبووە، بیری هیچ کەسێکی لە مەراکیش نەدەکرد، دڵی بۆ هیچ کەسێکی مەراکیش لێ نەدەدا. لە پەنجەرەی فڕۆکەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، لەپڕێکدا هەستیکرد دڵی لە مەراکیشە، دڵی بۆ لم و بیابان و خۆرو حوشترو بزن و کۆڵانەکانی گوندەکە لێدەدا. فڕۆکەکە گەیشتە ستۆکهۆڵم. عەلی هەستیکرد وابەستەی ئەم سەرزەمینەیە، ئەو بیری ئۆپسالاو قوتابخانەو مامۆستاکان و ئەو ماڵانەی کە دەیناسین، دەکرد.

عەلی تەمەنی (٢٨) ساڵ بوو کە دبلۆمی وەرگرت، لەماوەی حەوت ساڵدا دوانزە پۆلی بە نمرەیەکی بەرز بڕی، بەباشی فێری زمانی سویدی ببوو. یەکێک لە وانەکانی قوتابخانە زمانی ئینگلیزی بوو، عەلی لە زمانی ئینگلیزیشدا سەرکەوتوو بوو، ئیتر بە زمانی فەڕەنسی قسەی نەدەکرد. شارەزایی لە زمانی سویدیدا لە زمانی فەڕەنسی زیاتر بوو.

## عەلی دەچێت بۆ زانکۆ

عەلی تەمەنی (٢٩) ساڵ بوو کە وەکو خوێندکارێک چووە زانکۆی ئۆپسالاو بەشی جوگرافیای هەڵبژارد، ئیتر هیچ کەسێک گاڵتەی بەو نەدەکرد، ئەوکەسانەی بە پێڕابواردنەوە پێیاندەگوت پرۆفیسۆر، ئێستا بەڕاستی پێیدەڵێن پرۆفیسۆر. عەلی لە ساڵی یەکەمی زانکۆدا لەگەڵ کچێکی مەراکیشیدا هاوسەرگیریی کرد، ژنێک کە لە نەژادی بەربەرییەکانی باکووری ئەفریقا بوو. بەربەرییەکان گەلێکن کە دابەشبوون بەسەر وڵاتانی مەراکیش و جەزائیرو تونسدا، ئەوان خۆیان بەڕەسەنترین دانیشتووانی باکووری ئەفریقا دەزانن. بەهۆی ئەو هاوسەرگیرییە هەندێکجار ئارەزووی سەردانیکردنی مەراکیش و حوشترو بزنەکانی دەکردەوە، هەربۆیە بۆ تێپەڕاندنی مانگی هەنگوینی، دەستی هاوسەرەکەی گرت و ڕۆیشتن بۆ مەراکیش. ئێستا عەلی ئەوەندەی پارە هەیە کە بتوانێت دیاری بکڕێت بۆ هاوڕێکانی، بەتایبەت بۆ بن جەلال. لەکاتی گەڕانەوەشیدا بۆ سوید بۆ هاوڕێ سویدییەکانی و بەتایبەتی بۆ ئەوماڵەی خۆیان بە پارێزەری ئەو دەزانی، دیاری کڕی، هەروەها دیاری بۆ بەڕێوەبەرو مامۆستاکانی تری قوتابخانەکە کڕی. لەو گەشتەیدا بە ژمارەیەک لە خوشک و براکانی ئاشنابوو کە هەرگیز ئەوانی نەبینیبوو.

عەلی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەژوورێکی قوتابخانەکە نیشتەجێ بوون، هەمان ژووری ئەو قوتابخانەیەی کە کارگوزار بوو لێی، عەلی جگەلەوەی خوێندکار بوو، کارگوزاری خوێندنگاکەش بوو، لە ساڵی یەکەمی خوێندندا یەکەمی کۆلێژ بوو، هەر بۆیەش زانکۆ پارەیەکی باشی پێدەدا، هەروەها مووچەیەکی باشی لە قوتابخانەکە وەردەگرت، هاوسەرەکەشی کاریدەکرد. عەلی بن ساڵح نەجیب لە ساڵی (١٩٧٨) بەکالۆریۆسی وەرگرت، عەلی بەردەوامبوو لە خوێندن و ماجستێری لە جوگرافیای ئابووری لە زانکۆی ئۆپسالا وەرگرت. دوای دوو ساڵ بەبێ تاقیکردنەوە چووە بەشی دکتۆرا. لە دەورەی وەرگرتنی ماجستێردا بووە خاوەنی کچێک. لە دەورەی دکتۆراشدا کوڕی یەکەمی لەدایک بوو. دواتر عەلی بن ساڵح نەجیب لەلای هاوڕێکانی و مەراکیشی و عەرەبەکانی ئۆپسالا وەک کەسێکی زیرەک و خۆدروستکەر ناسرا. ساڵی (١٩٨١) نامەی دکتۆراکەی پێشکەش بە زانکۆی ئۆپسالا کردو بە نمرەیەکی زۆر بەرز دکتۆرای وەرگرت. عەلی لە ساڵی(١٩٨١) بەناونیشانی ئەندامی لیژنەی زانستی لە

زانکۆی ئۆپسالا دەستبەکاربوو. لە ساڵی (٢٠١٣) بەناونیشانی پرۆفیسۆر خانەنشینکرا، بەڵام خانەنشینێک لەسەر شێوازی ئەوروپی و سویدی. ئەو ژوورێکی تایبەتی لەناو زانکۆدا پێدراوە، چونکە تەمەنی لە (٦٣) ساڵ زیاترە لە (٥٠٪) کاردەکات و لە (٨٠٪) ی مووچەکەی وەردەگرێت، کچەکەشی مونا نەجیب لە خوێندنگایەکی ئەمریکی لە ستۆکهۆڵم خوێندوویەتی، بۆ تەواوکردنی خوێندن لە بەشی مۆسیقادا چووە بۆ ئەمریکا. ئێستا ساڵی (٢٠١٤) لە بواری مۆسیقادا کار دەکات. دەتوانیت چالاکییەکانی ئەو لە ئینتەرنێتەوە ببینیت. کوڕەکەشی عیماد خوێندکاری بەشی ئابوورییە.

## دیدار لەگەڵ عەلی

من (پاپۆلی یەزدی) لە سەرەتاوە بەبێ بینین و لە دوورەوە، لە ڕێگای کتێب و وتارەکانییەوە عەلیم ناسی، لێکۆڵینەوەکانی ئەو زیاتر لەڕووی ڕۆڵی ئابووری کۆچبەرانەوە بوو لە سوید، ئەو جگە لەوەی مامۆستای زانکۆ بوو، ڕاوێژکاری ئابووری چەند کۆمپانیایەکی سویدیش بوو. یەکێک لە کتێبەکانی ئەو بە ناونیشانی IMMIGRANT SMALL BUSINESSES IN UPPSALA سەرنجی منی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. کچەکەم (هومای پاپۆلی یەزدی) لە ئۆپسالای سوید خوێندکاری دکتۆرایە لە بەشی بۆماوەزانی. لە نەورۆزی (٢٠١٣/١٣٩٢) بۆ سەردانیکردنی چووم بۆ ئۆپسالا، پشتم ئازاری هەبوو، کە ناچار بووم نەشتەرگەری بکەم، هێواش هێواش ڕۆیشتم بۆ زانکۆی ئۆپسالا، سەردانی بەشی جوگرافیام کرد، ژووری عەلی بن ساڵحم دۆزییەوە. ئەو لەوێ نەبوو، مامۆستاکان لە هۆڵی پێشوازی خەریکی خواردنەوەی قاوە بوون. لە یەکێک لە مامۆستاکان هەواڵی پرۆفیسۆر عەلی نەجیبم پرسی. ئەویش گوتی: عەلی خانەنشین بووەو هەفتەی دوو سێ ڕۆژ دێت بۆ زانکۆ، ژمارەی تەلەفۆنی عەلی پێدام، لەهەمان شوێن تەلەفۆنم بۆ عەلی کردو خۆم پێناساند. (مامۆستایەکی ئێران کە کتێب و چەند وتارێکی ئەوی خوێندۆتەوە) لێم پرسی دەتوانم یەکتری ببینین. زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی: تاکو یانزە خولەکی تر دێت بۆلام ، دوایی داوای لێکردم مۆبایلەکەم بدەمە دەست یەکێک لەو مامۆستایانەی لەوێن، مۆبایلەکەم دایە دەست یەکێک لە مامۆستاکان، ئەویش داوای کرد خزمەتم بکەن. مامۆستایەکی پورتوغالی گوتی: چایی دەخۆیت، یان قاوە، داوای چایم کرد.

شوێنی تایبەتی مامۆستاکان لە هۆڵی پێشوازی دەچوو لەسەر مێزی ناو هۆڵەکە

جۆرەها میوە دانرابوو. سەرەتا وام هەستکرد لەوێ مەراسیمێک بەڕێوەدەچێت، بەڵام دوایی تێگەیشتم ئەوە ئادابی هەموو گرووپە زانستییەکانی زانکۆی سویدە. دوای دانیشتنم و بەخێرهێنانم، پرۆفیسۆر عەلی بن سالح نەجیب بە هەناسەبڕکێ گەیشتە لامان. ئەو لەماڵەوە تاکو زانکۆ بە سواری پاسکیل هاتبوو، هەوای ساردی سوید ڕەوشتی گەرمی ئەوی نەگۆڕیبوو، هێشتا گەرمای پێدەشتەکانی دەوروبەری شاری زاگ (ZAG) لە باشووری مەراکیش لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتیدا هەستی پێدەکرا. لە شێوازی گفتوگۆیدا گەرمیی بیابان شەپۆلی دەدا، ڕەوشتی میوانداری ڕەشماڵ نشینانی هەبوو. من هیچم لەبارەی ژیانی ئەوەوە نەدەزانی، ئەویش منی نەدەناسی، لەماوەی کەمتر لە پانزە خولەکدا، وەک ئەوە وابوو پەنجا ساڵ بێت من بناسێت. سەرەتا لە وتووێژی زانستییەوە دەستپێدەکەم، من لەبارەی ڕۆڵی کۆچبەران لەسەر ئابووری سوید پرسیاری لێدەکەم، ئەویش لەبارەی پلان و ئەو وتارو کتێبانەی کە نووسیویەتی قسە دەکات. نزیکەی کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆیەو دەپرسێت دەتەوێت زانکۆی ئۆپسالات نیشان بدەم؟ بە بیستنی وتەکەی ئەو و ڕەزامەندبوونی من بەشەکانی زانکۆم نیشاندەدات. زانکۆی ئۆپسالا هەموو کۆلێژەکان بەسەریەکەوە نین، بیناکان لە باکووری شار بە بەربڵاوی دروستکراون، من بەشێک لەو بینایانەم پێشتر بینیبوو، منی بۆ بینای سەرەکی زانکۆ برد. هۆڵی شانۆو وێنەی بنمیچی بیناکەی نیشاندام، منی برد بۆ کڵێسای گەورەی شار، لە کڵێساکەدا بەیەکەوە دەچین بۆ ئارامگای (لینە) دیارە مەبەستم لە لینەی بەناوبانگە.

دوای بینینی کڵێسا، بەیەکەوە دەچین بۆ کافتریا، کافتریایەکی جوان و ڕازاوە، بە قۆری و فنجانی چینی و جۆرەها چوکلاتەی نموونەیی، خزمەتگوزاریش کەسێکی بەڕێز بوو. کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی بەدەوری مێزەکاندا دانیشتبوون و گفتوگۆیان دەکرد، کاتیان بەسەر دەبردو پێدەکەنین و چێژیان وەردەگرت. لە پەنجەرەی کافتریاکەوە ڕووباری بچووکی ئۆپسالا دەبینرا، بورجی کڵێسای گەورەی ئۆپسالا دەبینرا. بورجێکی بەرز بە خشتی قاوەیی، دەبینرا. کاتێک سەیری کەلوپەلی ناو کافتریا دەکەم چێژ وەردەگرم، قۆری و ژێرپیاڵەو فنجانی چینی بەڕەنگی شین و سپییەوە، کە سەیری جلوبەرگی کارگوزارەکە دەکەم، چێژ وەردەگرم، کاتێک سەیری سەهۆڵی ناو ڕووبارەکە دەکەم کە لەکاتی توانەوەدایە، چێژ وەردەگرم، کە سەیری ڕوخساری ئەو مامۆستایەی پەروەردەی دەشتی گەرم و بیابان دەکەم، چەند بەرامبەر چێژ وەردەگرم، هەموو ئەو کەسانەی دەوروبەرم لە ئاسودەییدا

بوون، شوێنەکەشی شوێنێکی ئارامە، هیچ کەسێک دۆسیە بۆ کەسێکیتر دروست ناکات، ئەم دۆسیە دروستکردنە خراپترین و ناشیرینترین کەلتووری ئێمەیە، بۆیە پێویستە کارێک بکەین تاکو دروستکردنی دۆسیە بۆ یەکتری بێنرخ بکەین، تەنها بە دەستەبەرکردنی ئازادیی دروستکردنی دۆسیە بێ نرخ دەبێت، کاتێک کە شتێک نرخی نەما، بۆخۆی لەناودەچێت.

گوتم لە کافتریاکەوە بورجی کڵێسا دیاربوو، دەنگی زەنگی کڵێسا دەهات، کڵێسای ئۆپسالا ئەرکی کڵێسای گەورەی سویدی دەبینی. لەسەر کورسییەکەم هەڵدەستم و عەلی میوانداریم لێدەکات، مۆڵەت نادات پارە بدەم. بڕیار دەدەین سبەی یەکتری ببینینەوە، سبەی کاتی عەسر لە کتێبخانەی زانکۆ یەکتری دەبینین، کتێبخانەیەکی نموونەیی. من زیاتر لە سەد کتێبخانەی گەورەی زانکۆکانی جیهانم بینیوە، بەڵام کتێبخانەی زانکۆی ئۆپسالا نموونەییە، پێویستە تۆش بڕۆیت و ببینیت، تاکو بزانیت بۆچی من دەڵێم نموونەییە. عەلی من دەبات بۆ ناو فرۆشگایەکی ناو زانکۆکەو تیشێرتێکی خاکیم بۆ دەکڕێت کە ئارمی زانکۆی لەسەر چاپکراوە، بڕی (١٧٥) کرۆنی سویدی دەدات بۆ کڕینی تیشێرتەکە، منیش دیارییەکەی لێوەردەگرم و سوپاسی دەکەم.

بەیەکەوە دەڕۆین بۆ کافتریای (دەنجی)، بەدەوری مێزێکدا دادەنیشین، ئەو باسی ژیانی خۆیم بۆ دەکات و ئایپادێکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، وێنەکانی ناو ئەلبوومەکەی تێکردووەو وێنەکانم نیشاندەدات. وێنەی وڵات و دەشت و شوێنی لەدایکبوونی (دیارە ئەو لەکاتی گەشتکردنەکانی دواییدا کە گەڕاوەتەوە بۆ مەراکیش ئەو وێنانەی گرتووە). وێنەی شانزە خوشک و برای کە لە مەراسیمی کۆچی باوکیاندا لەدەوری یەکتری کۆببوونەوە، باوکێک کە ئەو تەنها لە مەراسیمی کۆچەکەیدا بەشداریکردووە. ئەو خوشک و برایانەی کە هەندێک لە ئەوانی لەهەموو تەمەنیدا چەندجارێک بینیوە، کاتێک ئەو بەناوی پرۆفیسۆرەوە لە ناوچەکەی خۆیاندا ناوی بڵاوبووەوە، ئیتر خوشک و براکانی بەدەرکەوتن، ئەمجۆرە دیاردەو هەڵسوکەوتە شتێکی نامۆ نییە، لە هەموو جیهاندا هەروایە، منیش ئەو بارودۆخەم هەیە. من لێی دەپرسم تۆ ماوەی هەژدە ساڵ لە مەراکیش ژیاویت، یادەوەریی نوێژکردن و قورئان خوێندنت لەگەڵ داپیرەتدا لەبیرماوە، دوو ساڵ لە کانە خەڵوزەکانی فەڕەنساو هۆڵەندا کارت کردووە، پەنجا ساڵ دەبێت لە وڵاتی سویدیت، زمانەکانی عەرەبی و فەڕەنسی و ئینگلیزی و سویدی بەباشی دەزانیت، هاوسەرەکەشتان خەڵکی مەراکیشە. منداڵەکانیشتان لە ئەمریکا دەژین، کەچی لە قسەکانتدا دەردەکەویت بیری هەتاوی گەرم و سووتێنەری

بیابانی وڵاتی خۆت دەکەیت و بیریشت لای خۆشییەکانی سویدو میواندۆستی خەڵکی سویدە، ئایا تۆ لە وڵاتی سوید ڕازیت؟ هاوکاران و هاوڕێیانت بە کەسانی باش و تێکۆشەر دەزانیت، پرسیاری من ئەوەیە، کە تۆ ناسنامەی خۆت چۆن پێناسە دەکەیت؟ ناسنامەی تۆ چییە؟ عەلی بن سالح لەماوەی (٤٥) چرکەدا وەڵامەکەی دامەوە. بەکورتی ئەمە وەڵامەکەی بوو، من بەرهەمی هاوبەشی شارستانییەتی ئیسلامی و مەسیحی و سەردەمی کۆن و نوێم، هەوڵدەدەم خاڵە باشەکانی شارستانییەتەکان و تێڕوانینەکانی لەخۆمدا کۆبکەمەوە، ئێستاش پەرۆشی ئەو پەروەردەیەی دایەگەورەمم کە بەیانیان زوو پێش خۆرهەڵاتن لە خەو هەڵیدەستاندم، ئێستاش دروشمی ئەو پیاوە گەورەیەی عەرەب کە (١٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا گوتوویەتی (نوێژکردن لە خەو باشترە) لەمێشکمدا ماوە. دایەگەورەشم ئەوەی لە دایەگەورانی خۆی بیستووەو بۆ منی دەگێڕایەوە، بەڵام من نەمتوانی ئەم کەلتوورە بگەیەنمە منداڵەکانم، من کەلتووری میهرەبانی و خۆشەویستی مەراکیشم لەخۆمدا هێشتۆتەوە، من کەلتووری ئاشتیخوازانەو ئازادیی خەڵکی سویدیش فێربووم.

ئەو ڕۆژە کەمێک زەعفەرانم بەدیاری دا بە عەلی، دوایین وتەی عەلی کە لەوکاتەدا کردی، هەرگیز فەرامۆشی ناکەم، ئەو گوتی: من هەمیشە بەو کۆچبەرانەی کە دێن بۆ سوید دەڵێم (هیچ کاتێک درەنگ نییە)، هەمیشەو لە هەر تەمەنێکدایت دەتوانیت دەست پێبکەیت، دوایی گوتی: دیارە هەلومەرجەکانی سوید بۆ کۆچبەران دەرفەتێکی نموونەییە، دەرفەتێک کە هەتاو و خۆرو گەرمای هاوین بە کەسی نادات، دەرفەتێک کە وڵاتانی وەکو مەراکیش و خەڵکەکەی نایدات و ناتوانێت بیدات. ئەو دەیگوت: هەموو سرووشتەکان جوانن، چ هەتاوی سووتێنەرو لمی بیابانی ئەفریقاو چ بەفرو سەهۆڵبەندان و سەرمای سوید. پێویستە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا میهرەبان بن. پێیدەڵێم تۆ نزیکەی پەنجا ساڵ دەبێت لە سویدیت. گوتی: بەڵێ، دروست ئەمساڵ پەنجا ساڵە لە سویدم. پێیدەڵێم بە بۆچوونی تۆ هۆکاری سەرەکی گەشەکردنی سوید چییە؟ بە پێوە وەستابووین، خەریکی قسەکردن بووین، لەوکاتەدا تەلەفۆنێکی بۆهات، هاوسەرەکەی بوو کە چاوەڕوانی ئەوی دەکرد تاکو بەزوویی بگەڕێتەوە بۆماڵەوە، لەکاتی خوداحافیزیدا دەڵێت: هۆکاری گەشەسەندنی سوید پوختەی ئەم چەند وشەیەیە (ئازادی، دیموکراسی، دادپەروەری کۆمەڵایەتی، هاوکاری خەڵکی، جیهانبینی ڕاست و سنگ فراوانی)، سوید گەشەی خۆی بە گەشەی وڵاتانی تر دەزانێت، نەک هەوڵی وێرانکردنی وڵاتانی تر، بەبێ ئەم بنەمایە سوید سەد جار لە باشووری

مەراکیش و بیابانی ئەفریقا دواکەوتووتر دەبێت. ئەو ئارەزوو دەکات هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی خاوەنی بنەمای بەڕێوەبردنێکی ڕاست و حکومەتێکی پشت ئەستوور بە ئازادیی دادپەروەری بن. دەیەوێت خەڵکی ڕەوشتێکی بەرزو دوور لە ئیرەیی و چاوچنۆکی بن.

وتەکانی عەلی منی خستە بیرکردنەوە. ڕۆژی دواتر سەردانی کتێبخانەی ئۆپسالام کرد، دەچمە سەر ئینتەرنێت و داوای هاوکاری لە خانمی ئەندازیار حەمیدە نەژادی دەکەم، لە ناوەندی ئامارو زانیاری سوید سوود وەردەگرم. تێدەگەم بەدرێژایی سی ساڵ ساڵی (١٩٨١-٢٠١١) لە هەر چوار کەسێکی کۆچبەری سادە کە هاتوون بۆ سوید، یەک کەس سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. دوای چەند مانگێک (٢٢) ڕۆژ لە فەرەنسا بووم. هەموو هەوڵ و کاری خۆم لە ناوەندی لێکۆڵینەوەی زانستی فەرەنسا (C.N.R.S) لەبارەی ئەو بابەتەوە بەسەربرد، تاکو بزانم لەسەدا چەندی ئەو کۆچبەرانەی ڕوویان لە فەرەنسا کردووە، سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، لەماوەی (٣٠) ساڵدا پێشکەوتنەکان لە فەرەنساش لەسەرەوەیە، لەسەدا بیستویەکی کۆچبەرانی سادە، واتە کەسانێک کە پارەو پولیان پێنەبووەو خوێندنیشیان لەخوار دبلۆمەوە بووە، سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، هاوڕێکانم لە زانکۆی ئەڵمانیا پێشتر ئەم لێکۆڵینەوەیەیان ئەنجامدابوو. ئەو کۆچبەرانەی کە بە پلەی باڵای زانستی و ئیداری و پیشەسازی گەیشتبوون، زۆر باشبوو، لە سەدا بیستوحەوتی کۆچبەرانی نەخوێندەوارو بێپارە لە ئەڵمانیا بە پلەیەکی بەرز گەیشتبوون.

ئێستا ئەم پرسیارە لە خۆمان دەکەم، سێ ملیۆن کۆچبەری ئەفغانی، کە ماوەی سی ساڵ دەبێت لە وڵاتی ئێمەن، لەسەدا چەند یا بڵێین لە هەزاران چەندیان توانیویانە بە پلەیەکی باڵا بگەن، دیارە من ژمارەیەک دەناسم خۆیان پێگەیاندووە. دکتۆر حەسەنی عەبدوڵڵاهی لاوێکی دانیشتووی گوڵشەهری مەشهەد بوو، لە زانکۆی تاران دکتورای وەرگرت، لە ئەفغانستان بوو بە وەزیری نیشتەجێکردن. دەربارەی ئەو دوایی دەنووسم. ئاغای نەجەفی کە ئەویش لە ئەفغانستان بوو بە وەزیر، بەڵام ئایا بە سەد گوڵ دەتوانین بڵێین سێ ملیۆن بەهارمان هەیە.

کێ عەلی بن ساڵح نەجیبی لە بیابانەکانی باشووری مەراکیشەوە پەلکێشی ئۆپسالای سوید کرد؟ چ هێزێک ئەم منداڵە بێ دایک و باوک و بێکەسەی لە شوانێکی بزن لەوەڕێنەوە کرد بە پرۆفیسۆرێکی بەناوبانگ؟

## گەشتێک بۆ دەریای تاریکی

بڕیارم دا بڕۆم، بۆکوێ؟ بۆ دەریای تاریکی، بۆ دوورگەی ستپیتز بیرگن (Stpitsbergen) یا سڤالبارد (Svalbard) شاری لانگ یربابن (Langyerbyen) دوورگەیەک هەڵکەوتووە لە هەزاران کیلۆمەتری باکووری نەرویج، (۱۱۰۰) کیلۆمەتر بەرزتر لە بەرزترین شوێنی ئالاسکا. دوورگەیەک هەڵکەوتووە لە دەریای بەستووی باکوور. دوورگەیەک لە نزیکترین شوێنەوە (۹۵) کیلۆمەتر دوورە لە وشکاییەوە. سەرزەمینێکی سەهۆڵبەندان، تەنانەت ئەسکیمۆکانیش لەو شوێنەدا ناژین. سەرزەمینێک تاکو ئەم سەد ساڵەی دوایی هیچ کەسێکی لێ نەدەژیا، سەرزەمینێک کە لە ساڵێکدا چوارمانگ و نیو بەتەواوی شەوە، چوارمانگ و نیویش بەتەواوی ڕۆژە. خەڵکانی ئەو دوورگەیە تەنها لە (۹)ی مارسدا بۆ ماوەی بیست خولەک تیشکی بێهێزی خۆر دەبینن، واتە ساڵانە لە (۹)ی مارسدا تەنها بیست خولەک ڕۆژە و (۲۳) کاتژمێرو چل خولەک شەوە. دوورگەیەک کە ساردیی (٤٩،٥) پلەی ژێر سفری بەخۆیەوە بینیوە، سەرمای (-۳۰)و (-۳٥) پلە لەوێ سەرمایەکی ئاساییە. بای بەهێزی (۷۰-۸۰) کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا ئاساییە. ئەو دوورگەیە دوو ئەوەندەی وڵاتی نەرویج فراوانە، بەڵام ژمارەی دانیشتووانی (۲٥۰۰) کەسە. (ڕووبەری سڤالبارد ٦١۰۲۲و هی بەلجیکا ۳۰٥۲۸ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە)، سەرزەمینێکی بەستەڵەک، کە لە ساڵی (۱۹۰٦) بەدواوە کەم کەم خەڵکی لێ نیشتەجێبوون. لەو سەردەمەدا کەسێک لەوێ کانێکی خەڵوزی بەردینی دۆزییەوە. ئەو پیاوە هەر لەوێ پێگەیەکی دروستکردو ناوی خۆی لەو پێگەیەنا، بەناوی پێگەی (لانگ یربابن)، دواتر ئەو پێگەیە بوو بە شارۆچکەیەک کە لە ساڵی (۲۰۱٥)

ژمارەی دانیشتووانی تەنها (٢١٠٠) کەس بوو.

چەند وێستگەیەکی لێکۆڵینەوەو بەندەری بچووک هەبوو، ئەو دوورگەیە ژمارەی دانیشتووانی (٢٥٠٠) کەس بوو، بەڵام (٣٥٠٠) ورچی سپی لەو دوورگەیەدا هەبوو. (لانگ یربایِن) بەرزترین شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤە لەسەر ڕووی زەوی، ئەو دوورگەیە بەدەر لە شوێنە جیۆپۆلەتیکەکەی، جێگایەکی سیاسی تایبەتیشی هەیە. شوێنێکی گرنگە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، جێگایەکی گرنگە بۆ ئایندەی تەواوی مرۆڤایەتی.

بڕیارم دابوو بە تیرێک دوو نیشان بشکێنم، بڕیارم دابوو بڕۆم بۆ سوید بۆ سەردانیکردنی هومای کچم کە زۆرم خۆشدەوێت، دواتر بچم بۆ ئەو دوورگەیەو ئەو شارە دوورە دەستە، خۆ ئەگەر هوما لە سوید نەبووایە، نەمدەتوانی گەشت بکەم بۆ ئەو دوورگەیە. بلیتی (تەرکش ئیر)م کڕی ڕۆژی (٢٠-١٠- ١٣٩٣/ ١٢-١-٢٠١٥) لە مەشهەدەوە بەڕێکەوتم، بەنیاز نەبووم جگە لە گەشتی دوورگەکە، لەبارەی هیچ شتێکی ترەوە بنووسم. دوو کاتژمێر لە ئەستەمبوڵ مامەوە، لە ئەستەمبوڵەوە بە فڕۆکەی ئێرباس و لەسەر کورسی (B٢٢) دانیشتم. کوڕێکی لاوی لوبنانی لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، ناوی محەمەد ساحلی بوو، زۆر بەباشی بە زمانی فەڕەنسی قسەی دەکرد، ئەو یەکەمینجاری بوو بچێت بۆ سوید، دەیویست وەک خوێندکارێک لەوێ بخوێنێت، دەیویست ببێت بە فڕۆکەوان، لەبارەی هەر دەردێکەوە قسەمان دەکرد، ئەو نیگەران بوو، لەوە دەترسا هاوڕێکانی بەشوێنیدا نەیەن بۆ فڕۆکەخانە، ئەو دەیویست ڕۆژێک ببێت بە فڕۆکەوان. پێمگوت: دەتەوێت ببیت بە فڕۆکەوانی فڕۆکەی جەنگی؟ گوتی: لە شەڕ بێزارە لە کوشتن و وێرانکاری بێزارە، لە تۆڵەسەندنەوە بێزارە. گوتی: دەیەوێت ببێت بە فڕۆکەوانی ئاشتی. زۆرم بەلاوە جوان بوو، دەیویست ببێتە فڕۆکەوانی گەشتیاری. گوتی: دەمەوێت ببمە فڕۆکەوانی ئاشتی. بەپێکەنینەوە ئەو قسەیەی کرد، ویستم ماچی بکەم، لەم دنیای داعش پەروەردەدا، لاوێکی لوبنانی دەیویست ببێتە فڕۆکەوانی فڕۆکەی ئاشتی، دەیویست ئاشتی لە تەواوی جیهاندا سەروەر بێت. لە ئەستەمبوڵەوە تاکو ستۆکهۆڵم بەیەکەوە لە بارەی وڵاتی لوبنان و خەڵکەکەیەوە قسەمان کرد، لەبارەی حیزب و ڕێکخراوەکانەوە، لە نیگەرانییەکانی کوڕێک کە زۆرباش دەیزانی لە وڵاتەکەیدا چی دەگوزەرێت. کاتێک ویستمان لە فڕۆکەکە دابەزین، دووبارە نیگەران بووەوە. پێمگوت: بەیەکەوە لە هۆڵی فڕۆکەخانەوە دەچینە دەرەوە، دڵنیابە هاوڕێکانت دێن بۆ پێشوازیت، خۆ ئەگەر ئەوانیش

نەهاتنایە بۆ پێشوازیکردنی، ئەوا من و کچەکەم هاوکاریمان دەکرد تاکو دەمانگەیاندە شوێنی مەبەست. پێمگوت: تازە نەشتەرگەریی پشتم کردووە، ئەوە جانتاکەی منەو لە فرۆکەکە دایانگرتووە، تکایە بۆمی هەڵبگرە. ئەویش بەخێرایی جانتاکەی هەڵگرتم. بەیەکەوە بەڕێکەوتین. هومای کچم بینی و پێی گەشامەوە، شادمانی باوکێک کە ماوەی ساڵێک دەبوو کچەکەی خۆی نەبینیوە. هوماش زۆر شادمان بوو جگە لەوەی گلەییەکی زۆری لێم هەبوو، بەڵام هێشتا بەبینینم خۆشحاڵبوو. محەمەد ساحلی لەپڕێکدا گوتی: ئەوەتان هاتوون. لەجیاتی یەک دوو کەس، نزیکەی بیست کەس هاتبوون بۆ پێشوازی. هاوڕێکانی بە گەرموگوڕی بەخێرهاتنیان کردو لەباوەشیان گرت، بەو پێشوازییە گەرمە هیچ نیگەرانییەکی نەما. یەکێک لە جوانترین ڕەوشتی ئێمەی خۆرهەڵاتی، میواندۆستی و هەڵسوکەوتی گەرموگوڕیمانە، پێویستە نرخی بزانین، بەڵام بەداخەوە وردە وردە خەریکە ئەو گەرموگوڕییە سارد دەبێتەوە.

کەشوهەوای ستۆکهۆڵم ساردو بەفراویی بوو. نەورۆزی ساڵی پار کە بۆ سەردانیکردنی کچەکەم هاتبووم. سەرەتا دوو ڕۆژ چووم بۆ ماڵی هاوکارو هاوڕێی دێرینم (خانم حەمیدەی نەژادی و ئاغای جەواد سابت قەدەم)ی هاوسەری. کچەکەم بلیتی پاسی ستۆکهۆڵم-ئۆپسالای بۆ وەرگرتبووم، بەڕێکەوتم بۆ ئۆپسالای پایتەختی کۆنی سوید، شوێنێک کە هوما لەوێ لە زانکۆکەیدا وانە دەخوێنێت. کچەکەم خوێدکاری دکتورای جیۆلۆجییەو لە بەشی بۆماوەزانی دەخوێنێت. زانای گەورەو بەناوبانگ (لینە) ش هەر لەو شارەو لەهەمان زانکۆ خوێندوویەتی. ساڵی پار هاوڕێ مەراکیشییەکەم دکتور عەلی بن ساڵح نەجیب مامۆستای هەمان زانکۆ منی برد بۆ سەر ئارامگای (لینە) لە کڵێسای گەورەی شار. ژیانی دکتۆر عەلی بن ساڵح نەجیب، پێش ئەم بابەتە بەجیا نووسیومە. ماڵی هوما نزیکەی (٣) کیلۆمەتر لە چەقی شارەوە دوورە. بە پاس تاکو نزیکی ماڵیان ڕۆیشتم، تاکو گەیشتمە ماڵیان، جانتا قورسەکەم بەو بەفرەدا ڕادەکێشا، بەدڵنیاییەوە دەپرسن بۆچی بەو بەفرو سەرمایە تاکسیم نەگرتووە. منی خەڵکی یەزد لە هەموو شوێنێک یەزدیم، یەزدییەکانیش کەسانی دەستگرەوەن. من لە ئۆپسالای سارددا پارە نادەم بە کرێی تەکسی، بەڵام بۆ ڕۆیشتن بۆ دوورگەیەکی سەهۆڵبەندان (٢٢) ملیۆن تومەن خەرج دەکەم. بێهۆ کەسێک پاسپۆرتەکەم بۆ مۆر ناکات. ئێمەی یەزدی ڕێزی کات دەگرین، پارەش بەباشی خەرج دەکەین، دیارە ئەگەر

هەمانبێت. کچەکەم ناو ماڵەکەی گەرمکردووە. ماڵی هوما لە کۆشکی خوێندکارانە، لەو کۆشکەدا سێ ژووری تێدایە، لە هەر ژوورێکدا یەک خوێندکار هەیە، ئەو دوو خوێندکارەش هاوشێوەی هوما خەڵکی سویدن. یەکێک لەوانە ڕۆیشتبوو بۆ شارەکەی خۆی. بڕیاروایە من لە ژوورەکەی ئەودا نیشتەجێ ببم. بەشی ناوخۆیی خوێندکارانی خۆمانم هاتەوە یاد، لە زۆرێک لە شارەکانی ئێمەدا هەر چوار خوێندکارو هەندێکجار شەش خوێندکار لەژوورێکدا دەژین. خۆزگە هەندێک لە خێرخوازەکان بەشەناوخۆیی بۆ زانکۆکان دروست دەکەن. خوالێخۆشبوو حاجی تەقی ڕەسوڵیان بەشەناوخۆییەکی باشی لە میرابادی تاران دروستکردو پێشکەشی زانکۆی تارانی کرد. حاجی عەلی ئاغای باقرزادە بەشەناوخۆییەکی باشی دروستکردو پێشکەشی زانکۆی فیردەوسی مەشهەدی کرد، بەڵام پێویستە بەشەناوخۆیی زۆر زیاتر دروستبکرێت. سەرنەکەوتنی خوێندکار لە وڵاتی ئێمەدا پەیوەستە بە هەلومەرجی بەشە ناوخۆییەکانەوە، لەبارەی کێشە خراپەکانی ژیانی شەش خوێندکاری لاو لە ژوورێکدا، هیچ نانووسم.

ئەو باڵەخانەیەی همای تێدابوو، لە هیچ شتێکی کەم نەبوو، هۆڵ و ژووری میوان و چێشتخانەو یەخچاڵ و حەمامی باش و عەمبارو پێویستییەکانی گەرمکردنەوەو تەلەفزیۆن و مێزی یەک کەسی و مێزی نانخواردنی شەش کەسی. وا باشترە لەوە زیاتر نەنووسم، ئەگەر زیاتر بنووسم لەوەیە زۆربەی خوێندکارەکانمان کۆچ بکەن بۆ سوید، ئەوکاتە زانکۆکانمان بەچۆڵی دەمێننەوە. زۆرباشە لەسەر سوید هیچ نانووسم. باسی میوانداریی و پێشوازیکردنی کچەکەم لە من، لەوەیە لە جێگایەکی تر بنووسم. باسی پێشوازی و میوانداریی خانم حەمیدەی نەژادی لە ستۆکهۆڵم نانووسم. لەگەڵ خانم حەمیدەی نەژادیدا سەردەمێک لە دەیەی (١٩٧٠/١٣٥٠) لە مەشهەد بەیەکەوە هاوکار بووین. ئەو ئێستا ساڵی (٢٠١٥/١٣٩٤) تەمەنی بووە بە (٦٣) ساڵ و هەروەکو جاران میواندۆستە، ئەو خانمە بەڕێزە کوردەو لە کوردەکانی مهابادە. ئەویش هەروەکو هەموو کوردەکانی تر کەسێکی گەرموگوڕو میواندۆستە. لە دەیەی ساڵی (١٩٤٠/١٣٢٠) باوکی سەرۆک شارەوانی مهاباد بووە، چەند ساڵێکیش سەرۆکی شارەوانی قوچان و فەردەوس و حەیدەریە بووە، ساڵی (١٩٧٥/١٣٥٤) خانەنشین کراوە. نەژادی خوالێخۆشبوو و هاوسەرەکەی ژیانێکی سەربەرزانەیان هەبووە. ئەو ماوەی (٤٥) ساڵ سەرۆک شارەوانی بووە. کاتێک خانەنشینکراوە، هیچ شتێک لە ماڵەکەیدا نەبووە، نە

خاوەنی خانوو بوو، نە پێویستییەکانی ناو ماڵ. تەنها خۆی و هاوسەرەکەی و شەش منداڵ بوون، خەڵکانی شارۆچکەی حەیدریە، بەتایبەت خوالێخۆشبوو حاجی جومعە زادە و سەرۆک شارەوانی دواتر خوالێخۆشبوو حەسەنی زەردکانلو و پارێزگاری ئەوکات هاوکارییەکی باشیان کرد، بەڕادەیەک تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی کرد، هیچ کێشەیەکی ژیانی نەبوو. ژیان بەو جۆرە نییە کە خەڵکی تەنها نرخی کەسە دزەکان بزانن، نرخی کەسە ڕاستگۆ و خزمەتگوزارەکانیش دەزانرێت. سەردەم گۆڕاوە لە ساڵی (١٩٧٥/١٣٥٤) تاکو ئێستا زیاتر لە (٤٠) ساڵ دەبێت، بەدرێژایی ئەم چل ساڵە ڕەوشتی خەڵکی جیهان و ئێران گۆڕاوە، هەروەکو چۆن باری ئابووری و تەکنۆلۆژیا گۆڕاوە. لە ئۆپسالام و دەمەوێت بڕۆم بۆ دوورگەی سپیتز بێرگن و شاری (لانگ یربایین) نە بلیتم کڕیوەو نە ئوتێلم گرتووە، ئاخر لە ئێراندا هیچ کۆمپانیایەکی فڕۆکەوانی بلیتی ئەو ناوچەیە نافرۆشێت، نە کۆمپانیای (ترکش ئیرۆ)و نە (قەتەر ئێر)، نە کۆمپانیاکانی تر. هوما زۆر دژی چوونمە بۆ ئەو ناوچە دوورەدەستە، دەڵێت تۆ بە ئەم زستانە دەچیت بۆ ئەو تاریکستانە لەوێ چی دەکەیت؟ بۆچی تۆ بەم هەموو ئازارەی پشتەوە دەتەوێت بچیت بۆ ئەو شارە؟ حەمیدە خانمیش بەتەواوی دژی ئەو گەشتەی منە. ئەوان هەردووکیان پێشنیارم بۆ دەکەن کە بڕۆم بۆ باکووری سویدو بۆ شاری (کی رونا) لەوێ چەندین ئوتێلی لە سەهۆڵ دروستکراو بوونیان هەیە. لە کۆتاییدا هوما ڕەزامەندی دەربڕی کە بڕۆم بۆ شاری (ترمسۆ).

ڕۆژی دووەمەو لە شاری ئۆپسالام و دەڕۆم بۆ بازاڕ، بەفرو سەهۆڵبەندان هەموو شاری گرتۆتەوە، پلەی گەرمی (١٠) پلە لەژێر سفردایە. بەپێ دەڕۆم بۆ ناو شار، دەچم بۆ کۆمپانیایەکی فڕۆکەوانی و پێیان دەڵێم دەمەوێت بچم بۆ شاری (لانگ یربایین) بلیت فرۆشەکە پەنابەرێکی جەزائیرییە، هەرگیز بلیتی ئەو دوورگەیەو ئەو شارەی نەفرۆشتووە. لە هاورێکانی دەپرسێت و دەڵێت: ئێوە ناوی دوورگەی سپیتز بورگن یا سڤالبارد و شاری (لانگ یربایین)تان بیستووە. هەمووان وەڵامیان بە نەخێر بوو. ئەوان وا هەست دەکەن من گەشتیارێکی سەرگەردانم و وڕێنە دەکەم، جوگرافیاناسێک دێت بۆ هاوکارییان و ئەو دوورگەو شارەیان لەسەر نەخشە نیشاندەدات، ئەوکاتە باوەڕم پێدەکەن کە بەڕاستی گەشتیاری ئەو دوورگەیەم. کارمەندێکی لاو دەچێتە سەر کۆمپیوتەر، کۆمپانیاکە چۆڵە، چونکە هەموو گەشتیاران لەڕێی ئینتەرنێتەوە بلیت

دەکرێن. کارمەندەکە نزیکەی یەک کاتژمێرو نیو لەسەر کۆمپیوتەر مایەوە، لەکۆتاییدا بلیت دەکڕم و لە ئوتێلێکیش بۆ ماوەی چوار ڕۆژ جێگا دەگرم. لە ستۆکهۆڵمەوە فڕینی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو دوورگەیە نییە، بۆیە دەبێت لە ستۆکهۆڵمەوە بچم بۆ ئۆسلۆ، لە ئۆسلۆشەوە سەرکەوم و بڕۆم بۆ (ترمسۆ)ی باکووری شاری نەرویج و لەوێ سواری فڕۆکەی تر بم و بڕۆم بۆ دەریای تاریکی.

هوما بەیانیان دەچوو بۆ زانکۆو کاتژمێر حەوتی شەو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. دوای کڕینی بلیت خەیاڵم ئاسودە بوو، هەستمکرد لە تەمەنی (٦٧) ساڵیدا هێشتا کەسێکی لاوم. بەهۆی ئەو هەستە خۆشەوە چووم بۆ ڕێستۆرانتی (کەیبانوو)، کە ڕێستۆرانتێکی ئێرانییە، ڕێستۆرانتێکی گەورەو خاوێنە، داوای دوو شیش کەبابم کرد، دوو شیش کەباب بە سەوزەو بیبسی کۆلاوە، هەموو خواردنەکەیان بایی (١٢٩) کرۆن بوو. دەبینین کە ئێرانییەکان بەتەواوی گۆی زەویدا بڵاوبوونەتەوە، ئێرانییە پەنابەرەکان بە زانست و پارەو سەرمایەو کارو داهێنانی خۆیان جێگای خۆیان کردۆتەوە. من بۆ هەر شوێنێکی ئەم زەمینە گەشتم کردبێت، لانیکەم کەسێکی ئێرانیم بینیوە. دوای نانخواردنی نیوەڕۆ ڕۆیشتم بۆ کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی ئۆپسالا. کتێبخانەی ئۆپسالا کتێبخانەیەکی گەورەیە. کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆ دنیا بەتەواوی تاریکبوو و بوو بە شەو، سێ کاتژمێر لە کتێبخانەکە بووم، کاتژمێر شەشی ئێوارە بەرەو ماڵ گەڕامەوە، بەلای گۆڕستانی ئۆپسالادا تێپەڕیم و یادی مردووەکانم کردەوەو نزای خێرم بۆ کردن. تاکو ماڵی کچەکەم لانیکەم یەک کاتژمێر بەپێ ڕۆیشتم، پلەی گەرما هەشت پلە ژێر سفر بوو. جادەکە باریکە، ڕێگای نییە ئۆتۆمبێل ڕووبەڕوو بێت. جادەکە پڕ لە بەفرە، لە بەشێکی زۆری ئەملاولای جادەکەدا هیچ خانوو و ئاوەدانییەک نییە. ئەگەر وڵاتی سویدو ئاسایشی ئەو وڵاتە نەبووایە، تووشی دڵەڕاوکێ دەبووم، گەیشتمە ماڵەوە. هوما هێشتا نەگەڕابووەوە، کچە خوێندکارە سویدییەکە لە ماڵەوە بوو، پەرداخێک شەربەتی چەوەندەرو گێزەرو پرتەقاڵی بۆ هێنام، ئەوە یەکەمجار بوو لە ژیانمدا شەربەتی لەو جۆرە بخۆمەوە، شەربەتی چەوەندەری سوورم تا ئەوکاتە نەخواردبووەوە، دیاربوو کە سویدییەکان شەربەتی چەوەندەری سور زۆر دەخۆنەوە.

هوما کاتژمێر حەوت گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، پێمگوت: بلیتم کڕیوەو ئوتێلیشم گرتووە. ئەویش بە ناڕەحەتییەوە گوتی: باوکە تۆ کەی دەست لەم سەرکێشییانەت هەڵدەگریت؟

بۆچی بەم کاتی زستانە تۆ دەچیت بۆ ئەو تاریکستان و سەهۆڵبەندانە؟ لانیکەم کە هەر دەچیت، لەکاتی هاویندا برۆ، ئەوکات ڕۆژەو دنیا ڕووناکە. منیش دەڵێم دەمەوێت لە شەوێکی تەواو تاریکی (٢٤) کاتژمێری لەوێ بم. کاتی گەشتەکەم (١٩ تا ٢٣) کانوونی دووەمە، بەم ئازاری پشتەمەوە کۆڵەپشت لەگەڵ خۆمدا ببەم یا جانتای تایەدار. لە مەشهەد هەندێک جلوبەرگی گەرمم کڕیوە، لەکۆتاییدا بڕیارمدا کۆڵەپشت لەگەڵ خۆم ببەم، چونکە ڕاکێشانی جانتای تایەدار بەناو بەفردا ئاسایی نییەو نارەحەتە. لەگەڵ هومادا دەچم بۆ ستۆکهۆڵم، ڕۆژی شەمە (٢٧-١٠-١٣٩٣/١٧-٢-٢٠١٥) بڕیارە دوو ڕۆژ لە ستۆکهۆڵم بمێنمەوە. خانم حەمیدەی نەژادی بانگێشتی ماڵی خۆیانی کردووم، بەیانی ڕۆژی دووشەممە دەبێت بەرەو ناوچەی لانگ یربابن برۆم. بردنی کۆڵەپشت هەڵەیەکی گەورە بوو. لە وێستگەی ڕێگای ئاسنی ستۆکهۆڵم خانم حەمیدەی نەژادی لەگەڵ هاوڕێیەکی بەناوی مەلیحەی دەرباری کە خەڵکی مەشهەد بوو، هاتن بۆ پێشوازیکردنم.

خانم مەلیحەی دەرباری ئەویش بۆخۆی چیرۆکێکی دوورودرێژی هەیە، ژنێکی هێمن و لەسەرخۆو خوێنگەرم، زیاتر لە بیست ساڵ دەبێت لە وڵاتی سوید دەژیان، بەڵام تائێستا یەک وشەی سویدی نازانێت. تەنانەت ناتوانێت چەند وشەیەکی ڕۆژانەش بەکاربهێنێت. ئەو لە کارگەیەکدا کاری بەرگدروی دەکرد، لەدوای چوار ساڵ کارکردن لەکاتی کاری درووماندا دەرزی مەکینەکە بەدەستیدا دەچێت و دەرزییەکە لەدەستیدا دەشکێت، هەر بەو هۆیەشەوە خانەنشین دەکرێت و مووچەی خانەنشینی وەردەگرێت. لە کەناری دەریاچەکەدا خانوویەکی جوانیان پێداوە، ئەو لەهەمان خانوودا دەژیا. دۆست و هاوڕێی هەبوو، بەڵام هیچ هەواڵێکی لە هاوسەرو منداڵ و ژیانی خانەوادەکەی نەبوو، هەروەکو چارەنووسی هەزاران ئێرانی دوورە وڵات. لە تەواوی جیهاندا هەر چارەنووسێک بۆ هەرکەسێک کە بەبیرتا بێت، لانیکەم ڕووبەڕووی چەند کەسێکی ئێرانی دەبیتەوە. من لە دارستانەکانی کۆنگۆ و شارە دوورە دەستەکانی بەڕازیل ڕووبەڕووی چەندین کەسی سەرکەوتوو و ناسەرکەوتووی ئێرانی بوومەتەوە، شۆڕش وەکو ئاگری بورکان هاوڵاتییانی بەهەموو لایەکی جیهاندا فڕێداوە.

لە سوید ژمارەیەکی زۆری ئێرانی هەیە، بەتایبەت کوردی ئێرانی. کوردە میهرەبانەکان کە حەز بە دۆستایەتی و تێکەڵاوی دەکەن، ژمارەیەکی زۆریشیان لە وڵاتی سوید دەژین و دەوڵەمەند بوون. لە کەناری بەندەری شاری ستۆکهۆڵم ئوتێلێک

هەیە خاوەنەکەی کوردە، من لەوێ ئەو پیاوە کوردەم بینی کە دەیویست بلیتی پاس بکڕێت، ئەو نەیدەزانی چۆن بلیتەکە بکڕێت، ژنێکی کورد بلیتەکەی بۆ کڕی. ئەو پیاوە زۆر پێداگری کرد تاکو ئەو ژنە پارەکەی لێوەربگرێتەوە، ژنە کوردەکە گوتی: پارە لە کورد وەرناگرمەوە، هەربۆیەش پارەکەی لێوەرنەگرتەوە. ئەو پیاوە تەمەنی نزیکەی (٣٥) ساڵ دەبوو، کەسێکی گورجوگۆڵ و دڵفراوان بوو، لە نەرویجەوە هاتبوو بۆ ستۆکهۆڵم. لە ڕژێمی جیهانی ئەمڕۆدا پارە هەموو شتێکە، ئەو ژنە کوردە دەیویست نیشانی بدات باوەڕی بە ڕژێمی ئابووری جیهانی نییە، دەیویست کەسایەتی مرۆڤانەو هاونیشتمانی خۆی نیشان بدات، دەیویست ڕێزی کەلتووری کوردانەی خۆی بگرێت.

لەماڵی حەمیدە خانم باسی گەشت و سەرکێشییەکانی من دەکرا، هەموو ئەوانەی لەوێ ئامادەبیان هەبوو بە ئینتەرنێت لە هەلومەرجی ئەو دوورگەیەیان دەکۆڵییەوە. هەموویان دەیانگوت: جلوبەرگەکانت بەکەڵکی ئەو شوێنە نایات. هوما دەیگوت: ئێستا کە هەر دەڕۆیت بۆ ئەو دەریای سەهۆڵبەندانە، لانیکەم بە پۆشتەیی برۆ. لەسەر قسەی هوماو حەمیدە خانم دەڕۆم بۆ کڕینی جلوبەرگ، زۆرلێکردنەکەیان بۆ من شتێکی باشبوو. کاتی عەسر لەگەڵ هوماو حەمیدە خانم و مەلیحە خانم ڕۆیشتین بۆ فرۆشگایەکی تایبەت بە جلوبەرگی ناوچە ساردەکان، جلوبەرگی گەرمی ژێرەوەم کڕی. لە مەشهەد لە فرۆشگایەک کە جلوبەرگی ناوچە ساردەکانی دەفرۆشت، جلی ژێرەوەم کڕیبوو، فرۆشیار گوتبووی: ئەم جلوبەرگە تاکو (٣٠) پلەی ژێر سفر بەرگەی سەرما دەگرێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەو جلوبەرگانەی ئەو بە منی فرۆشتبوو، بەرگەی ساردیی هەشت پلەی ژێر سفری ستۆکهۆڵمی نەدەگرت. خۆشم تێگەیشتبووم کە دەبێت جلوبەرگ بکڕم، دووقات جلی ژێرەوەو پانتۆڵ و چاکەتی تایبەت لەگەڵ جوتێک پێڵاوی سەهۆڵ شکێنم کڕی، پێڵاوێک کە هەم گەرم بوو، هەم فراوان و پڕ بەپێم بوو. لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو بزماری گەورەو بەهێزی پێوە بوو. هەندێک وردە شتی تریشم کڕی لە بابەتی کڵاو و ملپێچ. نزیکەی (٨،٥) ملیۆن تومەنم خەرجکرد. لە ئێرانیش بایی (٢،٥) ملێۆن تومەن پێویستییەکانم کڕیبوو. دوایی لە دوورگەی تاریک تێگەیشتم ئەگەر ئەو جل و پێڵاوەم نەکڕیبایە، دەبووایە هەر لە ئوتێلەکە بمێنمەوە، بەبێ ئەو کەلوپەلانە نەدەتوانرا لە ئوتێلەکە بڕۆمە دەرەوە. کۆڵەپشتەکەم زۆر گرانبوو، چۆن ئەو کۆڵەپشتە گرانە بدەم بە کۆڵمدا؟ لەکاتێکدا کە تازە پشتم نەشتەرگەریی بۆ کرابوو. نەشتەرگەرییەک

کە لەپشتمدا یەک برغو جێگیر کرابوو. دکتۆری ئێسک، دکتۆر محەمەد قەرەداغی لە مەشهەد فریشتەیەکەو خودا ناردوویەتی. سوپاس بۆ خودا نەشتەرگەرییەکی باشی بۆ ئەنجامداوم. هەرجارێک کە بمەوێت بڕۆم بۆلای ئەو دکتۆرە بەڕێزە دەبێت مۆڵەت لە ئەندازیاری بەڕێز عەلی ڕەزا قەرەداغی کوڕی وەربگرم. ئەندازیار عەلی ڕەزا قەرەداغی خوێنەرێکی باشی کتێبی شازادەی حەمامە.

دەبووایە شەو زوو بخەوم، بەیانی زوو فڕۆکەکە بەڕێدەکەوت. حەمیدە خانم گوتبووی خۆم دەتگەیەنمە فڕۆکەخانە، بەیانی کەمێک درەنگ بەڕێکەوتین. حەمیدە خانمیش ڕێگەکەی لێ تێکچوو دوای دە خولەک دووبارە هاتینەوە سەر جادەی سەرەکی. ماڵی حەمیدە خانم لە فڕۆکەخانەوە (٣٠) کم دووربوو، کاتژمێر (٧:٢٧) سواری فڕۆکە بووم. من دوایین کەس بووم کە سواربووم. ئەگەر تەنها سێ خولەک درەنگتر بگەیشتمایە، لەوەیە هەرگیز گەشتی ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوورم نەکردایە. دوای یەک کاتژمێر گەیشتینە ئۆسلۆ، هەموو جێگایەک بەفر داپۆشیبوو. لە فڕۆکە خانەی ئۆسلۆوە سواری فڕۆکەیەکی تر بووم کە دەچوو بۆ شاری ترمسۆ، لە فڕۆکەکەدا ویستم یادەوەرییەکانم بنووسمەوە، هەرچەندە فڕۆکەکە بەرەوپێش دەڕۆیشت، تیشکی خۆر کەمڕەنگتر دەبوو، فڕۆکەکە بەرەو کەنار دەڕۆیشت. زەوییەکە لەسەرەوە بەباشی دەبینرا، زەوییەکی بەرزونزم و نارێک بوو، هەمووشی بە بەفر داپۆشرابوو، دیاربوو بەفرەکە هەمووی ببووە سەهۆڵبەندان. دەوروبەری شاری ترمسۆ دارستان بوو، دارستانی ساردی جەمسەری باکوور. فڕۆکەکە (بیونگی ٧٣٧) بوو. لە فڕۆکەخانەی ترمسۆ دەبووایە هەموومان دابەزین، هەر لە فڕۆکەکەدا پێیانگوتین کەلوپەلەکانمان هەموو دابگرین و هیچ شتێک لە فڕۆکەکەدا جێنەهێڵین. ئەوکەسانەی دەیانویست بچن بۆ ترمسۆ، بەرەو دەرگای دەرچوون دەڕۆیشتن، ئەوانەشی بەرەو لانگ یرباین دەڕۆیشتن دەچوون بەرەو هۆڵەکە. لەوێ دوو پەنجەرە هەبوو، پۆلیس لەو پەنجەرانەوە پاسپۆرتەکانیان مۆردەکردن، من کەسی دووەم بووم لە یەکێک لە ڕیزەکاندا، پاسپۆرتەکەم نیشاندان. پۆلیسی فڕۆکەخانەکە هەرگیز پاسپۆرتی ئێرانی نەبینیبوو، دیاربوو هەرگیز هیچ کەسێک بە پاسپۆرتی ئێرانی نەچووبوو بۆ ئەو شارەو بۆ جەمسەری باکوور. دەبووایە سەرجەم (٧٦) کەس سواری فڕۆکە ببووینایە، ڕیزی تەنیشت من هەموو ڕۆیشتن، ئەو کەسەش کە لەدوای منەوە بوو چووە ڕیزەکەی

ترەوەو ئەویش ڕۆیشت. ئەو پۆلیسەی پاسپۆرتەکەی منی دەپشکنی بە تەلەفۆن دوو کەسی تری بانگکرد تاکو بێن بۆ هاوکاریکردنی. فرۆکەکە خەریک بوو هەڵدەستا، تەنها من مابووم سواربېم، پۆلیسەکان گوتیان: تۆ ناتوانیت بەم فرۆکەیە گەشت بکەیت. ڕۆژی دواتر فرۆکەی تر دەڕۆیشت بەرەو دوورگەکە، زۆرم قسە لەگەڵ کردن، بەڵام بێ سوود بوو. دەیانگوت: تۆ بۆچی دەتەوێت بچیت بۆ ئەو دوورگەیە. قسەکانم جێگای ڕەزامەندی ئەوان نەبوون. پاسپۆرتەکەم ڤیزای شنگنی پێوە بوو، شنگنی دوو ساڵەو دەیان مۆری گەشتکردنی لێدرابوو. پۆلیسی ترمسۆ ڕازی نەدەبوون. دەیانگوت: کەسێکی ئێرانی لەکاتی زستاندا بەناوی گەشتیارییەوە بۆچی دەچێت بۆ سەرزەمینی ورچەکان. ئاخر ئەگەر هەرکەسێک بچێت بۆ ئەو سەرزەمینە سەهۆڵبەندانەی وڵاتی نەرویج، نە وڵاتی نەرویج نە کاربەدەستانی ناوچەکە مافی ئەوەیان نییە لە دوورگەکە دەری بکەن. ئەگەر کەسێک گەیشتە ئەو سەرزەمینە سەهۆڵبەندانە دەتوانێت تاکو کۆتایی ژیانی لەوێ بمێنێتەوە. ئەو دوورگەیە یەکێکە لە چەقی مشتومڕەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا. بەشێکی دوورگەکە شاری (پیرامیدە) لەلایەن سۆڤیەتەوە داگیرکراوە، ئێستاش هەر لەژێر دەستی سۆڤیەتدایە. لەدوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت ئەو شارە چۆڵ کرا، لە ساڵی (٢٠١٤)دا تەنها حەوت کەس لەو شارەدا پاسەوانییان دەکرد، جگە لەوان هیچ کەسێکی تری تێدا نییە. شاری (پیرامید) لەوەیە ناوەندێکی گرنگی شوێنی پاراستنی ئەرشیفی سۆڤیەتەکان بووبێت. واتە پێش سەردەمی کۆمپیوتەر بەڵگە نهێنییەکانی سۆڤیەت لەو شارەدا پارێزراون. تۆش دەتوانیت لەڕووی ئینتەرنێتەوە بەشێکی ئەم شارە جوانە ببینیت، گوایە لە ساڵی (٢٠١٤)دا بەشێک لە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەت بوونیان هەبووە. بەلای شاری یربابینەوە پێنج بورجی گەورە بە تیرەی (٣٢تا٤٢) مەتر بوونیان هەیە. ئەو بورجانە ڕاداری جەمسەی زەوی و چالاکییە ئاسمانی و موشەکییەکانی سۆڤیەت کۆنترۆڵ دەکەن. زۆرباشە پۆلیسی نەرویج مافی خۆیەتی لەخۆی بپرسێت کەسێکی ئێرانی بەم کاتی سەرمایە بۆچی دەچێت بۆ سەرزەمینی تاریکی سەهۆڵبەندان. لەپشتی پەنجەرەکەوە چاوم لێبوو دارگای فرۆکەکە داخرابوو، پلیکانەکانیان لە فرۆکە دوورخستەوە، لەپڕێکدا شتێک هات بەبیرمدا. ناسنامەی مامۆستایی زانکۆی سۆربۆنم پێبوو، ناسنامەیەک کە بیست ساڵبوو دەرچووبوو، لەپڕێکدا گوتم پەلەمەکەن، پەلەمەکەن ناسنامەکەم نیشاندان. ناسنامەی ئەندامێتی ناوەندی لێکۆڵینەوەی زانستی فەڕەنسا (C

N. R .S)م نیشاندان، بەخێرایی تێمگەیاندن کە من ئەندامی ناوەندی لێکۆڵینەوەی زانستی فەرەنسام. بەبینینی ناسنامەی زانکۆی سۆربۆن، پۆلیسی فڕۆکەخانە بە تەلەفۆن فڕۆکەوانەکەی ئاگادارکردەوە بوەستێت. پلیکانەکانیان لە فڕۆکەکە نزیککردەوە، دەرگای فڕۆکەکە کرایەوە، پلیکانەکەیان هێنایەوە لای دەرگاکە. پۆلیس پاسپۆرتەکەی بۆ مۆر کردم، پۆلیسێکی ژن کۆڵەپشتەکەی بۆ هەڵگرتم تاکو لای فڕۆکەکە، بەردەوام دەیگوت: تکا دەکەم لێمان ببوورە پرۆفیسۆری بەڕێز. پاسپۆرتی ئێرانی پێویستی بە پاڵپشتییەک هەیە. کاتێک دەتەوێت بە پاسپۆرتی ولاتێک گەشت بکەیت کە لە هەموو لایەکەوە پروپاگەندەیەکی زۆری لەدژ دەکرێت، ڕوو بەڕووی ئەو کێشانەش دەبیتەوە. ناسنامەی مامۆستایم کە بیست ساڵبوو هیچ سودێکم لێ نەبینیبوو، لەو کاتەدا فریامکەوت. کاتژمێر (۲:۱۰) فڕۆکەکەمان کەوتە جوڵە. فڕۆکەکە ماوەیەک بەسەر زەویدا ڕۆیشت، لەماوەی یەک کاتژمێری وەستاندا باڵەکانی بوون بە سەهۆڵ. کەمتر لە نیوەی کورسییەکان پڕبوون. ژماردم تەنها (۷٦) کەس لەناو فڕۆکەکەدا بووین، گەشتیارەکانی تر لە ترمسۆ دابەزیبوون. کاتژمێر (۱۲:۲٥) فڕۆکەکە لە زەوییەوە بەرزبووەوە بەرەو ئاسمان. پردێکی درێژ لەسەر زەوی دوولای کەنداوێکی بچووکی بەیەکەوە دەبەستەوە. فڕۆکەخانەکە لە کەناری دەریاکە بوو، فڕۆکەکە بەرەوپێش دەڕۆیشت، خۆریش کەمرەنگ و کەمهێز دەبوو. تازە خەریکبوو عەقڵم دەکەوتەوە کار، لەخۆم دەپرسی بەندەی خودا بەم سەرمای زستانەو بەم تاریکییە تاکو تەنها بۆکوێ دەڕۆیت؟ بۆچی دەڕۆیت بۆ ئەو دوورگە دوورەدەستە؟ هوما ڕاستی دەگوت، لانیکەم هاوین بڕۆشتیتایە تاکو ڕۆژی (۲٤) کاتژمێری ببینیت. بەندەی خودا لەو بێپارەییەدا بۆچی دەڕۆیت بۆ ئەو گەشتە پڕخەرجییە؟ دەبووایە نزیکەی (۲۲) ملیۆن تومەن خەرج بکەم. کڕینی بلیت، جلوبەرگ، ئوتێل و خواردن و خۆراک بەگشتی هەمووی کردییە (۲۲،٥) ملیۆن تومەن. نرخی بلیتی فڕۆکە لە ستۆکهۆڵمەوە تاکو لانگ یربایین (۳۸۷٥) کرۆن، گرتنی ئوتێل بۆ ماوەی چوار شەو (۳۳٦۰) کرۆن. کڕینی جل و پێویستییەکانی تر لە مەشهەدو ستۆکهۆڵم بایی نزیکەی (۱۱) ملیۆن تومەن. بەندەی خودا تەواوی ئەو ماوەیە لە ستۆکهۆڵم لەلای کچەکەت دەمایتەوەو ئەو پارەیەشت دەدا بەو، خۆ ئەگەر میوانداریی خانم حەمیدەی نەژادی نەبووایە، دەبووایە لە ستۆکهۆڵم ئوتێل و خەرجی تریشم بدایە. ئەو ژنە کوردە میهرەبانە مەگەر دەهێڵێت کەسێک دەست ببات بۆ گیرفانی. ڕاستییەکەی خانم حەمیدەی

نەژاد لە فەرمانگەیەکدا کاردەکات (فەرمانگەی بێ سەرپەرشتان لە ستۆکهۆڵم)، لەو فەرمانگەیەدا بە تارا ناسراوە، تەنانەت ئەو دیاریشی بۆ منداڵەکانم کڕی و پێیدا ناردمەوە.

تەواو لە کاتژمێر (١٣:٠٥) گەیشتینە دەریای تاریکی، ئێستا دەمەوێت هەست بە جوگرافیاو جەمسەرو شەو و نیوەڕۆ بکەم. هەستی گەشتیارێک کە بە فڕۆکە گەشت دەکات لەکوێ و هەستی گەشتیارێک کە بە کەشتی چارۆکەدار گەشت دەکات بۆ جەمسەری بەستووی باکوور لەکوێ؟ لە سێ بەشی ناو فڕۆکەکە دوو بەشی بەتاڵبوو، ڕۆیشتم لە ڕیزی (٢٨) دانیشتم، هیچ کەسێکم لەلاوە نەبوو، یادی زۆر کەسم کردەوە، بەڵام نازانم چۆن بوو سەرەتا یادی مامۆستاکانم وەبیرهاتەوە. یادی ئەحمەد ئاغای دەبیری، عەلی و کوڕەکانی، ئەکبەرو سەکینە خانمی هاوسەری، کەسانێک کە پەنجا ساڵ دەبێت ئەوانم نەبینیوە، سێ کەس لەوانە کۆچی دواییان کردووە. یادی هاوڕێیانی سەردەمی لاوێتی و منداڵی، یادی هاوڕێیانێک کە ئێستا ژمارەیەکیان لەلام نین. لەدواییدا کاتژمێر نزیکەی سێی دوانیوەڕۆ بوو کە فڕۆکەکە لەسەر هێڵی سەهۆڵبەندانەکە وەستا. هێڵێک کە لەسەر زەوییە سەهۆڵاوییەکە دروستکرابوو. هێڵێکی جیاکەرەوە بۆ ئەوەی فڕۆکەکە لەکاتی نیشتنەوەدا هێڵێک لە چەند شوێنێکەوە بڕین و بڕگەی تێدابوو. هەروەکو کەلووی زنجیر. فڕۆکەکە بەدەنگ و جوڵەی تایبەت لەسەر هێڵەکە دەڕۆیشت. ئەگەر کەسێک نەزانێت فڕۆکە بۆچی بەو جۆرە دەڕوات، لە جۆری دەنگ و ڕۆیشتنەکەی دەترسێت. میوانداری فڕۆکەکە ئاگاداری بۆ گەشتیاران بڵاو دەکردەوە. وشەی ئاگاداری چەندجارێک دووبارە کردەوە. ئەو دەیگوت: هەوا لە دەرەوە (-٣٤) پلەیەو لەناو فڕۆکەکەشدا (٢٠) پلەیە. ئەو ئاگاداری بڵاودەکردەوە کە گەشتیاران ئاگاداری خۆیان بن، ئەو گۆڕانکارییی هەوایە بۆ گەشتیاران زیانی هەیە، دەرگای فڕۆکەکە کرایەوە. لە میواندار دەپرسم، دەبێت چی بکەم؟ ئەویش دەڵێت: کەمێک بوەستە تاکو پلەی گەرمی ناو فڕۆکەکە دێتە خوارەوە، جلی گەرم لەبەر بکەن و ئاگاداری چاوەکانتان بن. میواندار ڕایدەگەیەنێت دوای چەند خولەکێکی تر هەوا زۆرسارد دەبێت، کە لە پلیکانەکان دەڕۆنە خوارەوە ئاگاتان لەخۆتان بێت. فڕۆکەخانەی لانگ یرباین بچووکە، فڕۆکەخانەی شارێکی (٢١٠٠) کەسییە. ئیتر لە فڕۆکەوە دێمە خوارەوە، بایەکی بەهێز دێت، لەیەک کاتدا هەست دەکەم چوومەتە نێو فرێزەرەوە. فرمێسک بەچاوانمدا دێنە خوارەوە، فرمێسکەکان بەزوویی بەسەر گۆنامەوە دەبن بەسەهۆڵ، سەرماکەش بەجۆرێکە هەروەکو دەرزی بکەن بە گیانمدا.

لانیکەم سێ کەس لەپێش مندا لە فڕۆکەکە دابەزیبوون. ڕۆیشتن بەسەر پلیکانە ئاسنە سەهۆڵاوییەکاندا ترسناک بوو. گەیشتمە پلیکانەی خوارەوە، کەسێک لەپێش منەوە قاچی لە سەهۆڵەکە خزاو بە زەویدا کەوت، کارمەندەکان لە ئامادەباشیدان و بەخێرایی بڵندی دەکەن و دەچنە ژێر باڵییەوەو دەیبەن بەرەو هۆڵی فڕۆکەخانە.

ئەو چاکەتەی بۆ ئەو سەرماو سەهۆڵبەندانە کڕیبووم، هێشتا لەبەرم نەکردبوو، هەرچاکەتە ئاساییەکەم لەبەردا بوو. لەماوەی چەند خولەکێکدا سەرما کاری لە هەموو گیانم کرد، ددانەکانم کەوتنە لەرزە، نێوانی فڕۆکەکە تاکو هۆڵی فڕۆکەخانە تەنها سەد مەترە، لە کەشێکی ساردی (-٣٤) پلە لەگەڵ هەڵکردنی بایەکی بەهێز، هەموو ئەو سەد مەترە بەسە تاکو مرۆڤ لەقاچ بکەوێت. هیچ منداڵێک و هیچ کەسێکی بەتەمەن لە فڕۆکەکەدا نەبوو، وابزانم منی تەمەن (٦٧) ساڵ بەتەمەنترین کەسی ناو فڕۆکەکە بوو‌بێتم، بەگشتی ئەو دوورگەیە دوورگەی کەسانی بەتەمەن نییە. چەند چرکەیەک لە هۆڵی فڕۆکەخانە دەمێنمەوە، هەموو ئەو شتانەی کە پێمە هەر ئەوەیە لە کۆڵەپشتەکەمدایە، هەربۆیەش پێویست ناکات چاوەڕوانی باری ناو فڕۆکەکە بکەم. تەمەڵیم کردو ئەو چاکەتەی لە ستۆکهۆڵم کڕیبووم لە کۆڵە پشتەکەمدا دەرم نەکرد تاکو لەبەری بکەم. لەم کەژەی ساڵدا تاکە ڕێگەی پەیوەندی ئەم دوورگەیە بەشوێنەکانی ترەوە تەنها فڕۆکەیە، لەم کەژەی ساڵدا کە تاریکیی بەردەوامەو چەند مانگێک خۆر نابینرێت، کەشتییە گەشتیارییەکان و کەشتییە بارهەڵگرەکان ڕوو ناکەنە ئەو دوورگەیە، تاریکی و سەهۆڵبەندان ترسێکی گەورەن. هەر فڕۆکەیەک چەند بەرامبەری کێشی سەرنشینەکان بار هەڵدەگرێت، چونکە لە دوورگەکەدا جگە لە ماسی و خەڵوزی بەرد، هیچ شتێکی تر نییە، هەموو شتێک دەبێت بە فڕۆکە بێت بۆ ئەم شوێنە، تەنانەت لە هاوینیشدا یەک بزن لەو دوورگەیەدا بوونی نییە، جا چ بگات بە مانگاو گوێرەکە، تەنها ورچی بەستەڵەک و ئاژەڵە جەمسەرییەکانی تری لێدەژین. لە بەشێکی دوورگەکەدا گا کێوی هەیە، تەنانەت سەگیش مرۆڤەکان هێناویانە بۆ دوورگەکە. لە دوورگەکەدا سێ جۆر سەگ هەیە. سەگەکانی سیبریایی (سەگی ئەسکیمۆکان)، ئەوانەن کە گالیسکە ڕادەکێشن، سەگی تەزئینی و سەگی نێو ماڵ. لە دەرگای فڕۆکەخانە هاتمە دەرەوەی فڕۆکەخانەکە، تابلۆی جۆراوجۆرو ترس لە ورچی بەستەڵەک دەبینرێت.




لەدەرەوە پاسەکان چاوەڕوانی تاکو گەشتیاران بگوازنەوە بۆ ناوشار، شوفێری پاسەکە ژنێکی توندوتۆڵە بە جلوبەرگی ناوچەکەوە، کرێی پاس (١٠) کرۆنە. دەتوانیت ئەو پارەیە بە پارەی ئامادە بدەیت، یاخود بەکارت. هەر بۆدڵنیایی و کاتی پێویست جگە لە کارتی دابینکردنی پارە، هەندێک پارەی ترم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، کە پێم خستە ناو پاسەکەوە ئینجا وەبیرم هاتەوە کە لە دورگەکەدا ئاسایش هەیە. دوای ماوەیەکی کەم پاسەکە لە شەقامێکی پڕ بەفر دایبەزاندم کە تەنها سەد مەتر دووربوو لە ئوتێل سوالباردە. شۆفێرەکە تابلۆی ئوتێلەکەی نیشاندام. هیچ گیانلەبەرێک لە سەقامەکەدا نەدەبینرا، بارستایی بەفرەکە ڕێگەی نەدەدا پاسەکە لە ئوتێلەکە نزیک ببێتەوە. کۆڵەپشتم بەکۆڵەوە بوو، هێواش هێواش دەڕۆیشتم، پێڵاوەکانم نەگۆڕیبوو، ئەو پۆتینانەی لە یەزد کڕیبووم هەر ئەوانەم لەپێدا بوو، هەرچەندە بەوریاییەوە دەڕۆیشتم، بەڵام چەندجارێک لەسەر بەفرەکە خزیم، بۆئەوەی نەخزێم و تووشی کێشەیەک نەبم، هەوڵم دەدا قاچەکانم لەسەر بەفرەکە دابنێم، نەک لەسەر سەهۆڵەکە. جادەکە باریک بوو، بەفر تاکو پشت ئەژنۆم دەهات، هەوا سارد بوو، بایەکی بەهێزی دەهات. کاتژمێر (١٥:٤٠) بوو، تابلۆی ئوتێلەکە پلەی گەرمی (-٣٢)ی نیشاندا. هەروەکو ئەوە وابوو لە فرێزەردا بم، هەرچەندە فرێزەری ماڵان بە پلەی (-١٨) کاردەکەن. ساردی هەوا لەلایەک و ئەو بایە بەهێزەش کە بەفرەکەی هەڵدەگرت و بەدەموچاومیدا دەدا، لەلایەک.

میوانداری ئوتێلەکە خانمێکی دانیمارکی بوو، ڕۆژی دواتر لەوم پرسی بۆچی هاتووە بۆ ئەم دوورگەیە. لەوەڵامدا گوتی: مووچەیەکی باشم پێدەدەن. گوتم: تەنها لەبەر خاتری پارە هاتوویت بۆ ئەم تاریکستانە. لەوەڵامدا گوتی: بەڵێ، تەنها لەبەر خاتری پارە. ژنێکی جوان بوو، تەمەنی (٣٢) ساڵ دەبوو، لەدڵەوە ستایشی ئەوم کرد کە بۆ بەدەستهێنانی پاروونانێکی حەلاڵ و لەڕێگایەکی ڕاستەوە هاتووە بۆ ئەم شوێنە تاریک و سەختە، ئەو میواندارە دانیمارکییە گوتی: کاتژمێر (١٦:٣٠) ئێمە گەشتێک دەکەین بەدەوری شارداو لەبەردەمی هوتێلەکەوە بەڕێدەکەوین، منیش بەڵێنم دا بچم لەگەڵیاندا. خەریکبووم ناوم دەنووسی بۆ ئەو گەشتە، لەوکاتەدا ژن و پیاوێکی ئیسپانی هاتن ئەوانیش ناوی خۆیان نووسی بۆ گەشتەکە، دواییش لەگەڵ ئەواندا بووین بە ئاشنا. کرێکاری ئوتێلەکە (فلیپینی) بوو، کۆڵەپشتەکەی هەڵگرتم، میواندار کۆدی قفڵی ژوورەکەی پێدام، چوومە ژوورەکەمەوە ژوورێکی گەرم و جوان و ڕازاوە بوو، لە پلەیەکی گەرمی جێگیردا، هەستم بە سەرمای دەرەوە نەدەکرد.

کاتژمێر (١٦:٣٠) ئوتۆمبێلێکی بێنز بە شۆفێرێکی تایبەتەوە لە دووری (٣٠) مەتر لە ئوتێلەکەوە چاوەڕوانمان بوو، هەوا زۆر ساردبوو، ئێمە تەنها چوار کەس بووین لە ئوتۆمبێلەکەدا، من و ژن و پیاوێکی ئیسپانی (لوئیس و هاوسەرەکەی) و خانمێکی دانیمارکی.

شۆفێرەکە ئەرکی ڕێنماییکردنی گەشتەکەی لەئەستۆ گرتبوو، لە شوێنی دەرچوونمانەوە ئامانجی گەشتەکەی دیاریکرد. سێ کاتژمێر بەیەکەوە بووین، یەکەمین شت کە سەرنجی ڕاکێشام ئەو تفەنگە بوو بەدەستی شۆفێرەکەوە. ترس لە ورچی بەستەڵەکی باکوور، بەتایبەت لە دەرەوەی شار ترسێکی قوڵە، بەڵام تەنها لەکاتێکدا دەتوانێت تەقە لە ورچەکان بکەن کە گیانی کەسێک بخەنە مەترسییەوە، خۆ ئەگەر دەربکەوێت کەسێک بەئانقەست ورچێکی کوشتووە، دۆسیەیەکی تاوانی بۆ دەکرێتەوەو دەینێرن بۆ ترمسۆو لەوەیە چەند ساڵێک زیندانی بکرێت. کەوتینەڕێ، باوبۆران زۆر بەهێزبوو، دوولای جادەکە بەفرو سەهۆڵ بوو، تابلۆکانی قەراخ جادەکە بەڕووناکی ئوتۆمبێلەکە دەدرەوشانەوە، یەکەمین شوێن کە دەبووایە سەردانی بکەین، بانکی بۆماوەزانی گیاییە.

چوونەژوورەوە بۆ ئەو بانکە قەدەغەیە، کۆشکی بانکەکە لە دامێنی چیایەک دروستکرابوو. کاتێک لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزین، تاڕادەیەک هەستمان بە مانای بای بەستەڵەکی باکوور کرد، بایەک هەروەکو قامچییەکی تیژ لە ڕوخساری دەدام، لەو تاریکی و تۆفانەدا تەنها بێتوانایی مرۆڤەکان لە بەرامبەر سرووشتدا هەستپێدەکرا، بەڕاستی هەستم بەمانای گەورەیی سرووشت و بێهێزبوونی مرۆڤەکان لە بەرامبەر یەکتریدا کرد. نزیکەی دوانزە ملیۆن تومەنم بۆ کڕینی جلوبەرگی زستانە خەرجکردبوو، بەڵام هەستمکرد ئەو جلوبەرگانە لانی هەرەزۆر دەتوانن (٢٠) خولەک من بپارێزن لە بەرامبەر ئەو تۆفانە بەگوڕو خرۆشەی بەستەڵەکی باکوور. ئۆتۆمبێلەکەمان سازو توندوتۆڵ بوو. پلەی گەرمای دەرەوەی نیشاندەدا کە (-٣٥) پلە بوو. بەخێرایی سواربووینەوە. لوئیس ڕوویکردە من و گوتی: من و هاوسەرەکەم بەم گەشتە گەمژەیی خۆمان تاقیکردۆتەوە، بەم بارودۆخە سەختە، تاریکەو ترسی ورچ و سەرمابوونێکی زۆر، خەرجییەکی زۆر، هیچمان نەکرد جگە لە گەمژەیی. لوئیس و هاوسەرەکەی هەردووکیان ئەندازیاری تەلەفۆنات بوون، پیاوەکە هاوتەمەنی من بوو، تازە خانەنشین کرابوو، بەڵام هاوسەرەکەی هێشتا کارمەند بوو، مۆڵەتی وەرگرتبوو تاکو لەگەڵ لوئیسدا بێت بۆ گەشتی جەمسەری بەستەڵەکی باکوور. منیش پێمگوتن: خراپ بیر مەکەنەوە ئێمە ویست و خۆڕاگریی خۆمان تاقیدەکەینەوە، ئەم قسەیەم پەیوەندی هاوڕێیەتی ئێمەی بەهێزتر کرد، دوای دوو مانگ لەو گەشتە لوئیس و هاوسەرەکەی لە مەشهەد میوانی من بوون. سەردانی مۆزەخانەی مەشهەدو بورجی ڕادکان و تەربەقەو شاندیزیان کرد. گەشتکردن، واتە پەرەپێدانی ئاشتی و خۆشەویستی، گەشتکردن، واتە کەسێکی ئێرانی و کەسێکی ئیسپانی لە جەمسەری بەستەڵەکی باکوور دەبن بە هاوڕێی یەکتری، دەبنە هاوڕێ و دووبارە لە مەزاری ئیمام ڕەزای مەشهەد یەکتری دەبیننەوە.

شۆفێرەکە گوتی: ئێوە دەبەم بۆ شوێنی جێگیرکردنی ڕادارەکان، ئەو جادەی کێوەکەی گرتەبەر، دەیویست بمانبات بۆ سەر شاخەکە. بەهیچ جۆرێک دەرەوەمان نەدەبینی، تاریکی هەموو لایەکی گرتبووەوە، تاریکییەکی تاریکتر لە شەوێکی تاریکی ئاسایی. جادەکە پێچاو پێچ بوو، ترسی هەڵدێران هەبوو، بەڵام شۆفێرەکە شارەزا بوو. لانیکەم (٤) مەتر بەفر بەسەریەکدا کەوتبوو، بەفرێک کە لەسەر سەهۆڵ کەوتبوو، لەکۆتاییدا بە دڵەڕاوکەیەکی زۆرەوە گەیشتینە سەر شاخەکە، پێنج بورجی ڕادار بە

تیرەی ( ٣٢-٤٢) مەتر لەوێ هەبوون، بەڵام بەهۆی تاریکییەوە شتێکی تر نەدەبینرا. ئێمە دەبووایە لەو تاریکییەدا تەنها گوێ لە قسەکانی شۆفێرەکە بگرین و لە قسەی ئەو دەرنەچین. لەپڕدا بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی ئەم شۆفێرە ئێمەی هێناوە بۆ ئەم چۆڵەوانییە؟ بەڵام ڕووناکی لایتی ئۆتۆمبێلەکەمان لە پایەی یەکێک لە بورجەکانی دا. بیرم لە قسەکانی لوئیس دەکردەوە، لەوەیە قسەی ئەو بێت، ئێمە گەمژەیی خۆمان تاقیدەکردەوە. شۆفێرەکە گوتی: دادەبـەزن، خانمە دانیمارکییەکە لە ئۆتۆمبێلەکە دانەبەزی، کاتێک هۆی دانەبەزینیم لێپرسی، دەستیکرد بەپێکەنین و گوتی: ئێوە کە دابەزین، چیتان بینی. گوتم هەستمان بە سەرماو ترس و تاریکی کرد، هەستمان بەشتێک کرد کە بۆ هەستپێکردنی هاتووین بۆ ئێرە. چاوەکانی کردەوەو گوتی: گەشتی ترس، ئەو خانمە گەنج بوو تەمەنی نزیکەی (٢٨) ساڵ دەبوو. بەهێزو وەرزشکار بوو، جلوبەرگی گەرمی لەبەرکردبوو، بەڵام من لە شتێکی تر دەترسام، ئەگەر منیان لەلای ئەو ڕادارە دەستگیربکردایە، دەبووایە بڵێم چی؟ وڵاتەکەم لەگەڵ وڵاتی خاوەنی ئەو بورجانە لەکێشەدایە، لەوانە بەتاوانی بێبنەما زیندانی بکرێم. لەوێدا بیرم کردەوە کاتێک پۆلیسی ترمسۆ مۆڵەتیان پێنەدەدام بێم بۆ ئەو دوورگەیە، لەوەیە لەبەر پارێزگاریی بورجەکان بووبێت. ئۆتۆمبێلەکە دەیویست بەدەوری پایەی بورجەکەدا بسووڕێتەوە، بەهۆی ڕووناکی لایتی ئۆتۆمبێلەکە کۆشکێکی گەورەمان بینی، دیاربوو لە کۆشکەکەدا کەسانێک هەبوون. بە شۆفێرەکەم گوت: ئایا دەتوانم لەگەڵ کارمەندانی ئەو کۆشکە قسەبکەم؟ گوتی: دەبێت بپرسین. بە ئۆتۆمبێلەوە ڕۆیشت بۆلای کۆشکەکە. شۆفێرەکە دابەزی و بەو تەلەفۆنەی لەپشت دەرگاکەوە بوو، قسەی کرد، دوای چەند چرکەیەک ئاماژەیەکی کرد، کە دەتوانین بچینە ژوورەوە. من لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم، بۆ چوونە ژوورەوەی ناو کۆشکەکە دەبووایە لە چەند دەرگایەکەوە تێپەڕم. دەرگای یەکەمم کردەوە، کاتێک دەرگاکە داخرایەوە، دەرگای دووەم کرایەوە، کاتێک دەرگای دووەم داخرایەوە دەرگای سێیەم کرایەوە. من و شۆفێرەکە چووینە ناو کۆشکەکەوە. نازانم داخرانەوەی دەرگاکان بۆ پارێزگاریکردن بوو، یان بۆ بەرگرتن بوو لەسەرما. پیاوێکی میان ساڵ خۆی پێ ناساندین بەناوی فیگارد کیمنتز (VEGARD KEMNITS) ئەو ئەندازیاری تەلەفۆن بوو، چەند پرسیارێکی سادەم لێکرد. لەوەڵامدا گوتی: تۆی ئێرانی چی دەکەیت لێرە: گوتم: ئەگەر بەردەوام بم لە پرسیارەکانم لەوانەیە گومانێکم لێ بکەن،

ئاخر لەکوێی ئەم جیهانەدا دەگونجێت کەسێکی خەڵکی وڵاتێکی تر، بەڵکو کەسێکی ئێرانی بچێتە ناو کۆشکی دەمەزراوەیەکی تەکنۆلۆژایی ئاسایشی. بە ئەندازیارەکەم گوت: پرسیارێکی زۆرم هەیە، بەڵام هاورێکانم لەدەرەوە چاوەڕوانم دەکەن، ئومێدەوارم لەکاتێکی تردا بتوانم شتێک لەبارەی کاری بورجەکانی جەمسەری باکوور بزانم. گوتی: تۆ تاکو کەی لەم دوورگەیە دەمێنیتەوە. گوتم: تاکو چوار ڕۆژی تر. گوتی: من دوانزە کاتژمێر لێرە کاردەکەم و (٤٨) کاتژمێر پشوو دەدەم. سبەی دوای نیوەڕۆ لە کافتریای (FRUENE KAFFE BAC) دەتوانم بتبینم و وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە. خەریکبوو ترسم دەشکا، بەڵام سبەی کاتێک ویستم بڕۆم بۆ کافتریاکە لەدڵی خۆمدا گوتم: نەکا ئەمە داوێک بێت و دەستگیرم بکەن و لێم بپرسن بۆچی دەتەوێت زانیاریت هەبێت لەسەر ئەو بورجانە؟ دەزانیت من بەگشتی دوانزە ساڵ لە فەرەنسا ژیاوم، دەتوانم بڵێم یەک ساڵ و نیویش لە ئەڵمانیا ژیاوم. ئێستا گەشتی چەند ڕۆژەو چەند مانگە بۆ وڵاتانی تر بەجێگای خۆی، هەرکاتێک فەرەنسیانە بیردەکەمەوە، هیچ ترسێکم لە گرتن و لێکۆڵینەوە نییە، بەڵام هەرکاتێک وا بیردەکەمەوە من کەسێکی ئێرانیم لە هەموو شتێک دەترسم. ئایا من دەتوانم لە وڵاتەکەی خۆم بە ئازادی بچم لە ڕادارەکانی وڵاتی خۆم بکۆڵمەوە، دیارە وەڵامەکە بە نەخێرە. ئایا من دەتوانم لەگەڵ ئەندازیارێکی لێپرسراودا، یان لەگەڵ کارمەندێکی پاسەوانی بورجێکی گەورە کە ئاسمان کۆنترۆڵ دەکات، بچم لێی بپرسم کە ئەم بورجانە بۆچین و یان بڵێم ئێوە چ کارێک دەکەن، دیارە نەخێر. کەواتە مافی ئەوەم هەیە بترسم، لەناخی خۆمدا بترسم. ترس و دووربینی بەسەر هەموو گیانمدا زاڵە. یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرنەکەوتن ترسە. ترس ڕێگرە لەبەردەم داهێنان و نوێکاریی.

ئەندازیار (کرۆک) ئالیارەکەی ڕاکێشا، تاکو من باشتر هەست بە کارکردنی بورجەکان بکەم. بەپەلە هەندێک ڕوونکردنەوەی لەبارەی کارکردنی بورجەکانەوە بۆدام. کەلوی گەورەترین بورج (٤٢) مەترو بچووکترینیشیان (٣٢) مەترە. دوایی وا ڕێکەوتین کە یەکتری ببینین، ویستم بەزوویی لەژوورەکە بڕۆمە دەرەوە، بەڵام ئەندازیارو شۆفێرەکە گوتیان ناتوانین بەزوویی بڕۆینە دەرەوە، هەرکەسێک دەتوانێت بەخێرایی بێتە ژوورەوە، بەڵام ناتوانێت بەخێرایی بڕواتە دەرەوە. هۆیەکەیم لێپرسین. گوتیان هۆکەی جیاوازی پلەی گەرمییە. پلەی گەرمی لە ژوورەوە (٢٠) پلە بوو، بەڵام

لە دەرەوە (-٣٥) بوو، جیاوازی پلەی گەرمی دەرەوەو ناوەوە (٥٥) پلە بوو. سەرەتا لەناوەوە دەرگای یەکەمم کردەوەو چوومە هۆڵەکەوە. کەوتمە نێوان دەرگای یەکەم و دەرگای دووەم. ئینجا دەبووایە لانیکەم چوار خولەک چاوەڕوان بکەین تاکو دەرگاکە دەکرێتەوە. لە نێوان چوار مەتری چوارگۆشە دوو دەرگا هەبوو، پلەی گەرمی لە (٢٠) پلەوە بوو بە (٧) پلە، دوای چوار خولەکی تر دەرگای دووەم کرایەوە. لەوشوێنەدا پلەی گەرمی گەیشتە (-٢٠) پلە دوایی دەرگای سێیەم، یان دەرگای دەرەوە (دەرگای یەکەم لەدەرەوە) کرایەوە، منیش گەیشتمە پلەی (-٣٥)، لانیکەم هاوڕێیانم لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا (١٥) خولەک ماتەڵ کردبوون. داوای لێبووردنم لە هەموویان کرد. خانمی دانیمارکی گوتی: تەنها داوای لێبووردن بەس نییە، هەربۆیە هەموویانم بۆ خواردنەوەی قاوە برد بۆ کافتریا، ئەو بانگهێشتنە ئاشنایەتییەکەمانی بەهێزتر کرد.

لە کێوەکەوە سەرەوخواربووینەوە، هەستمکرد شۆفێرە بەئەزموونەکەمان دووچاری دڵەڕاوکێ بووە، هەرچۆنێک بوو لە کێوەکە هاتینە خوارەوە. پلەی گەرمی چوار پلە کەمیکرد. لە خوارەوەی کێوەکە پلەی گەرمی (-٣١) پلە بوو، واتە گەرمیپێوی ناو ئۆتۆمبێلەکە. پلەی گەرمی دەرەوەی (-٣١) پلە نیشاندەدا. هێزی باکە کەمیکردبوو. دوای چەند کیلۆمەترێک شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە، ئۆتۆمبێلەکەی لەسەر جادەکە ڕاگرت و لایتەکانی ڕۆشن. ڕووناکیی لایتەکان زۆر بەهێزبوون، ناوچەکە فراوان بوو، سەدان و بەڵکو هەزاران عەمود بەدیدەکران، ئەو عەمودانە بەشێوەیەکی ڕێک لە زەوی چەقێنرابوون. شۆفێرەکە گوتی: ئێرە شوێنێکی گرنگی کۆنترۆڵکردنی گازی ئۆزۆنە. لوئیس و هاوسەرەکەی کە هەردووکیان ئەندازیاری تەلەفۆنات بوون. گوتیان ئەوە شوێنێکی گرنگی پرۆژەی (هارپە). خەفەتم خوارد کە بۆچی لەکاتی ڕووناکیدا نەهاتووم، ئەگەر خودا مۆڵەتم بدات و پارەی تەواوم هەبێت، جارێکیتر لەکاتی ڕۆژدا گەشت دەکەمەوە بۆ ئەو ناوچەیە.

ئێستا گەیشتووینەتە دەشتایی و ترسی هەڵدێرانم لە کێوەکە نەماوە. لە شۆفێرەکە دەپرسم ئایا لەم دوورگەیەدا کەسانی ئێرانی هەیە؟ دەڵێت: بەڵێ و ماڵەکەشیان پێدەزانێت. گوتم: دڵنیایت کە ئەوان ئێرانین، گوتی: بەڵێ، سێ کەس هەن لێرە هەرسێکیان برای یەکترین، ئەوان ساڵی پێشووتر ماڵی شۆفێرەکەیان بۆیاخکردبوو، کاری بیناسازییان دەکرد. خۆشحاڵبووم کە چەند ئێرانییەکم دۆزییەوە، لەخۆم دەپرسم، بۆچی ئەو

ئێرانیانە لێرەو لەنێو ئەو فریزەرە سرووشتییەدا دەژین؟. تاکو ساڵی (٢٠٠٨) هاتن بۆ ئەم دوورگەیە پێویستی بە پاسپۆرت و ڤیزە نەبوو، بەڵام لەدوای ساڵی (٢٠٠٨) هاتن و ڕۆیشتن بەبێ پاسپۆرت نەدەبوو. پاسپۆرتەکانیان لە ترمسۆ مۆردەکرد، بەڵام هەرکەسێک دەهاتە دوورگەکەوە دەیتوانی تا ئەوکاتەی پێیخۆشە، بمێنێتەوە. کاتژمێر (٨:٣٠)ی دوانیوەڕۆ لە بەردەمی ئوتێلەکە سێ هاوگەشتەکەم دابەزین. شۆفیرەکە منی برد بۆ بەردەمی کۆشکێک لە دەرەوەی شار، پێمدەڵێت: لێرە بوەستە تاکو هاوڵاتییەکانت بانگدەکەم، لە ئۆتۆمبێلەکە دادەبەزێت و دەچێت بۆ کۆشکەکە. دوای دە خولەک شۆفێرەکە دەگەڕێتەوەو دەڵێت پاسەوانەکە گوتوویەتی ئێرانییەکان لە دوورگەکە ڕۆیشتوون، بەڵام لەوەیە ڕاست نەکات. لێی دەپرسم ئێرانی تر لە دوورگەکە دەناسیت، دەڵێت: نەخێر.

دەگەڕێمەوە بۆ ئوتێلەکە لەجێگای میواندارە دانیمارکییەکە خانمێکی تری سویدی دانیشتووە، کاتژمێر شەشی دوانیوەڕۆ پاسەوانەکان دەگۆڕدرێن. لە ئوتێلەکەدا چایەک دەخۆمەوە، پاسەوانە تازەکە خانمێکی سویدییە، ئەویش بۆ کارو داهاتێک هاتووە بۆ ئەو دوورگەیە. ئەویش گەنجەو تەمەنی (٣٤) ساڵ دەبێت. کەسێکی گورجوگۆڵە، بەباشی بە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی قسەدەکات، لێی دەپرسم ئایا کەسێکی ئێرانی لەم دوورگەیە دەناسیت؟ گوتی: نەخێر، هیچ کەسێک ناناسم. لەبارەی ژیانی دوورگەکەوە پرسیاری لێدەکەم، دەڵێت: لەم دوورگەیەدا پۆلیس نییە. چەند کارمەندێکی شارەوانی ئەرکی پۆلیس لەئەستۆ دەگرن. ئەگەر کەسێک لێرە تاوانێک ئەنجام بدات، سواری فڕۆکەی دەکەن و دەینێرن بۆ ترمسۆ، لەناو خاکی نەرویج. لەم دوورگەیەدا بنکەی پۆلیس و زیندان نییە، بەگشتی لێرەدا کەسانی تاوانبار بوونیان نییە، لەم دوورگەیەدا بەدڕەوشتی نییە. کارمەندانی ئوتێل دانیمارکی و سویدی و نەرویجین، بەڵام کرێکارەکان هەموویان فلیپینین، هەمووشیان بۆ پەیداکردنی پارە هاتوون بۆ ئەم دوورگەیە. تاکو دەیەی (١٩٧٠) تەنها پیاوان لەم دوورگەیەدا دەژیان، ژن و منداڵ زۆر بەکەمی لێرە هەبوون. لە (١٩٧٠) بەدواوە لەگەڵ دەستپێکردنی لێکۆڵینەوەکان و دامەزراندنی زانکۆو پەرەپێدانی پیشەسازی، ژن و منداڵیش ڕوویانکردە ئێرە. کاتژمێر حەوتی دوانیوەڕۆیە. من ماندووم و دەڕۆم بۆ ژوورەکەی خۆم.

کاتژمێر (٩) لە ئوتێلەکە دێمە دەرەوە، کەشوهەوا باشترە، باو بەفربارین نییە، دەمەوێت لە ئوتێلەکە بڕۆمە دەرەوە. میواندار (هەمان خانمی سویدی) لەترسی ورچی

جەمسەری باکوور ئاگادارم دەکاتەوە. دەڵێت: دوکانەکان و فەرمانگەکان داخراون، تەنها چەند کافتریایەک کراوەن، لەم کاتەدا ورچەکان ئاسانتر دێنە ناو شارەوە. منیش دەڵێم لێرە ورچ ئەوەندە مەترسیدارە. ئەویش دەڵێت: ورچەکان نایەنە ناو شارەوە، بەڵام هەندێکجار ڕێدەکەوێت دێنە ناو شارەوە. پێمدەڵێت: ئەگەر ورچت لێپەیدابوو، دەبێت بەبێ جوڵە بوەستیت. خۆ ئەگەر بێ جوڵە بوەستیت، لەسەدا پەنجا ئومێدی زیندووبونت هەیە. هیچ کەسێک ناتوانێت ڕوو بە ڕووی ئەم ئاژەڵە زل و دڕندەیە ببێتەوە، ورچ لەنێو بەفردا زۆر بەخێرایی ڕادەکات، لەسەر دووقاچ دەوەستێت و تەنها یەکجار لێی دەدات، لێدانێک کە کەسەکە دەکوژێت. دەڵێت لە ساڵی ڕابـردوودا ورچەکان پێنج کەسیان کوشتووە. ئەو گەشتیارانە دووچاری مەرگ دەبنەوە کە ئامۆژگارییەکان لەگوێ ناگرن. لوئیس و هاوسەرەکەشی دێن بۆ لامان، گەشتیارێکی تریش لە هۆڵەکە وەستاوە ئەو خەڵکی یابانە، هەموومان بەیەکەوە بەرەو شەقامە سەهۆڵبەندانەکە دەڕۆین، دوکانێکی فرۆشتنی خواردەمەنی لەوێ هەیە، دەمەوێت بچم بەشی خۆم خواردەمەنی بکڕم. دوای کڕین دەڕۆم بۆ کافتریا، لە خاوەنی کافتریاکە دەپرسم ئایا هیچ کەسێکی ئێرانی لەم شارەدا هەیە؟ دەڵێت: نەخێر نییە، بەڵام یەک کەسی کورد لە کافتریای (FRUENE) کار دەکات، لەوەیە ئەو بزانێت خەڵکی ئێرانی لێرە هەیە، یان نا. دوایی لەوە تێگەیشتم کە خەڵکی دوورگەکە جیاوازی دەکەن لەنێوان کوردو ئێرانیدا. دەڕۆم بۆ ئەو کافتریایەی کە هاوڕێکانمی لێیە، دەچمە ژوورەوە، ئەوان لەپشت مێزەکەوە دانیشتوون و داوای قاوەیان کردووە، منیش دەچمە لای ئەوانەوە.

ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ شارەوانی، بەستەیەک زەعفەرانم بردبوو بۆ سەرۆکی شارەوانی کە ژنێک بوو، لەو ژنـەش دەپرسم، ئایا هیچ کەسێکی ئێرانی لە شاری لانگ یربāین، یان لەم دوورگەیەدا هەیە؟ ئەو خانمە دەڵێت: کەسێکی کوردی ئێرانی لە کافتریایی (FRUENE) کار دەکات. لە شارەوانییەوە دەڕۆم بۆ زانکۆ. زانکۆکە زۆر جوان و ڕێکوپێکە، تاکو کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆ لە زانکۆ دەمێنمەوە، نانی نیوەڕۆش لە ڕێستۆرانتی زانکۆ دەخۆم. لەگەڵ ژمارەیەک لە خوێندکاران و مامۆستایان قسە دەکەم، کەسانێک کە لە (٤٢) وڵاتەوە هاتوون لەم دوورگەیەدا دەژین. واتە ئەو (٢٥٠٠) کەسەی لە دوورگەکەدا دەژین، خەڵکی (٤٢) وڵاتن. ژمارەی خوێندکارەکان نزیکەی (١٦٠) کەس دەبن، کۆشکەکانی شار بەبڵاوی دروستکراون. زانکۆ کەوتۆتە کۆتایی باکووری شار.

بەهۆشیارییەوە بەپشتی کۆشکەکانی زانکۆدا دەڕۆم و دەمەوێت بڕۆمە سەر جادەکە. لە قەراخ جادەکەدا تا پشتێنەم بەفرە، مردن بەچاوی خۆم دەبینم، هەوڵ و تەکانخواردن هیچ سوودێکی نییە، هیچ زیندەوەرێک لەو ناوە نییە، بەفرەکە هەروەکو زەلکاو وایە هەرچەند هەوڵدەدەم خۆمی لێ ڕزگار بکەم، بەڵام زیاتر تێی دەکەوم. بەبێ جوڵە دەوەستم و بیرێک بەمێشکمدا دێت، لایتەکەم دەردەکەم و ڕووناکییەکەی ڕوودەکەمە پەنجەرەیەکی گەورەی زانکۆ، بەردەوام لایتەکەم هەڵدەکەم و دەیکوژێنمەوە، دووریم تاکو پەنجەرەکە حەفتا مەتر دەبێت. دوای دە خولەک هەستدەکەم، چەند کەسێک سەرنجم دەدەن. ڕووناکییەک ڕووی تێکردم، خەیاڵم ئاسودە بوو، هەستدەکەم ڕزگارم بووە. دوای چەند خولەکێک چەند خوێندکارێک بە چەند پارچە حەبلێکەوە دەگەنە لام و لە بەفرەکە دەرم دەکەن. پێمدەڵێن دەبوو بەسەر جادەکەدا بڕۆیشتیتایە، چونکە بەفری سەر جادەکە دەکوترێتەوەو دەبێت بە سەهۆڵ، بەڵام بەفری قەراغ جادەکە بەردەوام بەرز دەبێتەوە. جادەکان چەند مەترێک لە شۆستەی جادەکە بەرزترە. ئەگەر بەرزتر نەبێت لەکاتی گەرمادا جادەکە ژێرئاو دەکەوێت.

من دەبەنەوە بۆ زانکۆ، بە خواردنەوەی چایەکی گەرم باری دەروونیم باشتر دەبێت. زانیم کە نەدەبووایە هەر لەخۆمەوە مل بنێم و بڕۆم، ترسی چاڵە بەفرەکان لەترسی ورچ کەمتر نییە، ئەگەر ئەو لایتەم لا نەبووایە، دیار نەبوو چیم بەسەر دەهات. دەبووایە ئەو نامیلکەیەی لە ئوتێلەکە پێیان دابووم، باشتر سەرنجم بدایە، لە نامیلکەکەدا زۆر بەجوانی ئاماژە درابوو بەمەترسی چاڵە بەفرییەکان. ڕۆژی سێیەم کەشوهەوا کەمێک باشتر ببوو. هەوا (٢٠) پلە گەرمتر ببوو. سەرێکم لە خانەی منداڵانی دوورگەکە دا، منداڵەکان لەناو سەهۆڵ و لە هەوایەکی ساردی (-١٤) پلە یارییان دەکرد، (٢٨٠) منداڵ خەڵکی (٢١) وڵات بوون. فێرکردنی ئەم منداڵانە زۆر دژوار بوو، بەڵام ئاکامەکەی هاوژیانی و پێکەوەژیان بوو. دووبارە گەڕامەوە بۆ زانکۆ جوانەکەی دوورگەکە، کۆشکی زانکۆ لە تاریکیدا لە دوورەوە هەروەکو پەرییەکی خەوتوو دەردەکەوێت، بەڵام ئەستێرەیەکی درەوشاوەی لێکۆڵینەوە بوو لە جەمسەری باکوور. خوێندکارانی بەشی زەویناسی کاتژمێر یانزەی بەیانی لەو تاریکی و هەوای (-١٤)یەدا خەریکی کارکردن بوون، مامۆستاکە بە زمانی ئینگلیزی و نەرویجی بابەتەکانی بۆ ڕووندەکردنەوە، لەو کاتەدا یادی مامۆستا بەڕێزو خۆشەویستەکەم دکتور عەلی ئەسغەر ئاریایی هاتەوە

بیرم. مۆزەخانەی دوورگەکە دیواری بەدیواری زانکۆوە بوو، نزیکەی دوو کاتژمێر لە مۆزەخانە مامەوە. کاتژمێر حەڤدە ڕۆیشتمە دەرەوە، ئەمجارەیان بە جادەکەداو بەسەر سەهۆڵدا بەرەو ناوشار دەڕۆم. چەند کەسێک لەسەر شەقامەکە دەبینم، ماتۆڕێکی گالیسکە بەلامدا تێدەپەڕێت.

دەوروبەری کاتژمێر (١٧:٣٠) گەیشتمە کافتریاکە. چەند کەسێک لەپشت بەرپرسی کافتریاکەوەن، تەواوی کارگوزارەکان ژنن، کافتریاکە سەندویچ و خواردنی سوکیشی هەیە، داوای فنجانێک چایم کرد. لەپڕێکدا سەیرمکرد کوڕێکی گەنجی تەمەن سی ساڵ بە لەشولارێکی ئێرانییەوە لە چێشتخانەکەوە هاتەدەرەوە. بەبێ هیچ پێشەکییەک بە زمانی فارسی لێمپرسی (تۆ ئێرانیت؟) تەکانی داو ڕایکرد بۆلام و گوتی: بەڵێ من ئێرانیم. بەدەنگێکی بەرز گوتی: تۆ لێرە چی دەکەیت؟ دوایی لەپشتی بەرپرسی کافتریاکەوە ڕایکردو توند باوەشی پێداکردم، فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتنەخوارەوە. گوتی: ئەوە شەش ساڵی تەواوە گوێم لە یەک وشەی فارسی نەبووە. ئەو کوڕە ناوی ئومێدی ئەبولحەسەنە، زۆر خۆشحاڵبوو بە بینینی من، هەرچەندە منی نەدەناسی، بەڵام وەک باوک و برای خۆی بینیبێت وابوو. ئەو کوڕە کوردەو خەڵکی مهابادو ئورمیەیە. دەڵێت: ئێستا وا خەریکی کارکردنم، دوای تەواوبوونی کارەکەم دەتوانم لەگەڵتا دابنیشم و بەیەکەوە قسە بکەین. شوێنی یەکتربینینمان لە کافتریای (سلوبارد) دیاریکرد. کافتریاو ڕێستۆرانتەکە تایبەتە بەو ئوتێلەی من لێی نیشتەجێم. خۆشحاڵبووم لەو سەرمای زمهەریرەدا لە گەرمی هاوڵاتییەکی خۆم وزەم وەرگرت. نازانم بۆچی من بۆ هەرشوێنێک دەچم بە دیداری هاوڵاتییەکی کورد دەگەم، وەک ئەوەی کە چارەنووسی من بە کوردە میهرەبانەکانەوە بەسترابێتەوە.

ئەمڕۆ زۆر هیلاک بووم، گەڕامەوە بۆ ئوتێل، پشوویەک دەدەم، بۆ خۆم چاییەک دروست دەکەم، ئەم تەرمۆزە کارەباییانەی ناو ژوورەکانی ئوتێلەکە نیعمەتێکی باشە. ئاوێک بە خۆمدا دەکەم، دەبێت ئاو کەم بەکاربهێنم، لە دە جێگا نووسراوە تکایە دەست بەئاوەوە بگرن. سیفۆنی تەوالێتەکە ئاوی کەمی دەوێت، بە نیو لیتر هەواو و ئاو پاکدەبێتەوە. لێرە ئاو زۆرە، کەناری دەریایە، ئەی بۆچی ئەم هەموو ئاگادارکردنەوەی کەم بەکارهێنانی ئاوە نووسراوە؟ شارەوانی چەند سەد مەترێک لە ئوتێلەکەوە دوورە، سبەی دەچمە لای لێپرسراوی ئاوی شارەکە، کە ئەویش لە شارەوانی دادەنیشێت و

لێی دەپرسم ئەو هەموو بانگەشەیە چییە بۆ کەم بەکارهێنانی ئاو؟ ئەویش دەڵێت: پێویستە ئاو بەکەمی بەکاربهێنین، توانەوەی بەفر بۆ ئاو زۆر لە سەرمان دەکەوێت. وزەیەکی زۆری دەوێت. منیش دەڵێم ئێوە خەڵوزی بەردتان زۆر هەیە. ئەویش دەڵێت دەرهێنانی خەڵوزی بەردین تێچوویەکی زۆری دەوێت، سووتاندنیشی دەبێتە هۆی پیسبوونی ژینگەی ناوچەکە. لێپرسراوی ئاوی شار دەڵێت، خراپترین کێشەمان کێشەی ئاوەڕۆیە، دوورخستنەوەی ئاوەڕۆ زۆر گران لەسەرمان دەوەستێت، ئەگەر ئاوەڕۆکە گەرم نەکرێت، لە بۆرییەکاندا دەیبەستێت. دەبێت ئاوەڕۆکان بکەینە ناو تانکەرەوەو ببرێت بۆ کەناری دەریاو بکرێتە پاڕەوە ئەوجا دەگوازرێتەوە بۆ ناوەڕاستی دەریاو لەوێ بەتاڵدەکرێت، ئێمە لێرە بانگەشە دەکەین بۆ کەم بەکارهێنانی وزە، بەتایبەت کەم بەکارهێنانی ئاو. ئێمە هەم بانگەشەو هەم بەکەلتوورکردن دەکەین. هەر لە باخچەی ساوایان و قوتابخانەوە بە بیر منداڵانی دەهێنینەوە کە چۆن دەست بە وزەوە بگرن و ئاو بەکەمی بەکاربهێنن. ئەو وشەی فێرکردنی بەکارنەدەهێنا، بەڵکو وشەی بەبیرهێنانەوەی بەکاردەهێنا، کە دەست بە بەکارهێنانی وزەوە بگرن. ئەو دەیگوت هەوڵدەدەین لەکاری بیناسازیدا بۆ کەمکردنەوەی خەرجی ئاو و وزە، سوود لە تەکنۆلۆژیای نوێ وەربگیرێت. لە نزیک ئوتێلەکە خەریکی دروستکردنی خانوویەک بوون، کرێکارەکان دیوارەکانیان بەرز دەکردەوە، ئەندازیارەکان و کرێکارەکان شەو و ڕۆژ بەردەوام بوون لە کارکردن، ئاخر لەو دوورگەیەدا ڕۆژیش هەروەکو شەو تاریکە، لە کەشێکی (-٢٨) پلە کاریان دەکرد، تەنها کاتێک پلەی گەرمی لە (-٢٨) پلە دادەبەزی کە کارەکەیان دەوەستاند.

خراپ نییە بزانیت لە کەلتووری دوورگەکەدا وشەی دوانیوەڕۆو پێشنیوەڕۆ بوونی نییە. کاتژمێر هەشتی شەو لە ڕێستۆرانتی سڤالبارد بەتەنیشت ئومێدەوە دانیشتبووم. ئەمڕۆ هەوا گەرمترە. کاتژمێر (٢٣) لە دوورگەکەدا پێشهاتێکی سەیر هاتە پێش. پێشهاتێک کە هەمووان سەریان لێی سوڕمابوو. پێشهاتێک کە نیشانەی کارەساتێک بوو، کارەساتێک کە مرۆڤەکان خۆیان دروستیانکردووە. کاتژمێر (٢٣-٢)ی بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی بارانباری، پلەی گەرمی گەیشتە (٣) پلە، واتە لە ماوەی دوو ڕۆژدا پلەی گەرمی لە (-٣٤) پلەوە بەرزبووەوە بۆ (٣) پلە. کەشناسان و خەڵکانی دوورگەکە تاکو ئەو بەروارە لە مانگی کانوونی دووەمدا ئەو دیاردەیەیان نەبینیبوو، خەڵکانی دوورگەکە هەموویان نیگەران بوون، دەیانگوت ورچەکان و گا کێوییەکان دەمرن، هەرگیز

ڕووینەداوە لە مانگی کانوونی دووەمدا باران ببارێت. من بۆ بینینی ئەو دیاردەیە هاتبووم، هاتبووم تاکو گۆڕانکاریی هەرێمەکە بەباشی هەست پێبکەم، هاتبووم تاکو لەو جۆرە دیاردانە تێبگەم، ئێستا وا بە چاو و گوێی خۆم هەست بە گۆڕانکاریی ناوچەکە دەکەم. سبەی دەچم بۆ زانکۆ، مامۆستای کارناسی ئاووهەوا ئەو دیاردەیەی بە ڕووداوێکی کارەساتبار ناوبرد. دیارە لێکۆڵینەوەکانی پێشتر پێشبینی ئەو دیاردە نامۆیەیان کردبوو، دەیان کۆمپیوتەر لەکارکردندا بوون لەسەر لێکۆڵینەوەی ئەو دیاردەیە. ئەم باسکردنە خوێنەرانی کتێبەکەماندوو دەکات، بۆیە لێرە هیچ ڕوونکردنەوەیەک نانووسم. ڕاپۆرتی زانستی گەشتەکەم لە شوێنێکی تردا بڵاو دەکەمەوە.

# ئومێدی ئەبولحەسەن

## ئاوارەیی و سەرگەردانی

دایکی کوردەو باوکی تورکە، تەمەنی سێ ساڵان بوو، کاتێک ئەویان لە باخچەی ساوایان ناونووسکرد. ئەو منداڵە بەشێوە زمانی کرمانی، فارسییەکی باش قسەی دەکرد، تەمەنی پێنج ساڵ بوو کە بە زمانی تورکی لەگەڵ باوکیدا قسەی دەکرد، لەگەڵ دایک و براکەشی بە کوردی و لەگەڵ منداڵە هاوپۆلەکانیشی بە فارسی قسەی دەکرد. ئەو منداڵە ناوی ئومێد بوو. دایکی بە بەردەوامی دەیگوت: ئێمە لەم شارەدا غەریبین، ئاووهەوای ئەم شارە بۆ ئێمە سازگار نییە. هەربۆیە بەهاوسەرەکەی دەگوت: کارێک بکە بەڵکو بگەڕێینەوە بۆ مهاباد یان ئورومییە. ئەو پیاوە پۆلیس بوو، بە ژنەکەی دەگوت: ئاخر بەندەی خودا خۆ من بەخواستی خۆم نەهاتووم بۆ ئەم شارە، بەڵکو دووریان خستومەتەوە. ئەوەبوو ئەو ژنە چەندین ساڵ ئەوەندەی گوت دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئورومیەو مهاباد، ئەوەندەی لەگەڵ پیاوەکەیدا گوت تاکو کاربەدەستان ڕەزامەندییان دەربڕی ئەو پیاوەیان گواستەوە بۆ ئورومیە. ئەو ژنەش خۆی خەڵکی گوندی چناقلو بوو. ئومێد تەنها چەندجارێک چووبوو بۆ ئەو گوندە. هیچ کات لەوێ نیشتەجێ نەببوو. باوکی ناوی عەلی بوو، واتە عەلی ئەبولحەسەنی. دایکی چوار منداڵی ببوو، منداڵی یەکەمی کچ بوو، ناویان نابوو ئارەزوو. ئاخر ئەو ژن و مێردە ئارەزوویەکی دوور و درێژیان هەبوو. منداڵی دووەم کوڕ بوو، ناویان نابوو ئەیوب کە دەبووایە سەبری ئەیوبی هەبێت، ئەو کوڕە جگە لەوەی منداڵێکی فەلەج بوو، کەڕولاڵیش بوو، هەر لە منداڵییەوە چاوەکانی کێشەی نابینایان هەبوو، کاتێک نەشتەرگەرییان بۆ چاوەکانی

کرد، چاوێکیانی بەتەواوی کوێر بوو، بەڵام چاوەکەی تری کەمێک ڕووناکی هەبوو. دایک و باوکی بەبێ ئەوەی بزانن ناویان لێنا ئەیوب. ئەوان نەیاندەزانی ئەیوب دەبێت سەبری ئەیوبی هەبێت. ئومێد منداڵی سێیەم بوو، لە شاری کرمان لەدایک ببوو، لەدوای ئومێد، منداڵی چوارەم لەدایکبوو ناویان نا ئەفسانە.

لەکۆتاییدا دوای هەشت ساڵ مانەوە لە کرمان ئەو پیاوە گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی (ئورومیە). دایکی ئومێد بە گەڕانەوەیان بۆ زێدی خۆیان زۆرخۆشحاڵبوو، دەیگوت: ئێستا لە شاری خۆمم، لەنێو خزم و کەسی خۆمدام، ئیتر هەست بە نامۆیی ناکەم و لەنێو کەس و هاوزمانەکانی خۆمدام. ئەو دەیگوت: لە ئورومیەوە تاکو مهابادو چناقڵو هێندە دوور نییە، لێرەوە دەتوانم سەردانی سەقزو سەردەشتیش بکەم، سوپاس بۆ خودا منداڵەکانم لە بێکەسی ڕزگاریان بووە. محەمەد باپیرەی ئومێد دوو ژن و دە منداڵی هەبوو، سەدیقەو جەعفەرو خەدیجە لە یەک دایک بوون. کەلسوم، داریوش، خەسرەو، کەمال، سەعید، کامەران و جەمال لە دایکێکیتر بوون.

خەدیجەو کەلسوم لە سەقز نیشتەجێ بوون، داریوش و خەسرەو لە مهاباد. کەمال و سەعید و کامەران لە سەردەشت. جەمالیش کۆچی دوایی کردبوو. ئارەزوو شووی بە پیاوێک کردبوو بەناوی نادری مەجیدی و لە شاری مهاباد نیشتەجێ ببوون، دوو منداڵی ببوو بە ناوەکانی میلادو سەدەف. دایکیان زۆر لە ژیانی خۆی ڕازی بوو، لە وڵاتی خۆی بوو بە زمانی خۆی قسەی دەکرد، زمانی ئەو زمانی کوردی بوو، کەلتوورەکەشی کەلتووری کوردی بوو، کەلتوورەکەیان پڕاو پڕبوو لە میهرەبانی و شادمانی و خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی. تەنها کێشەیەک کە ئەو ژنە هەیبوو، کێشەی فەلەجی منداڵەکەی بوو، بۆ ئەوەش هەمیشە سوپاسگوزاری خوداوەند بوو. هەر خۆی ببوو بە ئەیوبێکی ئەم سەردەمە. پیاوەکەشی کەسێکی ڕاستگۆو دروستکار بوو، پۆلیسێکی گوێڕایەڵ و میهرەبان بوو، هەرگیز ڕشوەی وەرنەدەگرت، ڕانە مریشکێکی حەرامی نەدەهێنایە ماڵەوە. کرێچی بوو سێیەکی مووچەکەی دەدا بەکرێ خانوو. سوپاسگوزاری خودا و خزمەتکاری وڵات و حوکمەت بوو، دەیگوت: هەرگیز یەک ڕیاڵی لە یەک کەس وەرنەگرتووە. ژیانێکی سەربەرزانەو خۆشبەختانەو ئارامی هەبوو. خزمەکانیشی کوردو تورک بوون، دایکی کورد بوو باوکیشی تورک بوو، هاوژیانی لەوە جوانتر نابێت.

ساڵی (١٩٩٩/١٣٧٨) بوو. ئەو پیاوە هەستی بە ئازاری قاچەکانی دەکرد، دەستەکانیشی ئازارێکی زۆریان هەبوو، بەگشتی هەموو ئێسقانەکانی گیانی دابوویانە ئازار، دوای ماوەیەک فەلەج بوو، ئێسقانەکانی دەستیانکرد بە پووکانەوە. ناچاربوو سەردانی نەخۆشخانە بکات و چارەسەر وەربگرێت. کەمێک پارەی بەدەستەوە هەبوو، ئەویشی بە دکتۆرو دەرمان خەرجکرد. دەرمان و کیمیایی هیچ سوودێکیان نەبوو. پیاوێکی بێوەفا بوو ژنێک و چوار منداڵی جێهێشت و بارگەو بنەی پێچایەوەو لە گرفتارییەکانی ئەم جیهانە ڕایکرد، سەبرو حەوسەڵەی بارگرانیی ئەم جیهانەی نەبوو، لەدوای خۆی چەند یادەوەرییەکی جێهێشت و لەژێر خاک سەرینایەوە. ژن بەسەر تەرمی هاوسەرەکەیدا کەوت و دەگریاو هاواریدەکرد. کاتێک چاوی کردەوە سەیریکرد لە وڵاتی خۆیدا بێکەس و تەنها کەوتووە. ئەو ژنە داماوە هەموو کێشەکانی بەلایەک و کێشەی کرێی خانووەکەی بەلایەکی تر. ئارەزووی کچیان شوویکردبوو، ڕۆیشتبوو بۆ ماڵە مێردی خۆی. دایک لە هاوسەری کچەکەی ڕازیبوو، هیچ شتێکی لە ئەوان چاوەڕوان نەدەکرد. ئارەزوو لە مهاباد نیشتەجێ ببوو، ئەیوبیش هەر لەسەر جێگا کەوتبوو، ئەفسانەش هێشتا کچێکی بچکۆلانە بوو. ئەوەی بەکەڵکی کارێک بهاتایە ئومێدو دایکی بوون.

ئومێد تەمەنی پانزە ساڵ بوو، تێگەیشت کە دەبێت نان پەیداکەری ماڵەکە ئەو بێت، وازی لە قوتابخانە هێنا، غیرەتی مۆڵەتی پێنەدا دایکی سواڵیان بۆ بکات، هەربۆیە دەستیکرد بە کاری کرێکاری. چەند ساڵێک بەردەوام بوو لە کرێکاری و چەندین جۆر کاری ئەنجامدا، تاکو پارووە نانێک بهێنێتەوە بۆ ماڵەوە. مووچەی خانەنشینی باوکی ئەوەندە نەبوو بەشی خەرجی منداڵی فەلەج و ئەو خەرجییە گرانە بکات و بەشی کرێی خانووەکەیان بکات. ئومێد تەمەنی هەژدە ساڵ بوو کە مۆڵەتی شۆفێری وەرگرت، لە شاری ئورومیە کاری تەکسی دەکرد بۆ خزم و کەسەکانی خۆی، لە هەریەک تمەن (٣،٥ ) ڕیاڵی کرێی شۆفێری وەردەگرت. خاڵەکانی دەهاتن و دەڕۆیشتن، پوورو مامەکانیشی هاتوچۆیان دەکردن. لەو سەردەمەدا هەرکەسەو لە خەمی بژێویی ماڵی خۆیدا بوو. هەموو ئومێدەکانی ئەو دایکە لێقەوماوە تەنها ئومێدی کوڕی بوو. لەدواییدا ئومێد بە پارەی قەرزو ئەو کەمەپارەیەی هەیبوو، بوو بە خاوەنی تەکسی خۆی، نیوەی داهاتەکەی بۆ خەرجی ماڵەوە بەکاردەهێناو نیوەکەی تریشی دەدایەوە بەقەرز.

ئەفسانە ڕۆژ بەڕۆژ گەورەتر دەبوو، ڕوخساری جوان و سەرنجڕاکێش بوو. ئەفسانە هەروەک تێکڕای کچە کوردەکانی تر کچێکی بەشەرم و بەئابڕوو بوو، نموونەی تەواوی کچێکی کوردو تورک بوو، کچێکی خوێنشیرین و جوان و ڕوسوورو داوێنپاک بوو، دەچوو بۆ قوتابخانەو هاوکاری دایکیشی داکرد، کچێکی میهرەبان بوو، خزمەتێکی باشی برا فەلەجەکەی دەکرد. ئومێد زۆر ئاگاداری خوشکەکەی دەکردو زۆری خۆشدەویست، بۆ ئەو، هەم براو هەم باوک بوو.

ئەفسانە تەمەنی ببووە شانزە ساڵ و ئومێدیش (٢١) ساڵ بوو، ڕۆژێک دایکی بە ئومێدی گوت: ئەمڕۆ کاتی عەسر میوانمان دێت، هەندێک میوەو پێویستی تر بکڕە. ئومێد لە دایکی پرسی میوانەکانمان کێن؟ دایکی گوتی: خاڵەکانت دێن، ئەوان لەگەڵ چەند پیاوێکی تردا دێن بۆ خوازبێنی. ئومێد بە سەرسوڕمانەوە گوتی: خوشکەکەم خوێندکارە، ڕاستە ئەو باوکی نییە، بەڵام خۆ من هەم و من برای ئەوم، ئومێد دەماری کوردانەو تورکانەی جوڵاو بە دایکی گوت: بە میوانەکان بڵێ ئەفسانە شوو ناکات. دایکی گوتی: من ناتوانم لەڕووی براکانمدا هیچ قسەیەک بکەم. ئەوەبوو کاتی عەسر میوانەکان هاتن. خاڵەکانی کابرای زاوایان پێ ناساندن کە پیاوێکی تەمەن (٥٥) ساڵ بوو. ئومێدو دایکی سەرەتا وایان هەستکرد ئەو پیاوە باوکی زاوا بێت، بەڵام دواتر بۆیان دەرکەوت ئەو پیاوە خۆی زاوایە. ئەو پیاوە وای هەستکردبوو بەهۆی هەژاری و نەبوونییانەوە بەئاسانی کچەکەیان لەدەست دەردەهێنێت. ئومێدو دایکی زۆر بەتوندی دژی ئەو خوازبێنییە وەستانەوە. ئەفسانەش زۆر خراپ دەگریا. دوای چایی خواردنەوەو خواردنی میوە خاڵەکانی گوتیان ئێمە بەڵێنمان داوە ئەفسانە بدەین بە ئەم پیاوە. خاڵەکانی زۆر پێداگرییان کرد کە ڕازیبن و ئەفسانە بدەن بە شوو، بەڵام ئومێدو دایکی ئینکارییان دەکرد کە کچەکەیان نادەن بەشوو. کاتێک کچێک باوکی نەبێت، ئەوا سەد کەس خۆی دەکات بە گەورەی ئەو. خزم و کەسەکانیان بەرامبەر ئومێدو دایکی و ئەفسانە لە بێگانە خراپتر بوون. خاڵەکان دەماری ملیان بەرزببووەوەو جوێنیان دەدا، دیاربوو بۆچی ئەوەندە پێداگرییان دەکرد ئەو کارە بەئەنجام بگەیەنن. ئومێدو دایکی دوو جار خانوویان گۆڕی وماڵیان گواستەوە، بەڵام لە شاری ئورومیە چەندی دەوێت تاکو ماڵی کەسێک دەدۆزیتەوە. ئومێد شۆفێری تەکسی بوو، بەناو شاردا دەگەڕا زۆر بەئاسانی دەتوانرا بدۆزرێتەوە. ئەفسانەش دەچوو بۆ قوتابخانەو دۆزینەوەی ئاسان

بوو. ئەو کچە دەترساو دەلەرزی، هەندێک جار لەترساندا ڕووخساری زەرد هەڵدەگەڕا. هەندێکجاریش کز لە گۆشەیەکیماڵەوە دادەنیشت. لە ماڵەوە نەچووە دەرەوەو چەند ڕۆژێکیش نەدەچوو بۆ قوتابخانە، داواو تکای براکەی هیچ سوودێکی نەبوو. ئەمجارەیان فشارێکی زۆریان خستە سەرو هەڕەشەیەکی زۆریان لێکرد، ئەوەش سوودێکی نەبوو ئەو کچە خەریک بوو تووشی نەخۆشی دەروونی دەبوو. ئومێد بەناچاری چوو بۆلای خاڵەکانی و تکای لێکردن کە وازیان لێبهێنن و ئەوان کچەکەیان نادەن بەشوو، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو خاڵەکانی دەیانگوت: هەرچۆنێک بێت دەبێت ئەفسانە شوو بکات بەو پیاوە تەمەن (٥٥) ساڵە.

سەرەنجام ئومێد بڕیارێکی گرنگی دا، بڕیاری دا کۆچ بکات و بڕوات، بڕیاری دا ئورومیەو مهاباد جێبهێڵێت، بەڵام ئەو کوڕە لاوە تەمەن (٢١) ساڵە بیری لەوە نەکردبووەوە کە کۆچ بکات بۆ شارێک لە شارەکانی وڵاتی خۆی، یان کۆچ بکات بۆ تاران، بۆ تارانێک کە دەریایە، بیری لەوە نەکردبووەوە کۆچ بکات بۆ ئەسفەهان، یا بەندەر عەباس، یان کرمان، کرمان جێگایەک بوو کە دایکی دۆست و ئاشنای لەوێ هەبوون. ئومێد پرس و ڕای بەچەند کەسێک لە ئاشناو برادەرەکانی خۆی کرد، ئەوانیش ئەویان بە قاچاخچییەکی باش ناساند. دوایی ئەوە بوو لەگەڵ قاچاخچییەکی کورددا قسەی کرد، ئەو قاچاخچییە کەسێک بوو هاورێکانی ئەویان زۆرباش دەناسی. ئەگەرچی ئەو پیاوە قاچاخچی بوو، بەڵام ڕەوشتێکی کوردانەی هەبوو، لەکارەکانیدا کەسێکی ڕاستگۆ بوو، نامەردیی تێدا بەدی نەدەکرا، بەڵێنەکانی بەڵێن بوون، قسەکانی ڕاست و دروست بوون. هاورێکانی ئومێد دەیانزانی ئەوکەسە کارەکانی بەڕاستگۆیی ئەنجام دەدات. ڕاستە ئەو دەڵاڵ و قاچاخچییە، بەڵام کەسێکی قۆڵبڕو ساختەچی نییە. پیاوی قاچاخچی پێشنیاری بۆکردن کە ئومێدو بنەماڵەکەی بچن بۆ نەرویج، هەروەها گوتی کوردێکی زۆر لە نەرویج هەیەو نەرویجیش ئاوارە وەردەگرێت. قاچاخچییەکە گوتی: دروستکردنی پاسپۆرت و وەرگرتنی فیزا بۆ چوار کەس (٢٠) ملیۆن تومەنی دەوێت. ئومێد مامەڵەی لەگەڵدا کردو لەسەر شانزە ملیۆن تومەن ڕێکەوتن. ساڵی (٢٠٠٦/١٣٨٥) بوو ئومێد تەکسی و کەلوپەلی ناوماڵی فرۆشت. قاچاخچییەکە چوار پاسپۆرتی بۆهێنا. پاسپۆرتەکان فیزای نەرویجیان پێوەبوو. ئەو پاسپۆرتانە هی وڵاتی تورکیا بوون. ئەو پیاوە پێیگوتن کە نابێت هەرچواریان بەیەکەوە بڕۆن. بۆیە بڕیاریاندا لەپێشدا ئومێد

لەگەڵ برا فەلەجەکەیدا بە فڕۆکە بڕۆن و دوای چل ڕۆژ ئینجا دایکی و ئەفسانە بەڕێ بکەون. ئومێدو براکەی بەرەو تاران بەڕێکەوتن. پیاوە قاچاخچییەکە گوتبووی ئومێد لە فڕۆکەخانەی تاران خۆی بە تورکێکی تورکیا بناسێنێت، چونکە پاسپۆرتەکەی هی وڵاتی تورکیا بوو، واتە پاسپۆرتی وڵاتی ئێرانی نەبوو. قاچاخچییەکە بە ئومێدی گوت: بەهیچ جۆرێک لە فڕۆکەخانەی تاران خۆی بە ئێرانی نەناسێنێت و بە کارمەندەکان بڵێت فارسی نازانێت. ئەگەر وابکات لە فڕۆکەخانە تووشی هیچ کێشەیەک نابێت، قسەکانی قاچاخچییەکە ڕاستبوون. ئومێدو براکەی سواری فڕۆکە بوون، کاتێک ئومێد لەسەر کورسی ناو فڕۆکەکە دانیشت، دڵەڕاوکەی نەما. قاچاخچییەکە کارەکانی بەباشی بۆ ئەنجامدابوو. ئومێد نەیدەزانی پاسپۆرتەکانیان تەزویرە، یان دزییە. لە فڕۆکەخانەی ڤیەنا ترانزێت بوون. پۆلیسی نەمساش هەستیان نەکرد کە ئەو پاسپۆرتانە تەزویرن. قاچاخچییەکە بە ئومێدی گوتبوو کاتێک لە نەمساوە بەڕێکەوتن بەرەو نەرویج، پێویستە پاسپۆرتەکانتان بدڕێنن و لەناویانبەرن، کاتێک گەیشتنە ئۆسلۆ بە پۆلیس بڵێن پاسپۆرتیان پێ نییە. ئومێد لە ئوروومیە تەنها یەک وشەی نەرویجی دەزانی، ئەویش وشەی (Refogie)بوو. یەکێک لە هاوڕێکانی ئومێد کە کاری لەگەڵدا دەکرد، دەیزانی ئومێد دەڕوات بەرەو نەرویج، هەربۆیە ویستی خزمەتێکی پێبکات، لەو بارەیەوە بە ئومێدی گوت: بۆ ئەوەی نەرویجییەکان وەک پەنابەرێک وەریبگرن، پێویستە خۆی بە کەسێکی سیاسی بناسێنێت. ئەو نامەیەکی تەزویری دا بە ئومێد، نامەیەک کە لەسەرەوە ئارمی وەزارەتی ئیتلاعاتی بەسەرەوە بوو، بۆ ئەوەی ئومێد لە نەرویج نامەکە نیشانی پۆلیس بدات، کە گوایە ئەو ئەندامی یەکێک لە پارتە بەرهەڵستکارەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانە. بەپێی ئەو نامەیە وەزارەتی ئیتلاعات بە شوێن ئەودا دەگەڕان. کاتێک گەیشتنە نەرویج ئومێد یەکسەر وشەی (Refogie) گوت. پۆلیس وەرگێڕێکیان بۆ ئومێد هێنا. ئومێدو ئەیوبیان برد بۆ ئۆردووگایەکی نزیک ئۆسلۆ هاوکارییانکردن. ئومێد ناونیشانی چەند کەسێکی لابوو، پەیوەندییە نەتەوەییەکان لە نەرویج باشتر لە ئوروومیە کاری دەکرد.

دوای نزیکەی (٤٥) ڕۆژ دایک و خوشکی ئومێدیش گەیشتنە نەرویج، پاسپۆرتی ئەوانیش هیچ کێشەیان بۆ دروست نەبوو، کارمەندانی فڕۆکەخانەکانی تاران و ڤیەننا نەیانتوانی دەستنیشانی بکەن کە پاسپۆرتەکانیان تەزویرن. کچ و دایکیش گەیشتنە

ئۆسلۆ، ئەوانیشیان برد بۆ ئۆردووگا. هەرچواریان یەکیانگرتەوەو نزیکەی چوار مانگ بەیەکەوە بوون. دایک و کچ و کوڕ بە بەردەوامی خەریکی فێربوونی زمانی نەرویجی بوون. ڕۆژێک کارمەندانی ئۆردووگاکە داوای ئومێدیان کرد، پێیانگوت کە نامەکەی ئەویان نیشانی پۆلیس داوە، بەڵام پۆلیس بۆی دەرکەوتووە کە نامەکە تەزویرە. (نامەی ئیتلاعات دەڵێم کە ئومێد لەگەڵ خۆی هێنابووی) دیار نەبوو پۆلیسی نەرویج چۆن زانیبوویان ئەو نامەیە تەزویرە. بەزوویی ئومێدیان لە دایک و براو خوشکەکەی جیاکردەوەو ناردیان بۆ ئۆردووگایەکی تر. ئۆردووگایەک کە لەنێو دارستانێکی چڕدابوو لە نزیک شاری موس (MOSS) دایکی هاواریدەکردو خوشکەکەشی دەگریا، ئەیوبیش تێگەیشتبوو کە براکەیان لە ئەوان جودا دەکەنەوە، لەدڵەوە خەفەتی دەخوارد، بەڵام نەیدەتوانی هەستەکانی دەربڕێت.

دایکێک لەگەڵ کچێکی جوان و کوڕێکی فەلەجدا لە گۆشەیەکی ئەم جیهانەدا تەنها مابوونەوە بەبێ ئەوەی زمانی نەرویجی یا ئینگلیزی بزانن، بەبێ پارەو بەبێ پاسپۆرت، بەڕاستی ئەوان تەنها و بێکەس مابوونەوە، تاکە کەسێک کە خەمخۆریان بوو ئەویشیان لێ جوداکردنەوە، نە ڕێگەی گەڕانەوەیان هەبوو، نە ڕێگەی دەربازبوون. دایک و کچ بەردەوام دەگریان و هاواریان دەکرد، بەڵام یاساو کارمەندانی نەرویج لەوان تێنەدەگەیشتن. ئومێد سەدان جوێنی بە ئەو هاوڕێ ناشارەزایەی ئورومیەی گوت. ئەو کاغەزە تەزویرە بەکاری چی دەهات؟ تەنها بەکاری جیابوونەوەو لێکدابڕان دەهات. ئەو دایکە سەردەمانێک لە کرمان خۆی بە غەریب دەزانی، ئێستا بە تەواوی لە مانای غەریبیی تێدەگەیشت. خۆشبەختانە لە ئۆردووگاکەدا چەند کەسێکی کوردی عێراقی و تورکیا هەبوون، ئەوان دڵیان دەدانەوە. ئەو دایکە نیگەرانی چارەنووسی کوڕەکەی بوو، لە وڵاتی غەریبیدا لە چارەنووسی کچەکەی دەترسا، بیری لە چارەنووسی کوڕە فەلەجەکەی دەکردەوە، کەوتبووە ڕۆژگارێکەوە کە هەرگیز بیری لێ نەکردبووەوە. ڕۆژگاری لێکدابڕان، ڕۆژگاری ترس و دڵەڕاوکێ، ڕۆژە کورتەکانی ساڵ، کە ڕۆژانە کورتتر دەبوون. ڕۆژە ساردەکان کە ڕۆژانە ساردتر دەبوون، ڕۆژگاری تاریک و نائومێدی، ئەو ڕۆژانە جوێنی دەناردەوە بۆ خزم و کەسەکانی و بەردەوام نزای دەکردو لە خودا دەپاڕایەوە کە هاوکاریان بێت.

ئۆردووگای موس (MOSS) لەشێوەی زیندانێکدا بوو، بەگشتی کەسانی تاوانباریان بۆ ئەو زیندانە دەگواستەوە. ئۆردووگاکە لەنێو دارستانێک بوو، لەوێوە تاکو نزیکترین شار (٤٥) کیلۆمەتر بوو، بەڵام ئومێد ئومێدی لەدەست نەدا. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا وانەی زمانی دەخوێند، زمانی سەخت و ئاڵۆزی نەرویجی. شەش مانگ چاوەڕوانی دۆسیەکەی بوو. دایکی ڕۆژانە سەردانی لێپرسراوی ئۆردووگای دەکرد، ڕۆژانە فرمێسکی دەڕشت و ئومێدی دەویست. ئەو بێچارەیە پارەیەکی ئەوتۆی پێنەبوو، ئەو کەمە پارەیەی لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان تەواو ببوو. لە ئۆردووگاکە خواردنیان پێدەدان و مانگانەش سێ سەد کرۆنیان پێدەدان. بەو پارەیە ئەو دایکە نەیدەتوانی موبایلێک بکڕێت و لەگەڵ کوڕەکەیدا لە پەیوەندیدا بێت. جلوبەرگەکانیشیان بەکەڵکی زستانی ساردی نەرویج نەدەهات. ئەو ژنە ڕۆژانی ساردی زستان بەتانییەکی لەخۆیەوە دەپێچاو چاو لەڕێی ئومێد بوو. ڕۆژانە چەندین کاتژمێر لە بەردەرگای ژوورەکەی دانیشت، کوڕەکەشی لەو ئۆردووگایە ڕووبەڕووی کێشە ببووەوە، بەڵام هیچ چارەیەکی نەبوو، جگە لە فێربوونی زمان نەیدەتوانی هیچ کارێکی تر ئەنجام بدات. ئومێد زستانێکی ساردی بەڕێکرد، زستانێکی بەفراوی، زستانێکی ساردو ڕۆژی کورت، زستانێکی پڕ لە نیگەرانی و دڵەڕاوکێ.

هەرچۆنێک بوو زستان تەواو بوو بەهار هات، بەهاری ساڵی (٢٠٠٧) بەهارێک کە ئومێد هەموو ئومێدی خۆی لەسەر هەڵچنیبوو. دوای شەش مانگ هێشتنەوەی لەو ئۆردووگایە هەواڵێکی خۆشی پێگەیشت و ئەویان گواستەوە بۆ ئەو ئۆردووگایەی کە دایکی لەوێ بوو. ئەو دایکە کاتێک چاوی بە کوڕەکەی کەوت لەباوەشی گرت و ماچی کرد. ئەفسانەش تەمەنی گەیشتبووە حەڤدە ساڵ و براکەی ماچکرد و ئومێدێکی زۆری بە ئومێد هەبوو. ئومێد فرمێسک بەچاوانیدا دەهاتنە خوارەوە، دەستی براکەی دەگوشی و بە زمانە بێزمانەکەی ئەوی تێگەیاند، کە جارێکیتر جێینەهێڵێت، بەڵام دوای دوو مانگ هەموو ئومێدەکانی ئەو ماڵە لەناوچوون. حوکمی دادگا گەڕایەوەو پێیان ڕاگەیاندن کە دەبێت تەنها لەماوەی پانزە ڕۆژدا ئومێد خاک و وڵاتی نەرویج جێبهێڵێت.

بەهار ڕەنگی پاییزی گرتبوو، ئومێد دەیتوانی بچێت بۆ کوێ؟ چۆن دەیتوانی دایک و خوشک و براکەی جێبهێڵێت؟ چۆن دەیتوانی بەبێ پاسپۆرت بگەڕێتەوە بۆ ئێران؟ ئەو لە ئۆردووگاکە چەند هاوڕێیەکی پەیداکردبوو. لەگەڵ هاوڕێ کوردەکانی

هەندێک پرس و ڕای کرد. کوردەکانی نەرویج هاوکارییان کرد. هاوڕێ کوردەکانی پێشنیاریان بۆکرد بڕوات بەرەو (ترمسۆ). ترمسۆ باکووری شاری وڵاتی نەرویجە. ژمارەی دانیشتووانی(٧٢٠٠٠) کەسە. لەسەر هێڵی پانی جوگرافی (٦٩) پلەو (٣٠) خولەک، واتە دوو پلە لە سەروو خولگەی بەستەڵەکی باکوور. شارێک کە هاوسەنگی شەو و ڕۆژی (٢٤) کاتژمێر نییە. ترمسۆ دەکەوێتە جەمسەری بەستەڵەکی باکورەوە. هاوڕێ کوردەکانی نامەو ناونیشانیان پێدابوو، ئەویش بەرەو ترمسۆ ڕۆیشت. بڕیاربوو لەو شارەدا لە ڕێستورانێکدا کار بکات، بەڵام دەبووایە بەردەوام لە ژوورەوە بووایەو نەیاتە بەر هەتاو، چونکە ئەگەر پۆلیس بیگرن، ئەوا یەکڕاست دەیبەن بۆ زیندان. ئومێد ماوەی حەوت مانگ لە ڕێستورانتێکدا کاری دەکرد کە خاوەنەکانی کوردێکی ئێران بوون. لەژووری چێشتلێنان کاری دەکردو تا دەیتوانی نەدەهاتە دەرەوە. ئومێد کوڕێکی زیرەک بوو، ئومێدی بە ژیان هەبوو. دیارە پۆلیسی نەرویج زۆرکەسیان دەستگیر نەدەکرد. ئەوکات هێشتا تیرۆرو تیرۆریستی هێندە پەرەی نەسەندبوو. بەڵام ئومێد دەترساو لەژووری چێشتلێنان نەدەهاتە دەرەوە، جارجارێک سەرێکی دەکێشایە دەرەوە تاکو دڵنیابێت لە بوونی پۆلیس لە چێشتخانەکەدا. سوپاس بۆ خودا کە خەڵکانی ئەو سەرزەمینە ساردەی باکوور ئەوەندە سنگفراوانن و دژی کەسانی وڵاتانی تر نین.

حەوت مانگ تێپەڕی، حەوت مانگی پڕ ترس و نیگەرانی، لەماوەی ئەو حەوت مانگەدا ئومێد فێری زمانی نەرویجی و هونەری چێشتلێنان بوو. ئەو لە هەموو ئەو ماوەیەدا هەوڵیدەدا بە زمانی نەرویجی قسە بکات، ئەو لە خەمی دایکیدا بوو، پارەی بۆ دەناردنەوە، هەندێک پارەشی لای خۆی پاشەکەوت کردبوو. دوای حەوت مانگ پۆلیس هەستیان پێکردبوو کە ئەو بەبێ کارتی نیشتەجێبوون و کارتی کارکردن لە ترمسۆ نیشتەجێ بووە. خۆشبەختانە پۆلیس هەستی بەوە نەکردبوو کە لە ڕێستورانتدا کار دەکات، خۆ ئەگەر هەستیان پێبکردایە، ئەوا خاوەن ڕێستورانتەکەش سزایەکەی قورس دەدرا. باش بوو پۆلیس هەستیان نەکرد کە ئەوە ماوەی چەندە لە ترمسۆ نیشتەجێیە. فێربوونی زمان هاوکارییەکی باش بوو بۆ ئومێد. لە وڵاتێکدا کە هیچ کەس درۆناکات، بەڵام درۆکانی ئومێد بەکاری خۆی هات. ئیتر ئەو نەیدەتوانی لە ترمسۆ کار بکات، ئەی دەبووایە چی بکردایە؟ ئەو توانی بە فێڵ خۆی لەدەست پۆلیس ڕزگار بکات. هاوڕێکانی پێشنیارێکیان بۆکرد، پێشنیارێک کە ژیانی ئەوی گۆڕی. ئومێد لە دەست

پۆلیس هەڵاتبوو، لەدەست، دەستێوەردانی خاڵەکانی لە کاروباری ژیانیدا ڕایکردبوو، لە دەستی پەیوەندییەکانی خزم و کەسەکانی خۆی ڕایکردبوو. ئەو هەڵاتووی کەلتوورو دەست تێوەردان بوو، لە کەلتوورێک ڕایکردبوو کە نەدەبووایە لە بەرامبەر قسەی کەسێکی لەخۆی گەورەتر قسەیەکی بکردایە.

هاوڕێکانی ئومێد پێیانگوت ئەگەر بڕوات بۆ دوورگەکانی (ئیستیزبرگن)، ئەوا ژیانی لە ئاسودەییدا دەبێت. گوتیان هەرچەندە ئەو شوێنە بەشێک نییە لە خاکی نەرویج، بەڵام بەبێ پاسپۆرت دەتوانێت بچێت، چونکە شاری (لانگ یرباین) بە شارێکی نەرویجی ئەژمار دەکرێت، هەربۆیە بۆ چوونی بۆ ئەو شارە پێویستی بە پاسپۆرت نییە. هاوڕێکانی ئومێد گوتیان (لانگ یرباین) شارێکی ئازادە هەرکەسێک بچێتە ئەو شوێنە، دەتوانێت تا کۆتایی ژیانی لەوێ بمێنێتەوە، هیچ پێویستی بە پاسپۆرت و کارتی نیشتەجێبوون نییە، لەوێ پۆلیس بوونی نییە. خاوەن ڕێستۆرانتەکە گوتی: لەوێ کەسێک دەناسێت کە کرێکاری دەوێت، تەلەفۆنی بۆ کردو کاتی چاوپێکەوتنیان دیاریکرد. ڕۆژی (١٢ مارسی ساڵی ٢٠٠٨) بوو، کەشوهەوای ترمسۆ باش ببوو. ئومێد کەلوپەلەکانی خستە کۆڵەپشتێکەوەو لاوی کەمئەزموون گەیشتە (لانگ یرباین) شارێک کە دەکەوێتە (١٣٠٠) کیلۆمەتری جەمسەری باکوور. شارێک لەسەر هێڵی (٧٨) پلەو (١٣) خولەکی باکوور، واتە (١٢) پلە بەرزتر لە خولگەی جەمسەری باکوور، واتە (١١٠٠) کیلۆمەتر لە باکووری شوێنی ئالاسکا. هاوڕێکانی بە ئومێدیان گوتبوو لەو سەرزەمینەدا بەدرێژایی ساڵ، چوار مانگ و نیو تەنها شەوەو چوار مانگ و نیویش بەسەر یەکەوە بەتەواوی ڕۆژە. پێیانگوتبوو ئێستا کە تۆ دەڕۆیت ڕۆژ بەرەو درێژیی دەڕوات و لە ئەمڕۆ بەدواوە گەشتیارێکی زۆر ڕوودەکەنە ئەو شوێنە. ڕۆژەکان درێژ دەبوون و هێواش هێواش ڕۆژی بەبێ شەو دروست دەبوو. هەروەها پێیانگوت لانیکەم دەتوانێت شەش مانگ لەوێ کاربکات و لەگەڵ دەستپێکردنەوەی زستان دەبێت بگەڕێتەوە بۆ (ترمسۆ).

ئومێد، بەئومێدی هەوای گەرمی هاوین ڕێگەی ئەو دوورگەیەی گرتەبەر، ئەو بە ئومێدی تیشکی ڕۆشنایی بەرەو سەرزەمینی تاریکی بەڕێکەوت، کاتژمێر (٣:٣٠) گەیشتە فرۆکەخانەی (لانگ یرباین)، ئەو پێشبینی ئەو سەرما سەختەی نەکردبوو، وایدەزانی زستان تەواو بووەو کەژی بەهارە. هێشتا بیری نەورۆزی ئورومیەی لەسەردابوو، بەڵام پلەی گەرمی فرۆکەخانە (-٢٧) پلە بوو. کاتێک لە فرۆکەکە دابەزی، هەستیکرد

کەوتۆتە فرێزەرێکەوە، تەنانەت نەیتوانی زنجیری کۆڵەپشتەکەی بکاتەوەو پارچە جلێکی گەرم دەربکات و لەبەری بکات. هەرچەندە جلوبەرگێکی گەرمی لەگەڵ خۆیدا نەبردبوو. ئەو هیچی نەدەزانی، وایدەزانی هاوین لەو شارەدا هەروەکو سەرەتای زستانی ترمسۆ دەبێت. هیچ شارەزاییەکی لە ئاووهەوای ئەو شارە نەبوو. لەبەردەم فرۆکەخانەکەدا لەتاو سەرما خەریک بوو لەهۆش خۆی دەچوو، هێندەی نەمابوو بکەوێت بە زەویدا، هەوڵیدا تەکسییەک بگرێت و سواری تەکسی بێت، لەناکاو قاچی خزی و خۆی بە تەکسییەک کێشاو کەوتە سەرزەوی. شۆفێری تەکسییەکە بەخێرایی ڕایکێشایە ناو تەکسییەکەوەو بەتانییەکی تێوە پێچا، گەرمیی ناو تەکسییەکەی زیادکردو پەرداخێک قاوەی گەرمی پێدا. دوای خواردنەوەی قاوەکە ئومێد زمانی کرایەوە، ئەو کاغەزەی ناونیشانی لەسەربوو، دایە دەست شۆفێری تەکسییەکە، لەناو تەکسییەکەوە پلەی گەرمی دەرەوەی نیشاندا کە (-٢٧) پلە بوو.

ئومێد یەکەمین ئەزموونی خۆی لە سەرزەمینێکی نەناسراو تاقیکردەوە. پێیانگوتبوو دەبێت لە فرۆشگایەکی گەڕۆکدا کاربکات. لاشەی ئوتۆمبێلێکی کۆنەی بێکەڵکیان کردبوو بە دوکانی ساندویچ فرۆشی، ئەو لەو ئۆتۆمبێلە بێکەڵک و خراپەدا کاریدەکردو هەر لەوێش دەخەوت. هەرهەمان ڕۆژ کە گەیشتبووە ئەوێ، ئەو لاشە ئوتۆمبێلەیان پێدابوو. ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی (١٢)ی مانگی مارس بوو، هێشتا درێژیی ڕۆژ نەدەگەیشتە یەک کاتژمێر، بەڵام چەند کاتژمێرێک خۆر بە تاریک و ڕوونی دەمایەوە. ئۆتۆمبێلەکە لە کەناری دەریا جێگیرکرابوو نەدەجولاو ژوورێکی ئاسنین بوو. خاوەنکار دەستێک جلوبەرگی تاڕادەیەک گەرم و چەند بەتانییەکی دا بە ئومێد، بەڵام دەکرا لەو ژوورە ساردەو نزمی پلەی گەرمییەدا خەوی لێبکەوێت؟ چەند ڕۆژێک سەردانیکەری کەم بوو، کەمترین کەس سەردانیان کرد، جگە لە چەند بەلەمەوانێک و چەند کرێکارێکی کەشتی و چەند کرێکارێکی بەندەرەکە نەبێت، هیچ گەشتیارێک سەردانی نەکرد. هەرچەند هەوڵی دەدا ئەو ژوورە ئاسنینە گەرم نەدەبوو، سووتەمەنی گران بوو، سووتەمەنی ئاسایی دوورگەکە خەڵوزی بەرد بوو، خەڵوزی بەردیان بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا بەکاردەهێنا. لەوێدا هەموو پێداویستییەکان بەکارەبا کاریان دەکرد، نرخی کارەباش گرانبوو. ئومێد ئەگەر بیویستایە لاشەی ئۆتۆمبێلەکە بە کارەبا گەرم بکات، هیچ پارەیەکی بۆ نەدەمایەوە. لەدواییدا کەمێک خەڵوزی پەیداکرد، بەڵام بەکارهێنانی خەڵوز

ترسناک بوو، چونکە گازو هەڵمی هەبوو. هێواش هێواش ڕۆژ درێژترو دنیا گەرمتر دەبوو، لەکۆتاییدا ئومێد ڕۆژی بەبێ شەوی بینی، بەڵام ڕۆژی بەردەوام بەبێ شەو بەلای ئەوەوە ناخۆش بوو. ژیانی هاوسەنگیی ژیانێکی خۆشە. ئومێد کەمتر دەخەوت، ئەو خواردنیشی وەک پێویست نەدەخوارد، دەیویست کەمێک پارە کۆبکاتەوەو بۆ دایکی بنێرێتەوە. ماوەی سێ مانگ لەو زیندانە ئاسنینەدا کاریکردو خەوت، ئێسقانەکانی ئازاریان هەبوو، ماسولکەکانی قاچی سەرما کاری تێکردبوون. دکتۆر پێیگوتبوو لەم کەشە ساردەدا پێویستە خواردنی باش بخوات، بەڵام ئەو پارەیەکی ئەوتۆی نەبوو، ڕۆژانەکەشی زۆرکەم بوو.

ئومێد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر غەمبار دەبوو، بەدبەختی بەسەریدا زاڵ ببوو، ببووە دیلی ئەو دوورگەیە. چەند ڕۆژێک دوای هاتنی ئەو بۆ دوورگەکە، حکومەتی نەرویج یاسایەکی نوێی دەرکرد، بەپێی ئەو یاسایە سەردانیکردنی دوورگەکەو دەرچوون لێی، تەنها بەهۆی پاسپۆرتەوە دەبوو. پاسپۆرتەکانیان لە ترمسۆ مۆر دەکردن، هەمان شوێن کە پاسپۆرتەکەی منیان لێ مۆرکرد. لە (لانگ یربایِن) پۆلیس و بنکەی پۆلیس نەبوو، تەنها لە ترمسۆ پاسپۆرتەکان مۆر دەکران. یاساکە گۆڕابوو، هەرکەسێک بچوایە بۆ دوورگەکە دەیتوانی تا ئەو کاتەی پێیخۆشە لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام بۆ چوون و گەڕانەوە پاسپۆرت پێویست بوو. لە هەلومەرجێکی ئەوهادا ئومێد زیندانیی کرابوو، ئەو پاسپۆرتی نەبوو لە شارێکی بچووکدا زیندانی بوو، لە دوورگەیەکدا کە ڕووبەرەکەی دوو ئەوەندەی وڵاتی بەلجیکا دەبوو، دانیشتووانەکەشی (٢٥٠٠) کەس دەبوو، ئەو لەوێ زیندانی بوو. دوورگەیەک کە ژمارەی ورچە سپییەکانی دوو ئەوەندەی ژمارەی دانیشتووانی دەبێت. وای لەدەست ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە، وای لەدەست ئەم کەلتوورو دەستتێوەردانە، ئایا ئێمە مانای پشتیوانی و دەستتێوەردان و ئاسانکاریی دەزانین و تێدەگەین؟ کەسێک نییە لە خاڵەکانی ئومێد بپرسێت و بڵێت ئێوە چیتان بەسەر ئەو باوک مردووەوە هەیە، لەجیاتی ئەوەی هاوکارییان بکەن، بۆچی بۆ کچێکی تەمەن شازدە ساڵ پیاوێکی تەمەن (٥٥) ساڵتان هێناوە شووی پێبکات؟ ئومێد لە جەمسەری بەستووی باکوور بوو. پێویستە ئێمە ڕەخنە لە کەلتووری خۆمان بگرین، کەلتووری دژەکان، کەلتووری ئاشنایی مرۆڤەکان، کەلتووری داهێنان، کەلتووری تێکدان، کەلتووری دەستتێوەردان.

ئومێد ڕۆژ بەڕۆژ نەخۆشییەکەی زیادی دەکرد، دایکی نەبوو تاکو بەلایەوە بێت، خوشکی نەبوو تا چێشتێکی گەرمی بۆ ئامادە بکات، هیچ هاوزمانێکی نەبوو. ئومێد زانیبووی لەو دوورگەیەدا چەند کەسێکی ئێرانی هەیە، لە شارەوانی ناوی ئەوانی پرسی، ئەو ئێرانییانە سێ برا بوون بە ناوەکانی ئیسماعیل، ناسرو مهران ڕەزایی، ئەوان خەڵکی شیراز بوون، بە ئومێدیان گوتبوو ئەوان زیاتر لە هەژدە ساڵە هاتوونەتە ئەو دوورگەیە. شۆفێرەکەم ناوی یەکێک لەو سێ کەسەی پرسیبوو، ناوی ئەحمەد ڕەزا بوو، خۆ لەوەشە ئەو ناوە خوازراو بێت. ئومێد ماڵی یەکێک لەو سێ برایەی دۆزیبووەوەو ئەو تەنها چەند قسەیەکی لەگەڵ ئومێد کردبوو، ئەویش ئەوە بوو گوتبووی ئێمە نامانەوێت چاومان بەهیچ کەسێکی ئێرانی بکەوێت. ئومێد هەستی کردبوو ئەوان کەسانی سیاسین و پەنایان بۆ ئەو دوورگەیە هێناوە. ئەوان هیچ هاوکارییەکی ئومێدیان نەکردبوو، تەنانەت ئامادە نەبوون قسەشی لەگەڵدا بکەن.

ئومێد سەردانی تەواوی دوکانەکانی دوورگەکەی کرد، لەهیچ شوێنێک کارێکی گیر نەکەوت، لە شوێنێک کاری دروستکردنی خانوو هەبوو، بەڵام ئەو شارەزایی لەوجۆرە کارانەدا نەبوو، ئەوان کرێکاری سادەیان نەدەویست. ئومێد لەتاو ئازاری ئێسقانەکانیشی هێزی لەبەر بڕابوو، باوکی تووشی نەخۆسیی سەرەتانی پووکانەوەی ئێسقان ببوو و مرد. زۆر نیگەران بوو، لەوە دەترسا ئەویش تووشی هەمان نەخۆشیی باوکی بووبێت.

ئومێد بە تەواوی لە ژیان نائومێد ببوو. گوتبووی: دەگەڕێمەوە بۆ ترمسۆ، خۆ ئەگەر پۆلیس بمگرێت ئەوا دەمبەنەوە بۆ زیندان، هەر چۆنێک بێت زیندان لەم ژیانەی من خۆشترە. بڕیاریدا دوایین هەوڵی خۆی بدات ئەگەر سەرکەوتوو بوو، ئەوا باشە ئەگەر سەرکەوتووش نەبوو، ئەوا بەپێی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ زیندان. کاتی عەسر بوو، عەسرێک کە شەوی بەدوادا نەدەهات. ڕۆیشت بۆ ڕێستۆرانتێک، ڕێستۆرانتی ژنانە خۆی بە خانم ( Toveeieo) ناساند کە لێپرسراوی ڕێستۆرانتی ( Fruene Kafee Bak) بوو، ئەو خانمە ژنێکی میهرەبان بوو، بەتەواوی گوێی بۆ قسەکانی ئومێد گرت. ئومێدیش خۆی ناساندو گوتی: من گەنجێکم ئومێدم بە ژیان هەیە، تکات لێدەکەم نائومێدم مەکە. گوتی: ئەگەر تۆ کارێکم پێنەدەیت، لەو کەلاوە ئاسنەدا دەبمە سەهۆڵ و دەمرم. بەڕێوەبەری ڕێستۆرانتەکە گوتی: ئەم ڕێستۆرانتە ژنان بەڕێوەی دەبەن،

ڕێستۆرانتەکەش ناوی (FRUENE) بەمانای ژن. لە هەمانکاتدا ئەو ژنە پێیگوت: دوو ڕۆژی تر وەڵامت دەدەینەوە. تیشکی ئومێد لە دڵی ئەو لاوە کوردەدا پرسکی دەدا. بە ئومێدەوە لە ڕێستورانتەکە چووە دەرەوە، هێشتا نەگەیشتبووە قەفەزە ئاسنەکە، مۆبایلەکەی زەنگی لێدا، بەڕێوەبەری ڕێستۆرانتەکە بوو. گوتی: ئێمە وەک کرێکارێک وەرت دەگرین. ئومێد گەڕایەوە بۆ ڕێستۆرانتەکە. خانمی ڕێستۆرانتەکە پێیگوت: پێویستە یەک هەفتە کاربکەیت و لەژێر چاودێریدا بیت، ئەگەر بەباشی کارت کرد، ئەوا بڕیاری وەرگرتنت دەدەین. ئومێد بەخێرایی کەوتە کارکردن، هێزێکی تازەی وەبەر گەڕابوو، شوێنی کارکردن گەرم بوو، جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەو زیندانە ئاسنەدا. خاوەنی کافتریاکە شوێنی حەوانەوەی بۆ کرێکارەکان دابینکردبوو، شوێنی خەوتنی بە ئومێد دا. لە خانوویەکی چوار ژووریدا ژوورێکیان بە ئومێد دا. لە ژوورەکەدا حەمام و تەوالێت هەبوو، شوێنی چێشتلێنان هاوبەش بوو. ئومێد لە ژوورێکی گەرمدا جێگای گرت. بەڕۆژ لە شوێنی گەرمدا کاریدەکردو شەوانەش لە ژوورێکی گەرمدا دەخەوت. کەمێک باری تەندروستی و جۆری خواردنەکەی باشتر ببوو، نیگەرانی ئەوەبوو ئەگەر دوای هەفتەکە خانم (TOVE) ئەوی نەویست، دەبێت چی بکات. ڕۆژی سێیەم خانم (TOVE) پێیگوت: تۆ لە تاقیکردنەوە دەرچوویت و ئێمە تۆمان قبوڵکرد لێرە کاربکەیت. دوایی بەڵێننامەیان نووسی و بە مانگانەی پانزە هەزار کرۆن، لەو پارەیە دەبووایە مانگانە پێنج هەزار کرۆن بدات لەجیاتی کرێی خانوو. مانگانە دە هەزار کرۆنی بۆ دەمایەوە. پارەیەکی خراپ نەبوو، مانگانە پێنج هەزار کرۆنی بۆ دایکی دەنارد. ئەو لاوە کوردە جگە لەوەی خۆی لێپرسراوی خۆی بوو، لێپرسراوی سێ کەسی تریش بوو.

دووبارە لە دوورگەکەدا بووەوە بە شەو. شەوەکان درێژ و درێژ تر دەبوون، سەرما زیادیکرد، ئومێد هەستی بە ئازاری ئێسقانەکانی کردەوە، ئەو دەبوو سەردانی دکتۆر بکات. دکتۆر لە شێوازی خواردنەکانی پرسی، دیاربوو وەک پێویست شیرو ماست و پەنیرو سەوزەی نەدەخوارد. لەو دوورگەیەدا هیچ جۆرە بەرهەمێک نەدەچێنرا، مانگاو مەڕو گیانلەبەرەکانی تر لەوێ بەخێو نەدەکران، هەموو شتێک لە نەرویجەوە بە فڕۆکە دەهات، لەوێ نرخی هەموو شتێک گرانبوو. ئومێد لەنێوان ناردنی پارە بۆ دایکی و سەلامەتی خۆی، دەبووایە هاوسەنگییەک دروست بکات، خۆشبەختانە هەندێکجار شاگردانەی وەردەگرت. لەو زیندانەدا هەموو کەس بۆ کارکردن و پەیداکردنی پارە

هاتبوون، دیارە ئەو لەو دوورگەیەدا کەسێکی تەندروست باش نەبوو، لە شارێکی (۲۵۰۰) کەسیدا وردە وردە جێگای خۆی دەکـردەوە. ڕۆژانـە باشتر فێری زمانی نەرویجی دەبوو، بەڵام خەمی دووریی لە دایک و خوشک و براکەی تەواو بێتاقەتی کردبوو، خەمی دووریی نیشتمان هێزی لەبەر بڕیبوو. شەوە درێژەکان بەبێ ڕۆژ زیاتر خەمباریان دەکرد. ئومێد هیچ هاوڕێیەکی نەبوو، لەو شوێنەدا کەس هاوڕێی کەس نەبوو، کەس لە هەواڵی کەسی نەدەپرسی، سەرماو تاریکیی کاری لە ژیانی هەموو کەس کردبوو. لە دەرەوەی کافتریاکە هیچ کەسێک ئومێدی نەدەناسی، لەوێ هەموو کەسێک لە شارو وڵات و خزم و کەسەکانی خۆیان دوورکەوتبوونەوە، هەمووان هەستیان دەکرد لەو دوورگەیەدا گرفتار بوون. ئەو خەڵکە یان لەبەر پەیداکردنی پارە، یان لەترسی زیندان و گرتن پەنایان هێنابوو بۆ ئەو تاریکستانە، تاریکستانێک کە ڕۆشنایی ڕۆژە بێ شەوەکانیشی خەم و پەژارەی پێوە دیاربوو. ئومێد بۆ گەڕانەوە بۆ نەرویج، یان هەر شوێنێک، بەتەواوی ئومێدی لەدەست دابوو. لێپرسراوان پێیانگوتبوو ناتوانێت هیچ کارێک بکات، لانیکەم دەبێت بۆ ماوەی (۹) ساڵ لەو دوورگەیەدا بمێنێتەوە تاکو دۆسیەکەی لە نەرویج پاکدەبێتەوە، دوای (۹) ساڵیش سێ بژاردەی لەبەردەستدا دەبێت.

۱-یان دووبارە داوای مافی پەنابەرێتی بکاتەوە لە وڵاتی نەرویج.

۲-یان لەگەڵ کچێکی نەرویجی، یان کچێکی وڵاتانی ئەندامی ئەوروپی هاوسەرگیریی بکات.

۳-یان داوای مۆڵەتی کارکردن بکات لە نەرویج.

هاوسەرگیریی باشترین ڕێگەچارەبوو بۆ ئەو، بەڵام لەو دوورگەیەدا کچێک نەبوو کە ئەو بتوانێت هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات. لەوێ کچانێک هەن کە ئەوانیش بۆ کارکردن و بەدەستهێنانی پارە هاتبوون. کچانی دانیمارکی، نەرویجی، سویدی، ئەڵمانی، ئیسپانی لە دوورگەکەدا کاریان دەکرد. کچانی فلیپینی زۆر هەبوون، بەڵام ئەوان بۆ پاسپۆرتی نەرویجی و هاوڵاتی نەرویجی نەدەبوون. سەیرکەن سیاسەت چۆن دڵی مرۆڤ ئاشکرا دەکات؟ لەم یەخچاڵەدا، هەمووان لەپێناو داهاتێک و لەپێناوی گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان دەژین. ئومید لەو زیندانەدا لەو شوێنە دوورەدا گیریخواردووە، نامەیەکی تەزویر ئەوی لە گۆشەیەکی تاریکی سەهۆڵبەندانی ئەم جیهانە وەک بزمار داکوتاوە.

ئومێد، ئومێدی لەدەست نەدا، بۆ ڕزگاربوون لە دڵەڕاوکێ و ئازاری ئێسقانەکانی، ڕوویکردە وەرزشکردن، ڕوویکردە یانەی وەرزشی. کاتێک من ئەوم بینی، نزیکەی حەوت ساڵ دەبوو لەو دوورگەیەدا بوو. کەسێکی وریاو گورجوگۆڵ بوو، ئەوەش وێنەکەیەتی کە دەیبینی.



ئومێد خوویدایە وێنەگرتن، کامێرای باشی کڕی، تفەنگ و فیشەکدان و چادرو پێویستییەکانی گەرمکردنەوەی کڕی. ڕۆژانی پشوو دەڕۆیشت بۆ دەرەوەی شار، وێنەی ڕێوی سپی و ورچە سپییەکانی دەگرت، وێنەکانی لە فەیسبووکەکەیدا بڵاودەکردەوە. هیچ کەسێک گرنگی بە وێنەکانی ئەو نەدەدا، دوای هەشت مانگ یەکەمین لایک و کۆمێنتی دەستخۆشی بۆ هات. ئومێد پارەی کۆکردەوەو ماتۆڕێکی لە جۆری (Snowmobile) SKOTER کڕی، ماتۆڕێک کە بەسەر بەفرو سەهۆڵبەنداندا دەڕۆیشت. ڕۆژانی پشوو سواری ماتۆڕەکەی دەبوو و دەڕۆیشتە دەرەوەی شار، کەم کەم ئومێد لە دوورگەکەدا وەک وێنەگرێکی سرووشتی ناوبانگی بڵاوبووەوە. وێنەکانی سەرنجی گەشتیارانی ڕاکێشابوو. ئەو گەشتیارانەی کە دەهاتن بۆ دوورگەکە دەیانگوت تەنها وێنەکانی ئومێد ئێمەیان ڕاکێشاوە بۆ ئەم دوورگە سەهۆڵبەندان و تاریکە. زۆرێک لە گەشتیاران وێنەکانی ئەویان دەکڕی. بەرواری (٢٠١٤/١٠/١٤) ڕۆژێکی گرنگ بوو بۆ ئومێد. ئەو

لەو ڕۆژەدا ناوبانگی باشی دەرکرد. یەکێک لە وێنەکانی بوو بە وێنەیەکی جیهانی.

لەو ڕۆژە تاریکەدا ئومێد بەمەبەستی وێنەگرتن لە شاری (لانگ یربایِن) ڕۆیشتە دەرەوەو ئەو ترسی ورچە سپییەکانی جەمسەری باکووری وەلانابوو، چەکەکەی ئامادەکردبوو، کامێرای وێنەگرتنی لەسەر بەفرەکە جێگیرکردبوو، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد ورچێک دەرکەوێت و ڕاوی بکات. کاتژمێر (٢:٣٠) بوو، لەناکاو ڕووناکییەک لە ئاسمانەوە دەرکەوت. ئومێد وای هەستکرد ئەوە ئەستێرەیەکی کلکداربێت، یان نەیزەکێک بێت لەکاتی کەوتنەخوارەوەدا، بەخێرایی چەند وێنەی لێگرت. وێنەکانی لە فەیسبووکدا بڵاوکردەوە، لایک و کۆمێنتێکی زۆری بۆ هات. ئاژانسی چاودێریکردنی ئاسمان ئومێدیان ئاگادارکردەوە کە هەندێک ڕوونکردنەوەیان پێبدات لەسەر ئەو وێنەیە. ئاژانسی هەواڵی ئاسمانی دڵنیابوو لەوەی کە ڕۆژی (٢٠١٤/١٠/١٤) کاتژمێر (٢:٣٠) هیچ نەیزەکێک و هیچ ئەستێرەیەکی کلکدار لە پانی (٨٠) پلەی باکوور بوونی نەبووە. داوایان لە ڕێکخراوە ئاسمانییەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا کردبوو تاکو زانیارییان پێ بدەن. دواجار بۆیان دەرکەوت ئەوە کەشتییەکی ئاسمانی ڕووسی بووە، لەکاتی کەوتنەخوارەوەیدا وێنەی گیراوە. کەشتییەک لە (١٩٨٠/١/٣١) ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان کرابوو، هەمان کەشتی لە بەرواری (٢٠١٤/١٠/١٤) دوای (٣٤) ساڵ مانەوەی لە ئاسمان کەوتۆتە خوارەوە.

ئومێد وێنەکەی خستبووە بەردەم زانایان. تۆش دەتوانیت لەسەر ئینتەرنێت سەیری وێنەکە بکەیت. من بەباشم نەزانی وێنەکە لێرەدا چاپ بکەم، بەڵام وریابن ئومێدی ئەبولحەسەنی دانیشتووی شاری (لانگ یربایِن) لەگەڵ ئومێدی یاریزانی تۆپێن لێتان تێک نەچێت. Langer bayean) Omid abolhasani) یا Svalbard

ئێستا ئومێد کەسێکی وەرزشکارو بەهێزە، لاوێکی کوردی وەرزشکار لە یەکێک لە خراپترین شوێنی ئەم جیهانە گیریخواردووە. ئایا فریاد ڕەسێک هەیە؟ ئایا ئومێدێک هەیە وەزارەتی دەرەوەی ئێمە پاسپۆرتێک بۆ ئەو لاوە کوردە ئازایە دەستەبەر بکات کە نموونەی ئازایەتی هەموو ئێرانیانە، نموونەی ئازایی هەموو کوردو تورکە، نموونەی لێپرسراوێتی و دڵسۆزیی بنەماڵەکەیەتی. ئەو بەهیچ شتێکی خراپ ئالودە نەبووە، ئەو لاوێکە ئارەزووی ئەوە دەکات دایک و خوشک و براکەی ڕزگار بکات، ئارەزووی ئەوە دەکات برا فەلەجەکەی بباتە لای دکتۆر، ئارەزووی ئەوە دەکات لە مهاباد چاوی بە

ئارەزووی خوشکی بکەویتەوە. واتە خوشکە گەورەکەی، ئومێد ئارەزووی ئەوە دەکات بەشداری ئاهەنگی بەشوودانی ئەفسانەی خوشکی بکات، ئەفسانە کە ئێستا تەمەنی بووە بە (٢٥) ساڵ.

بڕێکی زۆر لە ئارەزووەکانی لاوانی ئێمە بەهۆی کێشەی کەلتوورییەوە بەهەدەرچووە. چەندە دابونەریتی کۆن و کۆنەپەرستی لاوەکانی ئێمەیان لە گوندەکانەوە بەرەو شارەکان بردوون، چەندە لاوانی ئێمە لە شارە بچووکەکانەوە بەرەو شارە گەورەکان ڕۆیشتوون، لە شارە گەورەکانیشەوە کۆچیان کردووە بۆ وڵاتانی دەرەوە. لاوانی ئێمە سەریان بە بیابانەوە دەنێن و دڵیان بە دەریا دەبەستن و خۆیان دەگەیەننە جەمسەرە بەستووەکانی باکوورو باشوور، بەئومێدی ئەوەوە کە دڵەبەستووەکانمان خاو ببنەوە.

من بۆیە ڕۆیشتبووم بۆ جەمسەری باکوور، شتێک لەو بارەیەوە بزانم، ویستم لە نزیکەوە گۆڕانکارییەکانی ئەو ناوچەیە ببینم، ویستم لە نزیکەوە مەترسییەکانی توانەوەی بەستەڵەکی باکوور ببینم، ویستم ئەو مەترسییانە ببینم کە هەڕەشە لە ژیانی ورچە سپییەکانی باکوور دەکات. ئەو گەشتەی من لایەنێکی زانستی هەبوو، درکم بە گۆشەیەکی ژیان و کەلتووری خۆمان کرد. کەلتووری دژ بەیەک، کەلتووری ڕق و خۆشەویستی، کەلتووری زانایی و نەزانی. ئایا گەورە پیاوانی وەکو فیردەوسی، عەتارو مەولەوی و سەعدی و حافز نموونەی کەلتووری ئێمەن، یان زیاترن. ئایا دەکرێت بڵێین بە گوڵێک، یان چەند گوڵێک، بەهار نایات.

# پاپۆلی یەزدی لە بەڕازیل

**نووسینی: یوهان ئەردۆ والسیوا**
**زانکۆی ڕیۆدوژانیرۆی بەرازیل**

ئێمە چوار کەس خەڵکی ئەمریکای باشوور بووین، لە ساڵانی (١٩٨٨- ١٩٩٢) لە زانکۆی سۆربۆنی فەڕەنسا وانەمان دەخوێند بۆ وەرگرتنی دکتۆرا. سەرەتا ئاشنایەتیمان زۆر نەبوو بەیەکەوە، کە دەچووینە زانکۆ سڵاومان لە یەکتری دەکردو دوای زانکۆش خوداحافیزیمان لە یەکتری دەکردو دەڕۆیشتین. ساڵ و نیوێکمان بەوجۆرە تێپەڕاند، مامۆستایەکی ئێرانیمان هەبوو، بەشێوازێکی جوانی ئێرانیانە وانەی دەگوتەوە، ئەو خەڵکی وڵاتی ئێران و شاری یەزد بوو، لەسەر نەخشەش شاری یەزدی نیشانداین، پاشان گوتی: من بەشێوازی یەزدی و بە زمانی فەڕەنسی قسەدەکەم، ئەوە یەکەمین وتە بوو کە بووەهۆی خۆشی و شادی ناو پۆلەکە. ئەو ناونیشانی هەر یازدە خوێندکاری پۆلەکەی پرسی. دوای تەواوبوونی وانەی ئەو ڕۆژە گوتی: دەمەوێت چەند قسەیەک لەگەڵ هاوڕێیانی ئەمریکای لاتین بکەم. هەموو خوێندکارەکان ڕۆیشتن، تەنها ئێمە چوار کەسی ئەمریکای لاتین ماینەوە، هەر ئەوە بوو بووە هۆی دۆستایەتییەکی پتەو لەنێوان ئێمەو ئەو مامۆستا بەڕێزەدا. دواتر لەگەڵ ئەودا چەندین جار کۆڕو کۆبوونەوەمان ڕێکخست، هەندێکجار لە کۆبوونەوەکاندا نزیکەی (٢٧) کەس لە هاوڕێیانی ئەمریکای باشوور ئامادەییان هەبوو. کەسانێک لە سەرتاسەری کیشوەری ئەمریکای لاتیندا کە تاکو ئێستاش ئەو هاوڕێیەتییەمان بەردەوامیی هەیە، لەنێوان ئێمەی خوێندکارانی جوگرافیا، کە ڕاستەوخۆ خوێندکاری دکتور پاپۆلی بووین، هەموومان هاوخوێنی یەکتری

بووین، لەنێوان کۆڕو کۆبوونەوەکانی خۆشماندا کە زیاتر لە بەشی ناوخۆی زانکۆی پاریس ئەنجامدەدرا، هەمیشە باس باسی کۆڕو کۆبوونەوەکانی پرۆفیسۆر پاپۆلی بوو، بەجۆرێک کە ئێمە زمانی خۆمان پورتوگالی بوو، بەڵام هەمووومان بەیەکەوە بە زمانی فەرەنسی قسەمان دەکرد. زۆربەی شەوەکان ئێمە نانی ئێوارەمان بەیەکەوە دەخوارد، یا بەیەکەوە دەچووین بۆ ڕێستۆرانتی زانکۆ، یا بۆ ڕێستۆرانتەکانی تری ناوشار، چەندجارێکیش بەیەکەوە گەشتی یەک ڕۆژە، یا چەند ڕۆژەمان دەکرد لە ناوخۆی فەرنسادا. ئەو هاوڕێیەتی و دۆستایەتییەی ئەوکاتە دروستبوو لەنێوانماندا تا ئێستاش بەردەوامیی هەیە، بەجۆرێک هەفتە نییە من بۆ دوو سێ کەس لەو هاوڕێیانەی کە بەیەکەوە بەشداریمان کردووە لە کۆبوونەوەکانی پرۆفیسۆر پاپۆلیدا، لە وڵاتانی تری ئەمریکای لاتین، تەلەفۆنێک نەکەم، یان ئیمەیڵێک نەنێرم. هەندێک لەو هاوڕێیانە ئێستا لە وڵاتەکانی خۆیاندا لێپرسراوێتییان هەیە، لە سەرۆکایەتی زانکۆو سەرۆکی نەخۆشخانە تاکو وەزیر. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە تاکو چەندین ساڵ دوای ڕۆیشتنی پرۆفیسۆر پاپۆلی هەموو کۆڕو کۆبوونەوەکان هەر بەناوی ئەوەوە بوون.

ئەو بابەتە کۆمەڵایەتییانەی کە پرۆفیسۆر پاپۆلی لە کۆرسەکاندا پێیدەگوتین، زۆر چێژبەخش بوون بەلامانەوە. ئەو لە هەر کۆرسێکدا بابەتی کۆرسەکانی دواتری دیاری دەکردو کەسێکی دیاری دەکرد لەسەر بابەتەکانی پێشتر قسە بکات. من لەم کۆڕانەدا شتێک فێربووم کە لە هیچ شوێنێکی تر فێر نەبووم، بۆ نموونە پاپۆلی داوای لە خانمی دکتۆر (گ ئەستۆئیز ئەستیت)ی پسپۆڕی خوێن کرد کە خەڵکی ئۆرۆگوا بوو هاتبوو بۆ فەرەنسا، ماوەی شەش مانگ لەبارەی نەخۆشی ئایدزەوە لێکۆڵینەوە بکات. ئەوسەردەمە تازە باس لە لێکۆڵینەوە لەسەر ئایدز دەکرا، ئەو دەیویست لەو بارەیەوە قسەمان بۆ بکات، وتەکانی ئەو زۆر سەرنجڕاکێش بوون، من خۆم کە بەڕازیلیم، لەسەر ئەو کۆڕانە دووجار کۆنفرانسم بەستووە.

من سوودێکی زۆرم لە سیمینارەکانی دکتۆر پاپۆلی بینی، بەڵام گەورەترین بەهرە کە وەرمگرتووە لەدوای ئاشنابوونم بوو بەو، ئەو فێریکردم کە چۆن لە دەوری یەکتری کۆببینەوە، چۆن چێژ لە ژیان وەربگرین، چۆن کاری بەکۆمەڵ ئەنجام بدەین. ئەو هۆنراوەی شاعیرە ئێرانییەکانی بۆ دەخوێندینەوەو بۆی دەکردین بە فەرەنسی، تاڕادەیەک ئێمەی ئاشناکرد بە ئەدەبیاتی دەوڵەمەندی ئێرانی، ئەدەبیاتێک کە فێری

مرۆڤایەتی و لێک تێگەیشتن و ئاشتی و سازانت دەکات. ئێمەش لە کۆڕەکاندا باسی شاعیری گەورەی ئەمریکای لاتینمان دەکرد، وەک سیزەری شاعیری گەورەی ئێمە، هۆنراوەکانمان دەخوێندەوەو هاوڕێکانیشمان گیتاریان لێدەدا.

لە ساڵی (١٩٩٥)دا ئێمە چەند کەسێک لە هاوڕێیانی ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەی پاریس، لە وڵاتی خۆماندا نیشتەجێبووین. بڕیار وابوو لە (ڕیۆدوژانیرۆ) کۆببینەوە (ماریو ڕودرس) کە مامۆستای زانکۆکەمان بوو، پێشنیاری کرد پرۆفیسۆر پاپۆلی بانگهێشت بکەین، ئێمە هەموومان پێشوازیمان لەو پێشنیارە کرد. کاتێک (ژولیوس دی خوزە) کە ئەوکاتە جێگری وەزیری گەشتوگوزاری بەڕازیل بوو، بەم بابەتەی زانی، پێشنیاری کرد پرۆفیسۆر پاپۆلی بانگهێشت بکەین بۆ ئەو کۆنفرانسەی کە لە شاری (ڕیۆ) دەبەسترا سەبارەت بە گەشتوگوزار، جگەلەوەش لەدوای کۆنفرانسەکە بەشداری پێ بکەین لەو سیمینارەی کە لە شاری (ڕسیف) دەبەسترا، بۆیە دەبووایە پرۆفیسۆر پاپۆلی بۆ ئەو سیمینارەش بانگهێشت بکرێت. هەر بەو هۆیەشەوە کێشەی خەرجی گەشتەکەی پرۆفیسۆر پاپۆلی چارەسەرکرا. لەگەڵ پرۆفیسۆردا قسەم، کرد کە ئەوکاتە لە پاریس بوو، ئەویش ڕەزامەندی دەربڕی و بەرنامەکەی بۆ ئەو گەشتە لانیکەم بیست ڕۆژ درێژە دەکێشێت، بەپێی بەرنامەکە دەبووایە ئەوان پێنج ڕۆژ لە (ڕیۆدوژانیرۆ) بمێننەوەو دوو ڕۆژی تریش لە (ڕسیف). پاشان لە ڕسیفەوە بە ڕێگای زەمینی بڕوات بۆ (بەلم) لە ڕسیفەوە تا بەلم نزیکەی (١٨٥٠) کیلۆمەتر ڕێگایە. ڕێگاکە دەکەوێتە سەر هێڵی ئیستوا، لەو ناوچەیە هەوا زۆرگەرمەو ناوچەکەش هەمووی زەلکاوە، بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکان هەندێکجار دەبووایە دەیان کیلۆمەتر لە ڕۆخی ڕووبارەکە دووربکەوێتەوەو دووبارە بگەڕێتەوە بۆ جادەی ڕۆخی ڕووبار. بەرنامەکە بەجۆرێک بوو کە پرۆفیسۆر پاپۆلی دوو ڕۆژ لە (بەلم) بمێنێتەوە، پاشان لەوێوە بڕوات بۆ (ماکایا)و لەوێشەوە بە کەشتی و لە ڕێگای ڕووباری ئەمازۆنەوە تا (ئۆبیدۆس) بڕوات. پرۆفیسۆر پاپۆلی پێشنیاری کردبوو ئەگەر فڕۆکە هەبێت لەوێوە بڕوات بۆ (لیما)ی پایتەختی پیرۆ، پاشان بگەڕێتەوە بۆ پاریس. (ژولیوس دی خوزە) تەواوی خەرجییەکەی لەئەستۆ گرتبوو. من حەزم دەکرد لەو گەشتە درێژەدا لەگەڵ مامۆستای بەڕێزمدابم، بەڵام ڕاستییەکەی دابینکردنی خەرجی گەشتەکە بۆ من دژوار بوو. (ژولیوس دی خوزە) کێشەکەی چارەسەر کرد. ئەو هاوڕێی سەرۆکی زانکۆ بوو، کارێکی کرد کە

زانکۆی (ڕیۆ) من وەکو کارمەندێکی لێکۆڵینەوە دیاری بکات.

پرۆفیسۆر پاپۆلی بۆ گەشتێکی (٢١) ڕۆژە بانگهێشتی بەڕازیل کرا، هەموو هاوڕێیان لە سەرانسەری ئەمریکای لاتین لە (ڕیۆدوژانیرۆ) ئامادەبوون لە پێشوازیدا. دوای چوار ساڵ، هەژدە کەس لە هاوڕێیانی پاریس لەدەوری یەکتری کۆبووینەوە. بڕیار وابوو من لەم گەشتەدا لەگەڵ مامۆستاکەمدا بم، بەڵام دووکەسی تر لە هاوڕێکانم حەزیان دەکرد ئەوانیش لە گەشتەکەدا لەگەڵماندا بن. لەسەر ڕاسپاردەی (ژولیوس دی خوزە) کۆمپانیایەکی گەشتیاریی خەرجی ئەو دوو هاوڕێیەی ئێمەی لەئەستۆ گرتبوو، بەمەرجێک ڕاپۆرت و وێنەکان پێشکەش بە کۆمپانیاکە بکەین.

سەرەنجام پرۆفیسۆر پاپۆلی لە پاریسەوە بەڕێکەوت و هات بەرەو بەڕازیل، مامۆستا بەگەیشتنی بۆ فرۆکەخانەی (ڕیۆ) سەری سوڕما، ئەو هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی نەکردبوو هەژدە کەس لە هاوڕێیانی کۆبوونەوەکانی پاریس لە فرۆکەخانە لەپێشوازیدا بن، من هەرگیز فرمێسکی خۆشییەکانی ئەو لەیاد ناکەم. ئەو یەکە یەکە هاوڕێکانی خۆی ناسییەوەو بەناوی خۆیانەوە ناویبردن. ئاخر دەزانی ئێمەی هاوزمانی ئیسپانی و پورتوگالی ناوی دوورو درێژمان هەیە، بەلای ئێمەوە زۆر خۆشبوو کە دوای چەندین ساڵ ئەو ناوی هەموومانی بیرمابوو، ئێمە هەموومان پێنج ڕۆژ بەیەکەوە لە ڕیۆ بووین، کاتێکی خۆشمان بەیەکەوە گوزەراند، ئەوە یادەوەرییەکە کە هەرگیز لەیاد ناچێت.

بۆ ڕۆیشتن بۆ (ڕسیف)و بەردەوامی پاشماوەی گەشتەکە من لەگەڵ دکتۆر (ڕودرسو ساور)، کە خەڵکی پیرۆ بوو، هەروەها بە هاوڕێیەتی (عەما نوئیل ئوجداواب)، کە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی ئاوی کانزایی بوو لە شیلی لەگەڵ مامۆستادا کەوتینەڕێ.

ئەو گەشتە یەکێکە لە جوانترین یادەوەرییەکانم لە هەموو ژیانمدا، من کە لە وڵاتی خۆمدابووم، هەستمکرد لە زۆرشتا ئەوەندەی پرۆفیسۆر پاپۆلی شارەزایم نییە لەبارەی سەرزەمین و خەڵکی و وڵاتەکەمەوە. شاری (ڕیۆدوژانیرۆ) چەندین گەڕەک و ناوچەی نائارامی هەیە، کە بە ڕۆژی ڕووناک ناتوانیت بەئاسودەیی پێیدا گوزەر بکەیت. ئەو شەوانەی کە پرۆفیسۆر پاپۆلی لە (ڕیۆ) بوو هەر شەوەو دەچوو بۆ ناوچەیەکی ترسناکی شار، دەچوو بۆ شوێنێک کە زۆرێک لە هاوڕێکانمان بە بەهانەی جۆراوجۆرەوە لەگەڵماندا نەدەهاتن. شەوی سێیەم (ژۆلیۆس) دوو کارمەندی چەکداری

نهێنی بۆ دابینکردین. دکتۆر پاپۆلی دژی ئەو کارە بوو، ئەو دەیگوت: ئەگەر خەڵکی بزانن ئەو کارمەندانە لەگەڵ ئێمەدان، گومانمان لێدەکەن و وەڵامی پرسیارەکانمان بەڕاستی نادەنەوە. ئەو دەیگوت: بوونی ئەم چەکدارانە دەبێتەهۆی ئەوەی ئەو خەڵکە شەڕمان لەگەڵدا بکەن و تووشی دەردیسەری ببین. لە دەوروبەری کاتژمێر (١٠-١١) ی شەو دکتۆر پاپۆلی چووە نێو کوخە بەتەنەکە دروستکراوەکانی قەراغ شاری (ڕێۆ) و تێکەڵاوی خەڵکی بوو. داوای لە ئێمە کرد پرسیارەکانی ئەو و وەڵامەکانی ئەو خەڵکانەی بۆ وەربگێڕینە سەر زمانی فەڕەنسی. لە شەوی سێیەمدا کە کارمەندەکانمان لەگەڵدابوون، پێشبینییەکەی دکتۆر پاپۆلی ڕاست دەرچوو، لە یەکێک لە گەڕەکەکانی دەوروبـــەری شـاری (ڕێـۆ) هێندەی نەمابوو تێکهەڵچوونی چەکدارانـە لـە نێوان پاسەوانەکانی ئێمەو خەڵکی گەڕەکەکە ڕووبدات. پاسەوانەکانی ئێمە داوای هاوکارییان لە هێزی ئاسایشی شار کرد، بەڵام پرۆفیسۆر پاپۆلی تکای لە پاسەوانەکان کرد کە ئەوان بڕۆن و ئێمە پێویستمان پێیان نییەو خۆمان پارێزگاری لە خۆمان دەکەین. پاشان بە ئێمەی گوت: بەخاوەن ماڵەکان بڵێن ئێمە میوانی ئەوانین، ئەو دڵنیابوو کە وشەی میوان کلیلی کردنەوەی دەرگای هەموو ناوچە هەژارنشینەکانی جیهانە. مامۆستا بە زرنگی و هۆشیاری خۆی کارێکی کرد کە لەهەمان گەڕەکدا کە شەوی سێیەم بەهۆی بوونی پاسەوانەوە خەریک بوو تێکهەڵچوون ڕووبـدات، کەچی خەڵکەکە بۆ شەوی دواتر ئێمەیان بانگهێشتی ماڵەکانی خۆیان کرد. شەوی دواتر بەمیوانی چووین بۆ ماڵەکان، دانیشتووانی ئەو کوخە بچووکانە پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین. کەسێک لەوێ پێیگوتم: ئێمە بڕیارمان دابوو ئەگەر ئەمشەو ئەو کارمەندانەتان لەگەڵ بێت کە چەکەکانیان لەژێر جلەکانیاندا شاردبووەوە، ئەوا پەلامارتان بدەین، بەڵام ئەگەر خۆتان بەتەنها هاتن، واتە باوەڕتان بە ئێمە هەیەو ئێمەش هەرچییەک لە تواناماندا بێت خزمەتتان بکەین. تاکو نیوەی شەو لە ماڵێک دانیشتبووین، جگە لە ژاژ و قامیش کە لەناو ژوورەکەدا ڕایانخستبوو، لەگەڵ چەند کورسییەکی شکاو و مێزێکی شکاو، هیچ شتێکی تر لە ماڵەکەدا نەبووە. نزیکەی چل کەس لە خەڵکی گەڕەکەکە هاتن و لە دەورمان کۆبوونەوە، شەوێکی خۆشیان بۆ پێکهێنابووین. باشترین گۆرانیبێژو گیتارژەنی گەڕەکیان هێنابوو، ئاهەنگێکی خۆشیان بە گۆرانی و مۆسیقاو سوڕدانەوە سازکردبوو. پرۆفیسۆر پاپۆلی گوتی: ئەم خەڵکە هەژارە کە زۆرێک لەوان ژیانیان

لەسەر کاری دژایەتی و تاوان و تاوانکارییە، بەڵام کەسانی گەرموگوڕو خۆشگوزەرانن، تەنها پێویستە کارێک بکەین کە باوەڕیان پێمان هەبێت.

لە (ڕسیف) دکتۆر پاپۆلی دەیویست بڕوات بۆ گەڕەکێک کە (خوزە دوکا سترۆ) لە کتێبی (مرۆڤەکان و قرژاڵەکان)دا باسی لێوەکردووە. دەیویست بڕوات بۆ کەناری دەریا، دەیویست بڕوات بۆ دوورگەیەکی گەورە، کە چەند کیلۆمەترێک لە قەراغ دەریاکەوە دوور بوو، بەڵام ئەو شوێنە کەنار ئاوێکی هەژارنشین و شوێنی تاوانکارییە. ئامادەکارانی سیمینار هەمان شەو بەخۆشی میوانەکانەوە کۆڕێکی شەوانەیان لە ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەیی شاردا ڕێکخستبوو. مامۆستا گوتی: میوانداریی لە هەموو ئوتێلە پێنج ئەستێرەکانی دنیادا یەک جۆرو یەک دیمەنە، بەڵام کەنار ئاوەکانی (ڕسیف) جێگایەکە من لە تەمەنی (٢٠) ساڵییەوە ئارەزووی بینینی دەکەم، ئەو سەرەنجام ئێمەی لەو کۆڕە شەوانییەی هۆتێل و لەو هەموو خواردنە زۆرو بەلەزەتە بێبەشکرد، تاکو لە کەناری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و لە ڕێستۆرانتێکی بچووکدا خواردنی قرژاڵ بخۆین و یادەوەریی کتێبی (مرۆڤەکان و قرژاڵەکان) ڕاستەوخۆ لە خەڵکی بپرسین. ئەو لە (ڕسیف) ژمارەی تەلەفۆنی کەسێکی لابوو، کەسەکە زمانی فەرەنسی دەزانی، ئەو کەسەش زیاتر لە پانزە ساڵ لەزینداندا بووە، ئێمەش هەموومان بۆ نانخواردنی ئێوارە میوانی ئەو پیاوە بووین.

بەرنامەی گەشتەکەی ئێمە لە (ڕسیف)ەوە دەستپێکرد. (ژولیوس) هەندێک پارەی بە من دابوو بۆ خەرجی ڕێگا. ویستم ئۆتۆمبێلێک بەکرێ بگرم لە ڕسیفەوە بۆ بەلم. لەهەمان کاتدا لەم گەشتەدا نیگەران بووم، جگە لە کێشەی خراپیی ئاووهەوا، کێشەی ئاسایش و کۆمەڵایەتی ڕێگا زیاتر نیگەرانی کردبووم، جگەلەوەش مەرجەکانی تەندروستی لە هێڵی ئیستیوا هیچ کاتێک جێگای ڕەزامەندی نەبووە. (گابرێلا)ی برای (ئاغیلۆ) هاوڕێیەک بوو کە پرۆفیسۆر پاپۆلی پەیدایکردبوو، ئەو زۆر بەخراپی زمانی فەرەنسی دەزانی، لە ڕووخساریدا دیاربوو کەسێکی قۆڵبڕو سەربەگۆبەند بوو. بڕیار وابوو ئەو بە ئۆتۆمبێلی خۆی ئێمە تاکو (سائۆلوئیس) ببات، واتە نزیکەی (١٥٠٠) کیلۆمەتر ڕێگا. بەمامۆستام گوت: لە بەڕازیل نابێت بڕوات بە کەسانی نەناسراو هەبێت، بەڵام پرۆفیسۆر پاپۆلی گوتی: (گابرێلا) کەسێکی نەناسراو نییە. ئەگەرچی گابرێلا پانزە ساڵی تەمەنی بەهۆی تاوانکاری و شەڕەنگێزی لە زینداندا بەسەر بردووە، بەڵام

کەسێکی وریایەو لێی دڵنیام. جگەلەوەش ئەو ڕێگایەی ئێمە پێیدا دەڕۆین پڕیەتی لە کەسانی تاوانکارو شەڕانی، بۆیە پێویستە کەسانی وەک گابرێلا شارەزاو ڕێنوێنیکەرمان بێت، تابتوانین لەدەست چەتەو ڕێگرەکان ڕزگارمان ببێت.

سەرەنجام بەدڵەڕاوکێ و نیگەرانییەوە بەڕێکەوتین، پێویستە ئەوەش بڵێم ئەگەر پەیوەندی مامۆستاو خوێنکاری نەبووایە، پێشنیارەکەی دکتۆر پاپۆلیم قبوڵ نەدەکرد، لانیکەم کە من بەڕازیلی بووم و لێپرسراوێتی گیانی مامۆستاکەم و دوو هاوڕێی خەڵکی وڵاتانی پیرۆو شیلی لە ئەستۆی من بوو، مەحاڵ بوو کە ڕێگە بدەم بە ئۆتۆمبێلی کەسێکی تاوانبار گەشت بکەین. نزیکەی حەفتا کیلۆمەتر لە شار دوورکەوتبووینەوە تازە زانیم کە گابرێلا چەکدارە، دەمانچەیەکی حەوت تیرو تفەنگێکی زۆرباشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. (ئوجداواب) کاتێک زانی گابرێلا چەکی پێیە. گوتی: من هەلێکم بۆ هەڵکەوێت دەگەڕێمەوە. (ماریوردرس) وێنەی سەلیبێکی لەسەر سنگی خۆی کێشاو خۆی بەخودا سپاردو بە زمانی پورتوگالی گوتی: خودایە لەم ڕێگا دوورەو لەدەست ئەم کەسە چەتەو پیاوکوژە بمانپارێزە. دکتۆر پاپۆلی پێیگوتین: مەترسن، دڵنیابن خودا دەمانپارێزێت. ئێمە گوتمان: تۆ بڵێیت مامۆستا زمانی پورتوگالی بزانێت؟ وەک ئەوەی دکتۆر شتێک تێگەیشتبێت. گوتی: من زمانی پورتوگالی نازانم، بەڵام ئەو زمانی (ماریۆ) ی بەکاریهێنا کە ڕیشەی دەچێتەوە سەر زمانی فەڕەنسی. پاشان بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: هەوڵبدەن نەترسن. من زۆر شەرمەزار بووم، لەوکاتەدا هەوڵمدا زیاتر قسە لەگەڵ گابرێلا بکەم و لێپرسراوێتی خۆم بسەپێنم. لێرەدا دوو هاوڕێکەی ترمان بە زمانی ئیسپانی قسەیان دەکردو شارەزاییەکی وایان لە زمانی پورتوگالی نەبوو، بەڵام گابرێلا لە زینداندا فێری زمانەکانی ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئیسپانی ببوو، هەرچەندە لە قسەکردندا زمانێکی بازاڕیی بەکاردەهێنا.

گەشتکردن لەو ناوچەیەدا هاوتایە بە گەشتکردن لە هێڵی ئیستیوادا، گەشتکردن لەو ناوچەیەدا بە قسە زۆر ئاساییە. هەوای گەرم و شێدار، جۆرەها زیندەوەرو مێش و مێشوولە، جادەیەکی خراپ، نەبوونی ئاوێکی باش بۆ خواردنەوە، خەڵکانی دڵڕەق و هەندێک کێشەی تر هەلومەرجێکی خراپیان هێنابووە پێش. پێمان سەیربوو دکتۆر پاپۆلی لەو هەلومەرجە نالەبارەدا چێژی وەردەگرت، قسەکانی و چیرۆکەکانی و یادەوەرییەکانی و پرسیارەکانی کە لە خەڵکی ناوچەکەی دەکرد، بەلای ئێمەوە زۆر سەرنجڕاکێش بوون.

جگەلەوەش دکتۆر پاپۆلی هانی گابرێلای دەدا کە چیرۆک و یادەوەرییەکانی خۆی و هاورێکانی لە زینداندا بۆ باس بکات. یادەوەرییەکانی گابرێلا هەندێکجار زۆر ناخۆش و ترسناک بوون. دوو ڕۆژی یەکەم هیچ شتێکی ئەوتۆ ڕووی نەدا، نزیکەی هەشت سەد کیلۆمەتر ڕێگامان بڕیبوو. هەرچەندە لە (ڕسیف) دووردەکەوتینەوە، لە ناوچەی (ئەمازۆن) نزیکتر دەبووینەوە. هەلومەرجی سرووشتی و کۆمەڵایەتی گۆڕانکارییان بەسەردا دەهات و ڕێگاکەش خراپتر دەبوو. ڕۆژی سێیەم کاتی نیوەڕۆ گەیشتینە نزیک شاری (پارا) گابرێلا لە جادە گشتییەکە لایدا، واتە لە دەریا دووورکەوتەوەو بەرەو دارستان ڕۆیشت، کاتێک هۆکاری لادانەکەمان لێپرسی، گوتی: ئەم زەوییەی کە دەیبینن لێرەوە تاکو نزیکەی چل کیلۆمەتر کێڵگەی هاوڕێیەکیەتی. گوتی: قسەم لەگەڵ ئەو هاوڕێیەمدا کردووە کە نانی نیوەڕۆ لای ئەو دەخۆین. ئێمە سێ کەسمان ڕەنگ لەڕوومان بڕاو زۆر ترساین، نەماندەزانی بە چ زمانێک بەیەکەوە قسەبکەین تاکو گابرێلا تێنەگات، بە هەر زمانێک قسەمان بکردایە ئەو تێدەگەیشت. دکتۆر پاپۆلی گوتی: مەترسن جێگای ترس نییە، من پێشتر لەو بارەیەوە لەگەڵ گابرێلادا قسەم کردووە.

هاوڕێیانی گابرێلا لە کێڵگەکە چاوەڕوانی ئێمە بوون، کێڵگەیەکی قاوە بەتەنیشت دارستانەکەوە بوو، پانتاییەکی زیاتر لە شەش سەد هێکتار زیاتر دەبوو. تێگەیشتم کە گابرێلا بازرگانی قاوەو بەرهەمەکانی ترە، لە هەمانکاتدا کاری قاچاخچییەتی دەکرد. لە کێڵگەکەدا بەشێوازێکی شاهانە پێشوازییان لێکردین. کاتێک ڕەفتاری خاوەن کێڵگەکەو خزمەتەکەیانم بینی بەرامبەر بە گابرێلاو ئێمە، ترسمان شکا. هەربۆیەش بە هاوڕێکانم گوت: واهەست دەکەم ئیتر هیچ ترسێکمان لەسەر نییە. (ڕودرس) گوتی: داهاتی یەک ڕۆژی ئەم کێڵگەیە ئەوەندەی یەک ساڵی ئێمەی مامۆستا دەبێت، خۆ ئەگەر ئەمانە دزیش بن، ئێمە شتێکمان نییە تا لێمان بدزن، بۆیە واباشترە هێمن بین. خاوەن کێڵگەکە پێشنیاریکرد شەو لەلای ئەوان بمێنینەوە، هاوسەرەکەشی خۆشحاڵبوو بە قسەو بیرەوەرییەکانمان و ئەو هۆنراوانەی دکتۆر پاپۆلی دەیخوێندنەوە. بۆیە ئەویش زۆر پێداگریی کرد کە شەو بمێنینەوەو سبەی بەیانی زوو بەڕێبکەوین. منیش بە دکتۆر پاپۆلیم گوت: لەوەیە لە بەرنامەکەمان دوابکەوین. ئەویش گوتی: کام بەرنامەیە؟ هیچ کەسێک چاوەڕوانی ئێمە ناکات؟ ئەو بەردەوام بوو لە قسەکانی گوتی: ئێمە هاتووین بۆ ئەم ناوچەیە تاکو لەگەڵ خەڵکانی ئێرە پەیوەندی بگرین و سرووشتی ئێرە ببینین.

لەمە باشترو هەرزانتر لەکوێ دەتوانین لەگەڵ خەڵکیدا پەیوەندی بگرین و لەنێو دڵی سرووشتدابین، ئەو بە پێکەنینەوە پێیگوتم: من لە ئێران و تەنانەت لە ئەورووپاش هەمیشە لەنێوان دڵی سرووشت و لەنێو خەڵکی لادێکاندام، تۆش لەنێو شاردا خۆت لە چیمەنتۆ گرتووە، هەربۆیەش دڵت وەک چۆلەکەیەکی لێهاتووە هەمیشە لەترس و نیگەرانیدایت. دەمزانی کە دکتۆر پاپۆلی چەندینجار ڕۆشتووە بۆ دوورترین شوێنی ئەفریقا، بۆ ناوچەیەک کە لەوەیە لەم ناوچەیەی بەڕازیل ترسناکتر بێت، بەڵام دووبارە لەدڵی خۆمدا گوتم خودا ئاکاممان بەخێر بگێڕێت.

کاتی عەسر نزیکەی پانزە کەس بە چەند ئۆتۆمبێلەوە دەسمانکرد بە گەڕان بەلای دارستانەکەدا، سەیری ئەو دیمەنە جوانەمان دەکرد کە بەڕاستی مرۆڤ لەو جوانییە سەری سوڕدەما. هەموو پێویستییەکانمان بە خواردن و خواردنەوە لەلابوو، شەوێکی زۆر خوشمان بەڕێکرد، دەنگی گیتارو سوڕدانی کرێکارانی کێڵگەکەو دەنگە بەسۆزەکەی گابرێلا زۆر خۆشبوو بەلامانەوە. دەتوانم بڵێم ئەگەر گابرێلا بەشوێن ئاواز و گۆرانی بکەوتایە، دەبووە یەکێک لە ئەستێرە دیارەکانی هونەر لە بەڕازیلدا. لە درێژەی گەشتەکەماندا تێگەیشتم کە یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەی گابرێلا لە هەموو شوێنێک دۆست و ئاشنای هەیە، هی دەنگە بەسۆزەکەی و لێدانی گیتارەکەیەتی. بە شەو هەوا گەرمبوو، دەمانتوانی لە ژوورێکی تایبەت و خۆشدا بخەوین، بەڵام دکتۆر پاپۆلی حەزیدەکرد لە هەیوانەکەو لەنێو پەردەکوللەدا بخەوێت، بەڵام من مامۆستاکەم جێهێشت و خۆم چووم لە ژوورێکی جوان و خۆشدا لێی خەوتم، ئەو بەڕاستی دەیگوت حەزدەکات لەنێو سرووشتدا بێت. پێویستە بڵێم ئەو سرووشتە چەندە بۆ دکتۆر پاپۆلی تازەبوو، بۆ منیش هەر تازە بوو، ڕاستە من خەڵکی بەڕازیلم، بەڵام هەرگیز نەهاتبووم بۆ ناوچەی هێڵی ئیستیواو دارستانەکانی دەوروبەری ئەمازۆن. شوێنی ژیانی من تاکو ئەو شوێنەی کە لێی بووین، نزیکەی سێ هەزار کیلۆمەتر دوور بوو، هەربۆیەش تەواوی ئەو دیمەنە جوانانە، بۆ منیش سەرنجڕاکێش و جوان بوون، بەڵام من لەوەی کە لە ناوچەی ئیستیوائی شەو لەدەرەوە بخەوم، دەترسام، هۆکاری نەهاتنیشم بۆ ئەو ناوچەیە، نەبوونی ئاسایش و هەلومەرجی ناجێگیری سرووشت و خەرجییەکی زۆر بوو، بەڵام لەم گەشتەمدا کە هەلێک بوو بۆم هەڵکەوتبوو، هەمیشە لە ترس و نیگەرانیدا بووم.

بەیانی نانێکی باشمان خواردو کەوتینەڕێ، هاوسەری خاوەن کێڵگەکە هەندێک خواردن و میوەی بۆ پێچاینەوەو کڵاوێکی جوانی بە حەسیر چنراویشی پێشکەش بە دکتۆر پاپۆلی کرد. گابرێلا زۆر خۆشحاڵبوو، بەردەوام گۆرانی دەگوت. دکتۆر پاپۆلی لێی پرسی گابرێلا لەکوێ ئەم خاوەن کێڵگەیە دەناسیت؟ ئەویش گوتی: ئەو یەکێکە لە هاوڕێ کۆنەکانی زیندانم، لەگەڵ ئەودا حەوت مانگ لە یەک ژووردا بووین وّ ئەو بە تاوانی ڕێگریی و پیاوکوشتن زیندانی کرابوو. مامۆستا لێیپرسی ئەو لەسەر تاوانی کوشتن زیندانی کراوە؟ گابرێلا گوتی: ئەگەر بڵێم کوشتنی مرۆڤ بەلای (مونچۆوە) وەک کوشتنی چۆلەکەیەکی ئەو دارستانە وایە، درۆم نەکردووە، بەڵام ئەو ڕێزی هاوڕێکانی زۆر دەگرێت. ئنجا گوتی: ئەو کەسێکی زۆر بەڕێزە لەگەڵ هەر کەسێکدا دۆستایی بکات، هەرگیز پشتی بەرنادات.

لەکاتی ڕۆیشتنماندا لە هەندێک شوێن جادەکە زۆر خراپ و ترسناک بوو، چونکە ئەو ناوە هەمووی زەلکاو بوو، ئەوکات هێشتا جادە تازەکەی قەراخ دەریا تەواو نەببوو، لە هەندێک شوێن لافاو بەتەواوی جادەکەی تێکدابوو، لە هەندێک شوێنیش دەبووایە لە ئاوێکی زۆر بپەڕینەوەو پردیش دروست نەکرابوو، زۆر بە دژوار لە ئاوەکان دەپەڕینەوە. گابرێلا گوتی: ئەمڕۆ تاکو نیوەڕۆ ناتوانین لە سەد کیلۆمەتر زیاتر ڕێگا ببڕین، بەڵام دواتر ڕێگاکە باشتر دەبێت. دوای کاتژمێرێک بارانبارین دەستی پێکرد، بارانێکی بەخوڕ و ڕێژنە، من تا ئێستا بارانی بەو جۆرەم نەبینیوە، مەگەر جاروبار لە تەلەفزیۆن بینیبێتم. ئۆتۆمبێلەکەمان نەیدەتوانی بڕوات، چونکە گابرێلای شوفێر پێش چاوی خۆی نەدەبینی. گابرێلا ئۆتۆمبێلەکەی لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرز وەستاند، تاکو ئەگەر لافاویش هات، زیانمان پێنەگات، لەوکاتەدا دکتۆر پاپۆلی بلوزەکەی داناو چوو لەدواوەی ئۆتۆمبێلەکەوە سواربوو، وەک ئەوەی لەژێر بارانی ئیستیوائیدا خۆی بشۆرێت. بارانەکە دڵۆپەکانی گەورە بوون، وەک ئەوە وابوو بە شەلاق لەپشتی بدرێت. کەم کەم خەریکبوو لەگەڵ دکتۆر پاپۆلیدا ڕادەهاتم، ئیتر پێم نەدەگوت ئەو کارە بکە، یان ئەو کارە مەکە. بارانبارینەکەی زۆر بەهێز بوو، دکتۆریش لەژێر بارانەکە لێی دانیشتبوو. ئوجدا گوتی: پێستی لەشی خەریکە دەخوسێت. کاتێک بارانەکە خۆشیکردەوە، دکتۆر هاتەوە ناو ئۆتۆمبێلەکەو بەڕێکەوتینەوە. ئینجا گوتی: بەچیدا دیارە کە خودا جارێکیتر ئەم نیعمەتەم بەنسیب دەکاتەوە، من خەڵکی بیابانم، بیابانێک لەماوەی بیست ساڵدا یەک

کاتژمێر بارانی لێ نابارێت، ئەگەر دەمتوانی تەواوی ئەم بارانەم بەدیاری دەبردەوە بۆ هاوشارییەکانم.

لەدوای تەواوبوونی بارانەکە، ئیتر هەوا خۆشبوو، بەڵام جادەکە تەواو خراپ ببوو، کاری شۆفێریکردن بۆ گابرێلا زۆر ناخۆشبوو. (ئۆجدا) پێیگوتم: ئەگەر ئۆتۆمبێلی حکومەتمان پێبووایە، شۆفێرەکەی بۆڵەبۆڵی بەسەردا دەکردین، خۆ ئەگەر ئۆتۆمبێلی کرێمان بهێنایە، ئەوا داوای کرێی زیادەی لێدەکردین، بۆیە چوومە سەر ئەو باوەڕەی کە مامۆستا پاپۆلی مافی خۆی بوو کە داوای هاوکاری لە گابرێلا کرد. هەر لەوکاتەدا دکتۆر پاپۆلی لە گابرێلای پرسی نانی نیوەڕۆ لەکوێ بخۆین؟ گابرێلا گوتی: هەر شوێنێک تۆ پێتخۆش بێت. دکتۆر پاپۆلی گوتی: دوێنێ ئێمەت برد بۆ کێڵگەی هاوڕێ دەوڵەمەندەکەت، ئەمڕۆ دەمانبەیت بۆلای کێ؟ گابرێلا گوتی: ئەگەر ئێوە پەلەم لێنەکەن، دەتانبەم بۆلای هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستم. دکتۆریش قبوڵی کرد. (ئوجدا) قاچی فشاردام و بەهێواشی گوتی: دووبارە گۆبەندێکمان بۆ ساز دەکات (ڕودرس) سەرێکی بۆ لەقاندو بەدەست وێنەی سەڵیبی لەسەر سنگی کێشا.

نزیکی نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنێکی دوورە دەست لە کەناری دەریا، ئەو شوێنە بەندەر نەبوو، جێگایەکی گوماناوی بوو، نە قەیاغێک، نە بەلەمێک، نە کەشتییەک، هیچ شتێکی لێنەبوو. لە هەندێک شوێنی دەریاکەدا تەنکاو هەبوو، خەڵکانی سەیرو نامۆ لەوێ هەبوون، خەڵکانێک کەوا هەستمان دەکرد هەرئێستا لە دۆزەخ، یان لە زیندانە ترسناکەکانەوە گەڕابنەوە، ئەو خەڵکە زۆربەیان چەکداربوون و زۆربەشیان خەنجەرێکی گەورەیان بەقەدەوە بوو، هەموویان کەسانی ڕەش و گەورە بوون و کەسانی زۆر بەهێز بوون. چەند خانوویەکی جوان لەوناوە هەبوون. گابرێلا ڕۆیشت بۆلای خانوویەکی گەورە، دوای چەند خولەکێک چەند پیاوێک و دوو ژن هاتن بۆلای ئێمە، بەڕواڵەت لە کەسانی سۆزانی دەچوون، بەڵام بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردین. ئەوان ماسی و دووجۆر خواردنی ئەو ناوچەیەیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ هێنابووین کە لە گەلای درەختی ئەو ناوچەیە دروستکرابوون و زۆرخۆش و بەلەزەت بوون. هەر لەو کاتەدا لە چەند ماڵێک لەولاتر دەنگی هاوار هاوارو شەڕ هاتە گوێمان، تومەس لە نێوان چەند کەسێکدا شەڕ دروست ببوو. دەنگی هاواری پیاوێک ئێمەی ڕاپەڕاندو لە خانووەکە هاتینە دەرەوە، ئەو پیاوە سکی بریندار ببوو خوێنی لێدەهات، لەسەر لمی

قەراخ دەریا دەتلایەوە. پیاوێکی تر لە ڕانیەوە خوێن فیچقەی دەکرد، چەند پیاوێکی تریش لـەولاوە بە دارو بەرد لەیەکیان دەدا، لەناکاو دەنگی دەستڕێژی گوللە هات و ئەو شەڕکەرانەش هەموویان دەستیان لە شەڕکردن کێشایەوە. ئەو دەستڕێژەش گابرێلا بوو، کە بە تفەنگەکەی تەقەی کردبوو، بۆ ئەوەی شەڕەکە بوەستێت. بەوەستانی شەڕەکە چەند پیاویک چوون بۆلای دووبریندارەکە. لەو ناوچەیەدا نە پۆلیس هەبوو، نە نەخۆشخانە، خەڵکەکە دەیانگوت: نزیکترین نەخۆشخانە لێرەوە چل کیلۆمەتر دوور دەبێت. سەیرمکرد وا پرۆفیسۆر پاپۆلی خەریکە هاوکاری پیاوە بریندارەکە دەکات و دەیەوێت خوێنبەربوونەکەی بوەستێت. پیاوە بریندارەکە کەسێکی زل و بەخۆوە بوو، بەڵام بەخراپی هەناسەی دەداو خوێنی زۆر لەبەر ڕۆیشتبوو. دکتۆر پاپۆلی پێیگوتم: بە بریندارەکە بڵێم هیچ نەترسێت، باش دەبێت و ئێمە دەڕۆین و دەچین پزیشکی بۆ دەهێنین، نزیکترین دکتۆر چل کیلۆمەتر دووربـوو لێمانەوە. گابرێلا گوتی: لێرە شەڕو سکدڕین و پیاوکوشتن شتێکی ئاساییە. سواربن و با بڕۆین و لە شوێنێکی تر نانخواردنەکەمان تەواوبکەین. خەڵکانی ئەم ناوچەیە خوویان بەمجۆرە کێشانەوە گرتووە، خۆیان هاوکاری ئەم پیاوە دەکەن و کێشەکە چارەسەر بکەن. سەرەنجام ژنێکی جوانی تەمەن میان ساڵ پەیدابوو، ئەو ژنە بە چەند کەسێکی گوت: بەزوویی ئەو بریندارانە ببەنە ژوورێکەوە. پیاوەکان وەکو سەربازێک کە فەرمانی فەرماندەکەی جێبەجێ دەکـات، ئـاوا فەرمانی ئەو ژنەیان جێبەجێ کرد. گابرێلا گوتی: ئەو ژنە لێپرسراوی ناوچەکەیەو کەسانێکی زۆری لەبەردەستدایە. کەم کەم تێگەیشتم کە ئەو شوێنە شوێنێکی بەدناوەو گازینۆیەکی لێیە بۆ تەواوی ناوچەکە. ئەو پیاوانەشی کە لەوێ بوون، یا لایەنگری ئەو ژنە بوون، یاخود پاسەوان و باجگری ناوچەکە بوون. یەکێک لەو پیاوانەی کە بریندار ببوو، لەکاتی قوماركردندا فێڵی کردبوو، ئەو کەسێکی خاوەن دەسەڵات بوو، لایەنگری زۆری لە ناوچەکەدا هەبوو. گابرێلا لەگەڵ ئەو ژنەدا کە لێپرسراوی ناوچەکە بوو، دۆستایەتی هەبوو، کاتێک یەکتریان بینی بەگەرمی سڵاویان لە یەکتری کردو لە هەواڵی یەکتریان پرسی. ئەو ژنە لە گابرێلای پرسی: تۆ لێرەیت و بۆچی نەهاتوویت بۆلای من. گابرێلا گوتی: چەند مامۆستایەکی زانکۆم لەگەڵدایە ئەوان میوانی منن. ئەو ژنە سەیرێکی کردین و گوتی: ئەمانە چی دەکەن لێرە؟ ئەمان لێرە دووربخەرەوە. ئەو ژنە بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: ئەو پیاوەی

کە سکی دڕاوەو خەریکە دەمرێت، سەرۆکی گرووپێکی ترسناکە لە ناوچەکەدا، دوای چەند خولەکێکی تر لایەنگرانی دەگەنە ئێرە، ئەوکات دیار نییە کە چی ڕوودەدات لێرە. ئەوەی گوت، دەستی هەڵبڕی و خوداحافیزی لە گابرێلا کردو ڕۆیشتە ئەو خانووەوە کە بریندارەکانیان بۆ بردبوو. گابرێلا گوتی: بەخێرایی سواربن با بڕۆین. ئەگەر نەڕۆین لەوەیە هەر ئێستا لایەنگرانی ئەو پیاوە بریندارە بگەنە ئێرە، خۆ ئەگەر لێرە شەڕیش ڕوونەدات، چونکە ئوتۆمبێل لەم ناوچەیەدا کەمە، لەوەیە ئۆتۆمبێلەکەمان لێبسەنن و ئەو بریندارانەی پێ ببەن بۆلای دکتۆر. ویستمان نانی نیوەڕۆ نەخۆین و سواربین و بڕۆین. گابرێلا لەپشتی سوکانەوە دانیشتبوو. دکتۆر پاپۆلی گوتی: ڕۆیشتنمان لەم ناوچەیە، هەڵەیە. گابرێلا هاواریکرد: زووکەن سواربن. دکتۆر بە گابرێلای گوت: دابەزە ڕۆیشتنی چی؟ دکتۆر گوتی: یەکەم لەڕووی مرۆڤایەتییەوە پێویستە ئێمە هاوکاری ئەو مرۆڤانە بکەین، دووەم ئەگەر ئەو پیاوە لە ناوچەکەدا دۆست و لایەنگری هەبێت، ئەوا پێشمان پێدەگرن و بەزۆر دەمانبەن بۆ ئەو شوێنەی کە دکتۆری لێیە. گابریلا هاواری کردەوەو گوتی: دکتۆر سواربە. ئێمەش هەموو تکامان لێکردو گوتمان: دکتۆر سواربە. گابرێلا دەستیکرد بە لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکە. دکتۆر گوتی: من دڵنیام لەم هەلومەرجەدا ڕۆیشتن لەم ناوچەیە هەڵەیە، دەبووایە هاوکاری ئەو بریندارانەمان بکردایە. گابرێلا گوتی: هەرچۆنێک بێت ئەو پیاوە دەمریت. دکتۆر گوتی: ئەو پیاوە وا بەئاسانی نامرێت، برینەکەی زۆر قوڵ نییە.

نزیکەی پێنجسەد مەتر دوورکەوتبووینەوە، ڕێگاکە زەلکاو و پڕتاسە بوو، شۆفێرەکە نەیدەتوانی بەخێرایی لێبخوڕێت. لەناکاو گرووپێکی پانزە کەسی بە دارو تێلاو دەمانچەو تفەنگەوە پێشیان پێگرتین. ئەوان لە دۆستانی ئەو پیاوە بریندارە بوون، دەچوون بۆ هاوکاریکردنی ئەو، چەند کەسێکیان لێمان هاتنە پێش بە هەڕەشەی بەکارهێنانی چەک ئێمەیان دابەزاند و خۆیان سواربوون و بەرەو شوێنی شەڕەکە ڕۆیشتن. گابرێلا نەیوێرا دەست بۆ تفەنگەکەی بەرێت، بێگومان هەر ڕوو بەڕووبوونەوەیەک دەبووە هۆی تیاچوونمان. ئەو پیاوە زل و بەهێزانە زۆر توڕەو و توند بوون، ژمارەشیان زۆر بوون، هێشتا لەدوای ئەوانەوە خەڵکی تریش دەهاتن. ئێمە بەبێ ئوتۆمبێل و بە پیادە گەڕاینەوە بۆ هەمان شوێنی خۆمان. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بەجۆرێک لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا قسەبکەین کەوا تێبگەن ئێمە دۆستی ئەوانین و دەمانویست هاوکاری هاوڕێ

برینداره‌که‌یان بکه‌ین. گابرێلا ڕاستی گوت: ئێمه نه‌ده‌بووایه بڕۆشتینایه. دکتۆر به گابرێلای گوت: هه‌رچی زووتره خۆت بگه‌یه‌نه شوێنی شه‌ڕه‌که‌و پێیان بڵێ ئێمه بۆ هاوکاری ئێوه به‌ڕێکه‌وتین. ئۆتۆمبێله‌که‌تیان لێ وه‌ربگره‌و ئه‌و پیاوه بۆ هه‌رشوێنێک ده‌چێت، بیگه‌یه‌نه، ئه‌گه‌ر وا نه‌که‌یت بێ ئۆتۆمبێل ده‌بین و دیاریش نییه ئۆتۆمبێله‌که‌مان پێده‌ده‌نه‌وه، یان نا. له دووره‌وه دیاربوو شه‌ڕه‌که به‌رده‌وامه. گابرێلا ده‌ستیکرد به غاردان و ئێمه‌ش به‌دوایدا غارماندا. تێکرژانێک بوو دوولایه‌ن به خه‌نجه‌رو دار و چه‌ک تێکرژابوون. دوو که‌س ئۆتۆمبێله‌که‌ی ئێمه‌یان کردبوو به سپه‌رو له‌پشتی ئۆتۆمبێله‌که‌وه به تفه‌نگ ته‌قه‌یان ده‌کرد، له هه‌مان کاتدا سی چل که‌س له پیاو و ژن هاتن و هه‌ریه‌که‌و تێلایه‌کیان به‌ده‌سته‌وه بوو، که‌وتنه نێوان هه‌ردوو گرووپه‌که‌و نه‌یانهێشت چیتر شه‌ڕبکه‌ن و لێکیان جوداکردنه‌وه. چه‌ند که‌سێک له هه‌ردوولا بریندار ببوون و خوێن به سه‌رو ڕوویاندا ده‌هاته خواره‌وه. ئینجا پیاوه برینداره‌که‌یان هێنا که ناوی (کۆلۆمبۆ) بوو. هێشتا له هۆش خۆی نه‌چووبوو، سواری ئۆتۆمبێله‌که‌یان کرد. دکتۆر پاپۆلی به منی گوت: بڕۆ به پیاوه برینداره‌که بڵێ ئێمه بۆیه ڕۆیشتین تاکو هاوکاری بۆتۆ بهێنین، هه‌ر ئێستاش گابرێلای هاوڕێمان تۆ ده‌گه‌یه‌نێته لای دکتۆر. ئه‌و پیاوه سوپاسی کردین و ده‌ستی دکتۆری گوشی. گابرێلا به‌خێرایی سواربوو له‌پشتی سوکانه‌وه دانیشت، یه‌کێک له هاوڕێکانی ئه‌و پیاوه ده‌یویست خۆی ئۆتۆمبێله‌که لێبخوڕێت، به‌ڵام پیاوه برینداره‌که ئاماژه‌یه‌کی بۆکردو هاوڕێکه‌شی مۆڵه‌تی دا گابرێلا خۆی ئۆتۆمبێله‌که لێبخوڕێت. که‌سه‌که‌ی تری هاوڕێی ئه‌و پیاوه که له‌ڕاستیدا برینێکی قوڵی هه‌بوو، ئه‌ویان سواری ئۆتۆمبێلێکی تر کرد. چه‌ند که‌سێکی تر له هاوڕێیانی ئه‌و پیاوه بریندار سواری ئۆتۆمبێله‌که بوون. گابرێلا ڕوویکرده ئه‌و ژنه‌ی که لێپرسراوی ناوچه‌که بوو، گوتی: هاوڕێکانم به تۆ ده‌سپێرم و به‌ڕێکه‌وت و ڕۆیشت، ئۆتۆمبێلێکی تریش هاوڕێیانی پیاوه برینداره‌که‌ی سوارکردو ڕۆیشت.

ژنه‌کان به‌سه‌ر ئه‌و گرووپه‌دا سه‌رکه‌وتن که (کۆلۆمبۆ)یان بریندارکردبوو، له ناوچه‌که‌دا ده‌ریانکردن. دکتۆر پاپۆلی پێیگوتم: له‌گه‌ڵ هاوڕێکانی (کۆلۆمبۆ) به‌جۆرێک قسه بکه‌ین و تێیان بگه‌یه‌نین، که بۆ ئه‌وه‌ی دوژمنه‌کانیان ئێمه نه‌به‌ن و ئازارمان نه‌ده‌ن، ویستمان له ده‌ستی ئه‌وان ڕابکه‌ین، به‌جۆرێک تێیان بگه‌یه‌نین که ئێمه ویستوومانه هه‌واڵ بده‌ین به ئێوه که (کۆلۆمبۆ) برینداره. به‌هه‌رحاڵ ئێمه بووین به دۆستی دۆسته‌کانی

(کۆلۆمبۆ)، بەڵام گرنگ ئەوە بوو هەموویان تێگەیشتن ئێمە لەژێر چاودێریی خانمی سەرۆکداین.

کاتژمێر نزیکی (٣:٣٠) دوانیوەڕۆ بوو، هەوا زۆر گەرم بوو، لەگەرماندا هەناسەبڕکەمان پێکەوتبوو. خانمی سەرۆک کە ناوە خوازراوەکەی (سۆزانا) بوو، کوخێکی پێداین، ئەو کوخە باوەشێنی لە قوماش دروستکراوی تێدابوو. لەو ناوچەیەدا کارەبا نەبوو، بەگشتی وا دەهاتە بەرچاوم کە ئەو ناوچەیە شارۆچکەیەکی نایاسایی بێت، چونکە شارۆچکەکە ناوی لەسەر نەخشەش نەبوو. پیاوێک هات بۆلامان و گوتی: سۆزانا دەڵێت هیچ پێویستییەکیان نییە. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بەناوی ئێمەوە سوپاسی سۆزانا خانم بکەو پێی بڵێ ئەگەر دەتوانێت سەردانێکمان بکات. منیش لە دکتۆرم پرسی تۆ کاری چیت بەو ژنە هەیە؟ (ئوجداو ماریۆ)ش هەمان پرسیاریان کرد. پرۆفیسۆر پاپۆلی بیردۆزێکی هەبوو، ئەو هەمیشە دەیگوت: نابێت بە خەڵکی بڵێیت خۆشم دەوێیت، بەڵکو دەبێت کارێک بکەیت کەسەکە هەست بکات ڕاستەوخۆ خۆشتدەوێت، ئەو لە گەشتەکەدا ئەو بیردۆزەی پیادەکرد. ئەو پێیگوتم: کاتێک سۆزانا هات بۆ لامان، تۆ تەنها ئەوەی پێ بڵێ ئەم سێ کەسە هەم مامۆستای زانکۆن و هەم ڕۆژنامەنووس، ئیتر خۆم قسەی لەگەڵدا دەکەم. پاشان گوتی: خۆ ئەم قسەیەی من درۆ نییە، چونکە من گۆڤارێکی لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی چاپ دەکەم و وابڕیارە (ماریۆو ئوجدا)ش ڕاپۆرتی گەشتەکەمان بدەن بە کۆمپانیایەکی گەشتیاری.

دوای چەند خولەکێک سۆزانا هات و گوتی: چ کارێکمان پێی هەیە. دکتۆر پاپۆلی قسەی لەگەڵدا دەکردو منیش بۆم وەردەگێڕا. دکتۆر پاپۆلی گوتی: سۆزانا خانم ئێمە زۆر سوپاسی تۆ دەکەین لەسەر ئەو ئازایەتییەت، تۆ نێوانگیری ئەو شەڕەت کردو ناوچەکەت هێمنکردەوە، کە یەک لەشکری پۆلیس نەیدەتوانی بەو خێراییە ئەو کارە ئەنجام بدات و کۆتایی بە شەڕەکە بهێنێت. دکتۆر پاپۆلی بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: ئێمە هەم مامۆستای زانکۆین و هەم ڕۆژنامەنووسین. پرۆفیسۆر بە سۆزانای گوت: ئایا ئەو ڕازییە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵدا ئەنجام بدات و لەگەڵ وێنەیەکیدا بڵاوی بکاتەوە. دکتۆر گوتی: من وێنەکەی تۆ لە گۆڤارێدا چاپ دەکەم و لێی دەنووسم ئەم ژنە جوان و ئازایە بەڕێوەبەرێکی بەتوانایەو لێپرسراوی سەدان پیاوی ئازایە. ئینجا گوتی: مۆڵەت دەدەیت سەرەتا وێنەیەکت بگرم. سۆزانا لە جێی خۆی

هەڵساو گوتی: من کەمێک کارم هەیە، دەڕۆم و ئێستا دەگەڕێمەوە. کاتێک لە کوخەکە ڕۆیشتە دەرەوە. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بۆیە ڕۆیشت تاکو خۆی بگۆڕێت و ئارایشت بکات و بگەڕێتەوە، هێشتا چەند خولەکێک تێنەپەڕیبوو کە سەیرمکرد پیاوێکی ڕەشپێستی گەورە بەیەک سینی خواردن و چەند بتڵێک کۆکا کۆلاوە هاتە ژوورەوە. دیاربوو ئەوە کۆکا کۆلای ساردبوو. (ئوجدا) گوتی: بۆ مەگەر لێرە یەخچاڵ هەیە؟ پیاوەکە لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ یەخچاڵی نەوتی لێرە زۆرە. دوایی پیاوی ڕەشپێست بە زمانی فەڕەنسی گوتی: خانم گوتوویەتی چی تریان پێویستە. دکتۆر گوتی: تۆ بە زمانی فەڕەنسی چەند باش قسە دەکەیت. پیاوەکە گوتی: من خەڵکی (گویان)ی فەڕەنسام و لێرە کار دەکەم. ئەو گوتی سۆزاناش زمانی فەڕەنسی دەزانێت، چونکە دایکی خەڵکی گویانە و باوکیشی بەڕازیلییە. دکتۆر لەو پیاوەی پرسی سۆزانا لێرە لێپرسراوی چەند ژنە؟ پیاوەکە گوتی: لێرە هەموو شتێک موڵکی سۆزانایە، ئەو لێرە نزیکەی دووسەد کوخی هەیە، لە هەر کوخێکدا لانیکەم ژنێک هەیە. ئێمەش لێرە (٤٢) پیاو کاردەکەین و مووچە لەو وەردەگرین. چەند چرکەیەک بێدەنگ بوو پاشان دەستی کردەوە بە قسەکردن و گوتی: جگە لە ئێرە، سۆزانا لە چەندین شوێنی تری کەنار دەریا و لێرەوە تاکو (بەلم) چەند کۆشکێکی هەیە. دکتۆر گوتی: لێرە جگە لە ئێوە کەسێکی تری لێ هەیە. پیاوەکە گوتی: ئێرە گازینۆ و قومارخانەیەو شوێنی خۆشگوزەرانینیە. لە ئێوارانەوە خەڵکی دێن بۆ ئێرە ئەگەر لێرە بمێننەوە، دەبینن کە شەو چەند هەزار کەس بۆ قومارکردن و خۆشگوزەرانییەکانی تر دێن بۆ ئەم ناوچەیە. دکتۆر گوتی: ئێمە چەند کاتژمێرێک لێرە دەمێنینەوە تاکو هاوڕێکەمان دەگەڕێتەوە، خۆشحاڵم بەوەی کەسێکی وەک تۆم لێرە ناسی کە بە زمانی فەڕەنسی دەتوانێت قسە بکەیت. پیاوی ڕەش پێست خۆی ڕێکخست و لەتەنیشت دکتۆرو هاوڕێیانی تردا وەستاو منیش وێنەیەکم گرتن. دکتۆر ناوی ئەو پیاوە گۆیانیەی پرسی و ئەو پیاوەش گوتی: ناوی (جامائیک)ە، دکتۆر پاپۆلی لەبارەی ڕیشەی ناو و جوانی ناوەکەی قسەی کردو گوتی: تۆ دەبێت بنەچەتان خەڵکی جامایکا بێت. ئەو پیاوە گوتی: بەڵێ وایە. دکتۆر پێنج دۆلارییەکی دا بەو پیاوە، بەڵام ئەو لێی وەرنەگرت و گوتی: تۆ میوان و هاوڕێی سۆزانایت، من مۆڵەتی ئەوەم پێنەدراوە پارە لە دۆستانی سۆزانا وەربگرم، سوپاسی کرد. جامایک بە دکتۆری گوت: لەکاتێکدا کە (کۆلۆمبۆ) بریندارکرا، لەوەبوو هاوڕێکانی هێرشبکەنە سەر ئێوە، بەڵام ئێوە هاوکاریتان

کردو ڕۆیشتن هاوڕێکانی ئەوانتان هێنا بۆ ئێرەو هاوکارییەکی باشتان کرد، ئێستاش هاوڕێیانی کۆلۆمبۆ دەیانەوێت بەخۆشی ئێوەوە ئاهەنگێک بگێڕن. پاش تاوێک سۆزانا بەخۆی و سێ کچە جوانەکەیەوە هاتە نێو کوخەکەوە، خۆی گۆڕیبوو جلوبەرگی جوانی لەبەرکردبوو. ئەو ئێمەی بانگهێشتکرد بۆ کۆشکەکەی خۆی کە نزیکەی سەد مەتر لێمانەوە دووربوو.

هەموومان بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ کۆشکەکەی سۆزانا، کۆشکێکی گەورەی هەبوو. لەدەرەوە زۆر جوان نەدەهاتە بەرچاو، بەڵام لە ناوەوە زۆرجوان و ڕازاوە بوو. کەلوپەلەکانی ناو کۆشکەکە هەموو تازەبوون. کۆشکەکە لە چەند ژوورێک و هۆڵێکی گەورەی پێشوازیکردن پێکهاتبوو. لە هۆڵەکەدا قەنەفەی زۆرجوان دانرابوون. (ئوجدا) گوتی: بەڕاستی شوێنێکی جوان و خۆشە. سۆزانا گوتی: ئەوە هەمووی بەهۆی بوونی پارەوەیە. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بەڵێ هەم بەهۆی بوونی پارەوەیە و هەم بەهۆی بوونی سەلیقەو شارەزایی و لێهاتوویی خاوەنەکەیەوەتی. ئەم پێناسەیەی لەبەردەم چەند کەسێک لە دۆستانی سۆزانا ئەنجامدرا. من هەستم پێکرد کە ئەو پیاوە ڕەش پێستە گۆیانییە دەیەوێت ئەو وتەیە بۆ دۆستانی سۆزانا وەربگێڕێت. ئەم قسەیە بووە هۆی خۆشحاڵی سۆزانا. لەم ڕووەوە فەرمانی بە پیاوەکانی کرد خزمەتمان بکەن. دیارە کە مەبەستی خزمەتکردنێکی تێروپڕ بوو. لەماوەی کەمتر لە نیو کاتژمێر گفتوگۆو وێنەگرتن، سۆزانا بەجۆرێک لەگەڵ ئێمەدا ئاشنا بوو، کەوات هەستدەکرد دە ساڵ دەبێت ئێمە دەناسێت. ئەو ژنێکی تەمەن چل ساڵی زۆرجوان و بەهۆش و ئازا بوو، ئەگەر وا نەبووایە، نەیدەتوانی لەم گۆشە فەرامۆشکراوەی خاکی بەڕازیلداو لەنێوان ئەو هەموو پیاوە بەهێزو بەتواناکەیەدا کاربکات. کارێک وەکو بەڕێوەبردنی گازینۆی قومارخانەو بەڕێوبردنی ماڵەخراپەکان. لەسەر ئەوەشەوە سۆزانا لە ژیانی خۆی ناڕازیبوو، دەیویست لە ئەمریکا، یان فەڕەنسا نیشتەجێ ببێت.

سۆزانا فەرمانیکرد ئەو ماتۆڕەکارەبابیەی کە تەنها شەوانە کاریان پێدەکرد، بێخەنە کار، تاکو ژوورەکان هەواگۆڕکێ پێبکەن. لەکۆتاییدا ئێمە بووین بە دۆستی سەرۆکی ناوچەکە. بیردۆزەکەی پرۆفیسۆر پاپۆلی بەکردەوە پیادەکرا. ئەو لەو باوەڕەدابوو کە دەبێت پەیوەندییەکان ڕاستەوخۆ بە مەرکەزی هێزەوە بێت. نەک بە دەوروبەرییەوە، ئێستا هێزی سەرەکی ناوچەکە، نەک تەنها دۆستمانە، بەڵکو بە پشتیوانی خۆشمانی

دەزانین، هەر بەو هۆیەشەوە سۆزانا لەبەردەم هاوڕێکانی، ئێمەی بە کەسانی گرنگ باسکرد. سەرەڕای ئەوەش ئەو لەبارەی ئازایەتی ئێمە لە شەڕەکەی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە بۆ ئامادەبووان. سۆزانا فەرمانیکرد کە باشتر خزمەتمان بکەن، لەسەر فەرمانی ئەو چەند پیاوێکی تر هاتنەژوورەوە، بەجۆرێک کە ژمارەی خزمەتکارەکان گەیشتنە زیاتر لە پازدە کەس.

سۆزانا وایدەزانی دکتۆر پاپۆلی خەڵکی وڵاتی فەرەنسایە، چونکە دکتور زیاتر قسەکانی لەسەر پاریس و هاوڕێ فەرەنسییەکانی بوو، کاتێک دکتۆر ئەو هەموو خەڵکەی بینی دەست لەسەر سنگ وەستاون، بە سۆزانای گوت: دەمەوێت چیرۆکێکتان بۆ بگێڕمەوە. پاشان بە پیاوە گۆناییەکەی گوت: چیرۆکەکە بۆ ئەو خەڵکەی تر وەربگێڕێتە سەر زمانی پورتوگالی. پرۆفیسۆر چیرۆکێکی زۆر جوانی لە داستانی هەزارو یەک شەوەی ئێرانی گێڕایەوە، بەڵام چیرۆکەکەی بەجۆرێک دەگێڕایەوە کە وەک لەگەڵ سۆزانای بێت وابوو. نزیکی ئێوارە بوو، هێشتا هیچ هەواڵێک لە گەڕانەوەی گابرێلا نەبوو. دکتۆر پاپۆلی مۆڵەتی لە سۆزانا وەرگرت تاکو گابرێلا دەگەڕێتەوە لەدەرەوە پیاسەیەک بکەین. سۆزانا گوتی: ئەمشەو هاوڕێیانمان دێن بۆ ئێرە، تۆش ئەمشەو میوانی ئێمەیت و شەوێش چیرۆکمان بۆ بگێڕەوە، چونکە هاوڕێکانمان چیرۆکەکانی تۆیان زۆر پێخۆشە، شەوانەش لەم ناوچەیەدا تا دووری سێ سەد کیلۆمەتر هیچ ئاسایشێک نییە، ئەگەر بەشەو برۆن لە ڕێگادا گیانتان دەکەوێتە مەترسییەوە. ئنجا بەبێ ئەوەی بۆچوونی ئێمە وەربگرێت، بە زمانی پورتوگالی فەرمانیکرد چوار ژوور بۆ خەوتنی ئێمە ئامادەبکەن و لە کەنار دەریاش مێزێک و دوانزە کورسی ئامادە بکەن بۆ ئێمەو چەند هاوڕێیەک.

گەرماکە لەچاو نیوەڕۆوە کەمێک باشتر ببوو، بەڵام هێشتا هەوا گەرم بوو. وردە وردە خەڵکی دەهاتن، کات لەدوای کات ژمارەیان زیادی دەکرد. ئێمە نیگەرانی گابرێلا بووین، کات درەنگ ببوو، نزیکەی چوار کاتژمێر دەبوو ڕۆیشتبوو. ئێمە ڕۆیشتین بەرەو لای چەند کوخێک کە نزیکەی حەوت سەد مەتر لێمانەوە دووربوون، وا هەستمان دەکرد ئەو خەڵکە زۆربەیان ئێمە بناسن، لە چەند شوێنێک فەرموویان لێکردین بۆ خواردنەوە، ئەوان بە چاوی موشتەرییەوە سەیری ئێمەیان دەکرد. نزیکی کاتژمێر هەشت بوو کاتێک گابرێلا هاتەوە، بە سەروچاویدا دیاربوو زۆر شەکەت ببوو، کاتێک بینی ئێمە لە

کەنار دەریا لەسەر مێزێکی گەورە دانیشتووین، سەری سورما. هەواڵی بریندارەکانمان لێپرسی گوتی: (کۆلۆمبۆ) باشەو چەند ڕۆژێکی تر لە نەخۆشخانە دەردەچێت، بەڵام ئەو پیاوەی قاچی شکابوو، باش نییەو لەوەیە بمرێت.

هاوڕێکانی کۆلۆمبۆ خۆشحاڵبوون و لە دەوری ئێمە کۆبوونەوە. پرۆفیسۆر پاپۆلی گوتی: کوڕینە ئێمە ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە ئاگاداری خۆتان بن نە خواردنەوە بخۆنەوەو نە بەلای کاری خراپدا بڕۆن، دیارە دکتۆر پاپۆلی زیاتر مەبەستی گابرێلا بوو. گابرێلا کە بینی ئێمە ئەو هەموو هاوڕێیەمان پەیداکردووە، بەلایەوە سەیربوو، ئەو بە ئێمەی گوت: هاوڕێیانی کۆلۆمبۆ تفەنگ و دەمانچەیان لێسەندووە، دوای کاتژمێرێک سۆزانا هات بۆلامان. دکتۆر پاپۆلی تکای لێکرد بە هاوڕێیانی کۆلۆمبۆ بڵێت، بەڵکو تفەنگ و دەمانچەکە بدەنەوە بە گابرێلا. سۆزانا یەکێک لە پاسەوانەکانی نارد بۆلای هاوڕێیانی کۆلۆمبۆ، دوای نیو کاتژمێر کەسێک بە ئۆتۆمبێلەوە هات و چەکەکانی هێنابووەوە، ئەوکەسەش برای کۆلۆمبۆ بوو، هاتە لامان و سوپاسی ئێمەو سۆزانای کردو پێیگوتین: شەو میوانی ئەوین.

ئەو شەوە خواردنێکی باشیان بۆ ئامادەکردبووین، خزمەتێکی زۆریان کردین، بەدەنگی گیتار و گۆرانیگوتن ئاهەنگێکی نموونەییان بۆ سازکردین. سۆزانا کەسانێکی بانگهێشتی سەر مێزەکە کردبوو، کە زۆربەیان زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسییان دەزانی، تەنها چەند کەسێکی وەکو براکەی کۆلۆمبۆ بە زمانی پورتوگالی قسەیان دەکرد. دکتۆر پاپۆلی باسی یادەوەرییەکانی خۆی دەکردو چیرۆکی ولاتانی بۆ ئەو خەڵکە دەگێڕایەوە، ئەوە چ جۆرە توانایەک بوو، ئەوە چۆن توانایەک بوو لەو گۆشە دوورە دەستەی بەڕازیل ئەو هەموو خەڵکە لە خۆی کۆبکاتەوەو ببێتە دۆستیان، لەماوەی هەشت کاتژمێردا دۆستایەتییەکەی بەجۆرێک بوو کە ئەو بووە واستەی گابرێلا تاکو چەکەکانی وەربگرێتەوە. سۆزانا وەک فەرماندەیەک فەرمانی دەکردو ناوچەکەی بەڕێوەدەبرد. لانیکەم ئەو شەوە دوو هەزار کەس هاتبوون بۆ ئەو شوێنە. سۆزانا بۆخۆی بێسیمی ماوەکورتی دروستکردبوو، کەسەکانی دەوروبەری خۆی هەموو هەواڵێکی ناوچەکەیان زوو زوو پێڕادەگەیاند، ئەو چەند جێگرێکیشی هەبوو بۆ سەرپەرشتیکردنی کارەکانی. دەوروبەری کاتژمێر دوانزەی شەو گابرێلاو کەسەکانی تر ڕۆیشتن، ئێمە چوار کەس لەگەڵ سۆزانا و یەکێک لە جێگرەکانی لەوێ ماینەوە. پرۆفیسۆر پاپۆلی

گوتی: سۆزانا خانم ئەگەر دەکرێت لەبارەی ژیانی خۆت و هاتنت بۆ ئەم شوێنەو دروستکردنی ئەم شارۆچکەیە هەندێک قسەمان بۆ بکە... سۆزانا گوتی: تۆ چۆن بیر لە من دەکەیتەوە؟ پرۆفیسۆر گوتی: من وا هەستدەکەم تۆ زانکۆت تەواو کردبێت، لەهەمان کاتدا ئاگاداریت لەسەر باری ئابووری و کۆمەڵایەتی بەڕازیل و ناوچەکەو هەموو جیهان هەبێت، بەبێ پیاهەڵدان وا هەستدەکەم تۆ بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوویت. سۆزانا گوتی: تۆ چۆن دەزانیت من زانکۆم تەواوکردووە؟ پرۆفیسۆر گوتی: بە شێوازی قسەکردن و بەکارهێنانی هەندێک وشەو تێگەیشتنە کۆمەڵایەتییەکاندا دەزانم. سۆزانا گوتی: من لە ساڵی (١٩٨٤)دا لیسانسی باڵای بازرگانی نێودەوڵەتیم وەرگرتووە لە زانکۆی مارتینکی فەرەنسا، ساڵێکیش بە بەردەوامی بۆ خوێندن چوومەتە زانکۆی لیۆنی فەرەنسا، بەڵام لەوێ لە کۆمپانیایەکی بازرگانی دامەزرام. پاشان وەک نوێنەری کۆمپانیاکە دەستبەکاربووم لە بەلم و دەوروبەری ئەمازۆن، هەر لەوێ پارەیەکی باشم دەستدەکەوت، ئەو کاتە تەمەنم (٢٥) ساڵ بوو زۆر چالاک بووم، بۆ چالاکی بازرگانی دەچووم بۆ شارەکانی باکووری بەڕازیل و گۆیان و ناوچەی ئەمازۆن. ساڵی (١٩٨٦) بۆ دامەزراندنی بنکەیەکی بازرگانی هاتم بۆ ئێرە. دوای مانگێک کارکردنم لێرە، ڕۆژێک چەند کەسێک لەگەڵ هاوڕێکانمدا کەوتنە شەڕەوە، دووان لە هاوڕێکانم بەسەختی برینداربوون، دوایی ویستیان من بگرن و دەستدرێژیم بکەنە سەر، ئێمەش ڕەشاشێکمان هەبوو لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا بوو، منیش بەبێ ترس پەلاماری ڕەشاشەکەم داو کەوتمە تەقەکردن لێیان، کەسێکم لێکوشتن و دووانی تریانم بریندارکرد. دوو سێ کەسی تریان لەگەڵدا بوو، ئەوان بەزوویی ڕایانکرد، منیش هاوڕێ بریندارەکانم خستە ئۆتۆمبێلەکەوەو بەخێرایی بردمن بۆ نەخۆشخانە لە شاری (سائولوئیس)، کە سەد کیلۆمەتر لە شوێنی ڕووداوەکەوە دووربوو. لە نەخۆشخانەکە تەنها کەسێک لێی نەپرسیم و بڵێیت ئەم دوو کەسە بەچی برینداربوون. دوای چەند ڕۆژێک کە هاوڕێکانم چاکبوونەوە، لێم پرسین بۆچی ئەو کەسانە دەیانویست دەستدرێژیی بکەنە سەرم؟ هاوڕێکانم گوتیان: لەم ناوچەیەدا پیاوێکی زۆر هەیەو لێرە کاردەکەن و لە هاوسەرەکانیان دوورن. ئیتر من تێگەیشتم کە لەم ناوچە دوورەدەستەدا هەزاران پیاو لە چاککردنی ڕێگاوبان و کێڵگەی قاوەو هێنان و بردن و بەخێوکردنی ئاژەڵ کاردەکەن. منیش وام بەبیرمدا هات کە گازینۆیەک و قومارخانەیەک دروست بکەم و بۆخۆم کاری

بازرگانی بکەم، هەربۆیە لێرە نیشتەجێ بووم، دەیان کیلۆمەتر زەویم لە کەنار دەریاکە کڕیوە، یان لە حوکمەت وەرمگرتووە، ئێستا دەمەوێت لێرەدا لە ڕووبەرێکی بیست کیلۆمەتریدا شارێک و بەندەرێکی بچکۆلانە دروست بکەم. زەوییەکە موڵکی خۆمە، بەڵام حکومەت مۆڵەتی دروستکردنی شاری پێنەداوم. ئێسا ئێمە بەشێوەیەکی نایاسایی لەم ناوچەیەداین، هەربۆیەش هیچ خزمەتگوزارییەکمان بۆ نەکراوە، بەڵام جێگایەکی ترمان هەیە کە تازە خەریکین شارێکی لەسەر دروست دەکەین و شوێنەکەش مۆڵەتی هەیە. شارێکی تەواوەو لەوێ تەواوی دامەزراوە گشتییەکان بەرچاو دەکەون. منیش لێم پرسی ئەو هەموو کارانە بەپارەی خۆت ئەنجامت داوە. سۆزانا گوتی: زەوییەکەو پلانی دروستکردنەکەی هی خۆمە، بەڵام زۆرێک لە دامەزراوەو دووکانەکان و قاوەخانەکان و ڕێستۆرانتەکانم لەپێشەوە فرۆشتووە، بڕیارمداوە دوای تەواوبوونی پڕۆژەکە بەو پارەیەی کە دەستم دەکەوێت، بڕۆم بۆ ئەمریکاو لەوێ بژیم. دکتۆر پێیگوت: لەدوای تەواوبوونی پڕۆژەکەت چەندت پارە دەستدەکەوێت؟ سۆزانا گوتی: لانیکەم سەد ملیۆن دۆلارم دەستدەکەوێت. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بۆ ئەم پڕۆژە گەورەیەی لە ژێر دەستتدایە، بەدڵنیاییەوە پێویستت بە بانگەشەیەکی گەورە هەیە؟ سۆزانا گوتی: بانگەشەمان هەیە، بەڵام بانگەشەیەک کە بە پارەی ئێمە ئەنجام بدرێت جیاوازە لەو بانگەشەیەی کە بە قەڵەمی ئێوەی مامۆستایان دەکرێت. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بینیت بۆچوونەکەی من ڕاست دەرچوو. کاتێک گوتم: تۆ ژنێکی خوێندەوارو شارەزایت. سۆزانا گوتی: پرۆفیسۆر تۆ لە فەرەنسی ناچیت. دکتۆر پاپۆلی گوتی: بەڵێ من ئێرانیم، دکتۆر گوتی: ئێوە بەم هەموو کارەی لە ئەستۆتانەو بەو هەموو لێپرسراوێتییەی لەسەر شانتانە، کاتی خۆت بۆ ئێمە تەرخانکرد بۆچی؟ سۆزانا گوتی: من بەم دیدارە لەگەڵ ئێوەدا زۆر خۆشحاڵبووم، بەدرێژایی پانزە ساڵ کە لێرە نیشتەجێیم، ئەوە یەکەمینجارە کە گرووپێک لە مامۆستای زانکۆو کەسانی شارەزا بێن بۆ ئەم ناوچەیە، ئێوە بەنیازی خۆشگوزەرانی نەهاتوون، من دەزانم کە ئێوە تەنها بیر لە خۆتان و خۆشگوزەرانی ناکەنەوە، بەڵکو بیر لە خەڵکانی تریش دەکەنەوە، بەگشتی هەرکەسێک دێتە ئێرە، یا بۆ ئەوە دێت قومار بکات و پارەیەکی دەست بکەوێت، یا بۆ ئەوە دێت جەستەی تێر بکات و بڕوات. ئەوانە هەموویان بە پارەکانیان دەنازن، ئەوانە بە چاوی مرۆڤایەتییەوە سەیری ژنان ناکەن، بەڵکو وەکو دەستەسڕێکی کلینس سەیریان دەکەن، ئەگەر کارمەندەکانی من نەبن،

ئەوان لەسەر ژن و پارە دەیکەنە شەڕو ورگی یەکتری دەدڕن. ئێمە لێرە ڕۆژانە شەڕمان هەیە، کەسانێک دێن بۆ ئێرە کە هەموو ژیانی خۆیان دەکەن بەقوربانی ژن و قومارکردن، قازانجی من لە ئابووری ئەواندایە. نە من ئەوان بە مرۆڤ دەزانم و نە ئەوانیش من بە مرۆڤ دەزانن، بەدرێژایی ئەو چەند ساڵەی ڕابردوو هیچ کەسێک لێرە لەبارەی توانای بەڕێوەبردن و جوانییەکانی ساڵۆن و پێشوازییەکانم قسەیەکی نەکردووە، هەرکەسێک هاتبێت بۆ ئێرە، یان مێزێکی لێ داواکردووم بۆ قومارکردن، یان داوای کچێکی جوانی کردووە بۆ ڕابواردن، بەڵام دوای ئەم هەموو سەردەمە، ئێوە منتان بردەوە بۆ سەردەمی کتێب و هۆنراوەو مرۆڤایەتی. ئەم پرۆفیسۆرە ئێرانییە بەو هۆنراوانەی شاعیرانی ئێرانی کە بۆی خوێندمەوەو بۆی وەرگێڕاوم و ئەم هاوڕێ شیلییەش بە خوێندنەوەی چەند هۆنراوەیەکی ئەمریکای لاتینی، تێڕوانینی منیان گۆڕی بەرامبەر بە موڵک و سامان. دەمویست لانیکەم ببمە خاوەنی سەد ملوێن دۆلار ئەوکاتە بڕۆم بەرەو ئەمریکا، بەڵام ئێستا وا بیردەکەمەوە تا چەند مانگێکی تر حسابەکانم بکەم و هەرچییەکی بۆم مایەوە هەڵیبگرم و بڕۆم بەرەو دنیای پێشکەوتوو. خۆم لەم چڵپاوە ڕزگاربکەم کە لەپێناوی پارەدا خۆم بۆ خۆمم دروستکردووە. هەر ئێستا کە نزیکەی هەشتا ملیۆن دۆلاری نەقدم هەیە، هەر بەو پارەیە دەتوانم لە ئەمریکا ژیانێک بۆخۆم دروستبکەم و کتێب بخوێنمەوە. دکتۆر پاپۆلی چەند کاتژمێرێک لەوەوپێش داستانی (تەماحکار) لە نووسینی ئەنتۆنیۆ جیخۆفی بۆ باسکردبووین، هەر ئەو داستانە کاریگەری لەسەر سۆزانا دروستکردبوو.

کات ببوە نیوەشەو ئێمەش ڕۆژێکی ئاڵۆزمان بەڕێکردبوو، هێشتا دەنگی مۆسیقاو ئاهەنگی عاشقانە دەهاتە گوێمان، ئۆتۆمبێلەکان کەم ببوون و ڕۆیشتبوون. سۆزانا گوتی: هەندێک لەو پیاوانە، بەتایبەتی قومارچییەکان، تاکو بەرەبەیان دەمێننەوە. سۆزانا گوتی: پرۆفیسۆر دەمەوێت تکایەک لە تۆ و هاوڕێکانت بکەم، سبەینێش لێرە بمێننەوە، سبەینێ لەگەڵ چەند کەسێک دەڕۆین بەرەو دارستانەکە، بەڵێنتان پێدەدەم کاتێکی خۆش بەسەردەبەن. مامۆستا گوتی: بەیانی لەو بارەیەوە قسە دەکەین.

بەیانی کاتێک من و (ئۆجدا) لە کوخەکە هاتینە دەرەوە، چاوم لە دکتۆر بوو لە کەنار دەریا لەپشتی مێزەکەی شەوەوە دانیشتبوو، ژمارەیەک ژنیش لەدەوری بوون، کاتێک منی بینی، گوتی: وەرە قسەکانی منیان بۆ وەربگێڕە. دکتۆر دەیویست بزانێت ئەو

ژن و کچانە کێن و بۆچی هاتوون بۆ ئەو شوێنە، بۆچی ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردووەو چەندیان پارە دەستدەکەوێت و چی لە پارەکانیان دەکەن. پیاوە ڕەش پێستە گۆیانییەکە قەڵەم و کاغەزی بۆ هێنابوون، پرسیارەکان لەسەر کاغەز نووسرانەوەو درایە ژن و کچەکان تاکو دوایی وەڵامی پرسیارەکانیان بەنووسین بدەنەوە. دەوروبەری کاتژمێر (٩)ی بەیانی سۆزانا کەسێکی ناردبوو بەشوێنماندا تاکو بچین بۆ نانخواردنی بەیانی. کاتێک چووین، مێزێکی شاهانەیان بۆ ڕازاندبووینەوە. (ئۆجدا) دەستیکرد بە خوێندنەوەی هۆنراوە. سۆزانا خراپ کەوتبووە ژێر کاریگەری هۆنراوەکانەوە. سۆزانا بە ئۆجدای گوت: ئەگەر چیتر لەو هۆنراوانە بخوێنیتەوە، هەر ئەمڕۆ لێرە دەڕۆم. ئەوکات چی دەبێت با ببێت. پرۆفیسۆر گوتی: ئەگەر وایە ئوجدا بە بەردەوامی هۆنراوە بخوێنەوە، ئەویش زۆرترین هۆنراوەکانی شاعیرانی ئیسپانی و پورتوگالی خوێندەوە.

گابریێلا هێشتا خەوتبوو، نزیکی نیوەڕۆبوو، کە هات بۆلامان، داوای لێکردین بڕۆین. سۆزانا پێشنیاری چوونە دارستانەکەی دووبارەکردەوە. دکتۆر پاپۆلی بە گابریێلای گوت: تۆ دەڵێیت چی؟ ئێمە بۆ گەشتوگەڕان هاتووین بۆ ئێرە، بەڵام تۆ کارت هەیەو پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ شارەکەی خۆت. سۆزانا گوتی: ئەگەر گابریێلا دەیەوێت بڕوات من دەتوانم ئۆتۆمبێل بۆ ئێوە دابین بکەم و تاکو بەلم بتانبات. گابریێلا گوتی: من هاوڕێی نیوەڕێگا نیم. ئێمەش دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بەتەواوی پێویستییەکانەوەو بە سێ ئۆتۆمبێل و لەگەڵ چەند کەسێک لە هاوڕێیانی سۆزانا گەیشتینە دارستانەکە. سۆزانا لە دووری حەفتا کیلۆمەترو بەتەنیشت دارستانەکەوە کۆشکێکی جوانی لەسەر گردۆڵکەیەک دروستکردبوو، شەو لەو کۆشکەدا ماینەوە، بە چیرۆک و یادەوەری هاوڕێیان و هۆنراوە خوێندنەوەی ئۆجداو دەنگی هێمنی گیتار، شەوێکی خۆشمان بەڕێکرد.

بەدەر لە کارە ناشرینەکانی ئەو ژنە، بەڵام گیانێکی نەرمونیان و مرۆڤدۆستانەی هەبوو. پرۆفیسۆر پاپۆلی لە هەوڵدابوو ئەو گیانە بەئاگا بهێنێت لەگەڵ هەر چیرۆکێک کە دەیگێڕایەوەو لەگەڵ هەر هۆنراوەیەک لەو هۆنراوانەی کە ئۆجدا دەیخوێندەوە سۆزانا لەو جیهانەی کە خۆی دروستیکردبوو، دووردەکەوتەوەو دەچووە جیهانێکی ترەوە. ڕۆژی دواتر، بەیانی زوو بڕیاری دابوو دەست لەو کارو پیشەیەی هەڵگرێت و لەگەڵ چەند کچێکی دەوروبەری بچێت بۆ بەلم و لەوێ لەو کۆشکە گەورەیەی کە

هەیبوو نیشتەجێ ببێت و دەست بکات بە کاری بازرگانی. ئۆجداش کە توانایەکی باشی بازرگانی هەبوو، لە هەمانکاتیشدا سەرپەرشتی کۆمپانیایەکی ئاوی کانزایی دەکرد لە شیلی، ڕێنماییەکی باشی سۆزانای کرد.

ئێمە شەوی دواتریش لە کەناری دەریا ماینەوە، بەڵام لە هەلومەرجێکی باشتردا، ڕۆژی دواتر بەیانییەکەی زوو خوداحافیزیمان لە سۆزانا کردو ڕۆیشتین بەرەو بەلم. سۆزانا پێیگوتین: لە بەلم بچین بۆ کۆشکەکەی ئەو. گابرێلا کە ببووە هاوڕێی دڵسۆزمان، گوتی: من ئێوە جێناهێڵم و لەگەڵماندا هات بۆ بەلم. لەوێوە تا چوارسەد کیلۆمەتر لەناو ڕووباری ئەمازۆندا ڕێنمایی ئێمەی کرد. ئەو لەو ماوەیەدا کە لەگەڵ ئێمە بوو، بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی خۆشی دەکرد. ماوەی گەشتەکەمان (٢٣) ڕۆژ بوو. لە بەلم میوانی سۆزانا بووین، لە دوو ڕۆژی دواییدا کە لە ئەمازۆنەوە گەڕابووینەوە، ئەویش هاتبوو بۆ بەلم. پرۆفیسۆر پاپۆلی و ڕودرس لە بەلمەوە ڕۆشتن بۆ (لیما)ی پایتەختی پیرۆ، من و ئۆجداش گەڕاینەوە بۆ ڕیۆ.

لەگەڵ ئۆجدادا جارجار بەتەلەفۆن قسەمان بەیەکەوە دەکرد، نزیکەی یەک ساڵ و نیو دوای گەشتەکەمان بۆ بەلم، ئۆجدا تەلەفۆنی بۆکردم و گوتی: دوای مانگێکی تر لە سانتیاگۆ زەماوەندی ژنهێنان ئەنجام دەدات. پێیگوتم: پرۆفیسۆر پاپۆلی و چەند هاوڕێیەکی تریشمان لە ئەمریکای لاتینەوە دێن، بۆیە دەبێت تۆش هەر بێیت. دکتۆر پاپۆلیش لە پاریسەوە پەیوەندی پێوەکردم و گوتی: بەدڵنیاییەوە دەبێت تۆش بێیت. منیش پێمگوت: تۆ وەرە بۆ (ڕیۆدوژانیرۆ) لەوێوە بەیەکەوە دەچین بۆ (سانتیاگۆ). سێ کەسیش لە هاوڕێیانی تری بەڕازیلی هاتبوون بۆ زەماوەندەکە، ئۆجدا هەموو خەرجییەکانی ئێمەی لەئەستۆ گرتبوو، بۆیە هیچ هۆیەک نەبوو کە نەچین بۆ شیلی. ئۆجدا تەمەنی (٤٥) ساڵ بوو هێشتا هاوسەرگیریی نەکردبوو. کاتێک لە سانتیاگۆ لە فڕۆکە دابەزین، دکتۆر پاپۆلی گوتی: ئامادەی سوپرایزێک بە. کاتێک لە ساڵۆنی فڕۆکەخانە چووینە دەرەوە، سەیرمکرد سۆزانا لە جاران جوانتر وەکو بووکێکی ڕازاوە دەست لەناو دەستی ئۆجدا بۆ پێشوازی ئێمە هاتبوون.

هەرگیز گریانە خۆشییەکەی پرۆفیسۆر پاپۆلی لەوکاتەدا فەرامۆش ناکەم، ڕۆژی دواتر بەشداری ئاهەنگی زەماوەندی سۆزاناو ئۆجدامان کرد. ئاهەنگێک لە سانتیاگۆ. کە هەرگیز فەرامۆش ناکرێت.

ئەم پەرتووکەی بەر دەست و دیدەتان بەرگی چوارەمی شازادەی حەمامە. لەم بەرگەدا دکتۆر پاپۆلی سەرەتا باسی ژیان و نهێنی ناو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی یەزد دەکات، دەینوێنێت چۆن هاوسێکان ئاگایان لە ورد و درشتی شێوە ژیانی یەکتری بووە، بەڵام ئێستا شتەکان گۆڕاون، بەجۆرێک یارانی ئەشکەوت بوون، لە ژیانی هەمووماندا، بە بەراورد کردنی ڕابوردو بە ئێستامان، ژیان و زیندوێتی بە خۆی دەدات. کارامەییەکی لە ڕادەبەدەر دەنوێنێت لە چێکردن و وێناکردنی دوڕو گەوهەری ناو ناخی شەهربانوی پیری داناو مامۆستای پێگەیاندنی سەدان منداڵ وگەنج و لاوی دەورانـی، کە ئازایەتی و بەهێزی یادگەی ئەو پیرەژنە لە بڵێسەی ڕووناکی بەخشانیدایە بە هەموو ئەو کەسانەی بە کۆڵانەکەیاندا تێدەپەڕن.... پاپۆلی یەزدی پێمان دەڵێت هیچ کاتێک درەنگ نیە بۆ فێربوون، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیەش نمونەی بەرهەستکراوی ڕونـی بێڕتوشمان بۆ بەیان دەکـات. پێمان دەڵێت چۆن چووە بۆ دەریای بەستەڵەکی باکورو ئومێدی ئومێدەواری کورد دەبێتە هۆی گەرمبوونی گەشتی بەرەو ئەوێ چوونی.... دوایش بە گەشتێکی بۆ بەرازیل و لە ئەستەم و تالوکەدانی خۆیمان لەسەر زمانی خوێندکارێکیەوە بۆ دەهێنێتە سەر ڕوپەڕ.

